ناوی کتێب: تەیراوە.. . هەر بەپیاسە

نووسینی: زایەر عەبدوڵلا

بابەت: بیرەوەری

تایپ و نەخشەسازی: کۆمپیوتەر هیوا

فۆتۆی بەرگ: سەلام عەدۆ (ئاشتی)

دیزاینی بەرگ: جەمال حەمەدەمین

پێداچوونەوەی زمانەوانی: عەبدولڕەحمان فەرهادی

تیراژ: ٥٠٠ دانە

چاپی یەکەم: ٢٠١٩

کوردستان- هەولێر

نرخ: (٨٠٠٠) دینار

شوێنی چاپ : چاپخانەی رۆژهەلآت-هەولێر

لەسەر بودجەی پایتەختی رۆشنبیری چاپکراوە

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/هەرێمی کوردستان

ژمارە ( ٢٥٢٥)ی ساڵی (٢٠١٩)ی پێدراوە.

## لەجیاتی پێشەکی:

نامەوێ زۆر راستگۆبم، چونکە تا هەنووکە راستگۆیەکان هەناسە سارد و بەدبەخت و لەدواوەن، کەچی هەوڵمداوە زۆرترین راستی بدرکێنم، رازەکان.. نهێنییەکان بەراستگۆیی بنووسمەوە، گەر هەستت کرد وەنیمە، هیچ عێدز مەبە و گلەییم لێمەکە، بەڵام دەتوانی هەر هیچ نەبێت وەك منداڵە عەجوولەکانی تەیراوەی هەر کەعەقڵیان نەگرتبا لە (حەسەن پەنجا و پێنجیان) لەهەڵلا دەدا.. تۆش ئاوا هەر برگەییێکت لەم بیرەوەرییانە نەخێوایە عەقڵ، لێم لەهەڵلا بدە و چۆنت پێباشە، چیت پێراستە هەڵیرێژە، بەڵام بەمەرجێك راستی بێت و بەبەڵگەوە پشت بەراستی ببەستە.

ئیدی ئەوهایە، دواجار هەر راستییە دەبریقێتەوە و سەردەکەوێت و درۆ و دەڵەسەو بوختانیش دەکەونە ژێر کەوشان، کەواتە بژی راستی.

# بووە گرێ

ئەو هەموو ساڵە دایکم بوو، هەزاران جار سەرم دەخستە سەر سینگی و بەبۆنە خۆشەکەی حەیران و سەرمەست، سەدان جار بەتەنیا بەیەکەوە دانیشتووین ئەو گرێی دڵی بۆ من دەکردەوە و قسە نەدرکاوەکانی، ئەو قسانەی بەخۆی گۆتەنی لەلای عەبدلبەشەر نەدەدرکاند لەلای من هەڵیدەڕشت و کفتی دڵی دادەمرکاندەوە.. دەرێم لەو هەموو سەین و بەینەی لەلای منی کوڕ و ئەوی دایك هەبوو قەت رێك نەکەوت جارێکیان دەرفەت بقۆزمەوە و لەرووم بێ بڵێم:

– ئەرێ دایە گیان بەو فافۆنەی ئاوێ لۆ وەها سەرت شکاندم و خوێن بەبالآمدا شۆڕبۆوە چیم کردبوو؟

ئەم پرسیارە بووە کەسەر و ئەو ئۆغری کرد و سەری نایەوە و بەیەکجاری بەجێی هێشتم، کەچی ئەم پرسیارە بووە گرێیەکی گەورە و هەنووکەش لەدڵم دەرناچێ. دەبێ وێنەکە بینمەوە بەر چاوتان و کووم سەر شکا ئەوهاتان لۆ بگێڕمەوە:

تەمەنم هەر لەنێوان پێنج شەش ساڵی دا بوو، لەتەیراوەی ماڵی خۆمان کۆڵانەك خوارتر بوو، ماڵی باپیرم باوکی دایکم بوون.

کۆڵانەکە بەکۆڵانی مزگەوتی حاجی مجید قەرداری دەناسرایەوە. باپیرم (بابە حاجی) و ژنەکەی (دایە حاجی)کرێچی ماڵی باجی حەپسەی بوون، ئەو باجی حەپسەیەی هەموو سەلاری و جوانیی شاری سلێمانیی لەگەڵ خۆی هێنابوو، بەخاو خێزان لەگەڵ مێردە پۆلیسەکەی کە مەلا فەتحوڵلامان دەگۆتێ هاتبوونە هەولێر و لەتەیراوەی دەژیان، باجی حەپسە ژنەکی کەڵەگەتی کەمێك گۆشتن، جلکی کوردی بەکەوای شۆڕ و تاس و کڵاو هەر لەخۆی دەهات.

ڕۆژەکی دەمەو عەسرێ قرچەی گەرمای هاوینێ لەحەوشەکەیان وەك خەیاڵ و تەم دێتەوە بەرچاوم تەنەکە ئاو و تەشت و لیفکە و سابوون لەو ناوەی وێنا دەکەم. لەهیکرا بەم فافۆنە جامەی ئاویان پێ تێکەولێکە دەکرد دایکم وەرگەڕا سەرم و نەیەك و نەدوو و نەدە، خوێن وەك ئاوی بەلوعەی بەسەرم دا شۆڕبۆوە، چیم کردووە نازانم، یان نایەتەوە بیرم، لۆ لێیدام تێنەگەیشتم، سووچم.. گوناهم.. غەڵەتم، لەلام بووە گرێیەکی گەورەی سەر دڵم و هەنووکەش بەو گرێیە دەتلێمەوە.. ڕۆژەك لەڕۆژان نە غیرەتم کرد، نە لەرووم هات و بەخەیاڵم دا نەهات بپرسم و بڵێم:

– ئەرێ دایە گیان بەو فافۆنەی ئاوێ لۆ وەها سەرت شکاندم و خوێن بە لاملمدا شۆڕبۆوە ! چیم کردبوو؟ بووە گرێ.

# کۆرپەڵە

لەزاری نەنە کۆتری دەوڕاستی هەموو گەڕەکێ بیستمەوە کە:

ئێمە، ماڵی باب و داکم لەگەڕەکی کورانی سەر رێی مەخموری لە یەك لە کۆڵانەکانی نزیك جادەی ئەلبانی خاوەن خانوویێکی دوو سەد مەتری دوو هۆدە و هەیوان لەبنەبانێ و بەر و حەوشەکی گەورە و بیرەکی پڕ لەئاوی سازگار لەپاڵ دیواری دەرکەی حەوشێ کەبێجگە لەکۆڵانی خۆمان کۆڵانەکانی ئەم دیو و ئەو دیویش، بەئاوی بیرەکەی حەوشی مە تینوویێتیان شکاندووە و شیو و چایان پێ لێنایە و کۆریان پێ کردیە و خۆشیان پێ شووشتییە.

ئەو شەوەی کە ئەمن دەبی بێمە دونیایێ، بەرە ژان و زیڕ و هۆڕی قەدەی دایکم ئەو سەر و ئەمسەری کۆڵانێی گرتیتەوە.. بابم دەست و برد مام رەحمانی جیرانی بانگ دەکات و بەجێبە شرەکەی بابم و داکم و مام رەحمان و قیژ و هۆڕ و ژان و ژووی هاتنە دونیای بنیادەمەکی نوێ دەکەونە رێیێ، تەیراوە خۆت بگرە وا هاتین. لەرێیێ مام رەحمان هەر بەتەشقەرە دەرێتە بابم:

– عەبدوڵڵا ئەوەش بە مەرەدی کیژەکەی نەبەی، نەچی ئەوەش لەکۆشی خەسووت دابنێی و بە خەزووریشت برێی با ئەوەش سەنەوییەکەی بەناوینگۆ بی.

لەتەیراوەی، لەدەو کەندێ لەپێش دەرکەی ماری فاتمە قەڵەو مام حوسێنی ماستفرۆش رادەگرن، پۆلیسەکەی پێش دەرکەی مەخفەری کەبەرامبەر ماری ماستفرۆش بوو کەمەك مشەوەش دەبی، دوایی کەدەبینی پیاوەك وا چوویتە بن پیلی ژنەکی و لەجێبی دێنە خوارێ، دەگەڕێتەوە جێی خۆیی و لەسەر تەنەکە راعیەکەی دادەنیشیتەوە.

ئـەو کاتـەی مـاری بـاپیرم (بابـە حـاجی و دایـە حـاجی) کرێچـی بـوون دوو ژووریان لەماری ماست فرۆشی بەکرێ گرتبوو.

ئەوان (پەری و بابە حاجی و دایە حاجی) پڕخو هۆڕی خەوێیان بوو هەرکـە لەدەرگا دەدەن، نە جارەك و نە دوو، مـام حوسـێن چـاو دەکاتـەوە و دەرێتـە فاتمە قەڵەوی ژنی:

– حورمێ.. جارێ زووە لۆ ماستی پێرداودی، دەبی کێ لەدەرکەی بدات.

هەرکە دەرگای دەکەنـەوە، هـەینێ بابـە حـاجی و دایـە حـاجیش بەخەبـەر هاتبوون، بەتالووکە داکـم دەگەینـە ژوورێ.. دایـە حـاجی نەخشـین لـەدارەتی دونیایێ هەر ئەو کیژەی هەبوو.. مشەوەش دەبی و سەرلێشێواو.. بـەرە ژانـی منـداڵ بـوون پـتر دەبـی، داکـم دەهــەژێ و دەناڵێنــێ، حـاجی نەخشـین وەك مامانەکی مـەعلان تـەدارەکی منـداربوون حـازر دەکـات و بـەدزیش وردە وردە فرمێسکان بۆ قەدریەی تاقانـەی دەبارێنــێ، ئیـدی ئـەوها لـەژوورێ (قەدریـە و دایە حاجی و فاتمە قەڵەو) لەحەوشەش بابە حاجی پەریزاد کەتازە لەم هـات و هاوارە بەئاگا هاتبوو لـەئامێز دەگرێـت، جگـەرەش بەجگـەرە دادەگیرسـێنێ.. مام حوسێن خەوە کوتکە دەیباتەوەو سەر راناگرێ. بابە حاجی پێی دەرێ:

– کا حوسێن برۆ پاردەوە.. جارێ زووە لۆ پێرداود و ماستی خـەمت نـەبی خەمی ماستت نەبی، ئەمن خەمی قەدریەی کیژمە.

بـەرە بـەری بـەیانیان.. تاریـكو روون، تـازە پـێرداود و ماسـت سـەلام و عەلێکیان کردبوو، دەنگی گریانی کۆرپەیەك ئەو سبەینەیە بابە حاجی دڵخۆش دەکات، بابم سەرسـام و پێرداودیـش هـەر کـە دەزانـی حـار و حیسـاب کـووە، دەرێ:

– ئەو مەنجەرە ماستەی مەڕە کۆری، دیاری گوندی گرد عارەقیە لۆ کۆرپـە تازە بەوەلەد بووەکەتان.. ممبارەکە.

نەنە کۆتر بەگریانەوە دەیگوت: هەر کە گریانی ئەو کۆرپەیە بیستـرا، حاجی حەسەن چونکە بەدەیان ساڵ مەحرووم بووە لەبینینی وچاخ و بەئاواتی نێرینەیەك بووە، لەخۆشی ئەوەی چیدی پێی ناڵێن بێزووپیەتو وجاخکوێر، بەهەڵە داوان و بەبێ ئیزن، بەبێ شەرم لەو فاتمە قەڵەوەی کە هەموو تەیراوە شەرمی لێدەکرد، دەچێتە ژووری و قوماتی کۆرپەکە هەڵدەداتەوە سەیرێکی ناو رانی دەکات و چاوەکانی بەگون و گواندێنی تێر بینین دەکات.. ئینجا لەباوەشێی دەکات و تێر تێر بۆنی هەڵدەمژێ و دەڵێ:

– ئۆخەی لێت بەزیاد بی خودایە.. نەمردم و نەوەکەم.. نێرینەکەم لەباوەشکرد.. ئەوجا مردن هەقە و ناهەق نییە.. کۆرپەلەکە من بووم.

## بەدرۆ خستنەوە

دایکم دەیگۆت قسەکانی نەنە کۆتری هەمووی وەنینە، زۆرت بڕوا پێیان نەبێ.

دەمگۆت دایە کوو وەدەرێی نەنە کۆتر و درۆ کوجا مەرحەبا، ئیدی دایکم دەکەوتە سپی کردنەوەی درۆیەکان و دەرخستنی ڕاستییە قەومایەکە.

دایکم دەیگوت: نەنە کۆتر راست ناکات، ئەو شەوەی ئەتووم بوو نە پیرداود نە ماستی مەڕە کۆری گردعارەقی نەگەیشتنە تەیراوەی، بە ناچاری بابت دەستوبردی کرد و چوو لەچایخانەی مام حەسەن قانونی جێیە ماستەك و لەفرپنەکەی کن حەسارێش کە بەرامبەر باخچەی کەریمە گڕەی بوو دەستە نانەکی گەرمی هینا و هەر بەغاردان هاتەوە، ئەوجا با پێت برێم، چونکە ماری فاتمە قەڵەوی تەقریبەن لە مابەینی هەردوو مزگەوتی حاجی عەبدوڵڵا و مزگەوتی کوێتی بوو گوێمان لەبانگ و سەڵای هەردوو مەلایان دەبوو، ئەو سبەینەیە مەلایەکیان بەغوسل دەرکردنێ راناگات و ئەوی دیش لەتاو ژانە سك شتاقیان بانگیان نەدا، کە حانی بانگدانێ هەندۆکەکیش وەخت بەسەرچوو، بابم حاجی حەسەن چووە سەربانی مارێ و بەدەم گریانی خۆشییەوە و فرمێسك بەسەر روومەتی جۆگەلە دەبەستێ.. بانگ دانەك بانگ دەدا مەگەر کاتی خۆی هەر شەهابەی هەولێری لەسەر منارەی مزگەوتی قەراتێ بانگی وەهای دابێ.

نازانم هەر دایکم بوو، یان زولە حول حولی دەیگۆت:

ئەو سبەینەیەش حاجی حەسەنی باپیرت بانگەکی وەهای دا مەگەر هەر شەهابەدین لەقەراتێڕا رووی لە باداوەی کردبێ و بانگەکی وەهای لەبەر خاتری مەلا فەندی دابێ، ئیدی حاجی حەسەنی باپیرت لەسەربانی هاتە خوارێ و

وەرگەڕا نوێژان، کە لە نوێژانیش بۆوە، هەر لەو ژوورەی قەدریە و کۆرپەکە و فاتمە قەڵەو و نەخشینی ژنی و پەریزادی لێبووە، دەنگ هەڵدەبڕی و دەکەویتە وەسیەتان و دەرێ:

– کەمردم لەسەر کێلەکەم بنووسن ئەوە گۆڕی ئەو پیاوەیە کە وجاغی روونە، چونکە نێرینەیەك نەیهێشت بەبێ زورییەت بمرێت. هەر بەدەم وەسیەتەوە گۆتی ئەگەر نەوەکەشم گەورە بوو ئەمن نەمام پێی برێن بابە حاجی بەهاتنە دونیای توو زۆر دڵخۆش بوو، چونکە کەسەکت لۆ بێ کەسی و بێ زورییەتی و بێ خزمی ئەو دیتەوە.

## زا.. . هیر

لەقسان لە زەمانی مێرد منداڵی و جاحێلی باوکم کە ئەو کاتە لە کۆیە دەژیا.. کوڕێکی هاوتەمەنی خۆی برا و برادەر و دراوسێیان دەبێت، شەو و رۆژ بەیەکەوە دەبن.. مەگەر لەکاتی خەوتنان لێك دابڕابن، هەر ئەو دەور و زەمانی لەبەر خۆشەویستی بۆ ئەو، بەڵێن دەدات و بە برادەرەکەی دەڵێ:

– شەرتبی لەشەرتی پیاوان.. ژنێ بینم، کوڕی یەکەمم لەبەر خاتری تۆ ناو دەنێم زاهیر.

کەچی لەم هەولێرە، کە لە رواندزێڕا قەدریەی کچە خاڵی خۆی بۆ دەکەنە بووك و دەیگوازنەوە.. نۆبەرەیان کچ دەبێت، نەنە کۆتر، هەموو جارێ دەیگێڕاوە:

– کەپەریزاد لەدایك بوو، حەسەنو نەخشین لە عەبدوڵڵا و قەدریەی زیاتر خەنی بوو بوون و لەبەر کیژەی هەر دەسۆران، چونکە بێکەس و بێ مناڵ و تەنیا بوون، داك و بابێ کیژەش بڕیاریاندا بەیەکجاری بیدەنە داپیرە و باپیرەی هەر بە فەرمیش لەدایەرەی نفوسی پەریزاد بکەنە کچی (حەسەن و نەخشین) و تەسکەرەشی لۆ دەربینن.

دایکم دەیگۆت: هەر زانیمان ئەتوو لە رێی و دەبیە منداری دووەممان، بابت لەمێژ بوو بڕیاری خۆی دابوو شەرتی لەگەڵ خوا و برا و برادەرەکەی خۆی بەجێ هێنا و ناومان لێنای (زاهیر).

# تارماییەکان

هەندێك بەسەرهات، چەند وێنەیەکی ناروون و ناجێگیر وەك تارمایی دێنە پێشەوە، رەنگە زۆر گرنگ نەبن بەڵام گێڕانەوەشیان زەرەر بە شتاقە لایان ناگەینێ.

ئەوانەی دەیگێڕمەوە هی تەمەنی سێ و چوار و پێنج و پێنج ساڵ و نیویشی تێدەکەوێ. با لە سەموونی ئۆماتیکڕا پێدا بێین:

لەبیرمە، لەو ڕێزە دوکانەی لەدوای مزگەوتی ئەوقافی هەبوو، بابە حاجیم دوکانی سەموون فرۆشتنی هەبوو، سەموونەکە ئۆتۆماتیکی بوو، هەموو سبەینان بە لۆرییەکی سەر گیرای کە تایبەت بوو بە گواستنەوەی سەموونەکان، لەکاتی دیاری کراو سەموونی بۆ دەهات، فرنی سەموونی ئۆتۆماتیکیش لەبەرامبەر محەتەی قیتاری بوو ئەو کاتە دیمەنێکی جوانی بە دەوروبەر دەبەخشی و هەنووکەش بینایەکە و لوولەی فرنییەکە هەر مایە. خەڵك زۆر حەزیان لەو سەموونە بوو چونکە زۆر بەلەزەت بوو، ئەوکاتە کیسەی قاقەز هەبوو چەندیان سەموون بیویستبا تێیان دەکرد و دەیاندا موشتەرییەکان.

هەر ئەو سەردەمە، دوای هاتنە دونیای من باوکم و باپیرم و مامم ئەنوەر لە هەورازی حەساریێ.. شوێنی ئورزدی.. نانەواخانەیەك دادەمەزرێنن، بۆیە باوکم لە تەیراوەی لە هەورازی ماڵی مام حسێن ماستفرۆشی تا لە ماڵە خەزووری نزیك بێت خانووێك دەکرێت و بەڵام لەبەر کۆنی و کەم ژووری سەرلەنوێ بەپشتیوانی و هاوکاریی وەستا سادقی بەننا تازەی دەکەنەوە، وەستا صادق هەینێ باشترین و مەعلانترین وەستای خانوو بووە لەتەیراوەی.

لەو خانووەی تەیراوە کە کرایە پێنج ژووری گەورە و فراوان و دوو سەربانی

بەرامبەر بە یەك و مەتبەق و حەمام و حەوشەكی گەورە.. جگە لە ئێمە دایكم و باوكم و من و خوشك و براكانم، دوو باپیر و دوو داپیرو پلكەكم كە كچ بوو و هێشتا مێردی نەكردبوو و جار جارە (عەیشە بسك سۆر و مام حسینی مێردی و محەمەدی تاقانەیان و كچە عازەبەكەیان خێریە) تیا دەژیاین و هەمووشمان لەسەر یەك خوان و لە یەك مەنجەڕی شیومان دەخوارد، (سەرهات و هات و باتی عەیشە بسك سۆر و مام حسینی) جاریێ هەردەگرم چونكە لە زۆر جێی دی لەگەڵ ژیان و سەرهاتی من تێك دەكەنەوە.. . هەر جارەو لەجێی خۆی باسیان دەینمەوە گۆڕێ.

هەر ئەوان رۆژان، جارەكی لەماریێ گۆتیان دەچینە بەغدایێ، كوو دەچین؟ گۆتیان بە قیتاری.. ئێم لەوە خۆشتر هەیە.. پاش نیوەڕۆیێكی درەنگ (من و خدر سمێر سۆری باپیرم و باوكم و دایە حاجی و دایە بابە و دایكم) نازانم لەبیرم نەمایە بەسواری چ گەیشتینە بەردەم محەتەی قیتاری.. پێش دەركە هەموو قامیشەلان بوو دیوی ژۆریێ وەكی چایخانە و قاوەخانە و گازینۆ پێیان دەگوت رێست هاوس پڕ بوو لەمێز و كورسی خەڵك لێی دادەنیشتن هەتا كاتی بەڕێكردنی قیتار، دەرێم وەكی تارماییە.. سەرەتای تاریكی هێوارەكی زوو سەعات (٥)ی ئێوارە بوو ئەمەیان بردە ناو قیتاری، هەتا سواریش بووین هەمووومان هەركەسەو لەجێی خۆی دیارە من لەباوەشی باوكم بووم، دایكم هەر لەگەڵمان بوو، فیكوهۆڕی قیتاری دەستی پێكرد، كابرایەكی بەدلە شین یان خاكی بەسەركەت، هەركەسەو پارچە پلیتێكی دەستی خۆی پێشان دەدا و كابرا سەری بۆ دەلەقاند، پێم سەیر بوو نە دایكم هیچ پارچە مقەبایەكی پێشاندا نە ئەویش سەری بۆ لەقاند، بەر لەوەی قیتار بەڕێ بكەوی دایكم لە قیتاری هاتە خوارێ و رۆیی. من دەستم بە گریانەكی كرد هەرچی حەشاماتی ناو قیتاری هەیە لە گیانی خۆیان وەڕس بوون، زوو زووش دەمگۆت:

– ئەو پیاوە سەگبابە نەیهێشت داکم لەگەڵمان بێتە بەغدایێ.
تومەز دایکم لەگەڵمان هاتووە تا بەڕێمان بکات.
هەر ئەو دەورو زەمانی، پیرێژنەکی گچکۆکەی پاك و خاوێن و قسە خۆش کە بە کوردییەکی عەجایب قسەی دەکرد و ماڵیان لە قەلاتێ بوو، هاموشۆی ماڵی ئێمەی دەکرد و لەگەڵ دایکم و نەنکەکانم زۆر تەبا بوو، دەمانگۆتێ:
(نەنۆکەی قەراتێ)
نەنۆکەی قەلاتێ لە مامانی بابی دە دکتۆرانی دەزانی و مەعلان بوو، دەرمانی نەنۆزکی دەگرتەوە و ئەو ژنانە دەورەیان لێ دەدا کە چوار پێنج ساڵ بوو مێردیان کردبوو چ سك و زایان دیار نەبوو.. قسەزان و رووح سووك و بیرتیژ و بەندبێژ بوو.. بەو پیریەی کە لە ماڵی خۆی لەقەلاتێ بەدەر دەکەوت جگە لەعەبا رەشەکی پێچەکی وەکی دەڕابەی هەبوو ئەو روخسارە جوان و نورانییەی خۆی پێ دەشاردەوە، لەتەیراوەش کە دەگەیشتە ناو ژووری دایکم ئەوجا عەبای فڕێ دەدا و دەڕابەکەی هەردەداوە و دەیگۆت:
– ئیشتەم سەلامەو عەلێکم ئەهلی ئیمان.
بەخۆی ناوی (زوبێدە) بوو، بەڵام هەر هەموومان پێمان دەگۆت (نەنۆکەی قەراتێ) ئەویش هەر زۆری پێخۆش بوو.
هەر لەو دەورو زەمانی، دیارە بۆنەیەك هەبووە.. ئاهەنگ و شایی و لۆغان.. وێنەکە دێتەوە بەرچاوم و دەڕوا.. هاوین بوو هەموومان لە سەربان بووین. لەسەر قەراتێڕا تۆنترەقە و فیشەکە شێتەی رەنگاوڕەنگ دەتەقێنرا و ئاسمانی قەلات و دەورووبەری رووناك دەکردەوە، لەمنیش وابی ئەو فیشەکە شێتانە عایدی نەنۆکەی قەراتێیە.. بۆیە هاوارم دەکرد:
– دەی بیانتەقێنە نەنۆکەی قەراتێ.. بیانتەقێنە زۆر زۆریان بتەقێنە.
هەر لەو سەروبەندەی، هاوینەکی لەکۆلانێ مە، کۆلانی ماری خدر سمێر

سۆر و معاون ساڵح و سەید جەمیل و مام کاکۆی خەیات و عەزیز دەراری، سێ چوار مەنجەڵی گەورەی رەش لە ناوەڕاستی کۆلانێ داندران و دانوو کولاندن دەستی پێکرد، پاش ئاگر کردنەوە، ئەمەی مندار و تاری کۆلانێ بووینە عایدی خڕکردنەوەی پارچە مقەبا و پەڕۆکەکۆنە و کاغەز و پاکەتە جغارە و لاستیق تا ئاگری دانووی کز نەبێت و نەکوژێتەوە. چڕە دوکەڵەك بەرز دەبۆوە و بەری ئاسمانی دەگرت چاو چاوی نەدەدی.. بەخەیاڵ و زەینی منداری ئەوکاتە لەمن وابی هەر ئەو چڕە دوکەڵەیە دەچێتە عاسمانێ و دوایێ دەبیتە هەور و بارانی دەبارێنی.

## یەکەمین وێنە

سەردەمانێك، بەرامبەر قشڵەی پۆلیسی ناوبازاڕی.. ئەو قشڵەیەی لەبن قەراتێ و لەناو سەنتەری شاری بەدەیان سەرهات و رووداو و معاون و پۆلیس و دز و جەردە و باش و خراپ لە دووتوێی مێژووەکەی تۆمار کراوە.. لەبەرامبەر ئەو بینایەدا ریزە دوکانێکی لەفایبەر دروستکراو هەبوو، بەرەبابی مە (هەردوو باپیرم) برایەکانیان (مام مەولوود پێ پان و مام حوسێن جبرائیل) سەرو دوکانی فایبەریان لەوێ هەبوو.

ئێمەی گچکە، مەخسەدم هاوتەمەنەکانی خۆم، لەگەڵ ئەوانەی کەمێك لەخۆشمان هەراشتر بوون.

دەبووایە نیوەڕۆیان بۆ هەریەکێك لەم دوکاندارانە بە سەفەرتاس خواردن ببەین.. ئیدی هەر کەدەگەیشتینە دوکانەکان و سەفەرتاسەکانمان تەسلیم دەکردن، ئێمە لەنێوان دوکانە فایبەرەکان دەکەوتینە چاوشارکێ و راوەراو و گەمە و بەزمی خۆمان، هەتا ئەوان لەنان خواردن دەبوونەوە و جارەکی دی و هەرتەك هەرتەك دەست بەسەفەرتاسی بەتاڵ بەرەو تەیراوە شۆڕ دەبووینەوە،

سێ وێنەی زۆر دەگمەن و جوانی پەیوەست بەم دوکانە فایبەرانە بێخەم دەگرن:

وێنەی یەکەم: شەوێکیان باپیرم (خدر سمێر سۆر) خەون دەبینێ کەدوکانە فایبەرەکەی پڕ بووە لەمێرووله و هەر بابایە و مێروستانە و بەدەم و بەدەست شتێك لەناو دوکان دەبات و بزر دەبێ، بۆ سبەینێ پاش گێڕانەوەی خەونەکەی هەرکە چوونە دوکان دەبینن شەوێ دز چووینە گژ فایبەران و بەمشار کونیان کردووە و ئەوەی مەبەستیان بووە دزیتیان و بزربوونە و شتاقە پۆلیسی ناو قشڵەش عیلم و خەبەرییان لێ نەبووە.

وێنەی دووەم: مام مەولوود، برا بچووکی باپیرە خدرم بوو، ئەویش

پۆلیسی خانەنشین بوو لەوێ دوکاندار بوو، مام مەولوود بەگەنجی لەبەری مەرگە و پشدەر فەقێیاتی کردبوو و شرە خوێندەوارییەکی هەبوو قورئانی پێ دەخوێندەوە، باوکم درپناگەی لێداگرتم دەبی رۆژێ جارێك بچمە دوکانی مام مەولوودی و فێرە خوێندنەوەی قورئانم بکات. ئەوەی لەلام ماوە و لەسەر پەردەی زەینم جێگیربووە، دەچووم.. جزو عەمەیەکی کۆن و شڕی هەبوو دەریدەهێنا و لەسەر کۆشی خۆی دادەنا و ئەمن لەتەنیشتی و ئەویش دەست بەدەنکە شقارتە حەرف حەرف فێرە قول هوەڵڵاهی دەکردم، بەڵام زوو بەزوو لێم بێزار بوو و هەرەتەی لێکردم.

وێنەی سێیەم: رۆژەکی من و پەریزادی خوشکم، بەجل و بەرگێکی منالأنەی ئەوکاتە.. پاك و خاوێن.. قوتە قوتە دەستی یەکمان گرت و چووینە دوکانی بابە حاجی (دوکانە فایبەرەکە)، لەوێ بابە حاجی کەئەمەی بەو شێوە جوان و پاك و خاوێنە بینی دەستی هەردووکمانی گرت و پەڕینەوە ئەوبەری بۆ بن قەراتێ.. بۆ دوکانی وێنەگری.. لەوێ بابە حاجی یەخەی کراسی پەریزادی رێکخست و ئینجا وێنەگرەکەش (کەپاش چەندین ساڵ ئینجا زانیم مامە گیوی موکریانی بوو) سەر و پرچی منی تەڕ کرد و بەشانەیەك بوکڵەی بەلایەکدا داهێنام و من و خوشکۆرەی لەتەك یەك راگرتین و چرك، وێنەیەکی گرتین. هەنووکەش ئەم وێنەیەم ماوە و یەکێکە لەوێنە دەگمەن و جوانەکانی ئەوێ رۆژێ.

## عەیشە بسك سۆر و خەنە !

مامۆژنە عەیشێ، ژنە بسك سۆرەكە، ژنێكی تەبەش پان و سور و سپی، بەهەموو دەمێ دەمارە وردیلە سۆر و سپییەكانی سەر كولمەی گرشە گرشیان بوو، دوو بسكی سۆر و تەژی لە خەنە. هەركە دەڕۆیی دەلەرییەوە و پڕاو پڕ بوو لە گۆشتێكی تورت و لە خوێن و لە جوانی.

عەیشە بسك سۆر، مامۆژنی دایكم بوو. لە خانووە گەورەكەی تەیراوەمان ژورێك بەر ئەوان كەوتبوو. ئەوان: عەیشێ و مام حوسێنی مامی دایكم و چوار كچ و یەك كوڕی تاقانەو بەناز بوون.. لەگەڵ ئێمە خۆشی و ناخۆشی. گریان و پێكەنین و بوون و نەبوونیان دابەش و هاوبەش دەكرد.

شەوان، هەركە بابە خدرم خەنەی لە بنە پیاڵە مسەكە دەگرتەوە و لە سمێرە قیتەكانی هەر دەسوی، عەیشە سۆر بە لەنجەو لار و بەنازو عیشوە و بە ئاوازێكی تایبەتی كەهەر لە خۆی دەوەشاوە لە سمێر سۆر دەچووە پێشێ و دەیگوت:

–كا خدر.. خەنەت لەبەری نەمایەوە ؟هەتا هەندەكی لە بسكم هەرسوم.. ئەها تەماشاكە چ سۆراتی پێوە نەمایە.

مام حوسێن و مامۆژنە عەیشێ.. چۆن مام و مامۆژنی دایكم بوون ئاواش هی مە بوون.. هەركە ئێواران مەنجەری گەورەی خواردن.. برنج یان ساوار، كفتە یان شفتە، مەرەگەی پەتاتە یان فاسۆلیا دەهێندرایە حەوشێ و لە قاپان دەكرا.. من میوانی هەردوو قاپی بەتاڵی بەردەمی مامۆژن دەبووم، ئەوجا هەرچ خواردنێك با تام و چێژ و لەزەتی تایبەتی دەبوو.. ئەو رۆژانەی عەیشە بسك سۆر دەستی لە بسكان بەردەدا و ناوی خوای لێدەهێنا و وەعدی دۆڵمەی دەداینێ، ئیدی هەردوو لاقی درێژ دەكرد و كودی و باینجان و خەیار و پیاز و تەماتەی دەردەهێنا.. ئەوجا برنجی سەدری دەشووشتەوە و سیر و كەتە

گۆشت و بەهارات و كاری موختاری هەموو بەسەر یەكتری دادەكرد و هەری دەشێلاو یەك مەنجەری گەورە و تەڕ و ترش و بەتامی دۆڵمەی بەسەر ئاگر دەنا.. ئەورۆژەمان دەبووە جێژنەك لە چ جێژنان نەچوو.. مام حوسێنیش لەگەڵ لوقمە و پارو بادانی دۆلمە، دەیگوت:

– چەلاوی عەیشێ، خۆشترین چەلاوە.. ئەمن چەلاو خۆری عەیشێم ؟ نەمان دەزانی مەخسەدی چەلاوی دۆلمە ترش و تیژەكەیە یاخود هەر عاشقە دڵ تەڕەكەی چاوی عەیشێ بسك سۆرەكەیە.

ئەم ژن و مێردە، خاوەنی چوار كچ (بەدرییە، شوكرییە، خێرییە، لەعلی ) و یەك كوڕی تاقانە (محەمەد) بوون. ئەو كوڕە چونكە تاقانەی دایە و بابە و چوار خوشكان بوو. فەرمانڕەوای خێزانەكەیان بوو، ئەمر و نەهی بەدەست خۆی بوو و كەسیش حەدی نەبوو قسە لە قسەی دابكات.

ڕۆژگارێك مام حوسێنی پۆلیس لە دەڤەری شانەدەر خزمەتی پۆلیسی بەسەر دەبرد، محەمەدی كوڕی تازە پارچەڵەیە.. ئەوانیش وەك هەموو خێزانەكانی گوندی مریشك و پەلەوەر بە خێودەكەن و جێگەو ڕێگەیان بۆ تەرخان دەكەن، محەمەدی تاقانە مریشكەكی ڕەشی قوندە و خڕ و خەپان دەكاتە هی خۆی و ڕۆژانە دەیلاوێنتەوەو یاریی لەگەڵ دەكات، ڕۆژێك لە مریشكە ڕەشەكەی بێزاردەبێت و ئەمر دەكات دەلعاز سەری ببڕن.. ئەوەندەی مام حوسێن دەپاڕێتەوە و دەڵێ:

– كوڕم چ زۆرە مریشكمان زۆرە، با یەكەكی دیت لۆ سەرببڕم.

محەمەد نایەتە ڕایێ و دەڵێ:

–ئیللا دەبی ئەو مریشكەی من گۆشا و گۆش سەر ببڕی.

ئیدی بەناچاری مریشكە سەردەبڕن، هەركە دەبینی لاشەی مریشكەكەی لە لایەك و سەری لە لایەكی دی كەوتیە و هەست و خوست ناكات.. ئەم جارە ئەمر دەكات:

—هەر ئیستا مریشکەکەم لۆ زندی بکەنەوە.

هەینێ بە ناچاری ملی درێژی مریشکی سەر بڕاو لەگەڵ سەلکە خوێناوییەکە بە چیلکە دارێك وبەپەتکەك لێك دەبەستنەوە.. سەرە مریشك جارێك بەولا و جارێکی دی بەم لادا دەکەوێت.. تاقانەش چەندین شەو و ڕۆژ بەگریان و فیغان بەسەر دەبات.

مام حوسێن و عەیشە سۆرەکەی، عاشق و مەعشوقەیێك بوون، مام هەر بەبۆنی بسکە سۆرەکانی عەیشێیەکەی مەست و حەیران دەبوو.

ڕەمەزانان، هەرکە عانی پارشێو دادەهات و دۆڵەنگێو دەگەیشتە گەڕەکێ، مام حوسێن بانگی دەکرد و درهەمێکی لە دەستی دەنا و دەیگوت:

—ها بگرە ئەوە هەقی ماندی بوونەکەت، لێرە لە پەنا ئەو دیوارەی ڕاوەستە و دۆڵەکەت لەسەر نەزمی ئایشۆکێ بووکتە.

کابرا ڕمب و ڕمب دۆڵی دەکوتا.. عەیشە سۆریش لەودیوی دیوار و دوور لە چاوی گەڕەکێ هەڵدەپەڕی و شایی دادەبەست وەك ئەوەی شایی لە زەماوەندی برا ئازیزەکەی بکات هەتا ئارەقەی ڕەش و شینی دەردەداو تەواو هیلاك و ماندوو دەبوو، ئەوجا مام حوسێن کابرای دۆڵەنگێوی بەڕێدەکرد و پێی دەگووت:

—بڕۆ خوا حافیزت بێت تا سبەی شەوێ ئەم حەلانەو دەست بە بەزمورەزمی خۆمان دەکەینەوە.

ڕۆژان هاتن و محەمەدیش وەك پیشەی باوکی لە زەمانی پۆلیسی لاخەبەر بوە پۆلیس.. زۆر کەیفی بە سەمینۆفەکەی شانی دەهات، هەر لە سەر تەبیعاتی منداڵیشی بەردەوام بوو لەگەڵ خوشکەزاکانی توونـد و تیژ بوو، لەسەر بچوکترین هەڵە دەیگرتن و دارکاری دەکردن و جگەرەی لەسەر پشتە دەست و مەچەکەکانیان دەکوژاندەوە و پیاویش نەبوو بڵێ لەل.

لەم ساڵانەی دواییدا، محەمەدی پۆلیس کەوتە شاری کۆیە.. لە دایەرەی

خەزێنە لەگەڵ نووسەر و فۆلکلۆریست (خالد جوتیار ) ی رەوانشاد وەك دوو برا.. ئەو بەڕێوەبەر و محەمەدیش پۆلیسی بەردەست و دڵسۆز سەرییان پێکەوە نابوو هۆگری یەك بوون.. جوتیار زوو زوو بانگی لای خۆی دەکرد و داوای گێڕانەوەی سوالفەی خۆشی لێ دەکرد و پاشتر بەدوان دڵخۆش و رازی تێر تێر پێدەکەنین.

مامۆژنە عەیشێ بە پیریش هەر جوان و خانوومان و سەلار بوو.. پاش کۆچی دوایی مام حوسێن لە شاری کۆیە و لە ماڵی کوڕی دەژیا تا لە زستانە سەختەکەی ساڵی (١٩٩٧) لە رۆژێکدا کە بەفر وەك پارچە پەڕۆ لە ئاسمان بەردەبۆوە ئەو ژنە نازدارە، ئەو دایکە میهرەبانە.. ئەو بسك شۆڕ و سۆرە چاوی لێکناو کەوتە خەوێکی ئەبەدی، لەسەر قەبران.. لەگۆڕستانی عەرەبییان بە خاك سپێردرا و بەفریش هەر دەتگوت بۆ هەتیوان دەباری و نەیدەبڕاندەوە.

عەیشە بسك سۆرە ناسك و نازدارەکە بەدڵی خۆی زۆر جوان ژیا.. گەلەك جاران دەستم لەملی دەکرد و مرچ مرچ ماچم دەکرد، هەموو جارێ دەیگوت:

–ئەرێ زاهیرە بەڕاستی پێم برێ. ئەتوو ئەمنت خۆشدەوێ یان هەر حەزت لە ماچانە ؟!

منیش بە عەقڵی منداڵی ئەوێ رۆژێم دەمگوت:

–وەڵڵا مامۆژن هەر حەزم لە ماچانە !

هەنووکەشی لەگەڵ دابێت، هەر حەزم لە ماچانە.. ئای خودایە تامی ماچت بۆ هێندە خۆش بوو.. عەیشە سۆر دایکی دایکم.

# نیوچەوان

نەنە کۆتر گۆتیە دایکم: قسەکی لۆ زامیرۆکەی دەگێڕمەوە خوام لەو خوایەیە برێیێ درۆیە، گۆتییە من: ئەتوو هێشتا هەر کۆرپۆکە بووی، چەند جاری نەنۆکەی قەراتێ دەهاتە مارتان هەر کە ئەتوویان دەهاویشتە کۆشی.. پاش ماچ کردنت دەستی بەپشت و زگت دادەهینا و نەوعە ورتە ورتەکی لێوە دەهات وەکی برێی ئایەتان بخینی.. ئەوجا پەڕۆیەکی سپی سادەی وەکی بەفری کوێستانێ سپی لەباغەری ناوەوەی کورتەکی دەردەهینا و بسمیلای لێدەکرد و بە پانوپۆڕی نیوچەوانتی پێ دەبەست، دەمانگۆت لۆ بەو پانیەی چ قەومایە، کوڕەکە تەنگەنەفەس بووە.. دەیگۆت:

– نا.. نانە ئەنگۆ نازانن، ئەوها بەپانی و توند توند دەیبەستم.. هەتا نیوچەوانی پان بیتەوە و بەنیوچەوانی مەلایان بچی.. مەلایانی بی، مەلایانی.

# ئاوبار

گچکۆکە بووم.. . هەندەك چوارشەممان لەمارێ مە هەر لەشەوێوە دەبووە مشەوەشـی و شمـەك حـازرکردن، هـەر بابـا بـوو خـەریکی ئیشـەکی دەبـوو دەیانگۆت سبەی عەسرێ دەچینە سەیرانێ.

جێی سەیرانێ لەتەیراوەی بەرزاییەکانی ئەوبـەر و ئەمبـەری لای نـەقلیات و قوتابخانەی مەولەوی بوو.. هەردوولا وەکـی ئێسـتا نـەبوون لەبـەر زەینـی مـن گردۆکە و چۆلەوانی بوون، بەهاران سەوز دەچوونەوە.. ئیدی پاش نیوەڕۆیانی ڕۆژی چوارشـەممە هـەر خێزانـەو شمـەك لـەباوەش و لەسـەر سـەر و بـەپێیان هەموو تەیراوە رووی لەئاوباری دەکرد، هەبوو هێلکەی کولاّنـدبوو لەگـەڵ نـانی تـیری و تـەڕەپیازی، هەنـدەکی دی تەماتـە و خیـار و پیازیـان وەکـی هـاران دەخوارد، جگـە لـەوەی سـەماوەر گیـزەی دەهـات و هـەتا ئێـوارەکی درەنـگ تەیراوەیی لە ئاوباری سەیرانیان دەکرد و بە کەیفخۆشـی رایانـدەبوارد، ئـەوجا شمـەك خـڕ دەکرانـەوە و هەرکەسـەو پارچـە بزگـوڕەکی هـەردەگرت و هـەرتك هەرتك بەرەو ماڵ دەبووینەوە.

# دۆشەگ سووتا

نەنۆکەی قەلاتێ زۆرجاران دڵی دایکمی دەدایەوە و دەیگوت:

– قەدە دڵت مشەوەش نەبی، نێرینە هەیە پشت شلە، شەوان کە دەنووی ئاگای لەخۆی نامینێ هەر وەدەزانی رۆژە و لەدەشت و دەرە بەکەیفی خۆی میزی دەکات، بەلام خەمت نەبی دەرمانەکی هەر لەبۆ دەبینمەوە ئەو میزکردنەی شەوان تەرك بكات و لەکۆڵی بیتەوە !

میز بەخۆداکردنی شەوان لەخەوێ زۆر هەراسانی کردبووم.. چ نەنۆکە و چ دادە روقیە دەم و چاو هەڵگر زۆریان هەوڵدا ئەو میز بەخۆداکردنەم نەهێڵن.. بێ فایدە بوو.

دایکم زۆر بەمنەوە هیلاك دەبوو، جارێ شەوان دۆشەکی تایبەتیم هەبوو کەلایلۆنی بەسەر دادەدا و ئەوجا بەپارچە سەرچەفەکی لایلۆنەکەی بزر دەکرد، کەچی بەلاش بوو.. سبەینان کەلەخەوێ هەڵدەستام شلپەم لێوە دەهات لەناو گۆمی میزێ، بەخۆم لەبەر بۆنی ناخۆشی میز هێڕ دەبووم.. ئەوجا دەبوایە دایکم جلکە تەڕەکانم لەبەر داکەنێ و جلکی پاك و وشکی رۆژێم لەبەر بكات تا کەس بەمیزکردنەکەم نەزانێ. لەولاش دۆشەك ئەوەندەی میز هەڵمژتبوو ئیدی بەکەلکی لەسەر نوستنی نەدەما.. هەینێ دۆشەکی تەڕ هەردەگیرا و دەبردرایە خوار کۆلانی خۆمان لەنزیك حەسارێ دۆشەك ئاگری تێبەر دەدرا.. ئەوجا چرە دوکەڵی میزێ بەری ئاسمانێی دادەگرت و شەو و رۆژ کەس لەبەر بۆنی میزی من عەجمانی نەدەما.

جارێکیان نەنە کۆتر بەدزی نەنۆکەی قەراتێ دەرمانێکی بۆ هێنام هەر بەدزی دایە دایکم گوتی: ئەوشۆ پێش نوستنێ لۆی لەئاوێ بکە با بیخواتەوە.. یەکا و یەکە عەلەمی میزکردنێی نامینێ.. شەوێ دایکم دەرمانەکەی بۆ لەئیستکانە ئاوێك کردم و زەقنەبووتم خواردەوە، نەك هەر

چاك نەبوومەوە و میز قەتع نەبوو، بەو دەرمانەی نەخۆش كەوتم و دوو هەفتان لەسـەرجێ مامـەوەو كـەس بەتـەمام نـەبوو، بۆیـە هەنـدەی دی دایكـم لەنەنـە كۆتری بەرك راچوو دەیگوت:

– پیرێژنە قۆترِ، نەك هەر بەقسە، بەدەرمانانیش درۆیان دەكات.

كەرەتـەكی دی، نـازانم كـێ لـەبن گـوێی دایكمـی خوێنـدبوو، كەدەبدەبـە زۆرباشە وەبی جێ و بالینگان و دۆشە گۆرەكەی تەرِ نەبێ.

شـەوێ، ئـەو وەختـی لـەو ژوورەی دەنوسـتین كـەدوو پەنجـەرەی لەسـەر كۆلانـێ بـوو. وەختـی نووسـتنان منـی بـەپێوە راگـرت و بێجامـەی هێنامـە خوارەوە، بەهەردوو دەستیشی زاركی دەبدەبەی كردبۆوە و دەیویست منـیش سـەری هەرامــەم ببەمـە نـاو دەبدەبـەی تـا ئیشـەكە مەیسـەر بـی. ئـاخر نەهەرامەكـەم بـای ئەوەنـدەی بـوو تـەواو بچیتە نـاو دەبدەبـەی، نـەزاركی دەبدەبەش هەرامەكەی رادەگرتم.. فرت دەهاتـە دەرێ، ئـەم بەزمـە تـەواوێكی خایاند و من و دایكم ئارەقەی شین و مۆرمان دەردا، هەموو جارێكیش كەدایكم هـەوڵی دووبـارە و سـێ بـارە كردنـەوەی دەداوە زاركـی دەبدەبەكـەی بـە دوو پەنجان لێك دەكردەوە یەك بەخۆی هاواری دەكرد:

– دەی.. تێنێ.. زووكە لەناونێ!

دیارە ئەو شەوە عەدۆی تاك لایت بەلای پەنجەرەی ژوورەكەماندا رەت بـوو بوو، بۆ سبەینێ پەلاری لەباوكم دابوو:

– ها قەپات وەزعت باشە، لۆ وەناكەی كورِی سمێر سۆری؟!!

## بزر بوونم

عەسرێکی درەنگ بوو، نازانم چۆن رێم کەوتۆتە لای گەڕەکی خانـەقا و رۆخ گۆڕستانی شێخ عومەر، خوای گەورە ئەوە لـەکوێم.. سـەرم لێشـێواو سـەیری روخسـار و دەم و چـاوی خــەڵکی دەوروبــەرم دەکـرد کەسـم نەدەناسـی و نەمدەزانی کێن، قوڵپی گریان هـەوکی گـرتم، هێـواش هێواشـیش دونیـا بـەرەو تاریکی دەچوو.. خەمی ئەوەم بوو گەر شەو دابێ و من لـەلای ئـەم گۆڕسـتانە دەبێ چیبکەم، ئەدی دایك و باوکم و ئەوانیدی دەبـێ چـیبکەن کـەدەزانن مـن بزر بوومە و دیار نـیم، زۆر سـکم بـەخۆم دەسـووتا، یـەك دوو جـار ئەمسـەر و ئەوسەری رۆخی گۆڕستانەکەم کرد و لەکۆتایی گۆڕستانێ هەتا رۆخی جـادەی بەرامبەر تەکیەی شێخ عەبدولکەریمی دارەخورما چووم، پـتر هەراسـان بـووم، دەستم بەگریانێك کرد دەنگم گەیشتە بەر گوێی ئەوانەی لەوبـەریش دەهـاتن و دەچوون، یەك دوانێك لێم نزیك بوونەوە و قسەیان بەرەو رووم دەکـرد، کەچـی من گوێم لەدەنگیان نەبوو نەمدەزانی چیدەڵێن، دەستیان بەسەرم دادەهێنـا.. پێنج فلسیان دەخستە ناو لەپی دەستم و لەروخسارياندا دیار بوو سکیان پـێم دەسووتێ، منیش هەر دەگریـام و سـێرێز سـێرێز فرمێسـك لەچـاوم دەبـاری و بەهەر چوار دەوری خۆم دەڕوانی بەڵکو یەکێك ببینم و بیناسم..

ئای خوایە کەسێکم نەدەناسی و لەخەڵکی تەیراوەی نەدەچوون، باشە باش چی منی گەیاندە گەڕەکی خانەقایێ و رۆخ جادەی گۆڕستانی شێخ عومـەری؟ دوو ژنی عەبا بەسەر پەیدا بوون و لێمان هاتنە پێش هەر کەزانیان بزر بوومـە، یەکێکیان کە ژنێکی تەبەش پان و ورگن بوو بەچرپە لەگەڵ ژنە چورچە کەپوو دوو بسـتەکەی هـاوەڵی دوا، کـەپوو درێژەکـە لێمهاتـە پێشـێ و چـەندین جـار بەجووڵانەوەیێکی سەیری چاو و برۆ پێی گوتم:

– ئەوە لۆ بزر بووی کوڕە تاقانەکەم، مەترسـێ.. وەرە بـا بچـینەوە مـاڵێ

لێناگەڕێم بابت لێت بدات.

دەستی گرتبووم و رایدەکێشام، منیش دەگریام و دەستم رادەپسکاند و نەمدەهێشت بمبات و بەچاو لەخەڵکەکە دەپاڕامەوە کەئەم ژنە کەپوو دوو بستەم لێدوورخەنەوە، پیاوێکی مەرد دەستمی لەدەستی ژنەکە دەرهێنا و بەتوڕەییەوە پاڵێکی پێوەنا و دووری خستەوە.. لەهەمان کات کوڕێکی گەنج هاتە پێشێ، ئای خۆ من ئەو کوڕە گەنجە دەناسم.. ئەوە خزمی خۆمانە و زۆر جاران لەماڵی خۆمانم دیتییە، یەکسەر خۆم بۆ ئامێزی هەڵدا و هانام بۆ برد و بەکوڕتر گریام، ئەویش منی ناسیەوە و لەئامێزی کردم و دەستی بەسەرم داهێنا و بەخەڵکەکەی گوت:

– کاکە ئەوە خزمی مەیە.. ماری لەتەیراوەیە ئەمن دەیبەمەوە.

ئیدی خەڵکەکە پەرتەیان لێکرد و ئەویش دەستی گرتم و هەتا تەیراوەی بەگورکە لۆقە یەك بست لێی دوور نەکەوتمەوە، هەر کە لەدەرگای ماڵێش بەژوور کەوتین هەموو لەحەوشە حەپەسا و سەیری من و کوڕەکەیان دەکرد و واقیان وڕمابوو.

ئەو کوڕە جوامێرە، کاك عەبدولڕەحمان برا بچووکی حاجی شێمحەمەدی خزمی باپیرم بوو، تا نووسینەوەی ئەم چەند دێرەش لەژیاندا ماوە، یاخوا تەمەن درێژ بێت.

# چەپان

بەرە بەری چوونە مەکتەبێم بوو، ئەوەی لەبیرم بێ هاوین بوو پێیان دەگوت عوتلەی گەورە، چونکە باوکم مەراقی بوو تۆڵەی خۆشی لە نەخوێندەواری بۆ من بکاتەوە زۆر حەزی دەکرد زوو گەورە ببم و بچمە مەکتەبێ، ئەو هاوینەی قەڵەم و دەفتەرێکی پەیدا کرد و شەوان بانگی دەکردم دەیگوت: دەی کاکە بنووسە.

منیش یەکسەر قەڵەمەکەم بەدەستی چەپە دەگرت و شقڵی و بقڵی قاقەزم رەش دەکردەوە. باوکم دەهەری دەبوو.. بەتووڕەیی قەڵەمەکەی لەدەست وەردەگرتم دەیگوت: بەو دەستەی نا، بەدەستی راست بنووسە، دەمگوت: ئاخر ئەمن ئەوها و بەو دەستەی دەزانم بنووسم. دەیگوت: نابی کوڕم دەستی راستە لەبۆ نووسین و شەهادە و زۆر شتی دی بەکاردێ. بەس دەستی چەپە هیچ نییە.. بەتەنێ لۆ قوون شوشتنی باشە، بەناچاری قەڵەمم بەدەستی راستە دەگرت.. هەربۆیە هەنووکەش کێشەم لەنووسیندا نییە، چ بەراستە یاخود چەپە.

## نا.. مەکتەب

وەختی چوونە مەکتەب و قەیدکردنی منداڵان هات.. لەگەڵ هاوتەمەنەکانم (موفەقی مام کاکۆی، دڵشادی سابیر سەماوەری، تەهای حاجی قادری، کەژادی معاون سالحی، توفیقی عومەر پەڕەشوتی) هەرکەسەو دایکی یان یەکەکی گەورە دەستیان گرتین و قوتابخانەی زانین خۆت بگرە هاتین.

یەکەمین کەسەر، هەوەڵ لێدان کە وەبەر هەستی ناسکی منداڵیم کەوت ئەو رۆژە بوو، هاوتەمەنەکانم هەموو وەرگیران و ناویان نووسرا و بەقەولی ئەو دەمی قەیدکران.. کەچی منیان نەناو نووسی، نەقەید کرام چونکە تەمەنم سێ مانگی کەم بوو تا ببمە شەش ساڵان، ئیدی بەگریان و خۆ لەخرتۆڕێ وەردان لەگەڵ دایکم گەڕاینەوە ماڵێ.

بەوەش کۆڵم نەدا، دایکم باوڵەکی گچکەی بۆ پەیدا کردم هەندێك دەفتەر و کتێب و جزوعەمە و قەڵەم و مساحە و موقتاتەم تێکرد، هەموو رۆژێ، رۆژانەکەم لەدایکم وەردەگرت و لەگەڵ برادەرەکانم هەتا پێش دەرگای قوتابخانەی (زانین) کە لە تەنیشت باخچەی کورد و عەرەب بوو دەرۆیشتم.. لەوێ لەپێش دەرگای مەکتەب لەفە و نۆکاو.. یان کێکی بەعەینەك.. یان شیشەك فاتەڕەشم دەکڕی و دەمخوارد، جەرەس لێیدەدا، ئەوان دەچوونە ژوورێ و منیش یاغر یاغر بەرەو ماڵ شۆڕ دەبوومەوەو باوڵی دەفتەر و کتێبانم لەدەلاقەی ژوورێ دادەنا و هەتا سبەینێیەکی دی، ئەو ساڵەم ئەوها بەڕێ کرد.

# شەوی ترس

لەو سەروبەندە، لەماڵی خۆمان بەباوکمەوە کەس نەبوو لەباپیرم (بابە خدر) نەترسێ، ئایا لەبەر ترس و سامی خۆی وەك پیاوێکی بە ویقار یان لەبەر رێز و ئیحتیرام وەك بەتەمەنترین پیاوی ناو خێزان.

تەنیا من بووم، نەلێی دەترسام و نەسڵم لێ دەکردەوە، چونکە جارێ تەمەنم هی ئەوە نەبوو.

جارێکیان لەناکاو لەدرەنگانی شەو لەبەد بەختی خۆم هەڵمکوتایە ژوورە تایبەتییەکەی بابە خدرم، لەناکاو چ ببینم (بابە خدر لەسەر کورسێك لەپشت مێزە گەورەکەی بەردەمی دانیشتبوو، دیارە خەنەی لەسمێری دابوو بەپەرۆ رەشە تایبەتیەکەش سەر و گێلاکی بەستبۆوە) هەر بەژووری کەوتم دەم و چاوی هاتە بەرچاوم و ئەویش یەکسەر بەمۆرەییێکی نائاسایی و بەچاوی زەق بەئیشارەتێکی سمێڵی جارێك بۆ لای راست و جارێکی دی بۆ لای چەپ تێی خوڕیم هەر زەندەقی بردم و زراوم چوو، پشتاوپشت گەڕامەوە دواوە.. ئەو شەوی لەهەموو شەوان زیاتر میزم لە بنەخۆم کرد. ئیدی بەبڕای بڕ بەتەنها رووم لەو ژوورە نەکردەوە کەبابە خدری لێ بوو، جگە لەوەش هەر لەو شەوییەوە بەروح لەو سمێر سۆرەی باپیرم دەترسام.

## عەرەب.. یەکەمین قوتابخانە

دیارە چارەنووسی من وابوو کەیەکەمین ساڵ و یەکەمین ناو نووسین و قەید کردنم لەقوتابخانەیەك بێت بەناوی (عەرەب). چۆن؟

وەك باسم کرد ئەو ساڵەی نە ناوم نووسرا و نەقەید کرام لەبەر سێ مانگی نەقوستانیم بۆ شەش ساڵی، ئەوهام بەڕێ کرد.. چوونە بەر دەرگای قوتابخانەی زانین لەگەڵ برادەر و هاوتەمەنەکانم.. لەفە و کێك کڕین و خواردن.. ئەوان دەچوونە ژوورێ و منیش بەرەو ماڵ دەبوومەوە.. هەرکە ساڵ وەسوڕاوە لەبەر ئەوەی محەمەدی تاقانەی چوار خوشکانی عەیشە سۆری لە قوتابخانەی (عەرەب) قوتابی بوو، لەمن گەورەتر بوو.. ئەو ساڵی پۆلی چواری سەرەتایی بوو.. دایك و بابم وایان بەباش زانی منیش لەقوتابخانەی (عەرەب) ناونووس بکەن و هەر لەگەڵ محەمەدی عەیشە سۆری هاتوچۆ بکەم، چونکە لەمن گەورەتر بوو ئاگاشی لێم دەبێ و چاودێریشم دەکات.

قوتابخانەی عەرەب، لەدوو کۆڵانی دوای بنکە تەندروستییەکەی بەرامبەر سینەما سەلاحەدین بوو، هەورازی ئەو کۆڵانەی ماڵی قازی رەشاد موفتی لێ بوو. قوتابخانەکە خانووێکی کۆنی گەڕەکی عارەبان بوو.. بریتی بوو لەچەند ژوورێك بۆ پۆلەکان، لەگەڵ ژوورێك بۆ بەڕێوەبەر و ژوورێك بۆ مامۆستایان و حەوشەییێکی بچووك کەهەرگیز بۆ یاری قوتابیان دەستی نەدەدا.

پۆلی یەکەمی سەرەتایم لەقوتابخانەی (عەرەب) لەو بینایە کۆنە بردە سەر.. ئەوەی لەبیرم بێت وا لێرە باسیان دەکەم.

یەکەم: لەپۆلی یەك و لەقوتابخانەی (عەرەب) بووم.. ئەوکاتە باوکم وازی لە نانەوایی هێنابوو دەمێك بوو بە ئۆتۆمبێلی خۆی لەخەتی رێگای (رواندز-

هەولێر) نەفەری دەهینا و دەبرد.

ئەو دەمەی باس دەکەم.. ماڵی باپیرم (باوکی دایکم) لەگەڵ ئێمە نەبوون.. هەر لەکۆڵانی پشت ماڵی خۆمان لەخانووی (لەتیف سەرکار)ی دوو ژووریان بەکرێ گرتبوو.. نازانم لەسەرچی شەڕێك لەنێوان باوك و دایکم روویدا بوو، من و دایکم و پەریزاد و براییکی دیکەم لەماڵی بابەحاجی دەژیاین.. بەو مەبەستەی دایکم زیز بووە و تۆراوە.. لە قوتابخانەش رێك دوای نیوەی ساڵ بوو.. پێشبڕکێیەکیان سازدا لەسەر پاك و خاوێنی و رێك و پێکی جلك و بەرگ. ئەو رۆژە دایکم هەرچەندە ژنەکی زیز بووی ماڵە مێردان بوو.. بەڵام بەپاکترین و جوانترین شەرواڵ و کراس و پێڵاو رەوانەی قوتابخانەی کردم.. قوتابیانی قوتابخانەی (عەرەب) تێکەڵە بوون، لەمنداڵە کورد و تورکمانەکانی قەڵاتێ و عەرەبەکانی گەڕەکێ و فەقیر و دەوڵەمەندمان لەناو هەبوو، لەپێشبڕکێیەکە، بەفەرمانی بەڕێوەبەر و جێگرەکەی کەبەداخەوە نە ناو نە وێنەیان لەبەرچاوم دووبارە نابنەوە.. قوتابییێکی باوك دەوڵەمەند، کەپانتۆڵ و کراسەکی تازە و بەرەونەقی لەبەر بوو بەپاك و خاوێنترین قوتابی پۆلەکەمان هەڵبژێردرا، راست و چەپ پارچە پەڕۆییێکی رەنگاوڕەنگیان لەسینگی دا هەڵواسیبوو میدالیان پێشکەش کرد. ئەمەش یەکەمین نشوستی پێشبڕکێی پاك و خاوێنی ژیانی من بوو کەتا دەمرم، رقم لەپێشبڕکێی بێ بنەما و پاك و خاوێنی رووکەش دەبێتەوە.

دووەم: هەر لەپۆلی یەکی قوتابخانەی (عەرەب) بووم.. لەکۆڵانی خۆمان، رێك بەرامبەر ماڵی ئێمە، ماڵی وەستا (فەتاح) وەستای بینا و خانوو دروستکردن هەبوو، کوڕێکی هەبوو ناوی (کەمال) بوو، وەستا فەتاح ژنی دووەمی لەلا بوو، نازانم دایکی کەمال بۆ لەکۆڵانی مە، لە هزری من بوونی نییە؟ مردبوو؟ تەڵاق درابوو؟ بەهەرحاڵ کەمال هەتیو و قوڕبەسەر.. وەستا

فەتاح بێبەزەییانە و بەفیتی زۆڕدایك لەكەماڵی دەدا و دەری دەكرد و قوربەسەر و سەرگەردانی دەكرد.. چەندین شەو كەماڵ دەردەكرا و دایكم دەیهێناوە ماڵێ و لەتەك من دەیخەواند.. لێدانی باوك بۆ كوڕ.. زاڵمانە بوو.. شەیتان هانی دەدا.. بەبەرد.. بەدار.. بەقامچی، بەقایشە پانەكەی پشتی، بێ ئەوەی كەماڵ هیچ سووچ و گوناحێكی هەبێت. هەر لە هەینێوە رقم لەو باوك و پیاوانەیە لەپێناو زەوقی خۆیان كوڕ و كچ و منداڵەكانیان قوڕبەسەر و سەرگەردان دەكەن.

## گۆرگیسە فەندی

پیاوێکی باڵا کورتی کەمێك قەڵەو، دەم و چاو و تەبەش پان و کەمێك سەر رووتاوە، لەجلك لەبەرکردن سپۆرت و شیك جگە لەچاکەت و پانتۆر، بۆینباغی پەپوولەی لەمل دەبەست و لەجیاتی قایش شەیالی لەپانتۆری گیر دەکرد، ئەو پیاوە ناوی (گۆرگیس) بوو خەڵکی عەنکاوەی بوو، هەموو بەیانیان لەوێڕا دەهاتە هەولێر و لە قوتابخانەکەمان مامۆستای زمانی کوردی بوو، من لەو پیاوە جوان و شیك و سپۆرتە فێرە خوێندنەوە و نووسینە کوردییەکەی مامۆستا ئیبراهیم ئەمین باڵدار بووم، ئای خوایە گیان ئەو گۆرگیسە فەندیەم چەند خۆشدەویست، فەرموودەکانی لەلای من وەك دەقێکی نەمر و پیرۆز بوون، رۆژێك لەرۆژان جارێك لەجاران وێنای تووڕەبوون و هات و هاواری ئەم مامۆستا پایەبەرزە لەمێشك و یادەوەری من بوونی نییە.. زۆر گرنگی بەدەربڕینی پیتەکان وەك خۆی دەدا و لەخاوتندا هەستت نەدەکرد دیانی عەنکاوەیە، سەد سوێندو قورئانت دەخوارد ئەو گۆرگیسە فەندییە منداڵ و پەروەردەی ئەو تەیراوەیەی خۆمانە، ئەوەندە بەکوردییێکی بێگرێ و گۆڵ دەدوا، بەرۆح قەرزاری ئەو مامۆستا و پەروەردکارە پایەبەرزەم کەلەسەر دەستە پیرۆزەکانی ئەو من فێری خوێندنەوە و نووسینی کوردی بووم، رەوانی شاد و هەزار جار یادی بەخێر.

## عەرەب بووە مەریوان

هەر لەپۆلی یەك و هەر تەنها ئەو ساڵە لەقوتابخانـەی عـەرەب مایـنـەوە، بـۆ پۆلی دووەم هەم قوتابخانەکەمان ناوی گۆڕا بووە قوتابخانەی (مـەریوان) هـەم لەبینایەکـەش گواسـتمانەوە کۆڵانێـك هـەورازتر، لـەپۆلی دووەم بەڕێوەبـەرمان مامۆستا (عەبدولڕەحمان قەساب) بـوو، پیـاوێکی مەسلەکی بـوو دوو بـرازای خـۆی لەگـەڵمان قوتـابی بـوون (ئـازاد و رەشـاد) ئـەوانی هـەر عـەدم دەکـرد بەلێدان، زۆر بـەیانییان جـارێ نـەخێر بەشـکرایە نەشـەڕ، تومـەز هـەر لـەماڵی خۆیـــان شـــکایەتیان لێکـــراوە.. بەتایبـــەتی (ئـــازاد)ی دەهێنـــا دەرەوە و لەحەوشەی قوتابخانە و لەبەرچاوی قوتابیان بەدارێکی درێژ و ئەستوور دەیان داری لـەناو لـەپی هـەردوو دەسـتی دەدا و هـەتا شـل و کـوت دەبـوو دەسـتی رادەوەشاند، هـەر کـەئازادیش بێتاقـەت دەبـوو دەکەوتـە سـەر ئـەرز، هـەینێ عەبدولرەحمان فەندی دەیگۆت:

– کۆپەگ ئۆغلو، عاقڵ ئۆڵ.

ئـەو قوتابییانـەی لـەبیرم بێـت کەلـە (مـەریوان) هـاوپۆل و هاوقوتابخانـەم بوون، کوڕێکی قەڵاتی زۆر هۆگری یەك بـووین نـاوی (دیـار) بـوو، هـەموو جـار گۆرگیسە فەندی دەیگۆت ئەنگۆ هەردووکتان یەك ناوتان هەیە.. (زاهیر= دیار) چونکە یەك مانای هەیە، هەروەها ئەسعەد ماوەرانی هاوپۆلم بوو، هـەردوو بـرا (مجید محەمەد ئەمین) و (هاشـم محەمـەد ئـەمین)، کـەدواتر (مەجیـد) لـەپاش راپەڕین و دوای رووخانی رژێمی بەعس و سەدام ساڵانێك وەزیـری تەندروسـتی حکومـەتی عێـراق بـوو، هـاشمی براشـی پێشـمەرگە و فەرماندەیێکی ئـازا و چاونەترسی شۆڕشی کوردستان بوو لەکۆتایی هەشتاکان (هاشم شەمامکی) لە نەبەردییەکی بێوێنە چووە کاروانی سـەربەرزی شـەهیدان و لەدەشـتی هـەولێر

خۆشاوی شەهادەتی چێشت.

هەروەها ( شێخ لوقمان بەرزنجی) و (حسام و حەسیب و دارا) کوڕانی شێخ ئەنوەر بەرزنجی لەگەڵمان بوون، هەر لەهاوپۆلەکانم (ئەحمەد شەریف) و (سەلام) کوڕی عەنتەری خاوەنی گازینۆ عەنتەر و سالم مەردان و وەلی زراری. فەرید، ئازاد و عەلائەدین برا بوون، یەحیا ناوێك لە گەڕەکی تەعجیلەوە دەهات.

هەروەها نیهاد لەتیف قۆجە دوو ساڵ لەپێش ئێمە بوو دواتر لەبەرچاو بزر بوو وابزانم ماڵیان لەقەڵات گواسترابۆوە بۆ لای گەڕەکی شۆڕش ئەویشیان بۆ قوتابخانەیێکی ئەو ناوە گواستەوە. لەپۆلی سێ بووم ماڵی مام سدیقی مامی باوکم لەرانیەوە هاتنەوە هەولێر.. لەبەر ئەوەی من لەمەریوان بووم، نەوزادی مام سدیقی بۆ ئەم قوتابخانەیە گواسترایەوە و بەیەکەوە بووین، هەر ئەو ساڵە لە کۆیەڕا (شیروان غەفوری) برازای مامۆستا سەعدی غەفوری کەهەر بەخۆشی مامۆستامان بوو هات و لەگەڵ ئێمە قوتابی بوو.

ئەو مامۆستایانەی لەسەرەتایی لەبەردەستیان قوتابی بووم و پەروەردەیان کردووم، ئەوانەی لەبیرم مابن مامۆستا شێخ (عەبدولفەتاح)ەك هەبوو زۆر پیر بوو زیاتر بەتورکی قسەی دەکرد، مامۆستا زاهیر کۆیی پیاوەکی بالا بەرزی چوارشانە بوو کەتووڕە دەبوو بەقوتابیانی دەگوت (جگ سز) (هێلکەی کەرێ).. مامۆستا حەوێز پیاوەکی زۆر قۆز و لەسەرەخۆ بوو وانەی مێژوویی پێدەوتین، موحسینە فەندی مامۆستای وەرزش بوو، بەداخەوە دوای راپەڕین باری دەروونی تێکچوو بوو لەناو بازاڕ پارچە مقەبا و پاکەتە جگەرەی بەتاڵی کۆدەکردەوە و لەسەر بۆنیتی ئەو ئۆتۆمبێلانەی روو دەکرد کەلەرۆخ شەقامەکان وەستێنرا بوون، هەروەها مامۆستا رەشاد ئەویش مامۆستای وەرزش بوو، دەنگی زۆر خۆش بوو بەتایبەتی قۆریات و کەرەمی تورکی

دەخوێند، لە وەرزش زۆر گرنگی بەمن دەدا چونکە دەیزانـی بـرازای ئـەنوەری نانەوای برادەری خۆی بووم.

مامۆستا محەمەد حەسەن مەنگوڕی یـەك دوو سـاڵان مامۆسـتامان بـوو زۆر گرنگی بەرۆژانی پێنج شەممە دەدا کە لەحەوشە هەموو قوتابیان بۆ مەسەلەی پاك و خاوێن و ئامۆژگـاری کۆدەکراینـەوە، ئـەو سـروودی کـوردی پێـدەگوتین بەهەموو دەمێش جگەرەیێکی بەداگیرساوی لەسەر لالێوی دادەنا و وردە وردە دوکەڵەکەی بەبا دەکرد.

ئەو شەش ساڵەی لە (مەریوان) قوتابی بووم، سـەرهات و گێڕانـەوەی زۆر و عەجایبم لەتۆمارگای مێشك هەڵگرتووە.. هەر کاڤێکی پێویست بێت دەچمەوە سەریان. بەڵام بۆ ئێرە حەز دەکەم ئەوەندەتان بۆ هەڵڕێژم:

پۆلی سێ بووین، بەیانییەکی رەنگە هەر پێنج شـەممە بووبێـت لەحەوشـەی قوتابخانە ریز کراین، لەناکاو بەمەبەستی چاودێری پـاك و خـاوێنی بەڕێوەبـەر فەرمانی دا:

– هەر قوتابیە و دەستە سڕەکەی دەربینی و لەنێوان هەردوو دەستی دانێ و نینۆکەکانتان دەپشکنین.

ئیـدی بـووە مشەوەشـی، ئـەوەی دەستەسـڕی هـەبوو دەرهێنـا و خـۆی ئامادەکرد، ئەوانی دی هەر قوتابیە و بەجۆرێك هەوڵی خۆ دەربازکردنی دەدا.

من و وەلی زراری قوتابییەکمان نێوان بوو، هەر لـەهیکرِا داهاتـەوە و پارچـە کاغەزێك لەبەر پێیانی کەوتبوو هەڵیگرتەوە و وەك دەستەسـڕ رێکـی خسـت و لەنێوان هەردوو دەستی زۆر بەوەستایی داینا و ئامادەبوو بۆ پشکنین.

بەڵام فێڵ کردن لەعەبدولڕەحمان قەسابی بەڕێوەبـەر زۆر زەحمـەت بـوو.. پشـکنین دەسـتی پێکـرد، پـاك و خاوێنـەکان، ئەوانـەی دەستەسـڕیان پێبـوو نینۆکیان نەهاتبوو ئافەرین دەکران و پیس و پۆخڵەکانیش هەریەکەو بەجۆرێك

سزای خۆی وەردەگرت.. لەمنیش رەت بوو نە ئافەرینی کردم و نە سزای دام.. لەوەی تەنیشتیشم تێپەڕی گەیشتە سەر رۆحی وەلی زراری.. دەمێك وەستا، زۆر بەدیقەت تەماشای دەستەکانی دەکرد، پاشان پرسی:

– کوڕم ئەو دەستە سڕەت چ رەنگە؟

وەلی رەنگی وەك پەلکە پیازی سپی بوو، نوتقی گیرا.

قەساب لێی دووبارە کردەوە؟

– ئەو دەستە سڕەت پیشانم دە.. بزانم چ رەنگە؟

وەلی جووڵەی لەخۆی بڕی بوو وەك شەقشەقەی دەلەرزی.

ئیدی بەڕێوەبەر دەستی درێژ کرد و پارچە کاغەزەکەی نێوان مشتی وەلی پچڕیەوە، کەزانی لە پارچە کاغەزێك زیاتر هیچی دی نییە. بەدارەکەی دەستی وەرگەڕایە سەروگێلاکی وەلی.. پاش دوو سێ چرکان لەئەرز گەوزینی، وەلی.. چ فەرق و جیاوازییێك لەنێوان رەنگی جل و بەرگی و ئەو وەرەقەیەی لەجیاتی دەستەسڕ بەدەستیەوە گرتبوو نەما.. رەنگی یەکیان گرت.

مامۆستا (تۆما)یێکمان هەبوو وانەی بیرکارییی پێدەگوتین، خەڵکی عەنکاوەی بوو.. زۆر غەدار و بێ رەحم بوو.. وابزانم هەر لەرق و لەترسی ئەو مامۆستایەی بوو هەنووکەش لەبیرکاری و ژمێریاری و رەقەمان تەقەی سەرم دێ و هیچیان لێنازانم.

## بەدامچە

حەزمان لە قرتاندنی بەدامچە بوایە، دوو دوو و سێ سێ بەسواری پایسکل دەچووینە عەنکاوە و بەدامچەمان دەکڕی و دەگەڕاینەوە.

عەسرێکیان لەگەڵ برادەرێکم بەسواری پایسکل چووینە عەنکاوە، لەدوکانێك لاماندا و هەر کەسەمان بای پارەکەی خۆی بەدامچەمان کڕی، بۆیان لەکیسەیێکی کاغەز کردین و هەر لەناو دوکانێرا دەستمان بەقرتە قرت و شکاندنی بەدامچە سوێرەکە کرد، لەهیکەوە مامۆستا (تۆما)ی وانەی بیرکاری لەوبەری جادە رێك بەرامبەرم وەستابوو و سەیری دەکردم، هەنووکەش نازانم چۆن سواری پایسکل بووم و چۆن تێمتەقاند، ئەو رۆژی خشتەی جارانی (جەدوەل زەرب)ی دابوینێ تا ئەزبەری بکەین و بۆ بەیانی لێی دەپرسینەوە.

بۆ سبەینێ، کەهاتە ناو پۆل ئاگام لێبوو چاو لەمن دەگێڕێ، سەیرێکی کردم وەك ئەوەی بڵێ:

– هەنووکە بەقوربانت دەبم.

پرسینەوە دەستی پێکرد، یەك یەك قوتابییەکانی هەڵدەستاند و ئەوانیش جارانی یەك و دوو و سێ چوار و هەتا دەیان بەئەزبەر دەگوتەوە، نۆرەی من هات، هەڵسام تا جارانی سێ کەشەوەکەی خۆم بۆ ماندوو کردبوو باش بووم، لەجارانی چوار پەنجەر بووم و چەقیم، لەبەرم نەکردبوو، شڵەژام و دەمم تێك ئالا، بانگی کردمە پێش سەبورە و جارێکیدی لەسەرەتاوە جارانی پێگوتمەوە، لەترسی مامۆستا جارانی یەك و دووشم لەمێشکی سڕایەوە و هیچم بیر نەما.

تۆما فەندی مامۆستاییێکی بەتوانای بیرکاری و دڵسۆزی پیشەکەی بوو، بەلام لەگەڵ قوتابییە تەمبەڵەکانی زۆر زاڵم و بێرەحم بوو.

لێمهاتە پێشێ و بەدەستە گەورەکەی گوێی گرتم و گوتی:

– سەگباب، لەجیاتی بەدامچە خواردنێ جەدوەلەکەت لەبەر کردبا باشتر نەبوو، چ ئەتوی هینا لەعەنکاوە.

بەدەستەکەی دی قەڵەمێکی رەساسی لەگیرفانی چاکەتی دەرهێنا و خستیە ناو پەنجەکانی دەستە راستم و لەهیکرا بەهەموو هێزێکی کەهەیبوو هەردوو پەنجەی گوشیم و گوێم لەقرچوهۆرێك بوو، جا نەمزانی شکانی قەڵەمەکە بوو یان هێسکی پەنجەکان؟! روح لەشوێنێکی عاسێیە و نایەتە دەرێ، چەند خولەکێك بەمجۆرە و بەم ئازارە و بەنەرەنەری مامۆستا تۆما کاس بووبووم کەتەنها گوێم لەدەنگی بوو دەیگوت:

– وەرە لەعەنکاوە، بەدامچە بخۆ باشە؟!

هەتا یەك هەفتەش شوێن پەنجەی شایەتمان و ئەویدیم شین و مۆر هەڵگەرابوون، لەهەینێوە دوو شتم لەبەرچاو کەوت و نەمتوانی خۆشم بووێن:

یەکەم: بەدامچە.

دووەم: بیرکاری.

لەبیرکارییەکە هەنووکەش تەقەی سەرم دێ و جەدوەل زەربەکەشم هەر لەبەر نەکرد.

پۆلی چوارەم بووم.. چەند قوتابییێکی پەیمانگەی مامۆستایان هاتنە (مەریوان) پێیان دەگوتن موتەبیق.

یەك لەو موتەبیقانە لەوانەی کوردی دەهاتە پۆلی ئێمە.. هەموو جارێش دەیگوت: کتێبەکانتان داخەن با بۆخۆمان قسان بکەین.. کێ چیرۆکێك.. حەکایەتێکی دەزانی با هەستێ بێتە پێش سەبورەی بۆمان بگێرێتەوە.

یەك لەو جارانە غیرەتم دا بەر خۆم هەستام چوومە پێشەوە و دەستم بەگێرانەوەی هەقایەتەکەم کرد.

چیرۆکەکەم باسی دز و حاکمێك بوو ئەوسەری دیار نەبوو.. هەرچەند جاری

دەگەیشــتمە ئــەوەی بڵــێم حاکمەکــە.. دەمگــۆت عاکمەکــە.. مامۆســـتای موتەبیقیش بۆی راست دەکردمەوە دەیگوت بڵـێ حاکمەکە.. حـاکم.. بـە حـا نەك بە عا.. لەبنی قورگتەوە بڵێ حـا.. نـەك لەپێشـەوەی قورگـت بڵێـی عـا.. ئیـدی وازم لـەعاکم هێنـا و فێربـووم بڵـێم حـاکم. وابـزانم ئـەم گێڕانەوەیـەی چیرۆکی حاکم و دزەکە، بووە یەکەمین هەنگاوی سەرەتاییم کە بەرامبەر خەڵك قسە بکەم و دەست بجوڵێنم و نواندن بکەم. هەر لەو ساتەوەیش فێربووم حـا بە حا و عا بە عا نوتق بکەم.

## قوڕ و تراکتۆر

لـەخوار مـاڵی خۆمـان و لـەکۆتایی کۆڵانـێ، سـاکە بـەیارێکی پـان و بـەرین لەپێش دەرگای حەسارێ هـەبوو، لەگـەڵ برادەرەکـانم کردبوومانـە گۆڕەپـانی تۆپانێ.. ئیدی لەگەڵ فەوزی معاونساڵحی و مۆفەقی مـام کـاکۆیی و نـامیقی پلکە رەحمەتەی، دڵشـاد و ئـازادی سـابیر سـەماوەری و تـۆفیقی مـام عومـەر پەڕەشوتی و خالیدی حاجی مەجیـد قـەرداری تیپێکـی تـۆپی پێمـان دروسـت کردبـوو، لـەپێش دەرگـای حەسـارێ کـە گۆڕەپـانی یـاری بـوو لەهـەمان کـات هەرچی زبڵ و خاشاکی گەڕەکێش هەبوو لەوێ فـڕێ دەدرا و ببـووە گوفـەکێك نەسەری دیار بوو نەبن.

بە زستان و بە هاوین لەسەر ئەو گوفەکەی گەمەمان دەکـرد.. زسـتانێکیان فێربووم بۆ یاری کردن شەرواڵم لەبەر دەکرد.. بێگومان شوێنەکە دەبووە قـوڕ و چڵپاو.. پێڵاوی لاستیك هـەبوو لەسـەر شـێوەی لاپـچینی یاریزانـان دروسـت دەکرا بۆ یارییەکانمان ئەو پێڵاوەمان لەپێ دەکرد.. بێگومان پاش نیوەڕۆیـان تا تاریك دا دەهات گەمەمان بەردەوام دەبوو، من ئاگـام لـەوە نـەدەما دواوەی شەرواڵم چۆن لەلای دەلینگمەوە تا پشتی سەرم لەقوڕ و چڵپاو هەڵکێشراوە.. کەیاری نەدەما و دونیا تاریك دا دەهات بەرەو ماڵ دەبووینەوە، هەینێ لەکاتی ڕێکردن هەستم دەکـرد چ قـوڕ و چـڵپاوەك بەشـەرواڵمەوەیە.. جـا بـۆ ئـەوەی دایکم و ئەوانەی ماڵەوە ئەو عەیب و عارەم نـەبینن، بەپەلـە دەچـوومە ژووری خۆمـان و شـەرواڵم لەبـەر دەکـردەوە و بەبـەرەواژی هەڵمدەواسـی.. واتـە شـەرواڵەکەم هەڵـدەگێڕاوە.. قوڕاوەکـە دەکەوتـە نـاوەوە و دیـوە خاوێنەکـە بەدیار دەکەوت و هەڵمدەواسی.. بەڵام ئەو فرت و فێڵەم تا سەر نەبوو، دایکـم پێیزانی.. دیارە لەلای باوکیشم باسی کردبوو، ئێوارەیەکیان بەهەمان دەستور

گەڕامــەوە و ســەرتاپای شــەرواڵم قــوڕ و چــڵپاو بــوو، دوور بــەدووریش بۆنــە بۆگەنیەکەی زبڵە تێکەڵاوەکەی ناو قوڕاوم لێدەهات.. ئیدی بەهــەمان شــێوەی ڕۆژانی پێشوو شــەرواڵم لەبــەر کــردەوە و هــەڵمگێڕاوە و بــەبزمارم هەڵواســی.. لەناکاو دەستێك وەك پلایس گوێی ڕاستەی توند گوشـیم ئـاوڕم دایـەوە بـاوکم بوو، لێدانەك لێیدام لەکەڕێی دابا دەتۆپی.

# یا بازو.. یا باز

هێدی هێدی مەیلم بەلای گوێگرتن لە گۆرانی و کردنەوەی رادیۆ دەبزوت، مەراقم بوو و دەمگوت دەبێ بزانم چۆن ئەو گۆرانیبێژانە دەچنە ناو رادیۆ و دەنگیان تۆماردەکەن.. وابزانم هەر لەو سەر و بەندەش بوو تاك تاكە ئامێری تەلەفزیۆن لە ماڵە دەوڵەمەند و هەبووەکان پەیدا بوو بوو.

زۆر جاران لەگەڵ مۆفەقی برادەرم کۆڵان بە کۆڵان لە گەڕەکی تەیراوە دەسووڕاینەوە و تەماشای سەربانی ماڵانمان دەکرد تا بزانین چەند ماڵ (ئاریەل)یان لەسەربانی چەقاندیە، مانای وایە ئەو ماڵە تەلەفزیۆنیان هەیە.. دەوڵەمەندن.

هەر ئەو عەیامی بوو.. محەمەدی عەیشە بسك سۆری ئامۆزای دایکم وەبەر گوێی دام کە دکتۆر عەباس هەورامی برادەری باوکم و جیرانمان لە کۆڵانی خوارێ رادیۆیەکی کڕیبە دەنگیش تۆمار دەکات ، پێی دەڵێن (موسەجەلە).

ئەو موسەجەلەیە لێم بووە مەڕاق ، بەخەیاڵی منداڵیم دەمگوت لەوانەیە ئەو کەسەی دەنگی تۆمار دەکرێ خۆی لەپەنا پەردەیەك بشارێتەوە و هەینێ دکتۆر عەباس لەگەڵ ئامێرەکە قسان بکات و ئیزنی لێوەرگرێ و ناوی کەسەکەی بداتێ ئینجا موسەجەلەکە رێ بدات دەنگەکەی لەسەر تۆمار بکرێت، شەو و رۆژیش بیرم لێدەکردەوە !

یەك دووجاران باوکم وەك عادەتی خۆی پاش نانی ئێوارێ بەتەنێ دەچووە ماڵی دکتۆر عەباس و هەتا درەنگی شەوێ لەوێ دەمایەوە، کە دەشگەڕایەوە نە ئەو باسی ئەو دەعبایەی ماڵی دکتۆری دەکرد نە منیش غیرەتم دەکرد تا لێی بپرسم: بابە موسەجەلەکە کووە؟

هەتا عەیامەکی بەسەرچوو ، ئێوارەیەکیان زانیم باوکم کەرخی چوونە ماڵی دکتۆر عەباسی هەیە.. دایەم کردە واسیتەو بەناچاری قبوڵی کرد کە منیش لەگەڵ خۆی ببات ، ئیدی لە رێگا درکاندم کە حەزم لێیە لەسەر ئەو

موسەجەلەیە دەنگم تۆمار بکەم.. باوکم بە تێزەوە گوتی: ئەوجا چ دەرێی نەفەندی.. خۆ لێم نەبوویە مشکۆ و قۆرییاتانم لۆ برێی؟

ئەمنیش تێمگەیاند ئەو چەند جارەی کە لەگەڵە خۆی چوویمە تەکیەی شێخ عەبدولکەریمی کەزی سۆری دارەخورمای، لەوێ گێم لە خەلیفە رەسوڵی بووە بەسەر غەوسی گەیلانی دا دەگۆت.. ئەمنیش دەزانم وەکی وی برێم. بینیم باوکم کەمێك شلی کرد.. بەڵام گوتی: حەیامان نەبەی ها.. ئەوە موسەجەلەیە! با لەوێ قەشمەریمان پێنەکەن.. بەم جۆرە پێکهاتین.

کە گەیشتینە ماڵەکە، من چاوم لە دەعبایەکە دەگێڕا و باوکیشم خەریکی هەڵقوڕاندنی دیشلەمە بوو.. زوو زووش هەنیشکەکم لێدەدا و پەلەم لێدەکرد و بەبیرم دەخستەوە.. ئەوە بوو بەناچاری رووی لە دکتۆر عەباسی پسپۆری نەخۆشییەکانی چاو کرد و گوتی:

—کاکە دکتۆر.. وابزانم زاهیری کوڕم دەنگی خراپ نییە ئەگەر لە موسەجەلەکەی تۆ دەنگی تەنزیل بکات.. ئەرێ خۆ موسەجەلەکەت عێدز نەبووە و ئیشێ دەکات؟ ئەمنیش خۆم کش و مات کردبوو.

هەرکە گێم لێ بوو دکتۆر گوتی:

—کاك عەبدوڵڵا موسەجەلەکەی من ئەوەل بابە و بە هەوەنتە عێدز نابی و دەنگی دەڵێی زەنگوڵەیە، من لە خۆشیان خەریك بوو بفڕم.

ئەوەبوو.. من خۆم حازر و ئامادە کرد و چاوم لەو پەردەیە دەگێرا کە دەبێ بچمە پەنای و خۆم بشارمەوە، هەتا کاکە دکتۆر ئیزن لە ئامێرەکە وەردەگرێ.. کەچی دکتۆر هەستاو چوو قوتە موسەجەلی هیناو نیو هێندەی مێزێکی ناوماڵ دەبوو.. دوو بەکرەی خڕی پێوە بوو.. وایەری لە پلاکی کارەبا خست و قرچ و قرچ کەوتە ئیش پێکردنی ئەو سندان کوشتیە، منیش مشەوەشم و هەر هەندەیە لەتاوان بچمە ناو کۆشی باوکم.. هەینێ دکتۆر بە دوو پەنجە دووگمەیەکی بادا و بەکرەکان کەوتنە خولانەوە.. بەئامارەش

باوکمی تێگەیاند با زاهیر دەست بە گوتن بکات.. باوکیشم بە دەنگ گوتی:

—دەی کاکە دەی.. دەست پێبکە.

پاش کەمێك بێدەنگی و لەپڕ دەنگم هەڵبڕی و تێم چریکاند:

{یا بازو یاباز سەلم عەلەییە ، شێخ عەبدولقادر بازی گەیلانی.. .

دووبارە:

یا بازو یاباز سەلم عەلەییە، شێخ عەبدولقادر بازی گەیلانی. }

دیارە ئەو بەکرەیەی دکتۆر بۆ تۆمار کردنی دەنگی من بەکاری هێنا، بەکرەیەك بوو شتی تری لەسەر تۆمارکرابوو و ئەوەندەی بەر دەنگی من کەوت کۆتایی شریتەکە بوو، ئیدی شریت بەڕەڵلا بوو و بووە چرپە چرپی شریت و خولانەوەی بەکرە بەبەتاڵی. بەم شێوەیە دکتۆر دوگمەی کوژانەوەی باداو گوتی: بابزانین چۆن دەرچووە ؟

شریتەکەی خستەوە سەر بەکرە و کەمێکی گەڕاندەوە و دوگمەی داگیرساندنی بادا.. سەرەتا دەنگی قەبەی باوکم دەبیسترێ: دەی کاکە دەی دەست پێبکە.. "پاش بێدەنگییەکی کورت خایەن"دەنگی من.. دەنگی تیژی منالێك دەبیسترێ ((یاباز و یاباز سەلم عەلەییە.. .. . )).. دەبێ بڵێم دواتر زانیم ئەو شەوە دەنگی من لە کۆتایی ئەو بەکرەیە تۆمار کرا کە سەرتاسەری شریتەکە دەنگی زوڵاڵی حاجی عەبدوڵلای دەفژەنە و کاتی خۆی لە حزوری جەنابی کاکی هێرانێی شاعیر تۆمارکراوە. ساڵانی دواتر لەکاتی هەراشیم، من ئەو بەکرەیەم رادەستی هونەرمەندی گەورە مامۆستا وریا ئەحمەد کرد کە ئەو کاتە عەوداڵی دەنگی رەوانشاد حاجی عەبدوڵلای دەفژەن بوو.. دڵنیام هەنووکەش بەکرەکە لەلای ئەم هونەرمەندە گەورەیەمان ماوە و دەنگی منیش لە کۆتایی شریتەکە هەر دەزرینگێتەوە بە (یابازو یاباز).

ئەمە بەیەکەمین تۆمارکراو ئەرشیفی دەنگ وهونەری خۆم حسێب دەکەم.. کە بووە یادگارییەکی هەرە شیرین لەگەڵ باوکم و لەگەڵ دکتۆر عەباس هەورامیی هونەر دۆست.

# تۆپ بەسێ درهەم

چەند ئاوزەیێکی خۆم لەتیپەکەمان تۆپی خۆیان هەبوو، هەندەك جاران کە
ـەیەك عـادز دەبـووین تۆپیـان لـەماڵی عاسـێ دەکـرد و نـەیان دەهێنـا دەرێ،
ـەرکان بڕیارمدا هەر کوەکی بێت پێویستە تۆپی خۆم هـەبی و موحتـاجی ئـەو
ـامەردانە نەبم.

بابـە حـاجی (بـاوکی دایکـم) ئـەوەی لەبەرەبـەیانی لـەدایك بـوونی مــن
ـەخۆشیان لەسـەربانی مـاڵی مـام حوسـێنی ماسـتفرۆش بـانگی دا و فرمێسـك
ـەچاوانی جۆگەلەیان بەستبوو.. ئەو تاکە هیوا و پشت و پەنام بوو، کە هانـای
بۆ بەرم و پارەم بداتێ و تۆپێکی پێبکڕم، ئـەو زەمـانی دوکـانی بابـە حـاجی
ـەبن ئوتێل (سەفین)ی بوو بەرامبەر مەحکەمەی.

پاش نیوەڕۆییێکی خـۆم فـەقیر کـرد و چـوومە دوکانـێ.. بابـە حـاجی هـەر
کەئەوهای دیتم زانی شتەکم دەوێ.. گوتی:

– ها کاکە لۆ لچت شۆڕ کردیە؟ پێمبڕێ چت دەوێ؟

+ هەموو منداڵانی گەڕەکێ تۆپیان هەیە و گەمەی پێدەکـەن.. بـەس ئـەمن
نیتم و ئەوانیش پێکم ناکەن.

یەکسەر گڕی گرت و گوتی:

– تۆپ بەچەندیە؟

+ گرانە.. بەسێ درهەمیە.. داکیشم نامداتێ.. ئەمنیش قەت پـارەی لـەبابم
داوا ناکەم.

هەر دەستی برد و دەخیلەی راکێشا و سێ درهەمی دەرهێنا و لەمستی نـام
و گوتی:

– بڕۆ تۆپی بکڕە و یەکسەر بڕۆوە کۆڵانـێ و گـەمان بـەتۆپی خـۆت بکـە..

زووش بڕۆوە ماڵێ.. با داکت لەدووت نەگەڕێ.

خەنی بووم.. بەهەشتاوی بۆی دەرچووم.. دەمزانی تۆپی سێ درهەم بایی لەکوێ دەفرۆشرێ چونکە لەگەڵ برادەرەکانی دیم چووبووم کەلەوێ تۆپیان دەکڕی.

لەبن قەڵاتێ.. هەر رێك بەرامبەر باتای، جادەی ئەوبەری.. دوکانێك هەبوو کەلوپەلی وەرزشی دەفرۆشت.. یەکسەر چوومە وێ لەدیوی ژوورێی جامخانەی دوکانەکە یەك کارتۆنی گەورە پڕ بوو لەتۆپ.. تۆپێکم دەست کردێ و سێ درهەمەکەم لەمستی کابرای دوکاندار نا و هەر بەغار بۆ تەیراوە، بۆ کۆڵانی خۆمان کن حەسارێ خۆتان بگرن هاتم.. بە چاوتروکانێك گەیشتمەوە پێش دەرگای حەساری.. تۆپ لەباوەشمە و ئارەقەش لەتۆقی سەرم جۆگەلەی بەستییە و بەناو شانم را لەپشتم دێتە خوارێ.. ئەوە چییە ساحەکەمان کەسی لێ نییە.. لەکوێن نامەردینە.. ببینن منیش تۆپی خۆم هەیە.. منەتم پێتان نەما، بەتۆپی خۆم گەمان دەکەم، دەمێك راوەستام.. ویستم تۆپەکەم بەبەر شوتان بدەم و بەتەنها گەمان بکەم.. بەراستی دڵم نەهات.. گوتم تۆپەکەم تازەیە و خاوێنە با لێم پیس نەبێ.. وردە وردە ئێوارە دا دەهات و دونیا تاریك دەبوو.. بیرم کەوتەوە خۆ ئەگەر برادەرەکانم لێرە گەمان نەکەن ئەوە بێگومان لەولاینە، ئەولا کێندەر بوو؟

کۆڵانی ماڵی دایە سەید ئایشێ، هەورازی مزگەوتی حاجی مەجید قەرداری.. . چوارڕیانی نزیك ماڵی ساڵحە فەندی باوکی جەمال مورسەلی و حاجی رازیەی.. ئەمیری ئامۆزام پێیدەگوت: حاجی ریازە. هەر بەغاردان تۆپ لەباوەشم خۆم گەیاندە وێ.. عەجایب ئەوێش رەفیقەکانی منی لێ نەبوو.. چاوم دەگێڕا.. تۆپ لەباوەشم لەهیکڕا زڕتە بۆزێکی سمێل فشی چوارشانە لێم نزیك بۆوە و لبنەوەڕا بۆکسێکی لەتۆپەکەی باوەشم دا، تۆپ کەوتە

عاسمانێ.. زۆری برد تا هاتەوە عاردی، ئەوجا لەبەخت و نیوچەوانی من کەوتە بەر پێی زرتەبۆزی، زرتەبۆزیش هەتا شوت گرتی لەتۆپی هەڵدا و هاویشتیە تۆقەرەی ئاسمانێ.. بەران هەر ئەو بڵندبوونە بوو تۆپ نەگەڕاوە ناو کۆلانێ و کەوتە ناو خانووە دیوار بڵندەکەی بەرامبەر ماڵی حاجی رازیەی.. زرتە بۆزیش کەزانی گەمەکەی تەواو بەقاقای پێکەنین وەك لەندەهۆڕی ملی رێی گرت و لەبەرچاوم بزر بوو..

ئەی خوایە چ بکەم.. تۆپ کەوتیتە ماڵەکی، ساحێب ماڵ معاونی پۆلیسە، بەترس و لەرز چەند جارێك لەدەرگامدا و چاوەڕێم کرد.. نەخێر نەدەرگا کرایەوە و نەکەسیش گوتی: کێیە؟ هەتا بڵێم ئەمنم تۆپەکەم کەوتیتە حەوشەتان بەڵکو بۆم فڕێ دەنەوە دەرێ.. هەندێکم چاوەڕێ کرد بێ فایدە بوو.. بەناچاری و بەدڵی پڕ لەکەسەر و قوڕگی پڕ لەگریان گەڕامەوە ماڵێ.. سوو رۆژ دواتر بوومە پاسەوانی دەرگای ئەو ماڵە.. دەمگوت هەر دەرگا بکرێتەوە دەچم دەڵێم تۆپەکەم کەوتیتە حەوشەتان بمدەنەوە.. لەبەخت و نیوچەوانی من هەتا من پاسەوانیم دەکرد بەقەراری قەتعی دەرگا کەلێنی لێ نەبۆوە.. پاش چەند رۆژێك، کوڕێکیان زۆر بێباکانە تۆپە سێ درهەم باویەکەمی دەهێنا کۆلانێ و تێر شەق شەقانێ پێ دەکرد و دەیبردەوە ژووریٚ و منیش زەقەی چاوم دەهات. رۆژێك خۆم بۆ دانوساند، هەرکە کوڕەکە تۆپەکەمی هێنا دەرێ و کەوتە یاری کردن، لەهیکڕا زەفەرم پێبرد و تۆپەکەم لەباوەش گرت و هەرێ بۆ ماڵەوە.. لەماڵێ تۆپەکەم خستە ناو کەنتۆری دایکم و دەرگام داخست و کلیلەکەم خستە تەنکەی باخەرم.. هێشتا ماندیم نەحەسابۆوە پلە نەجیبە بەخۆ و بەعەبا رەشەی لەسەری بەژووریٚ کەوت.. چاوی بەمن کەوت گوتی:

– ها تۆپ دز.. چت لەتۆپەکەی کرد؟ ئیدی کەوتە قسان لەگەڵ دایکم و

ژنەکانی ماڵیمان.. دەبێ بڵێم (پورە نەجیبە ئەو دەمای کرێچی ماڵی حاجی رازیەی بوون).. دیارە کەمن تۆپەکەم رفاندووە، دایکی کورە چوویتە لای و پێی گوتووە تۆپ تۆپی خۆمانە.. زاهیری کوڕی برات لەکوڕەکەمی رفاندووە، نەیهینیەوە چی خراپە پێتان دەکەم.. چاوم لێبوو پلە نەجیبە هەر لە روومەتە چورچەکانی خۆی دەدا و بەدایکمی دەگوت:

– براژن.. ئەمن خەمی زاهیرم نییە چاوی دەردەهات.. ئەمن خەمی کاکمە.. ئەو ژنە هارە.. سەلوعەیە.. تەلیعەیە.. مێردەکەی معاونی پۆلیسە تیخ تیخەی بدات دەترسێم کاکم بەگرتن بدات.. گرتن ئاسانە، بەربوون زەحمەتە، کێ بەهانامان دێت.. بینە با تۆپەکەی ببەمەوە و یەخەمان لەیەخەی ئەو کچەتیمەی ببتەوە.

بێ فایدە بوو، هەندی هاوارم کرد تۆپ تۆپی خۆمە.. بەپارەی خۆم کڕیتم.. بەغەڵەت کەوتە حەوشەی وان کەس گێی لێڕانەگرتم.. ناچارییان کردم کلیلی دەربینم بەدەستی خۆم تۆپە سێ درهەم بابیەکەم لەبن دۆشەگ و لێفان ببینمەوە و بیدەمە دەست پلە نەجیبەم و ئەویش دەست و برد هاویشتیە بن عەبا رەشەکەی و بردییەوە ماڵی معاونی. زۆر گریام بۆ ئەو تۆپەی تەنها جارێکیش یاریم پێنەکرد و شەقێکم تێهەڵنەدا.

## گلە سەرو.. عەرەب

لە دووری ماڵ و کۆڵان و تەیراوەی خۆمان، پۆلی یەکەمی سەرەتاییم دەست پێکرد..ساڵی خوێندنی (١٩٦٤- ١٩٦٥) پێشتر باسم کردووە، لەبەر ئەوەی ئامۆزایەکی دایکم لە قوتابخانەی (عەرەب)ی سەرەتایی لە گەڕەکی عارەبان و هەورازی ماڵی جەنابی قازی (رەشاد موفتی) قوتابی بوو، منیشیان لەوێ ناونووس کرد و لەگەڵ ئامۆزا گیان هاتوچۆی ناو عارەبانم دەکرد.

لە پۆلی یەك و لەم بینایە کۆن و پتەوەی عارەبان، دوو وێنەی جۆر و ناجۆر دێنەوە بەرزەینم و سەرەتاتکێ دەکەن:

وێنەی یەکەم: خوشکێکی گچکۆکەمان هەبوو، ئەدیبەی ناو بوو.. (ئەدیبە) ساغ و تەندروست و هیچ نەخۆشیەکی نەبوو، گوپن وخرپن و خەندە شیرین و چاوگەش.. لەدەرفەتێکدا، باوکم.. من و پەریزاد و ئەدەیبەی بردە بن قەڵاتێ و لای مامە گیوی موکریانی، کەرەتێکیان هەر چوارمان لەویدیش تەنها هەر سێکمان (من و پەری وئەدیبە) وێنەمان گیرا.. لەهەردوو وێنەکە، ئێمە هەرسێکمان مۆن و خەمبار و حۆل.. کەچی (ئەدیبە) چاوگەش، تۆزێك بزە لەسەر لێو و روومەتە خەپەکانی خەپەتر دیارن، بەڵام بەداخەوە دوای ئەم دوو وێنەیە پاش عەیامێك کە پارچەلە بوو بوو لەناکاو (ئەدیبە)کەی هەموومان کەوتەئاوزینگان و بەشەو و رۆژێك لەبەرچاوان بزر بوو و بە قەولی (دایە بابە)ی بووە پەپوولەی بەهەشتێ.. مردنی (ئەدیبە)ی یەکەمین شکست و یەکەمین کارەساتی دێوەزمەی مردن و یەکەمین سەردانی من بوو بۆ گۆڕستان، هەر لە تەیراوە و لە گۆڕستانی (شێخ مەلا رەشید)ی ئەدیبەیان لەبەرچاوی من خستە ناو قەبرو خۆڵی دونیاییان بەسەردا کردو دوو بەردی گەورۆنەیان لەلای سەرو پێینگانی دا چەقاند و گۆتیان: ئەوە گۆڕی ئەدیبەی خوشکتە.

هەنووکەش (ئەدیبە) و گۆڕستانی شێخ مەلا رەشیدی لە تەیراوەی، بوونەتە یەکەمین زەنگی مردن و یەکەمین دەست بەرداربوون لە ژیان، گۆڕستانەکەش یەکەمین یادگای عەزیزێکی مردووم.

وێنەی دووەم: وەفاتی ئەدیبەی خوشکم و ناشتنی لەبەرچاوم لە گۆڕستانی تەیراوەی، نەك لەسەر دڵی من.. لەسەر دڵە گەورەکەی دایکیشم بووە کەسەرو گرێیەکی گەورە و زوو زوو بە هەژاندنی لانکی بەتاڵ و سەداو ئاوازی لایلایەی بۆ ئەدیبە گچکۆکە و گوپ خڕە بۆنخۆشەکەی جەرگی، ئەمنیش بەبیستنی ئەو دەنگە تەژی لە حوزنەی دایکم و بەو ئاوازە خەم هێنەرە.. شەوان بە دزی و لە ژێر لێفە گریاوم و هەنسکم داوە و سکم بەدایکم و بەئەدیبە و بەبابە و بەخۆم سوتاوە.

وێەی سێیەم: لای لایە و دایکم و گریانی بە دزی ژێر لێفەی من هەر بەردەوام بوو.. تا ئەو رۆژەی (نەنۆکەی قەلاّتیّ) هاتە ماڵمان و وەك مامانێکی پسپۆڕ و شارەزا لەگەڵ دایکم و دوای ئەوەی چ پێویستە لە فەحس ودەست لە سکدان و مەزەندە کردن لە ژووری بنەبانیّ هاتنە دەریّ.

—مزگێنیم دەویّ قەدە.. زگت دوو مانگە.. بەهیمەتی مشایەخان کورەکت دەبی (قەلاّتی دەیانگۆت کور نەیاندەگۆت کوڕ).. نەنۆکەی قەراتیّ وای بەدایکم گوت.

ئەو عانەی دەیگێڕمەوە، دایە مەکینەکی پەپوولەی خەیاتی هەبوو، جلکی خۆیان و ژنەکانی گەڕەکێی پیّ دەدووری، بە بیستنی ئەم مزگێنیە وازی لە گریان بۆ (ئەدیبە)ی گوپ خڕ هێنا و هاموشۆی گۆڕستانی (شێخ مەلا رەشید)ی تەرك کرد.. ئیدی دایە حاجی نەخشینی دایکی، بووە عایەدی کاروباری ناوماڵ لە (چێشت لێنان.. جلك شوشتن، نان کردن.. هەتا بازاڕکردن و شمەك کڕین) دایکیشم بەتەنیا دانیشتن و خۆماندوو نەکردن و جارجارە

ـورمان و مقەست و قوماش برین بووە خولیای.

دوای مزگێنیەکەی نەنۆکەی قـەراتیێ کـە گـوتی (قـەدە زگـت هەیـە) ئیـدی قۆناغی مەگێرانی و بێزووی دایە قەدری دەستی پێکرد.. ئەوکاتـە لـە زۆربـەی مالآن بەتایبەتی ژنـان بـەجۆرە سـابوونێك سـەرو پرچـیان دەشووشـت پێیـان دەگـۆت" گرەسـەر.. گڵەسـەر".. ئـەو گـرە سـەرە لەدەوروبـەری کـەرکوك و گەرمیان چیاییێکی تایبەتی هەیە لەوێرا بۆ هەولێریان دەهێنا جـۆرەك بـوو لـەو دەیان سابوونەی ئەویێ رۆژێ بەناو بازاڕی قەیسەری هەولێرییان وەردەکرد.

دایە (قەدە)کـەی مـن بـەو (گـرە سـەرە – گڵەسـەرە) مـەگێرانی و بێـزووی دەکرد، دەبوایە (نەنۆکەی قەراتیێ) هەر چەند جاری بهاتبا ماڵی مەو لە قەراتیێ دابەزیبا یەك توورەگە گرەسەری لەگەڵ خۆی هینابا.

ئیدی دایکم لەسەر مەکینەی دورمان بەدەم کرۆشتنی گڵەسەر و خرمە خرم و قوت دانی ئەم گڵەتاڵە و بێتامـە، جلـك و بـەرگی ژنـانی گـەڕەکی تـەیراوەی دەدوری.. ئەڵلاهــ کە زۆر زۆر جوانی دەدوری.

## پەلکە شفتییەکەی دادە روقیە

یەکێك لەو ژنانەی زۆر هاموشۆی ماڵی مەیان دەکرد و جێگا و رێگای تایبەتیان لای هەمووان هەبوو، بێوەژنێك بوو یەك تاقە کوڕی بە مەزەب کۆمەنیستی لە پاش مردنی مێردەکەی بۆ بەجێ مابوو.. دەمانگوتێ: دادە روقیە.

دادە روقیە ئافرەتێکی رەشتاڵە و رەقەڵەی روخسار خوریکاوی بوو، لەقسان روقیە لەسەر وەختی بالّق بوون، دەردێکی پیسی تووش دەبێت و لە ناو خەڵکی پێیان دەگوت: ئاوڵە.. پاشتر کە لە نەخۆشیەکەی دەرباز دەبێت.. روخساری بە قۆڵت و چاڵی بچۆك بچووك دادەپۆشرێ و جوانی جارانی نامێنێ دەبێتە دەموچاوان بە خوریکە.. ژنان هەر کە باسی رەنگ و رووی روقیەیان دەکرد، دەیانگوت:

—یەع.. دەم و چاوی روقیەی دەرێی پەلکە شفتیە و مریشك دەندووکی لێدایە!!

ئەم دادە روقیەیە لە قاوە گرتنەوە و ناولەپ خوێندنەوە و روو و برۆ هەڵگرتن ئەوەندە لێزان و مەعلان بوو ژنانی تەیراوە دەبووایە نۆبەت و سرەی بۆ بگرن وچەندین شەو و رۆژ بژمێرن هەتا خەونەکەیان دەهاتە دی و دەگەیشتنە بەردەمی دادەیان و چۆنیان بویستبا ئەوهایان لێبکات، دادە روقیەی عەیاریش بێ دڵی وانی نەدەکرد و لە هیچ شتێکیش مەحتەل نەدەبوو.

قسەزان و زمان لووس و لەبلەبان بوو، بە کوردی و بە توركی دەئاخفت و قیچۆکەکیش سەری لە عارەبی دەردەکرد.. بەئاگاو لەسەر هەست بوو، هەواڵی وردو درشتی ژنان و کیژ و هەتا پیرێژنە کانی لەلابوو، لەسنووری گەڕەکی تەیراوەی بە ئیخباری هەمووان رادەگەیشت. ناوی یەکە یەکەی ژنان و ئافرەتانی لەبەربوو، هەر ناوێکت لێدەپرسی، ئەو بە حەوت پشتی دا دەچووە

خواریَ و دەیگوت: ئەوە فلانە کیژی فلان و دایکی ناوی فیسارە و ئەوەندە براو ئەوەندەش مام و خالَ و پوورزا و ئامۆزایەی هەیە.. هەندەك لە تەیراوەی بە (سندوقە رەشەکە) بانگیان دەکرد و هەندەکی دیش بە موختاری ژنان ناوزەدیان کردبوو. دەیزانی کیَ و کیَ لە ئافرەتەکان منداڵیان لەبارچووە و کیَ و کێش لەو ژنانە تازە ئاوسن و هەر ئەوەندەش نا.. بڕوا بکە دەیزانی کامە ژن ئەوشۆ لەگەلَ مێردەکەی جوت بووە، کێهان ژنیش لەبەر بیَ نوێژی وا بۆ حەوت رۆژ دەچیَ لەگەلَ مێردەکەی پێیان پێکدی نەکەتیە.

دادە روقیە گەرچی بە خۆی دەم و چاوی ئاولاَوی و کون کون و بە خوریکە بوو، بەلاَم تەبەش و روخسار و دەم و چاوی ژنە تەیراوەییانی وەها لێزانانە هەڵدەگرت و وەهای لێدەکردن هەر نەناسرێنەوە و هەر کە مێردەکانیان چاوییان بەو دەم و چاو و روخسارە بە گرشە گرشە دەکەوت و دەیانزانی ئەوە فیتی دادە روقیەیە، نەك روبعەك، نیو دینار و بگرە یەك تاکە دیناری شین شینیان بە دەستی ژنەکانیان بۆ رەوانە دەکرد و دەیانگوت: دینارەکی قابیلە، بەخودای هەر ئەو پارووی حەرار دەخوا !

هەر ئەو دادەیە کەهەندێك ژن لە زمانی دەترسان و دەیانگۆت: هەر کە لێمان تووڕە دەبێت و بڕی پارەکەمانی بەدلَ نییە، بەتورکی جنێومان پیَ دەدات و ئەمەش چونکە تورکی نازانین مەجبورین خۆمان کڕکەین و بیَ دەنگی و قڕو قەپی لیَ بکەین.

دادە، قاوەی دەگرتەوە و جگەرەی لۆکسی بەلا لێوی دەگرت و لە خەریتەی ناو فینجانی قاوەکە رادەماو پاش تاوێك هەڵیدەدایَ و بە ژنەی قاوە بۆ گرتەوەکەی دەگوت:

—ئاهـ هـ، قوڕ بەسەر برۆ عیلاجەکی خۆت بکە، هەش بەسەر بەخۆت کەوە هەبزانە مێردت ژنەکی دی بەسەردا هینای.

ئەوجا دەستی لەبەرۆکی دەگێڕا و لە دیوی ژووریٚ شتێکی دەردەهێنا و لە دوور دەستی ژنەی دەنا و دەیگوت:

–ها بگرە ها.. ئەو کشتەکەی باش تەقەت کە وەکی مێردت لە ماڵیٚ مێزی رازاندەوە و عارەق و مەزەی داناو پێکی یەکەمی لە قورگی ئاودیوکرد و پێکی دووەمی سازکرد، ئەتوو هیچ شەرمیٚ مەکە حەراری کابرای خۆتی لەسەر یەك تێلی خۆت برازێنەوە.. بۆنی خۆش لە رومەت و گەردن و بن هەنگڵت بدە، سینگ و مەمکت رووتکە ، پرچت بەسەر شانتدا بەردەوە، با بەو پرچە رەشە کارەباییەت هەر دوو چاوی کۆرەبی و بێجگە لەخۆت شتاقە شتان نەبینی، هەینیٚ و لە هیکرا کشتەکەکەی لە ناو مەمکدانت دەربینە و سیٚ جاران لە پێکی دووەمی عەرەقەکەی مێرت هەر کێشە، ئەوجا بیٚ خەمبە هەر یەکەمین قومی لە پێکی دووەمی عارەقەکەی ناو دەستی دا ئەوە یەکسەر غەرەزی ژنهێنانی دووەمی نامێنیٚ و هەر بەیەکجاری دەبیتە عەبدی زەلیلی بەر پیٚ و مەیموونی بە بۆنکەوتوی سینگ و مەمانت.

بەدڵنیایی کابرای عارەقخۆر دەبووە ئەو کەسەی کە دادە روقیە وێنەی بۆ کێشا بوو، بەلاّم نەك لەبەر کاریگەری کشتەك و نوشتە و دوعاکە، بەڵکو لەبەر ئەوەی ژنەکە ئامۆژگاری و راسپاردەکانی دادە روقیەی بەتەواوی جیٚ بەجیٚ دەکرد و خۆی دەرازاندەوە و بە (ئەتەگ لێغ) و چاو پڕ لەکل و لێوسۆر کردن و بۆن و بەرامەی سینگ و مەمکان و پرچە رەشە کارەباییەکەی و ناز و نوزی پڕ لە عیشوەی. ئیدی کابرا بڕای بڕ لە خەونێش بیری بەلای ژنی دووەمدا نەدەچوو.. هەموو عەقڵ و هۆشی تەسلیم بە ژنە عەیارەکەی دەکرد. هەر ئەمەش مەبەستی دادەی بوو و دەیویست ژنان گرنگی زیاتر بە پیاوەکانیان بدەن وایان لێبکەن چاو لەدەرنەبن، ئەدی ئاخر دادە روقیە ئەمجۆرە خێر و بەرەکەتەشی هەبوو.

## لەماڵی ئێمە پەپۆلەیەك
## ناوی بابە حاجی بوو

خانووێکی پێنج ژووری.. حەوشە و حەمام و نانەدین هەر هەموومانی کۆکردبۆوە، جگە لە دایك و باوکم و پێنج براو کچە تاقانەکەیان.. دوو باپیر و دوو داپیرە لە دەوری یەك مەنجەڵ گرد دەبووینەوە و لە چوار ژوور دەخەوتین.. بەردەوام ژووری پێنجەمیش خێزانێکی کرێچی تێدا بووە.

ئەمجارە با گەواڵە لەسەر بابە حاجی و دایە حاجی بێت، دایك و باوکی دایکم، بڵێ دوو فریشتە لە بەرگی بنیادەم.. دوو پەپوولەی سوتاوی دەورووبەر.

دایکم کچە تاقانەکەی ئەم دووانە بوو، بابە حاجی (حەسەن حوسێن ئیبراهیم) و دایە حاجی (نەخشین ئەحمەد مەولوود) – ئەم دووانە هەموو دونیایان دایکم و ئێمەی منداڵەکانی ئەو دایەیە بوو. ، بەوان با بمردبان ئێمە برسی نەبین.. بگریابان بەس ئێمە پێکەنین و زەردەخەنە و خۆشنودی لە روخسارمان نەتۆرابا.

دایە حاجی نەنکم.. کابانی ماڵ، بە هەموومانەوە ماندوو بۆ ئەوەی دایکم ماندو هیلاك نەبێت، ئامادە بوو شەوو رۆژ نەحەسێتەوە.. سێ ژەمەی خواردنی هەر هەمووومان دەستاوی ئەو بوو، بەس کابان و مەعلان و دەستا و خۆش بوو.. چ کابانێك حەدی هەبوو وەك ئەو برنج و فاسۆلیا و گۆشت و کشمیش بەسەرنێ.. بە قەولی خزم و ناسیاوان کە دەهاتن و بەشداری نیوەڕۆخوانیان دەکردین دەیانگوت: برنج و فاسۆلیای حاجی نەخشین هێندە بەتامە ئاگات لە خۆت نەبی دەست و پەنجەی لەگەڵ دەکرۆژی. (بەزم و رەزمی کوردایەتی و ئێستگەی دەنگی کوردستان و حاجی نەخشین (نازدار) و کۆبونەوەکانی لە گەڕێکی دی وێنا دەکەم).

بابە حاجیش رۆحی لەو جێ یە بوو ئێمە پێمان لێ دادەنا.. دەست و دەروون فراوان، ناندەر وچاوتێر.. هەرچی هەبوو بە قوربانی ئێمەی دەکرد.

ئەوەی لە بیرمە.. لەو شوێنەی ئێستا تەلاری پارێزگای هەولێرە.. ریزە دوکانێك روو لە قەلاً، قاتی سەرەوەی ئوتێل.. لەتەك چایخانەی مام قادر خۆشناوی دوکانی بابە حاجی بوو، لە تەنیشت ئەویش دەرگایەکی گەورەی دوو دەری دەیبردیە مەرکەزێکی پۆلیس کە بەردەوام جمەی دەهات.

بەیانیەکیان لەتاو تام و بۆی شفتە و پیاز و تەماتە بەتامەکەی سابیری شفتە فرۆش بەگەر بابە حاجی کەوتم، چونکە هەر شەوێ وەعدی دامێ گۆتی سبەینێ زوو لە خەوێ هەستە دەتبەم شفتەی لای دوکانێ بخۆ.. ئیدی شفتەمان خوارد و ئەو خەریکی ناو دوکان بوو، منیش مەشغولی گەمەی خۆم.. لە پڕ ئەفەندیەکی کەتەی لە بنیادەم نەچوو خۆی بە دوکانێ دا کرد.

دەبێ بلێم.. بابە حاجی وەکیلی چایەی حکومەت بوو، ئەوکاتە لەبەر زەبر و زەنگی پێشمەرگە و شۆڕش، تا گوشار بخاتە سەر ناوچەکانی ژێر دەسەلاًتی شۆڕش حکومەت شەکر و چای بە رێگای وەکیلەکانی ناو شاردابەش دەکرد.. کفر بوو شەکر و چا لە بازگەکان بپەڕێننەوە و بگاتە دەستی پێشمەرگە.. بۆیە چاودێرییەکی توند لەسەر وەکیلەکان هەبوو لە دابەشکردنی شەکر و چا، کەم و زیاد وەکیل بەرپرسیار دەبوو.

کە ئەفەندیە زەبەلاحەکە بە ژوورکەوت یەکسەر بەهەڕەشە گوتی:

– حاجی چای حکوومەتی لۆ پێشمەرگەی دەنێری.

حاجی: کێ وەدەرێ ؟ شتی وا نەبووە و نابی.

ئەفەندی: تەقریرت لەسەر هاتیە.. نیو سندووق چایەت لەناوکیسەی ساواری بە دزی رەوانەی سماقوڵی کردیە لۆ ناو پێشمەرگان.

حاجی: عەفوت فەرموو.. هەموو شتەك بەحیساب و بە کتاب نییە.. ؟ وەرە

با چایەی بکێشین.

ئەفەندی: دەیکێشین.. بەس لێرە نا لە دایەرەی ئەمن دەیکێشین، ئەمن ئەمرم پێ یە دەبی هەرچی چایەت مایە بیبەم لەوێ بیکێشین، کەمی کرد ئەوا ناردیتە.. کەمی نەکرد هەر بەخۆم دیفاعت لێ دەکەم و دەبمە پشت و پەنات.

حاجی: نە زیاد و نە کەم.. ناوەکانم لەکنە.. هەرکەسە و حسەی خۆی بردیە.. قەتیش کەم ناکات.

من، هەروا تەماشا دەکەم.. ئەو ئەفەندی یە زەبەلاح و ئەقۆرایەم رۆژێك پێشتر لە کن ئەحمەدی ماتۆڕچی دیبوو لەتەیراوەی ئەو رۆژە ئەمن پاسکلەکەم پەنچەر بوو بردم تا لۆم چاکەنەوە.. لەوێ بووم ئەو ئەفەندیە هات ماتۆڕەکەی پێ بوو پێشانی وەستا ئەحمەدی دا، پێم وابی بە تەمای فرۆشتنێ بوو.

ئەفەندیەکە، سێ سندوق چای سەر مۆر و یەکێکی نیوە بەتاڵی لە ترومبێلێ بارکرد و دەست و برد بۆی دەرچوو.. بابە حاجیش مشەوەش، دەم وشك و رەنگ زەرد هەر بەغار خۆی گەیاندە مەرکەزی پۆلیسی تەنیشت تا شکایەت بکات.

هەر شەو و رۆژێکی پێچوو، ئەفەندیە زەبەلاحەکە بە کەلەبچە کراوی و سندووقە چا لەناو مسەلەحەی پۆلیسی برانە مەرکەزی.. لەوێ بانگی بابە حاجیان کرد و ئەمنیش بەگەری کەتم.. کە چووین ئەفەندی دەست بەکەلەبچە لە ناوەڕاستی ژوورێ راگیرا بوو معاونەك قسەی لەگەلێ دەکرد. معاون کە چاوی بە بابە حاجی کەوت گوتی:

- مام حاجی ئەتوو بە سندووق چایەت لێ دزرایە.. گۆتیت دزەکەش دەناسمەوە.. تەماشایەکی ئەو فیلەتەنەی بکە.. بزانە هەوە یان نا؟

بابە حاجی تەماشایەکی کابرای دەست بە کەلەبچەی کرد گۆتی:

– هەوە.. ئەو زاڵم بابە بوو بە ناوی دایەرەی ئەمن سندووقەکانی چای لەبن دەستی دەرهینام.

لەو کاتەدا ئەمنیش بە معاونەکەم گوت:

– ئەوە دوێنێ ماتۆڕەکی دزرای پێ بوو هاتە کن ئەحمەد ماتۆڕچی دەیویست بیفرۆشی.

معاون گۆتی:

___ هەنوکە دەیبەینە قوڵغی هەرچی دزیە هەمووی بە قەڵلا پێ دەگێڕینەوە..

ئیدی سندوقەکانمان هیناوە دوکانێ و دزەش قوڕی بەسەری بوو.

بابە حاجی، لەکۆتایی هەفتاکان نەخۆشیەکی کوشندەی تووش بوو، شێرپەنجە لە قوڕگی هات.. لە هەولێر نەشتەرگەری بۆ کرا، قوڕگیان کون کرد لەکاتی قسە کردن دەستی بە کونەکەوە دەگرت ئینجا بەئاستەم دەنگی دەردەهات.. دکتۆرەکەی رەوانەی بەغدای کرد، ناونیشانی نەخۆشخانەو دکتۆرێکی بەغدایێ ی دایە تا لەوێ چارەسەر وەرگری.. چووە بەغدایێ بەلاّم زۆری پێچوو هەر نەگەڕایەوە.. دایە حاجی نیگەرانی نەهاتنەوەی بوو.. ناونیشانی نەخۆشخانەکەی بەغدای دەزانی.. رۆژێك منی نێرینەی لەگەلّ خۆی برد و چووینە بەغدایێ.. بەپرس و بە ناونیشان نەخۆشخانەمان دۆزیەوە، لەناکاو لەبەر دەرگای گەورە چاومان بە بابە حاجی کەوت لە پەنایەك هیلاك و بێ هێز کەوتبوو.. چاوی بە ئێمە کەوت هەستاوە سەرپێ و بەگریانەوە لە بابەڕۆی دا.. ئەو بگریێ و ئێمە بگریێ.. ئۆخەیش بەیەك شادبووینەوە.. هێنامانەوە هەولێر.. دوو هەفتەی بە ئازار و دەرد و ناخۆشی و وشك هەلاّتی بردە سەر.. تا بەیەکجاری چاوی لێك ناو خەوی کۆتایی لێ کەوت.. وای هەزار جار یادی بەخێر.. پیاوە پەپوولەکەی ناو ماڵە قەرەباڵغەکەی مە.

## پیاز خۆر و زەمبیلی گەورە

لـە حەسـارەکەی خـوار ماڵێمـان، کـە بـەدەیان خێزانـی کەمدەرامـەت و سەرگەردان و داماوی تیادا نیشتەجێ بوون، بە ژیانێکی مەمرەو مـەژی ڕۆژانـە بەڕەنجی شـانی خۆیـان قـوتی مـاڵ و منـداڵیان پەیـدا دەکـرد، هـەر خێزانـە و ژوورێك و بە هەموانیش یەك بەلوعەی ئاو کە لە ناوەڕاستی حەوشە ملی قیـت کردبۆوەو بۆیەك توالێتیش ژن و پیاوو گەورە و گچکە ڕێچکەیان دەبەست.

ئێواران کەلەبەر دەرگای حەسارێ خڕ دەبووینەوە، ئێمەی منـداڵانی گـەڕەك هیچ نەبێت یەك و پێنج یان دە فلسمان لەباخەری بوو، دەچـووین کێکێـك یـان عەسـەلیات، یـاخود گوڵەبـەڕۆژە یـان شـەعرولبەنات، ئەگـەر هـەرنا شیشـێك فاتەڕەشمان دەکڕی و بەدەم یاری و قسـە و فشـقیات کاتمـان بەسـەر دەبـرد. کەچی منداڵەکانی حەسارێ چونکە نەبوون بوون کێشتانێ زوو لەگەڵ باوکیـان دەچوونە ئیشێ، ئێوارانیش هەرکە دەهاتنەوە ماندی و شەقی هەر ئەوەندەیان لەدەسـت دەهـات بـە ژەمـە خـواردنێکی وەك تەماتـە و روونێـك داسـەکنێن و شوکری خوا بکەن.

لەو حەسارەی مام دەروێشێك هەبوو، سرقە سۆرێکی پـرچ درێـژ، دەیـانگوت "لەسەر دەستی بابە شـێخ عەبدولکـەریمی کـەزی سـۆری دارە خورمـا تۆبـەی کردیە و بوویتە دەروێش" پەنگران بەهەردوو دەستان هەر دەگری و لە دەمـی دەکات و کرم کرم بەددان پشکۆیەکان وردوخاش دەکـات و قووتیـان دەدا، نـە دەستەکانی و نە ناو دەم و قورگیشی بەرای خوایان ناگاتێ !

ئەو مام دەروێشـە سـرقە سـۆرە کـوڕێکی هاوتەمـەنی ئێمـەی هـەبوو نـاوی (سەدرەدین) بوو، ئەو کوڕە پرچـێکی چـەور و لـووس و بەبریقـەی هـەبوو زۆر کەشخەی پێ لێدەدا و خۆی پـێ بـادەدا.. هەرکـە پـاش عەسـران لەگـەڵ مـام

دەروێشی باوکی لە ئیشیێ دەهاتەوە، دەچووە ناو حەساریێ و پاش کەمێك ئیسراحەت و جلك گۆڕین دەهاتە دەریێ، وەتدەزانی ئەوە کوڕە پاشایە، نەخێر کوڕی ئەحمەد چەلەبیە و بەغەرەتی کەتیتە ئەو حەسارەی کە خەڵکەکەی هەموو برسی و رەش و رووتن، ئێمەش هەر هەموومان حەسوودیمان پێدەبرد.

هەرواش بوو بەڕاستی ئێمەی کوڕانی گەڕەك حەسوودیمان پێدەبرد، واماندەزانی ئەو کوڕە بەهەڵە کەوتۆتە ناو خانەوادەکەی مام دەروێشە سرقە سۆرەی لە برسان مردی و رۆژێك دادیێ چ منداڵەکانی ئەحمەد چەلەبی بێت، یاخود نەوەکانی خدری پاشا یان کوڕە قۆزە پرچ سۆرەکانی دزەییان دێن و دەرێن: کاکە سەدرەدین کوڕ و جەرگی مەیە و چاوی زەمانە کوێر بێت بە غەڵەتی کەتیتە کۆشی خێزانەکەی مام دەروێشی، دەیبەینەوە لای خۆمان !

ئێوارەیەکیان، سەدرەدین بەچرچی لوس و بە بریقەی لە دەرکی حەساریێ هاتە دەریێ و بابۆڵەیەکی بە هەردوو دەستان گرتبوو زوو زوو قەمپاری لێدەدا، وەها خۆی بادەداو قەمپاری دادەگرت ئێمە واماندەزانی هەر هیچ نەبێت پاروەکەی دەستی جگە لە تەماتە و خەیار پڕە لە جگەری سۆرەوەکراوی ناسکی بە لێوان خوراو، نەخێر خۆمان پێڕانەگیرا، (غازی)یەکمان لەگەڵ بوو بیژی وەکو خۆی لە هەموو دونیاییێ قاتی بوو، لە هیکرا هەر تاوی داییێ و بابۆڵەی لەدەستی راپسکاندو هەر بەهەمان گوڕوتین خۆی گەیاندەوە لای خۆمان و پاروەکەی کردەوە.. چ ببینین ؟! پارچە نانێکی تیری گەورە و پانوپۆڕی پڕ لە پیاز ! ! ئاویێ بێنە و دەستان بشۆ.. لە هەینێوە سەدرەدینی بەدبەخت عەلەمی شکا، باق و بریقی پرچ و بوکڵە و قاقۆڵی نەماو لەقەبیشی بووە (سەدرەدینی پیاز خۆر).

لەتەیراوەی، زۆربەی خێزانەکان ئەگەرچی زۆر هەژار و داماو و کەم دەرامەتیش بووین، بەلام ئەوەندەمان هەبووە رۆژەکەی پێبەڕیێ بکەین و

گەدە و ورگمان پڕکەین، نەنکم گوتەنی " زگ پڕ بی، چ حەلوا بی چ قوڕ بی".
ژنە سەلار و جوان و ئاقڵەکانی تەیراوەی مەکرۆ و عەیار بوون، دەیانزانی
ەناو هەمووان کێ پارەی باشی پێیە ؟ کێ زیاتر دەکڕی ؟ کێ باشتر دەخوا ؟
کێ جوانتر و پۆشتەو پەرداخ ترە ؟
جار هەبووە، هەر لەو تەیراوەیەی خۆمان، وا هەڵکەوتووە خانەوادەیەك
ـشتر بخۆن و جوانتر بپۆشن و زۆرتر بکڕن. هەرکە ژنە کابانی ماڵ ئەوەی
هاموشۆی ناو بازاڕی دەکرد و شمەك و رزقی ماڵێی دەکڕی، ئەوەندە زۆری
ـەکڕی پێویستی بە زەمبیلێکی گەورەتر بوو لە چاو زەمبیلی ژنانی گەڕەك
بۆیە بەو جۆرە ماڵ و ژنانەیان دەگوت: -ماڵە زەمبیل گەورەکە.. یاخود ژنە
زەمبیل گەورەکە ! ! !

## حاجی نازدار.. نازدار بوو

بەسەرهات و چیرۆکی ئەو شێرە ژنەی ئەمە پێمان دەگوت ( دایە حاجی ) یەکجار زۆرە.

دایە حاجی، کوڕی نەبوو تا بینێریتە ناو پیاوان و شانازی پێوە بکات، کەچی هەموو کوڕە جوامێرەکانی تەیراوەی بە کوڕی خۆی و بەجەرگی خۆی دەزانی.

لە تەیراوەی.. یەکێك لە وەکرە سەرەکیەکەی ڕێکخستن و شۆڕش تاقە ژوورەکەی دایە حاجی (نازدار )بوو لە ناو ماڵی مە.

سبەینان زوو.. دوو ژوور دەکەوتنە مل ملانێ ی بیستن و ئێستگەو دەنگ و سەدا.

ژووری سمێر سۆری: ئیستگەی کوردی بەغدا و دەنگە نەرمەکەی مامۆستا مەلا عومەر مەولوود دیبەگەیی و پەند و ئامۆژگاری و قسە نەستەقەکانی، کە دەبوایە گەورە و گچکە گوێی لێ بگرین.

ژووری دایە حاجی: سەدا و دەنگی ئێستگەی (دەنگی کوردستان)، بەدەست خۆت نەبوو بە بیستنی "ئێرە دەنگی کوردستانی عێراقە " جۆش و خرۆشێك بەروحدا دەگەڕا.. هەرکە هانی هانیەکەش لێنەدەگەڕا بە چاکی گێمان لە ئێستگە بێت دایە حاجی هەزار دووعای لە تەخت و بەختی زاڵمەکەی بەغدایێ دەکرد.

هەندێ جار.. پاش نیوەڕۆیان حاجی نازدار بە خەبەری پێشتر هەموو ژن و ئافرەتەکانی کۆلانێ و دەورووبەری گەڕەکێ خڕ دەکردنەوە.. دەهاتن هەر ژنە پێچە و عەبا لەسەر بوو لە حەوشە عەبای تەسلیمی من دەکرد و بە ژوورێ دەکەوت، حاجی نازدار و عەبدولڕەحمانە رووتەش لە بنەبانی ژوورێ لە پێشوازی ژنان و حورمەی بەحورمەتی گەڕەکێ لە ئامادەباشی دابوون، ئیدی لەکنە من لەحەوشێ گردۆلکەیەك لە عەبای رەش و پێچە و نەعل و سۆلی ژنان

ڤیت دەبۆوە، لە ژوورێش جگە لە نازدار و رووتە، دەیان سەری کۆت.. بسکە ئەرە پیازی.. پرچی رەشی دوو کەرتی دەفتەری روو بە خەندە و بە ئاگا، گوێرایەڵی بەسەرهات و دوا هەواڵی پێشمەرگە و رێنمایی ریکخستن و شۆرش دەبوون.. پاش دوو سەعات کۆبوونەوە هەر ژنەو هەر خاتوونە کیسەی خۆی هەڵدەرشت و ئابوونەی خۆی لەسەر دۆشەگی پێش نازدار و رووتە دادەناو.. خواحافیز دەهاتە دەرێ و منیش مەعلانانە دەمزانی کامە عەبا هی کامەیانە و کیهان نەعل هی کێهە خاتوونییە ئەوان تاك تاك دەرۆیشتن و لە حەوشەش وردە وردە گردەکەی عەباو پێچە و نەعل مەحف دەبۆوە.. کەچی لە ژوورەوە گردی جل و بەرگ وپێڵاو و دەرمان لەلایەك و ئابوونە لە لایەکەی دی کەڵەکە دەبوو، ئەوجا دەست و برد پاش رۆیشتنی عەبدولڕەحمانە رووتە، ئێمە.. حاجی نازدار و من و دایکم و پەریزادی خوشکم دەکەتینە جولە.. کیسەی پارە بە جیا، هی جلك و پێڵاوەکان جودا، هی خۆراك و داو ودەرمانیش ئایری، هەر هەمووی سەفت دەکرا.. ئەوجا نۆرەی من بوو دەبوایە بچم بەدوای ئەمیرەی کیژی وەستا پیرەی فیتەر، هەر بەشەو دەهات و کیسەکانمان لە جێبە قوتەی پیرەی فیتەر بار دەکرد و لە چاوان بزر دەبوو، سبەینێش رەوانەکردنیان بۆ سەرەوە عایدی وەستا پیرەی فیتەر بوو.

دایە حاجی و بابە حاجی بەخۆیان کەڵکی پێشمەرگایەتیان نەبوو.. کوڕیشیان نەبوو تا بینێرنە سەرێ و بیکەنە پێشمەرگە و دڵیان پێی خۆش بێت.. کەچی بەردەوام فەخرییان بە پێشمەرگە دەکرد و دەیانگوت: کوڕەکانی شاخ، پێشمەرگە تیلاك خوارەکانی دەشتی هەولێرێ ئەولادی مەنە.. کەس نەڵێ ئەوانە وجاغیان کوێرە.

زەمان زەمانی حەرەس قەومییانە.. ماڵی مە لە تەیراوەی یەکەم خانوو لە کۆڵانی دووەمی پشت تەجنیدی یە.. رۆژەکیان دونیا کاول بوو، بووە هەرا و

تەق و تۆق.. تەیراوە تێك قژ قژا، لە پەنجەرەی ژووری سەر کۆلانێ سەیری دەرەوەمان دەکرد، سێ زەلامی جلك مەدەنی چەك بەدەستی مشەوەشم دیت لە خوارێڕا بەرە وجادەی سەرەکی بە ملا و بەو لایان دەڕوانی.. دایکم گوتی: ئەوانە حەرەس قەومین زۆر پیسن، ئەوەی پێشەوە نازانم کێ قەسابی پێدەلێن زۆر ڕکی لە کوردانە لە خوای دەوێ یێکەکی بکەویتە بەر دەستی زۆر زاڵمانە دەیکوژی.

باوکم ئەو ڕۆژی چوو بووە بازاڕ و نەگەڕابۆوە، لە پڕ لە دەرگا درا، دەرگامان کردەوە کابرایەکی رانکو چۆغە کر لەبەری جەمەدانی لەسەر بە مشەوەشی و تەنگە نەفەسی بە ژۆرێ کەت.. یەکسەر بەدڵە راوکێ و بەنواندن گۆتی:

—ئەی هاوار چم لێدەکەن، ئەمن پێشمەرگەمە و حەرەس قەومی لەدوومن، خاتری خوای بمشارنەوە. دایە حاجی یەکسەر لە دەوی وەرگرتەوە:

+کاکە چت لێ بکەین ؟ لەکێت بشارینەوە.. ئەمە هەموو حورمەین و بێ پیاوین سەرمان لە قوڕێ مەنێ.. وەرە بە سەربانێ ڕا برۆ ئەو دیوی با ئەوان عیلاجەکت بکەن.

ئیدی کابرای کر لە بەر و جەمەدانی بە گوڵینگە لە سەر ، بە قالدرمەی هەڵگەڕا بۆ سەربانێ، دایە حاجیش لە دواوە زوو زوو پاڵی بە قونی وەدەنا و لە قالدرمەی بەسەر دەخست وازی لێ نەهێنا هەتا لە سەر بانێش ئاودیوی لای ماڵی محەمەد غەفوری کرد.. کە گەڕاوە هەر ئەوەندەی گۆت:

—جاشی سەگباب وەدەزانی ئەمە غەشیمین و نایناسین.

گۆتمە دایە حاجی: ئەوە کێ بوو ؟

—بابی دایەی ئەوە حەمەی سابیری رەئیسی جاشانە، بە بیژیاتی وە دەکا دەیەوێ تووشی بەلآیەکمان بکات.

بۆ عەسرەکەی، تەیراوە هەندێك هێور بوو بۆوە.. ئەو جارەی لە لای

چایخانەی ئەحراری فارووق چایەچی بووە تەق و هۆڕ و بگرە وبەردە، کەس
ـەبووە بـرای کـەس.. هــەر بابـا بـوو هەڵـدەهات و لـەلای چـایخانەکە دوور
ـەکەوتنەوە و خۆیان دەشاردەوە لـە هیکـرا زەلامـەك خـۆی بـە مـاڵی ئێمـەدا
کرد.

دایە حاجی ناسییەوە و لێی چووە پێشیّ:

_ ئەیەڕۆ کاك هەمزە چ قەومایە.. خۆ ئەو تەقانە لە تو نەکرا.

- نازانم.. تەقەکان لەلای چایخانەی ئەحراریـەوە کـران.. بـە خـوای زەلامـەکم
ـیت لە پێش چاوی ئینزیباتەکان یەکێکی بـەرداوە.. هـەر هەنـدەم پێکـرا خـۆ
قوتارکەم.. دەمانچەم پێیە، نەوەك ببتە تەفتیش و تەحەری.

ئیدی دایە حاجی تێیگەیشت، دەمانچەکەی لێوەرگرت.. عەبای خستە سـەر و
ـەستی منی گرت و لە ماڵیّ بەدەرکەوتین، کـاك هـەمزە سـێویّ لـە پێشـمان و
ئیمەش لە دوای بە جادەی تەیراوەی بۆ گەڕەکی دۆمان بەسـەرکەتین، هەرکـە
ئورم داوە لولەی دەمانچەکە لە کونی قۆڵی عەبای دایە حاجی یەك بست ملـی
ـەرهینایە، گوایە ژنە دەمانچەی شـاردیتەوە.. زوو بـە زوو بـە ئیشـارەت تـێم
گەیانـد، دەمانچــەی بـردەوە دواوە و عەبایەکـەی بــە مەحکـەمی لـە خـۆی
وەرپێچا، کاك هەمزەی بە سەلامەتی گەیاندە ماڵێکی ئەو سەری گەڕەك.

حـەیف و مـەخابن.. دایـەحاجی بـیّ کـوڕ و بـیّ کـەس، لـە پـاش وەفـاتی
هاوسەرەکەی عەیامەك ژیا.. دڵی هەر لەلای پێشمەرگە و شۆڕش و ئێسـتگەکە
بوو، من هەرکە لە سەرەتای هەشتاکان گیرام، بە دایکمی گوتبوو:

—کیژم قەدریە هیچ قبور ناکەم فرمێسکان لۆ زاهیری برێژی و بگریی.. بـەرخی
نێرە و لۆ سەربڕینیّ باشە.. ئەویش نێرینەی مەیە.. کو کـوڕی مەیـە ئـەوهاش
کوڕی ئەو میللەتەیە.

ئای هەزار جار یادت بە خێر حاجی نازدارەکەی هەموومان.

## خێریە خێری دایەوە

ئەو فەترەیەی جگە لەخانەوادەی خۆمان کەپتر لەسێزدە کەس بووین، ماڵی مام حوسێن و عەیشە بسك سۆر و محەمەد و خێریەی کچ و کوڕیشیان لەژوورێکدا لەگەڵ ئێمە دەژیان.

جا ئەو کاتە (خێریە و پورێکی) دیم دوو کچە عازەبی ناو ماڵێ بوون و تۆغیانیان بوو، ژێر بەژێریش منافەسەیێك لەنێوانیاندا هەبوو، لەکاروباری ناوماڵ رق بەرقەی یەکتریان دەکرد و پێشبڕکێی ئەوەیان بوو کەکامەیان جوانتر و شۆخ و شەنگترن.

وا رێکەوت خێریەی عەیشە بسك سۆری کچە عازەبەی ماڵێ داخوازی هات. وەك ئەوەندە دیمەنەی لەسەر پەردەی بیرم بەتۆمار کراوی مابێت، ئێوارەیەکیان دوو سێ ژنی عەبا رەش پەیدا بوون دوانیان سەرەژن و یەکێکیان گەنج و تازە هەڵچوو، پاش دیتنی پلە خێریە و بەفێڵی قسە و پێکەنین دەست لەروومەت و سینگ و قۆڵ و باسکدان دیاربوو کیژەکەیان بەدڵ بوو، ئیدی ناوی خوایان لێهێنا و هاتنە سەر باس و خواسی داخوازی و مارەیی و پێشەکی و جل و بەرگ و زێڕ و داوا و داخوازی.

کە ئەم بەزمەش تەواو بوو، عەیشە سۆر بەپێداگیری گوتی: دەبێ خێریەش رازی بی و کوڕەی بەدڵ بی دەنا بەلاشە، لەو کاتەدا پلە خێریە لەناندین لەگەڵ دایکم و دایە حاجی خەریکی تەدارەکی چا و قاوە ئامادەکردن بوونە ژنە گەنجە داخوازیکەرەکە هەستا چووە لای ئەوان، لەگیرفانی کەوای وێنەیێکی بچووکی دەرهێنا و ویستی پێشانی پلە خێریەی بدات.. ئەویش بەهەردوو دەستی چاوەکانی دەگرت و بەشەرمەوە رووی وەردەگێڕا و سەیری وێنەی کابرای زاوای نەدەکرد.. ئیدی بەهەمووان رازییان کرد چاو بداتە وێنە و

ـوخساری زاوا ببینی.. دواجار بەتیچاو وێنەکەی بینی و گوتی:

– ئەگەر داك و باوکم رازی بن، ئەمنیش رازیم. ئەوجا بووە هەلهەلە لێدان و کەیف و خۆشی. لەماوەی یەك هەفتە پلە خێریە مارە کرا و گواسترایەوە، ماڵی زاوای لە کۆلانی ماڵی سەید ئایشی بوون، ئەوەندە لەماڵی ئێمەوە دوور نەبوون.

کات هاوین بوو، ئەوکاتە خەڵك شەوان لەسەربانان دەخەوتن، ژن و مێردە گەنج و بووك و زاوایەکانیش کوڵلەیان هەڵدەدا، ئەوجا هێواران هەرکە ژن و کچە عازەبەکان بەسەربان دەکەوتن و خەریکی جێڕاخستن دەبوون تا دۆشەك و رایەخەکان کەمێك فێنك ببنەوە، لەوکاتەدا محەمەدی مامە حوسێنی رووی ـەماڵی خوشك و زاوایە تازەکەیان دەکرد و بەتەوسەوە و بەدەنگی بەرز هەتا کیژە تامەزرۆکانی مێردکردنێ گوێیان لێبێت و سەر و دڵیان بگیرێ، بەردی خۆی رادەوەشاند و دەیگوت:

– قوربانت بم کوڵلە سۆر، خێریەی خوشکم خێری داوە.. خێر! !

## رادیۆ و فیتنەی ئاخیر زەمان

باپیرم خدر سمێر سۆر، کۆنە پۆلیسی خانەنشین بوو، وەك دەڵێن پیاوەکی مەسـلەکی بـوو، زەبـت و رەبتەکـەی لـەماڵێ بێـزاری کردبـووین، بەدەگمـەن پێدەکەنی.. هەموو دەم مڕومۆچ بوو.

تاکە پەیوەندی ماڵی ئێمە بەدونیای دەرەوە یەك رادیۆ بوو، ئەویش موڵکی ئەو کەونە پۆلیسەی باپیرم بوو، لەسەر ئەو مێزەی کەلەژووری خۆی و تایبەت بـەخۆی، رادیۆیـەکی گـەورەی دانـابوو.. شـەوان هـەتا بێتاقـەت دەبـوو ئـەوە دەست و رادیۆی شەڕ بوو، لەو ئیزاعەی بۆ ئەو ئێستگەی، لەهەواڵی کوردی بۆ ئیخبـاری عـەرەبی.. زۆر بەدەگمـەن لەسـەر گۆرانییـەك، ئـاواز و مۆسـیقایەك رایدەگرت.. بەرۆژیش بەیانیان بەهەمان دەستوور، هەر کەعەسرانیش دەچووە دەرەوە بۆ چایخانەیێك، پیاسەیەکی ناو بازاڕ.. ئەوە میلی رادیۆیەکەی لەسەر شوێنێکی دیارکراو بەجێدەهێشت کەخۆی مەبەسـتی بـوو، وەك نیشـانەیێك تـا بزانێ لەدوای دەرچوونی رادیۆکەی دەستکاری کراوە یاخود نا.

هەر کەچاوی لەماڵ بزر دەبوو، ئیدی (کچەکەی و خێریـە و هـەتا دایکیشـم) خۆیـان دەگەیانـدە پـێرە رادیـۆ و میلیـان دەسـووڕاند هـەتا دەیـانبردە سـەر ئیستگەی کوردی لەبەغدا.. جا بەکەمالی ئیسراحەت دەنگیان بـەرز دەکـردەوە و گۆیان لەگۆرانییەکانی (فوئاد ئەحمەد و تەحسین تەها و بـاکووری و شـەماڵ سائب و رەسوول گەردی و تاهیر تۆفیق) دەگرت.. ئەوەندە بەدڵ بەدیار رادیۆ و ئێستگەی کوردی بەغدایێ دادەنیشتن.. بڕواتان هـەبی دوایـی کـەدوو بـەدوو دادەنیشـتن‌و باسـی فوئـاد ئەحمـەدو شـەماڵ سـائیبیان دەکـرد وەتـدەزانی چەندین ساڵە ئەمانە دەناسن و بۆرە خزمایەتییەکیشیان هەیە.

جارێکیان لەبەدبەختی خۆیان، دوای ئەوەی تێر و پڕ گوێبیسـتی گـۆرانی و

مۆسیقا و دەنگ و ئاوازەکان بوون، بەر لەکاتی گەڕانەوەی بابە خدر رادیۆیـان کوژاندەوە کەچی لەبیریان چوو میلەکەی لەهەمان شـوێن راگرنـەوە کـە سمێـر سۆر بەنیشانە دانابوو.

ئیدی لەگەڵ گەڕانەوەی هەر کەزانی رادیۆکـەی دەسـتکاری کـراوە قیامـەت هەستا.. بووە فیتنەی ئاخیر زەمانـێ. نـەرادیۆ مـا.. نەئـەو هـەموو گۆرانییـە خۆشانەمان جارێکی دی لەماڵی خۆمان بیستەوە.

## شەوی ئەوەل و ئاخیری باوکم لەئەگلەنجە

رۆژانێك ئێمە تولاز و مێرد منداڵ و تازە پێگەیشتوو بووین، لەم هەولێرە، لەم تەیراوەیە، ئاهەنگ و گواستنەوەی بووك کەشێکی تایبەتی و تام و لە زەتی خۆی هەبوو.

ئێوارانی پێنج شەممە، لەگەڵ بانگی ، خزم و دۆست و ئەحباب خڕ دەبوونەوە و چاوەڕێی تەواو بوونی نوێژی مەغریبێیان دەکرد.. ئیدی لەسەر بانێ سەید ئیسماعیل و حاجی جەمیل قاپ قاپچی و برادەرانیان، بە دەف و دمبك و دەنگ و سەلاو و کەوا و سەڵتەیان بنەبانێیان دەگرت و مەراسیمی خوێندنەوەی مەولوودی پێغەمبەر بەڕێوە دەچوو، لەولاش.. دەستەیەکی دی گەنج و سەرچڵ لە ژوورێکی خوارەوە تەدارەکی خواردنەوە لە زەڵاتە و جاجیك بەسیرەوە و تۆکاو و مەنجەڵی تەشریب و هەندێ جار مەنجەڵی گەورەی گیپە و سەرو پێیان ئامادە دەکرد.

چ سەید ئیسماعیل و جەماعەتەکەیی و چ دینداره بەڕواڵەتەکان دەیانزانی مەراسیمی ئەوان کاتییە و زوو یان درەنگ هەر دەبی تەواو بی. ئیدی لە گەنجانی خوارەوە هەربۆ دەربڕینی جۆش و خرۆش سلاوات لێدان و لە سەرەوەش ئیماندارەکان بە ملەقوتە و بە سەیرکردنی سەبەتەی شیرینی (پاقلاوە و حەلوای بەتام و جوکلێت و بەداملی ) و دابەش کردنیان، کۆتایی بە خوێندنەوەی مەولوودەکە دەهات.

لێرەوە نۆرەی ئەگلەنجە بوو.. لە ئەگلەنجان دەبوایە واحید مەرجان و جەودەت شاکر و مستەفا رەئوف و قەسابەکەی دمبك بەدەست پێشوەختە حازر بن، ئینجا لە سەربانێ مێز دادەنران و کورسیان لە دەورە خڕ دەکردنەوە، هەینێ ماڵی زاوا بە گەنجە خورتەکانیان سێنی گەورەی پڕ لە زەڵاتە و جاجیك و تۆکاویان بەسەربان دەخست و مێزەکانیان پێ

-مڕازاندەوە.. ئیدی وردە وردە میوانەکان، ئەوانەی ئەهلی شیری شێر و سیفۆنە تاڵەکەن هەردەستە و دەوری مێزێکیان دەدا.

-و سەرو وەختە مامم ئەنوەر دۆستی ئەگلەنجە چییەکان بوو.. شەوانە ـەرەوەی شار یان لە یانە بە یەکەوە سەریان گەرم دەکرد و رەفاقەتی ـەکتریان تۆخ دەکردەوە.

-شکۆ و محەمەد ئەحمەد ئەربیلی و جەبار و جەلال حەردان ئەستێرەی ئەو ـەوە جوان و هەست رفێنانە بوون.

ـە شەستەکان.. من تازە دەمزانی گۆرانی بۆ گۆرانییەو بۆ دەبێ گوێ لە گۆرانی و مۆسیقا و بەستە و حەیران رابگرین.

ـە عادەتی هەرکە دەبووە ئەگلەنجەی پاش مەولوود خوێندنەوە، پیاوان لە سەریان ومەیخۆرەکان لە دەوری مێز خڕدەبوونەوە، لەولاشەوە تیپی جوق و مۆسیقا دادەمەزرا و لەگەڵ گۆرانیبێژەکان پێش مێزیان پڕ دەکرا لە قاپی عەرەقی مەستەکی و مەزە و دۆلکەی ئاو و پەقرەجی گچکۆکەی پڕ لە بووز.

هەینیێ.. باپیرم سمێر سۆر نانەواخانەیەکی لە ژێر قەڵا هەبوو.. باوکم و مامم، ـەلاع و نان پێوەدەر و ئەنگوتك بڕی نانەواخانەکە بوون.

هەر هەینیێ، لە کۆتایی پەنجاکان و سەرەتای شەستەکان تازە رۆڵی ژنە ـنەواکانی گەڕەکی عارەبان کز بوو بوو.. لێرە و لەوێ لە ناو بازاڕی ـنەواخانە قوت دەبوونەوە و پیاو هەویریان دەشێلا و ئەنگوتکیان دەبڕی و ـنیان پێوە دەدا، ئەم رۆڵە جوان و پێشەنگەیان لە ژنانی گەڕەکی عارەبان ـەندەوە.

هەر ئەو عەیامی مامم ئەنوەری نانەوا، ئێوارەیەکیان داوەتی ئەگلەنجەیەك ـەبێت، کە مۆسیقار و گۆرانیبێژەکان هەر هەموویان دۆست و ئەحبابی ماڵە ـزلوا بوون.

عەسرەکەی مامم ، باوکم دەباتە پەنایەك و رازی دەکات کە دەبێ ئەم شەو

لەبەر خاتری (عەدنان)ی زاوا کە برادەر و خۆشەویستی هەردووکیان بوو، ئەویش بچێتە ئەگلەنجەکە و بەشداری لە دانیشتنەکە بکات.

مەغریبێ.. لە کاتی دیاریکرا و مامم و باوکم دەچنە ماڵەکە و بەسەربانێ دەکەون.. لەوێ تازە مۆسیقا دەنگ و سەدای بەرز دەبۆوە و موتریبەکان ئەمنەمەی مەیی و مەزە و سەر گەرم کردن بوون، ئەوانیش لە مێزێکی برادەرەکانی مامم جێگیر دەبن، ئیدی پێك درووست دەکرێت و بەرز دەکرێتەوە و نۆش دەکرێت و مەزە بەتام و لەزەتەکان حەپەلووش دەکەن، لەو عانەش مشکۆ دەنگی زولاڵی و ئاسمانی بەرزدەکاتەوە و دەفەرموێ:

– لە پاش مەرگم چ فایدەیە بێیە سەر قەبرم و ئینجا بەبەستەی نەماڵم دەوێ نە گەنجی دونیا سەر خۆشەکانی سەربانێ دەخاتە هەلەکە سەما.

بەزم و رەزم گەرمتر دەبێت، مامم و ئەحبابەکانی تەکلیف لە باوکم دەکەن کە ئەویش پێکێك نۆش کات.. باوکیشم کە قەد نەیدەتوانی دڵی کەس برەنجێنێ قایل دەبێ و پێکێك عەرەقی مەستەکی خەست و خۆڵی بۆ دەگرنەوە و هەموو بەیەکەوە پێکەکانیان بەرز دەکەنەوە و یەکێکیشیان هەڵدەداتێ و دەڵێ:

–نۆش.. بەسیحەت و خۆشی کوڕی سمێر سۆری.

هەموو بە یەکەوە پێکەکان هەڵدەقوڕێنن.

بەم شێوەیە باوکم.. لەگەڵ دەنگ و سەدای مشکۆ و لاواندنەوەی قۆریات و لاوکی لێ لێ جەوێ و بەستەی دەچمە سلێمانی گۆیژەم لێ دیارە و گۆرانی یار زەینەب زەینەب و بە دەنگی محەمەد ئەحمەد ئەربیلی و گۆرانی (قەلعانن دیبندە و سەمانچ قز و نافوورە ) سەر گەرم دەکات و نەشئەیەك وەردەگرێ، برادەرانیش لەگەڵ قۆریات و بەستەکان پێك لە پێك دەدەن و پەرداخی سپی عەرەق بە قیتی دەخەنە سەر تۆقەرەی سەر و رەقسیش دەکەن.

ئیدی بەم جۆرە شەو رادەکشێ و مەی خواردنەوە و بەستە و گۆرانی و قۆریات تا درەنگی شەو بەردەوام دەبێت ئەو شەوە باوکیشم تەواو سەرخۆش

ـ مەست دەبێت.

ـی.. خۆ دەبوایە درەنگی شەو بۆ بەیانییەکەی سەعات دوو نیو تا سێ باوکم ـ مامم بچن نانەواخانە بکەنەوە و هەویر بشێلن و تەندوور ئاگر بدەن و گەرمی ـکەن، تا لەگەڵ دەرکەوتنی تیشکی خۆر مشتەرییەکان هەرکەسە و بای ـپێویستی خۆی نانی گەرم بکڕی و بباتەوە ماڵێ.

ـرەنگی شەو.. مامم فولە.. باوکم هەندۆکەك باشترە لە هیکەوە دەڵێ:

-کوڕە ئەنوەر ئەوە سبەینەیە ئەمن دەچم دوکانی دەکەمەوە و هەویری ـەشێلم و فڕنی گەرم دەکەم.. ئەتوش زۆر تاخیر نەبی دەست و برد بکە و ـمگەیێ.. باشە ؟

ـامم ئەنوەر:

-بڕۆ کاکە بڕۆ خەمت نەبی.. ئەمنیش ئەو پێکەی تەواو کەم فەوڕی ـەتگەمێ.

ـوکم دەڕوا، سەرخۆشە لە بن قەلاتێ بەرامبەر نانەواخانەکەی خۆیان سەر بە ـئوستەی شەقامەکە دەکات و پرخ و هۆڕ خەوی لێ دەکەوێت. مامیشم هەر ـەگەڵ برادەران لە رەقس و سەما و ئەگلەنجەیە.

بۆ سبەینێ.. سمێر سۆر بەرەو نانەواخانە دەچێت، وای وای چ ببینێت خۆ ـوکان قەپاتە و دەرابە هەڵنەدراوەتەوە، دەهەری دەبێ و سەر هەڵدەبڕێ چاوی بە باوکم دەکەوێ سەری بە ڕەسیفی شەقامەکە کردووە، خەوتووە، ئیدی گڕ دەگرێ.

ئەنجامی ئەو شەوە ئەگلەنجەیە و نانەواخانە نەکردنەوەیە.. مەگەر هەر باوکم بیگێڕێتەوە کە سمێر سۆر چ دکرەکی پێ کردوون !

ئیدی لەو رۆژەوە، بەڵکو لەو شەوەوە باوکم ئەمە یەکەمین و ئاخیرین جاری ئەگلەنجە و مەی خواردنەوەی دەبێت و بڕای بڕ دەمی لێ ناداتەوە.

بەداخەوە خۆی لە خۆشی ئەگلەنجەی شەوانەی هەولێرییان مەحروم دەکات.

# ئەو پێشمەرگەیەی خۆشمان دەویست

لە پەنا دیوارە ئەستوورەکەی حەساری خوار کۆلانێ، ڕۆژانە ئێمە پێنج شەشێکمان کۆدەبووینەوە و بە وەرەقەی قومار، یاری (٢١) مان دەکرد، قومار بوو لەسەر پارە، بەئەو ڕۆژانەیەی لە دایە و بابە وەرماندەگرت و خەرجمان نەدەکرد، لەوێ لە پەنا حەسارێ دادەمەزراین و قومار هەی قومار. ئەوانەی قومارمان دەکرد و لەبیرم مابن (دڵشاد و ئازادی سابیر سەماوەری و مۆفەقی مام کاکۆ خەیاتی و نامیقی پلکە ڕەحمەتەی و تۆفیقی عومەر پەڕەشوتی و غازی و ئازاد سیسرکەی برای و عوسمانی داك مەلا ژنێ و فەوزی معاون سالحی و خالیدە کۆری نەوەی حاجی مەجید قەرداری) ئینجا هەر لەسەر چیچکان و سێ سێ و چوار چوار دەورمان لەیەکدەدا و قومار گەرم دەبوو.

دەبێ بڵێم من لەگەمەی قومار زۆر شارەزا و مەعلان و بەبەخت نەبووم، بەردەوام یەکێك لە دۆڕاوەکان بووم، جاری وا بووە سێ بۆ چوار دینار لە حەوزی گەمە خڕ دەبۆوە و هەر بە خۆشم وەستا و وەرەقە دابەشکار بوومە، کەچی لە دوا چرکە کە یانزە خاڵم پێبووە و دەبوایە (دە) خاڵێك ڕاکێشم و ببمە بیست و یەك، یان هەر هیچ نەبێت لە دوو جۆکەران یەکێك بۆ من بێت، کەچی لە هیکرا (بلیەك)ی ڕەزا قورسم رادەکێشا، یانزە بە یانزە دەیکردە بیست و دوو و وەکی ڕەژووی دەسوتام و ریسەکەم لێ دەبۆوە بە خوری.. بەناچاری بە بەرامبەرەکەم دەگوت:

—کەمت نییە ؟ لە دەرچەکەت کەم ناکەیەوە؟

ئەویش دەیزانی سوتایمەو وا بۆنکروزم لێدێ.. بەتەوسەوە دەیگوت:

—هەستە خەت !!

ـەناچاری منیش دەمگوت:

-وەرە نییە !!

ـەمجۆرە بـە خـالێکی زیـادە دەسـووتام و دەمدۆڕانـد و ئـەو پـارە زۆرەی لـە
حـەوز کۆمکردبـۆوە ؟ بەدەرچـەیەکی قومارچـی بەرامبـەرم دەمدۆڕانـد و بـە
ـسیەکی نەگبەت دەهاتمەوە سەر سفر و لەقەل و کۆتر دەبووم.

ـۆر جاران میوانەکانی باوکم کە شەوانە بە دیشلەمە و مێوژە ڕەشە و گـوێز و
ئەسپ کاتیان بەڕێ دەکرد، باس و خواسی شۆڕش و پێشمەرگە و جاشـە مـل
ـشۆرەکانی نـاو شـارییان دەهێنـا گـۆڕێ، ئـەو دەمانـەی کـە بەوێنـە پێشـانی
ـدەمـەوە مـن پـۆلی سـێی سـەرەتایی بـووم، کـە لـەو مەجلیسـانەی بـاوکم و
ـرادەرەکانی دادەنیشـتم هێنـدەم پێخـۆش بـوو گـوێ بیسـتی ئـەو قسـانە بم،
هەموو هەستم دەکردە گوێ.

ئەوێ ڕۆژێ هەر لە کۆلانەکەی مە، پیاوێکی بەتەمەنی بالا مامناوەندی بەناوی
عـەزیز دەلاڵ) بـەخۆ و بەپیرێژنەکـەی لـە خانووێکـدا دەژیـان، جـار جـارە
ـەوەکانی لەگەڵ دایکیان دەهاتن و بەکاروبارەکانیان رادەگەیشتن.

ـوو کوڕ لە نەوەکانی مام عـەزیز (فـارس و هاشـم ) بـوو بوونـە رەفـیقم و تـا
ـەماڵی باپیرییان مابانەوە ئەوە لەگـەڵ مـن و لـەلای حەسـارێ یـاری و بـەزم و
ـڕەزمی خۆمان بەدڵخۆشی بەڕێ دەکرد. لەگەڵ ئەم دوو برایە (پرسیارێك) لێم
بووە مەراق ، من هەر دایکیانم دەدیت، هەرکە لێم دەپرسین:

-ئەنگۆ هەر لەگەڵ داکتان دێنە ئێرە.. ئەدی بابتان ؟

ئەوان، هەر دووکیان خۆیان لێ خەشیم دەکردم و باسـی شـتێکی دیـان لەگـەڵ
دەکردم، من هەستێکم لـەلا درووسـت بـوو بـوو کـە بـە هەوەنتـە نییـە ئەوانـە
باوکیان دیارنیە و یەقین بووم هەبێو نەبێ باوکیان لـە شـاخە و پێشـمەرگەیە،
کەچـی هـەر لـە کـۆلانێ دوو سـێ بـرادەری خۆمـان منیشـیان دەبوغزانـد و

دەیانگوت:

–نابی رەفاقەتی ئەو دوو برایەی بکەی، ئەوانە بابیان فەرمەسۆنە و لە دین وەرگەڕایە، ئەوانە مندارە شیوعینە و مەکروهە بیانحوبێنی و گەمەیان لەگەر بکەی.

ئەو دوو برایە قوتابی بوون، یەکێکیان بەیانیان و ئەوی دی پاش نیوەڕۆیان دەچوونە قوتابخانە، ئەوەی بەیانیان کە لەدەوام دەهاتەوە و پاش نیوەڕۆیان فاتەرەشی دەبرژاند و ئێمەش لێمان دەکڕی و دەمانخوارد، ئەوەی نیوەڕۆیانیش بوو بەیانیان زوو دەچوو سێنیەك لەوزینە و کێکی بەعەینەگ و گەزۆی دەهێنا و لە کۆلانان دەیگێڕا و ساغی دەکردەوە.

تەیراوە هەموو دەیانزانی باوکیان پێشمەرگەیەو لە شاخیە و لەگەڵ شیوعیەکانە، زوو زووش باوکم هەرکە لە گەلالە و ناوپردان دەگەڕایەوە هەواڵ و نامەی ئەو پێشمەرگە شیوعیەی بە مام عەزیزی خەزوری دەگەیاند و ئەگەر ئەوانیش هەر راسپاردەیەکیان هەبا باوکم دەیگەیاندە ئەو پێشمەرگەیەی کە ئێمەی مندالانی تەیراوە بەبێ ئەوەی بینیبیتمان خۆشمان دەویست، هەتا رۆژێك لەناکاو لەبەر دەرگای مالی مام عەزیز دەلالی بووە مشەوەشی و جرت و فرتی خەلکی نەناسراو و نامۆ، ئێمەش واق وڕماو لەسۆسەی ئەوە دابووین کە بزانین چ قەوماوە ؟ هێندەی نەبرد (فارس و هاشم) و دایکیان گەیشتنە کۆلانێ، ژنەی عەبا بەسەرو دایکی ئەو دوو رەفیقەی من بە بابەڕۆ و وەیشێرەو لە خۆدان خۆی لەمالی مام عەزیزی پەستا، کوڕەکانیشی بەدوایدا، لەژوورەوە بووە گریان و شین و شەپۆڕ و وا وەیلاو قوڕ پێوان و ژنانی کۆلانیش کە پێشتر لەمالەکە خڕ بوو بوونەوە شینیان دامەزراند و کۆلان و گەڕەك سەرتاپا ماتەم دایگرت.

هەینێ زانیمان، ئەو پێشمەرگەیەی کە تەنها بۆ یەکجاریش نەمان بینی و

خۆشمان دەویست، لەشەڕی دژ بە عەسکەر و سوپای داگیرکەر لە چیای هەندرێن) شەهید بووە، بۆیە زۆربەمان کوڕانی تەیراوە بووینە هاوخەم و دۆستی (فارس و هاشم)ی باوك شەهید، لە گریان و بابەڕۆماندا بۆ پێشمەرگەیەکی شەهید) کە نە دیتبوومان و نە دەماننناسی، دواتریش نەك هەر (فارس و هاشم) بەڵکو دایکیان و مام عەزیز دەلاڵ و پلکە گوریش لەلامان بوونە سومبلی بەرخودان و قوربانی وەك خانەوادەیەکی پیرۆز و قەدرگران دەمانعەملاندن.

* باوکی(فارس و هاشم) پێشمەرگەی قارەمانی حیزبی شیوعی (عەریف یونس عەزیز مستەفا ) بوو، کە لە رێکەوتی (١٩٦٦/٥/١٢) لە داستانی (هەندرێن) دا جی سەروەری لەسەر ناو گەیشتە کاروانی پڕشکۆی شەهیدانی کوردستان.

# مەلا یاسین و چایخانەکەی

هاوین و پشووی خوێندنی ساڵی ١٩٦٧، بابم نەیهێشت وەکی سارەکانی دی لەگەڵ منداران لە کۆڵانی عندۆپ عندۆپ بسووڕێمەوە و لە مارێش بێ عاری بکەم، پێی باش بوو دەست و پێ سپی دەرنەچم و فێری سەنعاتەك بم، چونکە سەنعات بازنی زێڕە. لە حەلاقیشی باشتر نەبینینەوە کە ببمە شاگردی، هەر زوو بە زوو دەستی گرتم و بردمیە دوکانەکەی حەمەدەمین حەلاقی، کە لە تەیراوەی بە (سەرتاشخانەی قوباد) بەناوبانگ بوو، لە تەنیشت دوکانی ئەنوەرە کۆر و جەعەفەری برای، لەوێ جگە لە وەستام، کوڕێکی گەنجیش سەری خەڵکی چاك دەکرد، ناوی (عەلی مام برایم) بوو.

چایخانەکەی مەلا یاسینی زراری، لە مابەینی دوکانی مە لەلای سەرەوە و کەبابخانەی مام وسوو کەبابچی، کە لەسەری ئەو جادەیەی بوو کە لۆ قەبرستانی شێخ مەلا ڕەشیدی دەچی.

چایخانەکە گەورە و قەرەباڵغ بوو، بەتایبەتی پاش عەسران هەر کە کوڕە زراری و گەردی و شێروانیەکانی وەستای قوڕکاری و لەبغ و سپیکاری، کە لەدوای ڕۆژێکی پڕ لە کار و ماندوو، عەسران بە چایخانەی وەردەبوون و دوو دوو و سێ سێ دادەنیشتن و دوای جامەك ماستاوی کەللەتەزێن و قاپەك پاقلاوەی بەشیلاوەیان دەکرد و لەگەڵ نۆشکردنیان گوێیان لە لاوکی بابێ کەریمی رادەگرت، عاشقەکان عاشقتر دەبوون و عەگید و خوێنگەرمەکانیش رژدتر دەبوون لەسەر کوردایەتی و هاوکاریی شۆڕش. هەرکە بابێ کەریمی بەخۆ و بە پیرە تەمبورەکەی دەنگی لە ریکۆردەرەکەی بنەبانێ بەرز دەبوو و (غەزاڵ عەزاڵ و بەفرباری و دهۆك سەرچیایە و خەرابۆ و دەلال دەلال و مەلۆلۆ و لۆگدی) دەچڕی، هەرچی ماندووبوون بوو لە بیریان دەکرد و ورد ورد

ـەڕژانە ناو لاوك و بەستە سۆزدارەکەی جەزیری و پاقلاوە و ماستاوەکەیان ـشتر لە قەلبی دەگەڕا.
ـچیخانەی مەلا یاسین هەر چایخانە نەبوو، مەکۆی لێك گرێدانی کوڕانی شاخ ـ شار بوو، هەرچی نامە و ڕاسپاردە و بڵاوکراوە و دەنگوباسی جوامێرەکانی ـخ و شۆڕشی ئەیلول هەبوو دەگەیشتە ئەم چایخانەیە و مەلا یاسینیش ـەستیانە، لێزانانە و بەوپەڕی نهێنی هەر هەمووی بە جێی خۆیان دەگەیاند و ـەڵام و کۆمەك و داوودەرمانی پیاوە جوانەکانی تەیراوەشی کۆدەکردەوە و هەر بە هەمان وەستایی و لێزانین و نهێنی ڕەوانەی شاخی دەکردەوە و هەموو ـرێش بە وشەی نهێنی (ئەیلولتان باش) ئەم تێکەولێکە جێبەجێ دەکرا، لەم ـرکە پیرۆزەش مەلا یاسین شاگردێکی ئازا و سەرڕاست و جەسوور هاوکار و ـوریگای بوو (گەنجۆ) یان دەگۆتێ.
ـەیانییان هەر کە ماست لە (داری شەکران و بەحرکە و گردجۆتیار و گردعارەق) بە قەمەرە شڕەکەی عەدۆی دۆرەنگێو دەگەیشت، دەستوبرد ـەستا و شاگرد ئەوەی پێویست بوو لۆ تێکنەچوونی ماستەکە ئەنجامیان ـدا. ماستی ئەو گوندانە لە بەتامیدا بەناوبانگ بوو، ماستی مەڕە کۆری هەر ـوعی نەبوو، بلئەخەس ماستە حەیاتەکەی گردعارەقی، هەموو جارێ جەماڵە ـۆر دەیگوت دەزانن لۆ ماستی ئەو گردعارەقەی لە هەموو ماستی دونیایێ ـەتامترە؟ دەیانگۆ: لۆ؟ دەیگوت: ئەمن پێتان برێم، چونکە پلە بەسێ هەر کە ماستەکە هەوێن دەکات، یەك پێکی خەست خەست لە عارەقە سەر ـەشەکەی مام ئیسرافیلی عەنکاوەی بەسەردا دەپرژێنێ، ئەدی کو چما ـەوەنتەیە لە هەموو ماستان بەتامترە؟
هەر کە ماست بە جێی و ڕێی خۆی تەرتیب دەکرا ئەوجا دوو سێنییە پاقلاوەی گەرم بە عارەبانەی سەدۆی بیژی دەگەیشتە پیش چایخانە و ـەبرایە بنەبانێ سێنییەك بە دەستی مام ڕەسووڵ پاقلاوەچی و ئەوی دی

دەستاوی مام مەجید پاقلاوەچی بوو، هەردووکیان شەڕە لەزەتیان دەکرد.
مەلا یاسینیش زۆر کەیفی بەوە دەهات، دەنگ و ڕەنگی گەلاڵە و ناوپردان و چۆمان و قەسریَ لەبەر دەستی خۆی دەگاتە تەیراوە و دەینێریتە لای حەمامی دۆمان و گەڕەکی کەناسان و فڕنی نانی مام ڕەسوولی کراو لیادی.
نێوەڕۆیەك گەنجۆ لە عانوسەعاتی خۆی نەگەڕاوە و دوا کەوت، مەلا یاسین مەشەوەش و بێ ئۆقرە، پیارەی بە بنە پیارەی دادەدا و عەجمانی نەبوو، دری ختورەی شتی خراپی دەکرد، لە هیکرا گەنجۆ وەکی بۆراقی نەجات پەیدا بوو، بەخۆ و بە کۆری پشتی خۆی بە تەختەکەی ژوورێدادا، مەلا پرسی: خانە خراپ چت بەسەر هات لۆ ئەوەندەت پێ چوو؟
گەنجۆ: وەستا بێ خەم بە هەموو شتەك بە دری توە، لۆیەش تاخیر بووم لەبەر دەرزی برینان، هەتا دختۆر عومەر شەریف لە خەستەی هاتەوە و دەرزییەکانی لۆ پێچامەوە و لەناو بوزگرانمان شاردەوە.
مەلا یاسین زراری هەقی بوو لە دواکەوتنی گەنجۆی شاگردی مشەوەش ببی، چونکە دەبوایە دەستوبرد شمەکەکانی ماریَ و ئەوەی گەنجۆ هێنایتییە چایخانەی هەمووان لە گونیەی بپەستی و توند توند بیانبەستی و حازریان بکات، چونکە شەویَ تەتەر دیَ و هەر دەلعاز دەگەڕێتەوە شاخ.
سیَ شەموان بۆ من جێژنە بوو، چونکە دوکانی حەلاقی دادەخرا و منیش ئازاد و بێ منەت لەگەڵ برادەرەکانم (مۆفەقی کاکۆ خەیانی و فەوزی معاون سالحی و ئازادی سابیر سەماوەری و تۆفیقی عومەر پەڕەشووتی و غازی و ئازاد سیسرکەی برای، لە کۆلانێ و لە پێش دەرکەی حەساریَ دەکەتینە گەمان.
جارێکیان هێوارەکەی دووشەمێ مەلا یاسین بانگی کردم:
+کاکۆ.. سبەینێ دەبی بێیە لای مامی خۆت و لە چایخانەی هاریکاریم بکەی.
—لۆ مام مەلا.. . ئەدی گەنجۆ لە کێیە؟
+گەنجۆ لە سەفەرێیە، یەك دوو ڕۆژی پێ دەچێ، ئەمنیش بە تەنێ دەرەقەتی

ـتـەكەی نایێم. لۆیی دەبێ سبەینێ بێی.
-ـەی بەسەرچا.. . بەس بە شەرتی كەبابی نیوڕانێ.
-ـوری گێ بە گوارەی بە كەبابی مەمترسێنە.. . با وەبی.
ـەوێ لە خۆشی سبەینێ و ئیشكردن لە چایخانە و شان بە شانی مەلا یاسین
ـ كەم نووستم، لەبەر دالغەی ئیشی سبەینێ و ناو چایخانە و ماستاوی سەر
ـ كەف و پاقلاوەی بەشیلاوە و كەبابی نیوڕانێ.
ـەینێ زوو خۆم گەیاندە وێ، مەلا خەریكی مەنجەرە ماستاوەكان بوو،
ـەیشی ڕاسپارد وەبەر مشتەرییەكان ڕابگەم و نەهێڵم گازاندەیان هەبێ.. .
مەـ واشم كرد.
-ـوری سەعات دە حەمەدەمینی وەستام بەژوورێ كەت، هەر كە ئەمنی ئەوها
ـت قیت قیت چایە و ئاو و ماستاوی دەگێڕم و ئاو ڕاوەستی ئەمن ڕاناوەستم،
-ـگی كردم پری دایە گوێم و چرپاندی: ها سیسی پیس، ئەدی لۆ لە دوكانێ
ـوها چوست نی؟ بە تۆپزی گوێم لە دەستی ڕاپسكاند، هەر ئەوەندەم پێ كرا
-ـە: حەزت لە چییە چایە یان ماستاو؟
ـەبەری نیوڕانێ مەلا یاسین بردمیە لای قاوەچاغی و بە پستە پست گۆتی:
ـەی لە گیرفانی شەرورات بپەستە (دەفتەرۆچكەیەكی چەند لاپەڕەیی بوو)
-ـۆ ماری عەزیز دەراری، هەر لە كۆرانی خۆتانە، بە خۆی چاوەڕێت دەكا.
ـەوەی ناو گیرفانتی بدێ و چ قسان مەكە، زوو وەرەوە ئەوجا نان و
كەبابەكەی دەخۆین.
ـی بە هەشتا و لۆی دەرچووم. لە ڕێێ لە دری خۆم گۆتم جارێ زوە
ـەكسەر ناچمەوێ، دەچم لەكن حەمە رەحیمی پایسكلچی پایسكلەكی بەكرێ
-ـگرم تێر تێر لە كۆرانی خۆمان هەتا هەورازی ماری دایە سەید ئایشێ و دایە
حەجی ڕازیە تێ دەسووڕێمەوە. پاشان ئەمانەتەكە دەگەینمە دەست مام
عەزیزی دەرار.

هەر وام کرد، بازۆ پایسکلی بازۆ لەوسەری لۆ ئەوسەری، لە پێش دەرکەی حەساریێ بە تەناش هەردەستام و تەپوتۆزم بەو ناوەی وەردەکرد و ئارەقەی رەش و شینم دەردابوو، هاتمەوە سەری کۆرانی خۆمان پۆلیسەکەی حەرەسی ماری معاون سالحی بوو رایگرتم، ئەمن بە ئەمری ئەو خوایە ئەو کابرایەم هیچ نەدەحوباند، شتەکی لە دوور دەستی بوو، گۆتی ئەوە لە توکەت، ئی تووە؟ دەستم گێرا گیرفانم بەتار بوو، درم کەوتە کوتە کوتێ. گۆتم: بببببەریێ.. زمان تێك ئارا.

گۆتی: کورم جاریێئەتۆ لۆ ئەو شتانە منداری، ئاقڵ نەبی لەکن بابت چوغلت دەکەم. دەفتەرەکەی دایەوە دەستم هەر لێم وەرگرت و پێم لێ نا چووم پایسکلەکەم تەسلیم کردەوە و گەرامەوە کۆلانێ پۆلیسی لیێ نەمابوو، ئۆخەی هەر بە غار گەیشتمە بەردەکەی مارەکەی و دەقولبابم کرد دەم و دەست مام عەزیز بەخۆی هاتەدەری، نە ئەو دەنگ و نە ئەمن دەنگ، دەفتەرەکەم لە دور دەستی نا، ئەو گەراوە دواوە و دەرکەی شیشدا، ئەمنیش هەر بە غار لۆ چایخانەی تێم تەقاند.

گەیشتمە جیێ.. .. یەك سێنی کەباب لە کەبابخانەی مام وسوو کەبابچی تەنیشتمان گەیشت، ماستا و تەماتە و پیاز و نانی گەرم شەرپیان بوو.

مەلا گۆتی: بردت؟

گوتم: بردم.

گۆتی: دەوجا وەرە ئەو نان و کەبابەت لیێ حەرار بی هەی مارەباب.

ئەو نان و کەبابەی لە چایخانەی مەلا یاسینی خواردم هەتا دەمرم تام و لەزەتیم لەبیر ناچیتەوە.

# کامێرا و گەلی عەلی بەگ و خەرمەندی رواندزێ

مەر ھەشت نۆ ساڵێك دەبووم، بابم کامێرایەکی ڕەشی سەر بە کلاوی بۆ کڕیم
ـۆکس) یـان دەگـۆتیێ.. مـەراقم کردبـوو بـزانم ڕەسمـی کامێرایەکـەم جـوان
ـەردەچێ ؟ بابیشم دەیگۆت: عەجەلەی مەکە با فیلمەکی دوازدەیـی باوێینـە
ـەر ھـەینێ لەگـەرە خـۆم دەتبەمـە روانـدزێ لـەوێ رەسمـی جـوان جـوان
ـەگرین– ( بابم ترومبێلەکی دۆج پلایمۆتی مۆدێل شەست و سێ ی ھـەبوو لـە
حەتی (ھەولێر – رواندز) ئیشی پێ دەکردوو نەفەری دەگواستەوە.
عەسرێکی درەنگ، ھەرکە بابم گەیشتەوە پێش دەرکەی ماڵێ یەکسەر دەستم
ـیە گێسك و چووم ناو ترومبێلم بۆ پاك کردەوە.. بابیشم گۆتی: ئافەرین.. با
ھەندەك بحەسێمەوە دەچین فیلمی داوێینە سەر کامێراکەت.. پاش ئەوەی بەر
ـیانم خـاوێن کـردەوە و چـوومە ژوورەوە و کـامێرا ڕەشـە سـەر بەکلاوەکـەم
ـەرھێناو قیت لە بەرامبەر بابم چەقیم.. بە ناچاری سـواری ترومبێلـی کـردم و
ـڕۆ لـۆ جـادەی مەحکەمـەی، لـەوێ لـە کـن مامۆسـتا وەعـدوڵڵای خـاوەن
ـتۆدیۆی خەیام فیلمێکی دوازدەییمان کڕی و ھاوێشـتیە سـەر کامێراکـەمان و
گۆتی: کاك عەبدوڵڵا کە ڕەسمتان گرت و خەلاس بوون گەمە بـە کامێرایەکـەی
مەکـەن نـەوەك ڕەسمـەکانتان بسـوتێ، بیننـەوە ئـەمن بـەخۆم لـە ژوورێ و
ـەتاریکی فیلمەکـە دەردەیـنم و لۆتـان دەشـۆمەوە. ئـەمن ترسـی سـووتانی
ڕەسمەکانم لەمێشکی چەقی و زۆر بە ناسکی دەستم لە کامێراکـە دەدا نـەوەك
ـشتی سندوقەکە بکرێتەوە ڕەسمەکانم عەدم بن. لە گەڕانەوەمان بەرەو ماڵێ
ـبم گۆتی: کاکە جومعەی دابێ یەکەم تڕومبێل سڕەی خۆمە پێکەوە دەچینە
ڕواندزی، بەس دوعای بکە باران نەباری.
خەنی بووم، لە کۆلان لە کـن ھـەموو برادەرەکـانم ئـیعلانم کـرد کـە جومعـەی

لەگەر بابم دەچمە ڕواندزێ.. شەوی پێنج شەممە فازیلی مام کاکۆی خەیاتی جیرانمان هات گۆتی: کاك عەبدوڵڵا سبەینێ لۆ ڕواندزێ ئەمن نەفەرم، هەندەك ئیشی خەستەخانەی ڕواندزێم هەیە (ئەو وەك یاریدەدەری پزیشکی لە نەخۆشخانەی جمهوری هەولێر فەرمانبەر بوو).

ئەوەبوو سبەینێ زوو، من و کاك فازیل لە پێشەوەو سێ نەفەریش لە دواوە بەرەو ڕواندزێ هەر کشاین هەر لەگەڵ دەرچوون نەفەرەکی پشتەوە گۆتی: کاکی سایەق وەزعی سەیتەرەی کووە؟ دەبی زۆر ماندیمان نەکەن؟ بابم گۆتی: وەڵڵا هەندە ڕۆژ چ عەیبیان نییە. هەندەك ڕۆژیش دەرێی سەی هارن بەو خەڵکەی دەوەڕن، بە تەمای خوای بابزانین کو دەبی، کە گەیشتینە سەیتەرەی سێ سەیارە لە پێش ئێمە بوون، دیار بوو یەك یەك دەچوونە پێش و کابرای سەیتەرەی ڕایدەگرتن و دەکەوتە پرس و ڕایان.. ئەمەش چاوەڕێین هەتا نۆبەمان هات کابرای پشتەوە هەزار قوڵوەلا و ئایەتەلکورسی خیند، هەر ورتە ورتی بوو.. کە گەیشتین و بابم جامی لای خۆی کردەوە.. کابراش سەری شۆڕکردەوەو بە چاوی کرپین یەك یەك سەیرێکی هەمووماني کرد.. زۆر سەیر بوو نە ئەو قسە و نە ئێمە قسە بەتوندی دەستەکی لە دەرگا داو بە مانای ئەوەی بڕۆن.. ئیدی بابم گێڕی گۆڕی و لۆی دەرچوو، کابرای دواوە گۆتی: ئەها ماخەرا ئایەتەلکورسی چتۆ بەزمی کرد.. هەردوو چاوی کۆربوون. کابرای ناوەندێ گۆتی: یاخوا سکوردیشی دەشکا.

ڕۆیشتین، لە گەروی گەلی عەلی بەگ ڕەت بووین و بەلۆفەیەك شۆربووینەوە، بابم لە پەنایەك ڕایگرتوو من و ئەو و کاك فازیل بە کامێرای بۆکسەوە دابەزین.. ئەوان لە پێشەوە و من لە دواوە، چوونە بەردەم هاژە هاژەك.. چ ببینم خوایە، شەپۆلەك ئاو لە عاسمانێ ڕا دێتە خوارێ و دەرژێتە حەوزەکی گەورە گەورە.. هیکەکم لە خۆم زانی و گۆتمە بابم:

- ئەو هەموو حەلوا قاوەیی یە چی یەو لە کێندەرێ ڕادێتە ئێرە.

- کوڕم ئەوە حەلوا نییە.. ئەوە بەفر و قوڕاوی سەری سەرێیەو لەو عاسمانەی دێتە خوارێ.. ئەوە شەلالی گەلی عەلی بەگی یە.

لە بیرمە لەوێ و لە بەردەم ڕەزەك و لە ڕۆخ پردەکی ناو گەلیش ڕەسممان گرت.

بازۆ لە هیکرا نەمان توانی چیدی بڕۆین کەوتینە دوای چەند ترومبێلەك، دیار بوو لەلای شوفێرەوە ترومبێل سەریان لە دوو یەك نابوو لە لای مە ڕەت نەبوون و بەرەو هەولێرێ تێدەپەرین..

وەختەك کابرای پۆلیس کە کارتێکی سەوز و سۆری بەدەستەوە بوو.. ڕووی سەوزی پێشان داین و کاروانی مەش بەرێ کەتن.. هەندەی نەبرد گەیشتینە جێ و ڕێیەکی کەرتکە شاخەك زگی شۆرکردبۆوە و بە عاستەم ترومبێل بەبنی دا ڕەت دەبوو، ئای خوایە ئەوە چ ڕێ یەکە.. لەوێش ڕەت بووین، بازۆ.. گەیشتینە جێ یەکی بابم گۆتی:

- ئەوەش کاولۆکان.

بەس ئەمن چ کاولکاریەکم لەوێ نەدیت پاش پەڕینەوە لەپردێك بە ئاوەدانیەك دا ڕەت بووین هیچ جێ یەکی کاولکاری پێوە دیار نەبوو.. یەکێك لەوانەی پشتەوە گۆتی:

- کاتی خۆی لە سەر ئەو پردەی پاشای گەورەیان بە دارێ وە کرد.

مەراقم کرد، پاشای گەورە کێیەو مەعنای چییە بەدارێ وەکرا.

ڕۆیشتین، بەرەو هەوراز و بەرەو لۆفە جوان و دا نسقە و ڕکەکانی ڕواندزێ.. دیاربوو ترومبێل گران و لە سەر خۆ ملی دەنا.. کە گەیشتینە دوا لۆفە بابم لەگەر منی بوو ئیشارەتی خانوێکی لەلای دەستە ڕاست داو گۆتی:

- کاکە ئێرە ماری ئیسماعیلی عەلە شێتێ یە.. دوایێ سەرەکیان لێ دەدەین.

تێپەڕین بەناو بازاڕ و هەوراز بوو سەرکەوتین فازیل گۆتی: ئەو لایە زۆر خەتەرە.. خەرەندەکە هەزاری بەرهەزاری !

بابم: بویتە عیزڕائیلی جاحێلەکانی ڕواندزێ.. حوتە حوت قەت تێر نابی.

ئەمن هەر زەندەقم چوو.. خوایە ئەو خەرەندە چ عەزیایەکە ئەو هەموو جوامێرەی خواردیە.. هەندەکی دی ڕۆیشتین لە مەعمەلی بوزی تێپەڕین هەوراز ئوتێلێکی پەرپوت ڕێك لە بەرامبەری لاماندا ناو گەراجی، نەفەرەکان دابەزین و ئەمەش هاتینە دەرێ.. کابرایەکی شەرواڵ و کراس لەبەر گۆتیە بابم:

– ها گێ بە گوارە.. ئەو مندارە دم و لموزی بە توو دەچی.. لۆ ناریێ ی کوڕمە؟

بابم: کوڕە حوسە شێت ئەوە زاهیری کوڕە گەورەمە.. هەتیم ئاگات لە زاری خۆت بی.

هەندەی پێ نەچوو هەر لە بۆ تەشقەرەی حوسە شێت لابەلا پیلی گرتم و بردمیە پشت تڕومبیلان و گۆتی:

– کاکێ هاتی داکێ گچکەت ببینی؟

–داکێ گچکەم کێ یە؟ (من بە تووڕەیی )

– وای غەریب عار.. ماخەرا لۆ نازانی باو لێرەش ژنە کادی هەیە ؟

بابم زوو هەستی پێکردوو هاتوو لەبەر دەستی حوسە شێتی قوتار کردم.

شەوێ هەر لە تەنیشت گەراجەکە، شوێنی خەوتن و حەسانەوەی شوفێرەکان بوو، لەولاش دەبووە دۆمینەو ئەزنیف و دامە.. جامیلەی شوفێر و دەنگخۆشی هەولێرێ لەگەڵ کابرایەکی باڵەکی خەریکی ئەزنیف بوون.. ئەزنیفەکە لەسەر چای هەموو جەماعەت بوو، لە دوا دەست خەریك بوو بە دیار کەوی کێ دەدۆڕێ و کێ براوەیە.. کابرای باڵەکی دەست بە پوولی ئەزنیفەوە هەستاوە سەرپێ و نەڕاند یە سەر جامیلەی دەنگ شووشەیی.

– خۆ بکرەوە.. دەنا ئەوشۆ فەوتایی، جامیلەش هەر بە هەوای خۆی هەریکردە سەر قۆریاتەکی هەولێریانە و ئەوەندەی منی منداڵ تێیگەیشتم ـسی قەڵات و یارە جوانەکەی و غەریبی خۆی دەکرد. بووە پێکەنین و بەس ـەمزانی کێ پارەی هەموو چایەکانی مەی دا.

شەوێ لە تەنیشت بابم ڕاکشام.. هەر خەمی منی بوو.. زوو زوو دەیگۆت: کاکە لە سەرت لانەکەوی دەنا سەرمات دەبی.

سبەینێ هەستاین.. بەس سرەی باوکم نەبوو.. هەتا دەوری سەعات سێی پاش نیوەڕۆ.. چووینە چەند جێ یەك:

یەکەم: هەورازی گەردە گەردێ و ڕەسمەکیشمان گرت. نازانم چی لێهات؟

دووەم: لە ڕۆخ خەرەندێ.. لەلای بەردی بووکێ لەوێش ڕەسممان گرت.. تەماشای خوارێم کرد و سەرم سۆرا وەخت بوو بەر ببمەوە بابم زوو ئامێزی پێداگرتم و نەیهێشت بکەوم.

سێ یەم: سەرێکی ماڵی (ئیسماعیلی عەلە شێتێ ) ماندا و کوڕ و کچەکان و بەخۆو بەژنی لە ماڵێ بوون،

هەندەك دانیشتین.. من لەگەڵ (خەلیل و ئیبراهیم) ی کوڕی چووینە کۆڵان و کامێراش هەر بەدەستمەوەیە.

خەلیل: ها.. هەولێری بە مریشکە کورکی ناوێری.

من: ها.. ڕواندزی کفتە دزی.

ئیبراهیم گۆتی: کاکێ ئەمە باوێ تومان خۆشە وێ.. باوێ توو و باوێ مە هەردووك دەروێشی کاکی هیرانێنە.

کە گەڕاینەوە ژوورێ.. دەروێش ئیسماعیلی عەلە شێتێ دەیگۆتە بابم:

– دەروێش عەبدوڵلا.. ئەو شریتەی حاجی عەبدوڵلای دەفژەن لە حزوری حەزرەتی کاکی هیرانێ ی پرکردیتەوە ئەمنیش لەوێ بووم.. ئەوە لە کنە

منه.. زۆرم کەیف پێ دێ.

لـه هـەموان زیـاتر لـەوجێ یـەی دەنگـی مـن دەرچـووە وارێـم.. (هـەی هـەزار ڕەحمەت لە باوێت عەبۆلەی کاکی)

بابم: عەبۆلەی کاکی کێ یە؟

ئەو: کوڕە دەگە حاجی عەبدوڵڵای دەفژەنمە کاکی هیرانێ وایرێتـێ عەبۆلـە.. ئەمنیش وە مگۆتێ عەبۆلەی کاکی. یەعنی عەبۆلەی کاکی هیرانێ.

پاش نیوڕانێ.. دیسان ئەمن و کاکە فـازیلم لـە پێشـەوە سـێ نەفـەری دی لـە دواوە.. بازۆ لۆ هەولێرێ. هەر لە لۆفەکان دەهاتینە خوارێ یەکێك لە پشتەوە هەریدایێ:

کاکی سایەق ئەگەر هەندەك پێ هەر نەینی ڕەنگە درەنگ بگەینـە خـەلیفانێ و لەوێ نەجاتمان نەبی.

– وەڵڵا کاکی خۆم.. ئەمن بەوەی ناسرایمە زۆر لەسەرەخۆ داژۆم، خۆ ئەگـەر عەجەلەت بوو هەندەك زووتر لەگەڵ ترومبێلەکی دی برۆیشتبای.. ئیدی نە ئەو دەنگ و نە بابم دەنگ.. هاتین بـەرەو هـەولێرێ، سـەبر سـەبر دونیـاش تاریـك دادەهات، لۆژە لۆژە بابم وەها سەبرۆکە و ڕێش وەهـا دوور و درێـژ و بـەپێچ و لۆفــە.. گەیشـتینە سـەیتەرەی دەرچـوون لــە شارۆچـکەی خــەلیفانێ، داری سەیتەرەکە دادرا بۆوە.. بابم گۆتی:

– وەڵڵا فەوتاین.. ئەوشۆ دەبی لێـرە لـە خـەلیفانێ بنـووین. هـەروا بـوو، لـە بازگەی خەلیفانێ دەرباز نەبووین چونکە لە دوای سەعات چواری پاش عەسرێ ڕێ قەپات دەبوو.. بەینی هەولێر و خەلیفان لە ترسی پێشمەرگە دادەخرا.

بەناچاری گەڕاینەوە ناو خەلیفانێ و لە گازینۆیەکی خۆشـی نـاو بـازار لەسـەر باوەشە ئاوەکەی هەردوولای گازینۆیەکەی دەکردە دوو چارچە ماینـەوە.. زوو بە زوو بابم چوو شوتیەکی گەورەی کڕی و خستیە ناو ئاوە ساردەکە و دەم و

ـەست شرقەی لێـوە هـات و شـەقی بـرد. دوای نـان خـواردنی ئێـوارەو تاکـە ڕـدیۆی ناو گازینۆکە گرمەی دەهات.. من دڵم توندە و خـەمی نەگەیشـتنەوەی هەولێر و باوەشی دایە و ناو ماڵی خۆمان زوو زوو گریـان قـوڕگی دەگـرتم و لـە ـۆریێ دەکولاٚم.. لە شەرمی بابم و کاکە فازیلیش زەختم لە خۆ دەکـرد. ڕادیـۆ ـەسەر ئێستگەی کوردی بەغدا بـوو، بەرنامـەی گـۆرانی داواکـراو بـوو. لەبـەر غەلبە غەلب و قسە و پێکەنین نەمزانی گۆرانی کێ داواکراوە وکێ پێشکەش بە کێ ی کردووە ؟بەلاٚم لەناکاوڕا مۆسیقایەکی بە دڵی من دەستی پێکردوو لە پڕ ـەنگێك گۆتی:

ـایە دایەی شیرینم

ـوازی خۆشی ژینم

خوا بتپارێزی دایە

هەر لە خۆشی بتبینم

ـایە دایەی شیرینم

کورس / دایە دایەی شیرینم.. .. .. .

من: لە پرمەی گریانێم دا.. ئەوەی پێشتر نەمهێشـت هەسـت پـێ بکـەن و بـە پیاوەکی تەواوم تێبگـەن نـەما و ڕووخـا و هەسـتم کـرد ئـەوانیش (بـابم و کـاك فازیل)یش لەگەڵ من دەگرین و فرمێسك لە چاوان دەسڕن.

کاك فازیل: ئەوە دەنگی مامۆستایەکە کوڕی مام خـدر مەرجانیـە.. مـام خـدر کوڕەکانی هەردووك فەنانن چ لە مۆسیقا.. چ لە تەمسیل و چ لە مەقام و چ لـە ڕەسم. وابزانم ئەوەیان مامۆستا یەحیایە.

بابم: کاکە سبەینێ چووینەوە.. لەکن عەبدولەتیف چەخماخچی شریتەکی ئـەو کوڕەی مام خدر مەرجانی دەکڕین.

زۆر بەغەریبی بەسەر داکی دا هەرگۆتیە.

لەسەر تەختەی رەق و تەقی گازینۆیەکە و لە تەنیشت یەك هەموومان نووستین، سبەینێ زوو پاش نان وماست و چا کە من دەمم لێ نەدا بەرەو هەولێری رووح شۆڕ بووینەوە.

هەر کەگەیشتینەوە ماڕێ.. ئەمن بەغاردان بەرەو دایە چووم و دایەش باوەشە بۆن خۆشە گەرم و نەرمەکەی لێ گرتمەوەو لە باوەشێی گرتم. (ئۆخەی خوایە ئەو جارەش بە باوەشی دایە قەدرییەکەی خۆم شادبوومەوە). تێر تێر بۆنی کردم و بۆنم کرد. داکم ڕووی لە بابم کرد و گۆتی:

___ جارەکی دی زاهیری لەگەرە خۆت نابەیە یەك جێ ی.

لە کامێراکەم یازدە وێنە گیرابوو یەکەکمان مابوو، بەتەمابووم لە هەولێرێ لەگەر ئازادی سابیر سەماوەری بە دوان ڕەسمەکی بگرین. کەچی کە بەپۆزەوە بەدەست و کامێرای بۆکس چوومە ناو برادەران ئازاد دیار نەبوو.. هەموو برادەران حەسودیان بەمن دەبرد کە کامێرای خۆم هەیە.. لەهیکرا شێرزادی عەزیز پاڵەوانی دەستی درێژ کرد و چرك دوا وێنەی کامێراکەی هەر لەهەوا دا چرکاند، من خەمی ئەوەم بوو زمانەی سندوقی ترازاندبی و ڕەسمەکانمانی هەموو سوتاندبی. بۆیە هەر دەستم برند کردوو کامێراکەم لە نیو چەوانی شێرزادی گیر کردوو خوێن فیچقەی کرد و بەلا ڕومەتی دا شۆڕبۆوە.

هەرکە بابم کامێرای برد و دوای یەك هەفتە ڕەسمەکانی هێناوە.. دەرچوو بە هەوەنتە سەری شێرزادی برادەرم شکاندیە، زۆر شەرمەزار و دڵ توند بووم.

## سەرتاشخانەی فوباد و حەمەدەمین حەلاق و
## عەلی مام برایم و شتی تریش !

ـە پشووی هاوینی پۆلی چوارەمی سەرەتاییم ، باوکم دەستی گرتم و بردمیـە
ـلای حەمەدەمین حەلاق و پێ ی گوت: کاکە ئەوە زاهیر ئەو هاوینەی شاگردی
ـتووە.. کوت پێ باشە ئەوها فێرە حەلاقی بکە. هەرکە باوکم ئەو قسـەی کـرد
عەلی مام برایمی جێگری وەستاشم لەوێ بوو هەموو قسەکانی بـاوکی گـێ لـێ
ـبوو، ئەو تەنها بزەیەکی هاتە سەر سمێرە قەیتانیەکەی و هیچی نەدرکاند.
ـئەو رۆژی هیچ ، شەوێ لـە خەونمـدا.. .. حەمـە دەمـین و عـەلی هـەردووکیان
شاگردی من بوون. ئـەمن سـەری موشـتەریەکانم چـاك دەكـرد.. . موسـم لـە
ـرێنیان دەدا و بە تەنتریۆ تیف تیفـەم دەدان و ئـەوانیش بـەدووان بـە گێسـك
موی سەر کاشییەکانیان رادەماری وفلچەو قۆدی کەفاوییان بەئاوی گـەرم پـاك
ـدەکردەوە چاوەڕێ ی بەخشیشیان دەکرد.

ـتام و لەزەتی خەونەکەی شەوێم ، سبەینێ زوو هەر لەگـەڵ یەکـەمین هـەنگاوم
بۆ ناو دوکانێ هـەلا هـەلا بـوو ، ئـەو رۆژی دووشـەممە بـوو.. وەسـتام گـۆتی:
زاهیر سبەینێ سێ شەممەیە ئەمەش وەکی حەلاقـەکانی دی دوکانمـان نییـە..
بەس ئەتو وەرەوە ، چونکە دەبی دوکانێ بشـۆین و خـاوێن کەینـەوە. ئـەدی
نەمگوت هەرچی لەزەتی خەونەکەم بوو بەو ئینزارەی هەمووی هەلا هەلا کرد.
وەستا حەمەدەمین موشتەری تایبەتی خۆی هەبوو.. سەری هـەموو کەسـەکی
چاك نەدەکرد، ئەوەندەش گرنگـی بـە دوکـانێ نـەدەدا ، زیـاتر متـوی گەمـەی
ئەزنیف و دۆمینەی بوو.. هەر لۆی هەرکەتبا ئاودیوی چایخانەی مـەلا یاسـینی
دەبوو کە دیوار بەدیوار بووین لەگەڵ یـەك.. لـەوێ لەگـەڵ ( ئـەنوەر زڕجـوو و
عـەزیز پەلەتیقـە و حەیـدەر بزمـارکوتی ) دادەمـەزران.. وەسـتام و پەلەتیقـە

وڵاش و لە زدی بزمارکوت و زڕجووی دەبووە شرق و هۆڕی پولان. ( گەر لەبیرم نەچی هەر ڕێك کەوی بەزمی عەنتیکەی زڕجوو و پەلەتیقەو بزمارکوت ) تان لۆ دەگێڕمەوە.

وەکی دی.. . عەلی مام برایمی وەستای دووەمم شاعیرێکی نە خویندەوار بوو ، لەکاتی دەست بەتاڵی گورینگی خڕ خڕی تەسبێحانی زۆر بە مەعلانی درووست دەکرد.. لەگەل هەندێ عاشقیش بوو. ئەو دایمەی خوای لە دوکانێ بوو هەر کوی بخێوابوایێ سەرو ڕیشی موشتەرییانی چاك دەکرد ، گەورە گچکە.. پیر و جاحێل یەك حسێب بوو.

زوو زووش لە عانی بێ ئیشی و شرقە شرقی مقەستی گورینگە خڕ کردنێ دەیگۆت:

– زوویە زاهیر دەفتەر وقەڵەمەکەی دەربینە هەتا لەبیرم نەچووە ئەو شیعرەم لۆ بنووسە.

ئەدی نەمگۆت ئەو شاعیرێکی نە خویندەوار بوو !

گۆتم ئەگەر لەبیرم نەچی بەزم و رەزمی ئەو سێ مەخلوقەتان لۆ دەگێڕمەوە. دەبی برێم: زڕجوو و پەلەتیقە و بزمارکوت هەر سێکیان ئیشی سپی کارییان دەکرد. هەر سێکیان لەهەمان کات وەستاو عەمەلەو مەستاڕچی بوون.. فەرقیان نەدەکرد هەر کامیان بەهەر ئیشەکی ڕاگەیشتبان بێ منەت بوون.. هەر سێك حەزیان لە پاقلاوەکەی مام رەسولێ پاقلاوەچی بوو لەگەلێ ماستاوە حەیاتەکەی گرد عارەقی ، بەهەر سێکیان لەگەلێ بابی کەریمی و لۆ بسکی تەڕەپیازی غەزالی شۆڕ دەبوونەوەو دەبونە تنۆکەك ئاو ، هەرسێکیش ڕکی دونییاێن لە کەباب و تکە و فەشافیشی سبەینانی جەماله سۆری رۆخ جادەی پێش چایخانەی بوو.. بەس لەگەلێ وەستام سازشیان دەکرد دوو دەبوونە وڵاش و ئەوی دی (پەلەتیقە ) دەبووە لای وەستام و گەمەیان دادەمەزراند.

هەنوکە وەختی گێڕانەوەی پەلەتیقەکی پەلەتیقەیە.
سبەینەکی زوو ، ئەوان هەرسێك لەپیش جامخانەکەی چایخانەی وەرگەڕابوونە ماست و نانی گەرمی مام کلاو لباد و چایەی گەرم ، لەبەر دەمیشیان زەلامەکی زرپەستوری پۆشتە.. کراوی بە زەنگیانە وجەمەدانی بە گورینگ لە سەر دانیشتیەو لێکە لێکە جەمالە سۆر گۆشت و جگەر و دڵ و گون و گورچیلەی لۆ دەبرژێنی و ئەویش قل قل ئاودیوییان دەکات ، هەرسێك واق ورماى بەديار زرپەستوری زار دەکەنەوە و چاوییان زەق دەبتەوە.. نە شیشەك و نە دوو نە سێ و نە هەشت و نە نۆ.. وەختەکی هەرسێك بەخۆ ێنەوە لۆ چوونە سەر ئیشێیان وەخت درەنگە.. لە هیکرا عەزیز پەلەتیقە قیت دەبتەوە بەرۆخ زرپەستوری دا دەڕوا و دەگاتە کەرخی وی ڕایدەوەشێنیێ:
هەی سەر زگت بدڕێ.. بن زگ مردی ئەوها بڕوا و رانەوەستی پشیلە گەورەکەی خۆمت لۆ دەنێرمە مارێ !
لۆ کابرای زرپۆ گێ ی لێ نابی.. شیشی گۆشتی بە عاردی دادە داو قیت دەبتەوە
–چت گۆت هەی سەی لە سەی لۆ وە دەزانی ئەمن پشیلەمە وەرگەڕایمە گۆشتی ؟
دەستوو برد بزمارکوت و زڕجوو دەکەونە مەعبێنیان و بەتکاو رجا هێخەی کورتەکی پەلەتیقەی لە دەستە خاکەناس ئاساکەی زرپەستوری دەردەینن و کابرای سارد دەکەنەوە
زرپە لەگەڵ ڕاکێشانی پشکە درکەکی گەرم وتەڕ دەرێتە پەلەتیقەی:
_ ئەتوش گیسك بای قوتم دەدای.. کوڕی بابم ئەمن نیورانان بەرخەکی هەنکی تو لەگەڵ مەرەگەی بە تەشریبی دەخۆم.
لەوێ بەزم کوژایەوە ، هەر سێك سواری جیبی حاجی کەریمی بوون لۆ سەر

ئیشیێ.. زڕجوو هێشتا هەر هەموو قەلبی دەلەرزی لەترسی زڕپۆی ، بە تورەیی گۆتیە پەلەتیقەی: کوڕە هەی سەگی سەگباب کەس نەما شەڕی ئەو گەوادەمان پێ دەکەی.. ئاخر ئەوە باش گەوادی موتەسەریفی هەولێرێیە جەنابیشت دەیکەیە پشیلە ؟

پەلەتیقە پێکەنی و گۆتی: کورە دەبڕۆ هەی زڕجوو ئەمن بەویم نەگۆت پشیلە.. ئەمن گۆتم پشیلەت لۆ دەنێرمە ماریێ.. مەخسەدم ئەو برا گەورەیەمە.. هەتا ئەگەر لەبەر گۆشت خواردنێ بە هیچ راناگاو ناتانی براژنێ رازی بکات ئەوە پشیلە گەورەکەی من حازرە.

زڕجوو کە هێشتا وەکی سەی دەلەرزی گۆتی: وەڵلا ئەگەر ئەوها تێدەگەیشت هەرسێکمانی قوت دەدا و لەسەر دونیایێ ڕەشی دەکردینەوە.

## د. شێخ عومەر شەریف لە یادەوەریمدا

پیاوەکی زۆر کەرەگەت نەبوو، باڵای مامناوەندی و تێکسمڕاو تەبەش پان و خاوەن بزە و خەندەکی زۆر تایبەت بوو، دیسان درێم، زۆر بە بەژن نەبوو لە ئەسڵ خەڵکی لای قەرەداغی سلێمانی بوو، نازانم چۆن و کەی بەخاوخێزانەوە کەوتبوونە ئەم پیرە هەولێرە، بەڵام ئەوێ ڕۆژێ و لە پێش چاوی منی مێردمناڵ، ئەوەندە کەرەگەت و بەقەلافەت و بە بەژن بوو، درێژترین پیاوی دونیایێ نەدەگەیشتە لای چۆکی خۆ ڕەنگە هەر لەبەر هەڵوێستە جوانەکانی ئەم دکتۆر و شێخە بووبێت کە ناوی (عومەر شەریف) بوو.

ئەوەندەی لە خەستەخانە خزمەتی خەڵکی دەکرد، دوو ئەوەندەش لەناو ماڵێ، بێ ئەوەی ڕوو گرژ بکات، بێ بەرامبەر هەموو دەمێ دەست و مقەست و دەرزی و داودەرمان و شرووبی شەڕ بوو.

ئەم شێخە زۆر عەجایب بوو، لە پێناو شۆڕش و کورد نازانم لە کێ و بە چ ڕێگایەك ئەو هەموو حەب و دەرزی و دەرمان و لەفاف و لۆکە و تەنتریۆیەی پەیدا دەکرد و دەینارده شاخ بۆ پێشمەرگە، لەکن دۆست و ئەحبابانیش دەیگوت: دەزانم خراپە، بەڵام من شانازی بەو خراپەیەوە دەکەم.

دکتۆر عومەر گورێی ژنی، دوو کچ و دوو کوڕیان هەبوو (گوڵاڵە و عادیل و عامرو هەڵاڵە)، عومەر و گورێ بۆ ئەم چوارە ژیانێکی پڕاوپڕ لە خۆشی و شادییان ساز کردبوو.

وەکی ئەوشۆ لە بیرمە، نیوە شەوێك حەسەن قەردار بە پڕتاو هاتە ماڵێ مە، هاتبووە دوو دایە حاجی نەنکم، چونکە ژنەکەی لە ئان و ساتی منداربوونە، کەچی نەنکم بە سەفەر چووبووە ڕانیە، قەردار ڕەنگی وەکی قاقەزی سپیی لێهات و نەیدەزانی چ بکات. داکم گۆتی:

لۆ ناچی دختۆر عومەری ببەی.. .. . مێردەی سەرلێشیواو گۆتی: بەختە ڕەشەکەی مەیە، دایە سەید ئایشیش لۆ مامانی ڕۆیشتییە و ئەو مامانەی تەنیشت ماری سەعدییە لۆریش نەخۆشە، گۆتی ناتانم لەناوجێی بێمەدەرێ.

ئیدی داکم هانی دا بچیتە دوای شێخ عومەر و پێی گۆت: ئەو پیاوە هەر دکتۆر نییە شێخیشە، هەتا برێی پیاوێکی بە شەرەف و بە نامووسە، بڕۆ بیهێنە هەتا ئەنگۆش دێنەوە ئەمن دەچمە مارینگۆ و ئاگام لە شوکریەی دەبی.

لۆ سبەینێ داکم گێرایەوە کو ئەو شەوە شێخ عومەر بووە بە بۆراقی نەجات و دایك و کۆرپەکەی لە مەرگێکی موحەقەق ڕزگار کرد.

شێخە دکتۆرەکەمان ئەوەندە عاشقی کورد و شۆڕش بوو، جار جارە دەمی لە شیعری بە کێش و سەرواش دەدا.. . بەیداخ (ئاڵا) نموونەیەکە لە شیعرێکی تەژی لە هەستی کوردایەتی:

بەیداخ

بـــژی بـــە بـــەرزی بەیـــداخی جـــوانم
لـــە پـــاش خـــوا تـــۆی هێـــزی ئیمـــانم
بـــژی بـــە بـــەرزی لـــە هـــەوا بـــۆ دوور
بـە سـەیری چـاومان پـڕ ئـەبێت لـە نـوور
بـــژی بـــە بـــەرزی دائـــم بـــۆ ولات
لـــە کـاتی نزمیـــت خـــۆم ئەکـــەم فیـــدات
بـــەرزیت نیشـــانەی ســـەرکەوتنمانە
نیشـــانەی یێکیـــەتی و رێککەوتنمانـــە
هـــەر بـــژی بەیـــداخ هـــەر بـــژی ولات
بەرزیتـــە نیشـــانەی نـــەجاتی ولات

ئەدی منداره چوار ساڵانەکەی عەبە ملدرێژی، کەلا شووشەکی گەورەی قووت دابوو، زۆری نەمابوو بخنکێ، بە پەلە گەیاندییە بەر دەستی دکتور عومەری.
عەبە: دختۆر بە قوربانت بم شتەك لە قورگی گیر بووە وەختە بخنکێ، منداری تەنگەنەفەس لە رووحدانێ بوو، هەر چوار پەلی دەکوتا. دکتۆری شێخ، بانقە بە شەرەفەکەی شۆڕش و کوردایەتی، دەست و برد مندارەکەی لە باوەشێ کرد و بردییە ژووری دەزری لێدان. هەندێ برێی یەك و دوو کەلا شووشەی لە قورگی دەرهێنا و فڕی دایە بەر پێی عەبە ملدرێژ و مندارەکەش قیت بووەوە.
عەبە: چەند زوو ئەو کەلا شووشەت لە قورگی دەرهێنا؟
د. عومەر: بە (پێکەنینەوە)
عەبە گیان منداڵەکەت ملی کورتە، خۆ وەکی ملەدرێژ و بامییەکەی تۆ نییە، کەلا دەرهێنانیش پیاوی خۆی دەوێ، ئەوە سڕوئەلمیهنەیە.

## ( جبووری )یکی پێشمەرگە و ئەفسەرێکی دۆست

ئەو کاتانەی باوکم لە ڕێگای (گەلاڵە–هەولێر) بە قەمەرەکەی شۆفێریی دەکرد و نەفەراتی دەهێنا و دەبرد، ڕۆژێکیان زوو هاتەوە، بینیم لەگەڵ دایکم بە چرپە دەدوێ و منیش بەبێ ویستی خۆم گوێم لە قسەکانیان بوو.

–قەدە.. .. . ئەوڕۆ ناچمە ئەولای، دەچمە موسرێ ڕەنگە یەك دوو شەوم پێ بچێ.

+لۆ دەچی؟ خێرە؟ خۆی چ نەبووە؟

–نا نا هیچ نەبووە، کاکۆ ڕای سپاردم بچم لەوێ نەفەرێکی عارەبی زابت هەیە بیهێنمە هەولێرێ و لێرەش بیگەیەنمە گەلاڵەی.

+ئەوجا کاکۆی فەلە کەسی بە دەست نەکەت، ئەو ئیشە خەتەرەی بە تو سپارد؟

–کچێ نا نا خەتەر نابی، لێرە دەچمە موسرێ، لەوێش کە کابرای عارەبم هەرگرت، لە لارێ و بە دەشتێ شوڕ دەبمەوە لۆ مەخمووری، بە حەول و قوەتی خوای گەورە یەك ڕۆژی دی لێرە لە ماری خۆمان برنج و فاسۆلیای دەرخوارد دەدەین.

ئەوە بوو باوکم چووە موسرێ، بەڵام دوو شەوی پێچوو هەر نەهاتەوە، دایکیشم پرتە و بۆڵەی دەست پێکرد و دەیگوت:

–ئەو پیاوە هەتا سەری خۆی و سەری مەش بە فەتارەت نەدا لەخۆی ناگەرێ.

ئاگام لێ بوو بە دزی لە ژووری خۆیان دەگریا و دوعای دەکرد و لەخوا دەپاڕایەوە، کە مێردەکەی بە سەلامەتی بگەڕێتەوە، سێیەمین ڕۆژ تازە تاریك داهاتبوو، بە هۆڕنی ترومبێلە دۆجەکەی، هەردووکمان، من دایکم بە غاردان و

بــە پێخواســی دەرپەڕینــە دەرێ.. . چ ببیــنین، ئەفەندییــەکی کەشــخە لــە قەمەرەی دابەزی و عەینەکێکی ڕەش لە چاو، باوکم بە (تفـەزەڵ تفـەزەڵ) بـە پێش خۆیدا و بردمانە ژوورەوە.

شەوێ پاش خواردنی برنج و فاسۆلیایەکە، ئینجا زانـیم ئـەو ئەفەندییـە نـاوی (جەمیل جبووری)یـە و ئەفسـەرە لـەناو سـوپای عێـراق و هـاتووە بچـێتە نـاو شۆڕش و ببێتە پێشمەرگە بۆ بـەیانی بـە دۆجـە جوانەکـەی بـاوکم (جبـووری) گەیەنرایە گەلاڵە و تەسلیم بە کاکۆی فەلە کرا.

هەفتەی دواتـر و جـارێکی دی بـاوکم چـووەوە مووسـڵ، تـا هاوسـەر و منداڵـە گچکۆکەکەی ملازم جەمیل جبووری بێنێ و بیانگەینێتە ناو شۆڕش.

هەر کـە ژن و منداڵەکـە گەیشـتنە مـاڵی ئێمـە، ژنـە بـۆ چـوونە گەلاڵـە هێنـدە بەتالوکە نەبوو، بە ڕۆژ لەگەڵ دایکم بـازاڕی دەکـرد و پێداویسـتی مـاڵی نـوێی دەکڕی و بە شەویش هەموو لە دەوری کۆ دەبووینەوە، ئەو بە عەرەبی قسەی دەکرد و ئێمەش بە کوردی زۆر چاکیش لە یـەکتر حـاڵی دەبـووین، بەتایبـەتی من و پەریزادی خوشکم نانمان کەوتە ناو ڕوونی و خەنی بووین، چونکە ژنەکـە مامۆستا بوو، شەوان وانەکانی بیرکـاری و عـەرەبی بـۆ دەنووسـین، کیـژە دوو ساڵانەکەی یان لە باوەشی من بوو، یان لە ئامێزی پەریزادی، بە نۆرە هەر کـە سەعی بە من دەکرد، کۆرپەکە لە باوەشی خوشکم و کە نـۆرەی منـیش تـەواو دەبوو، کیژە دەهاتە باوەشی من و پەریزاد دەچووە بەر دەرسێ.

سێیەمن ڕۆژی هاتنی ژنەکە بوو، ئێـواران دایـە حـاجی بـە نهـێنی و لـە ژووری بنەبانێ رادیۆی دەکردەوە و گوێمان لە دەنگی کوردسـتانی عێـراق رادەگـرت، ئەو ئێوارەیە و لە بەشی عەرەبی، چاوپێکەوتن لەگەڵ ملازم جـەمیل جبـووری تازە پێشمەرگە پـەخش کـرا، قرووقـەپمان لـێ کـرد و گوێمـان ڕادێـرا، ژنـە لـە هەموان پتر و هێدی هێدیش فرمێسکی دادەباراند، نازانم لـە خۆشـیی ئـەوەی

بوو، کە گوێی لە دەنگی مێردەکەیەتی، یان بۆ چارەنووسی نادیار و دواڕۆژی بزری خۆیانە وا بەکوڵ دەگری.

پاش ئەوەی هەموو شتێك جێبەجێ کرا، بەیانییەك دایکم و ژنە عەرەبە موسراوییەکەی هاوسەری ملازم جەمیل جبووری و کۆرپەکەی لە دواوە سمێرسۆری باپیرم لە پێشەوەی قەمەرە ناوی خوایان لێ هێنا و بازۆ بۆ گەلاڵە، پاش عەسرێکی درەنگ ژن و کیژە گچکۆکەیان تەسلیم بە خانەخۆی کرد و بۆ ڕۆژی دوایی گەڕانەوە پیرە هەولێرێ.

دوکانی بابە حاجیم لە ژێر میوانخانەی (سەفین)ی بەرامبەر تەلاری مەحکەمەی بوو، زۆر جاران و لە پاش عەسران، کە دەچوومە لای، پیاوێکی عارەبی زۆر ڕەشی کەتەی لچولێو ئەستووری دیشداشە لەبەر لەلا دادەنیشت و چایەی شیرینی فڕ دەکرد، سەیرەکەش لەوەدابوو، نە کابرای عەرەب کوردی دەزانی و نە بابە حاجیش ئەو عەرەبی زانە بوو، کە بتوانی لەگەڵ پیاوەکە قسەی پێ بکات، کەچی ڕۆژ بە ڕۆژ جار لە دوای جار پەیوەندیی و دۆستانەیان بەتێنتر دەبوو و زیاتر یەکتریان خۆش دەویست.

کابرای عەرەبی ڕەش و لچولێو ئەستووری دیشداشە لەبەر، کە هەر سپێتی چاوە زەقەکانی و ددانە شاش و واشەکەی سپی سپی دەبریسکانەوە، نەمدەزانی چ کارەیە و بۆ لە هەولێرێ و لە ئوتێل (سەفین) دەژی، هەتا بەیانییەکیان لەگەڵ بابە حاجی لەناو بازاڕی هەوراز دەبووینەوە و لە پڕ دەستی گرتم و لای دایە مەرکەزی پۆلیسی تەنیشت مزگەوتی شێخەڵا و چووینە ژوورەوە و لەوێش خۆی گەیاندە ژوورێك، هەینێ زانیم کابرای عەرەب معاونی پۆلیسە و خەڵکی بەسرەیە وەك سزادراوێك گواستراوەتەوە هەولێر و لەو بنەکەیە و لەم ژوورە بەبێ ئیش و بێکار ڕۆژانی وەزیفەکەی بەڕێ دەکات.

یەکەم ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان بوو، لەسەر داوای بابە حاجی، سەفەرتاسی ماڵێ

پڕ کرا لە برنج و شلە و گۆشت و کشمیش، نانی تیری تەڕ کرا و درایە دەستم و بردمە ئەو ژوورەی ئەفسەرە پۆلیسە ڕەشەکە بەسرپاییەکەی لێ بوو لە ئوتێل سەفین، هەر کە سەفەرتاسەکەم لەسەر تەپلەکە بچووکەکەی تەنیش قەرویلەکەی دانا، کابرا لەسەر جێگا و سەر لەسەر سەرین چاوی کردەوە و منی بینی، گوتی: شلونك ظاهر، عیدك مبارك.

ئەوەندە بە لچە ئەستوور و دەموچاوە ڕەشەکەی حەپەسام هیچم بۆ نەگوترا و هەر بە غاردان لە ژوورەکەی دەرپەڕیم و گەڕامەوە ماڵێ، هەرکە لێیان پرسیم: ها چیت کرد؟

خواردنەکەت برد؟ من وەڵامم دەدانەوە و لاسایی ئەفەسەرە بەسرپاییە قوڵەڕەش و ددان سپییەکەم بۆ دەکردنەوە، کە چۆن لە ژێر بەتانی سەری لێ دەرهێنام و پێی گوتم:

-شلونك ظاهر؟

بابە حاجی و ئەوانیش بە لاساییکردنەوەکەم تێر پێ دەکەنین و خەنی دەبوون و زوو زووش پێیان دووبارە دەکردمەوە، ڕەنگە ئەمە یەکەمین لاساییکردنەوەی من بووبێت لە بواری نواندن.

## مەرگی زەماوی هەموومانی گریاند

هەر کە گفتوگۆی شۆڕش و حکوومەتی بەعس بێ ئەنجام کۆتایی هات، عەلی مام برایمی وەستام لە هەموو گەنجەکانی تەیراوەی مشەوەش تر بوو، ئاخر ئەو هەم موتەخەلیف و هەم فیراری عەسکەریش بوو، لە رۆژگاری مفاوەزات پسولەی ( عدم التعرض ) لە تەنکەی باخەری نابوو بێ منەت لە جادان دەسوڕایەوە. دەمە و عەسرێکی گەرم عەسکەری بێری سۆر کە (ئینزیباتیان) دەگۆتنێ وەك شێرە کلۆ بەناو بازار و جادەی تەیراوەی وەربوون بە لۆریەکی عەسکەری هاتن و دوو لۆریشیان بە بەتاڵی لە دوابوو بۆ گرتییان. هەرکە دابەش بوون عەلی برایمی لە دەرەوەی دوکانێ بەپرتاو خۆی بە ژوورێ دا کرد و لە قوژبنێ گیرسایەوە و وەك شەق شەقەی دەست منداڵێکی ساوا دەلەرزی. من زوو بە زوو هەستم پێکرد ویستم بچمە دەرەوە تا بزانم چ باسە، ئەو خۆی لێ تورە کردم و گوتی: گلۆپەکان بکوژێنەوە و لە کن دەرکەی دانیشە تەماشای لای من نەکەی.

وام کرد ، تەنانەت تەماشای لای ئەویشم نەکرد و رووم لە دەرەوەم کرد، بینیم ئینزیباتێکی رەش و کەڵەگەت رێك بەرامبەر دەرگای جامخانەکەمان پشت لە ئێمە چەقی، لەم لاو لەو لاش هەر عەسکەری بێریە سۆر بوو گەنج و مێرد منداڵیان بە شەق و زللە دەخستە ناو زیلەکان، چاویان سۆر سۆر بوو بوو، لە پر ئەستێرە لە شانەکە لە چایخانەی مەلا یاسین ئاو دیو بوو بەرەو لای ئێمە وەرسوڕا.. هاتە لای ئینزیباتەکەی بەردەم دوکان.. ئینزیبات سەلامێکی بۆ کرد و بەگوێیدا چرپاند. ئیدی ئەستێرە لە شان لە دوکانی ئێمە رەت بوو بەرەو دوکانی ئەنوەرە کۆر هەوراز هەڵکشا. ئەم بگرەو بەردەیە هەر دە دەقیقەیەکی پێچوو، ئیدی ئەوان خەریکی خۆ خرکردنەوە بوون

ئینزیباتەکــە دەرگــای ئێمــەی کــردەوەو بــە ژوور کــەوت، روو لــە وەســتاو بەزەردەخەنەوە بەعەرەبی گوتی:

مەترسە.. من خەڵکی بەسرام.. کوردم زۆر خۆشـدەوێ هـەتا ئـەمن لێـرە لـە واجب بم تۆ ترسی هیچت نەبێت.

ئیدی نەك عەلی وەستام بەڵکو منیش لە خەنی خۆشیان نەماندەزانی چ بکەین و چ بڵێین !

عـەلی شـاعیری وەسـتام دوو رەفیقـی زۆر نزیکـی هـەبوو زوو زووش دەهاتنـە دوکان و لەکاتی دەست بەتاڵی لەگەڵ عەلی وەستام دەکەوتنە وتووێژ.. باسـی هونەر و گۆرانی و خەتخۆشی و عەشق و راوە کچیان دەکرد، عەلی وەستام هەر دەیهێنایـەوە سـەر تایـەر تۆفیـق و ئـەوهای وەسـف دەکـرد و بـە دەنگەکـەی سەرسـام بووگەیشـتبووە رادەی پەرسـتن. ئـا بـا بڵـێم رەفیقـەکانی وەسـتام هەردووکیان خۆشنووس بوون ئـەو زەمـانی بـە خـەتات ناویـان دەبـردن، وریـا هەرکی و عەزیز زەهاوی، هەرسێکیان هاوتەمەن و کورد پەروەر و هونەردۆست و عاشق بوون.

رۆژێکیان لە دەرەوە تەپوتۆز و خۆڵبارین بوو، عەلی وەستام گوتی:

– زاهیر هەستە دەرکەی پێوەدە با تۆزو خۆر کۆرەمان نەکات.

منیش بەپەلـە و بـە هـەموو هێـزی خـۆم دەرگـا کراوەکـەم راکێشـا و گـرم بـۆ پێشـەوە پێمـوەدا، تومـەز دەرگاکـە شـلە و لێـك دەتـرازێ بـە لایەکـەی تـری جامخانەکە کەوت و جامەکان هارەیان کردو دونیا هەژا. وەسـتای گـەورەم لـە چایخانە دەرپەڕی و هەرکە چاوی بەو دیمەنەی جامخانە شکاوەکە کەوت شێت و هار بوو لا جامخانەیەك بەساغی مابوو ئەویشی شکاند. دواتـر خـەڵك لێمـان کۆبوونـەوەو وەسـتایان سـاردکردەوە و بڕیـاردرا سـەر لـە نـوێ جامخانەکـە دروسـت بکرێتـەوە.. وایـان کـرد جـام بەسـترا، دەرگـا شـل و شـۆقەکە

توندکرایەوە.. مایەوە وەك جاران لە سەر پارچە جامەکەی ناوەراست بنوسریّ (سەرتاشخانەی قوباد )هەر واش رێکەوتن رۆژی سیّ شەممە کە پشوومان بوو ( وریا و عەزیز ) بێن و بەخەتە خۆشەکەیان ئەم ئەرکە جیّ بەجیّ بکەن.

ئەوەبوو رۆژی پێشتر منیان نارد میوەو بیبسی و کێك و محەلەبیم کری و هێنامەوە، بۆ سبەینیّ هەردووکیان ( زەهاوی و هەرکی ) هاتن بەخۆ و بە فلّچە و بۆیاغ و ئەدەواتی خەتاتی.. عەلی وەستاشم یەك مەنجەلّ شۆربای برنجی هینا بوو، زۆرم پیّ سەیر بوو. دوێنیّ وەستام گوتی: لۆ نیوڕانیّ کەبابتان لۆ بانگ دەکەم خەمی زگتان نەبی.

کەچی وا مەنجەلّێك شۆربای هێناوە، عەجایب.. ئەوان دەستیان بە ئیش کردو من و وەستاشم هاوکارییان بووین وەك بەردەست چاوەروانی فەرمان بووین. جار جارە بۆ پشوو دادەنیشتن، هەرکی میوەی دەخوارد، کەچی زەهاوی دەمی لیّ نەدەدا.. وریا هەرکی کێکی تام دەکردو بیبسی هەلّدەقوڕاند.. عەزیز زەهاوی تەنها جامە ئاوەکی نۆش دەکرد و دەستیان بە ئیش دەکردەوە. عەجایب زەهاوی بۆ دەم لەم شتانە نادات، بۆ نیوەرۆش سێنیەك کەبابمان بۆ هات و ئەوان دەستیان پاك پاك شووشت و وەستاشم شۆربای ناو مەنجەلی لە قاپێکی بەلەم کردو لەبەردەم زەهاوی دانا. ئێمە هەتا مڕ بووین کەبابمان خوارد، ئەویش چەند کەوچکێك شۆربا و هەستایە سەر پیّ.

دواتر زانیم عەزیز زەهاوی خەتات نەخۆشی گەدەی هەیەو شەوو رۆژ بە ئازارەکەی دەتلێتەوە.. زەهاوی کوڕە گەورەی عەریف رەشیدی بوو، لە ئەسلّدا گەرمیانی بوون، کاتی خۆی بە پۆلیسی دەکەونە هەولێر و تا ئیستاش لە تەیراوەی دەگوزەرێنن، زەهاوی دەسگیراندار بوو، زۆرجار گەر بیانویستبا تورەی بکەن پێیان دەگوت: کوڕی خەجە هاری.

دەسگیرانەکەی مالّیان لە کەرکووك بوو، ئەو زوو زوو دەچووە سەردانی کە

دەگەڕایەوە بۆ هەرکی و عەلی دەگێڕایەوە کە چییان کردوەو چییان وتووە.
ماڵی عەریف رەشیدی باوکی زەهاوی لە سەرووی ماڵی ئێمەو لە هەورازی مزگەوتی حاجی مەجید قەرداری بوو، نیوەڕۆیەك بۆ نان خواردن دەچوومەوە، کۆڵان شڵەژا بوو.. وتیان عەزیز خەتات لە کەرکووك مردووەو تەرمەکەی وا لە رێگایە دەیهێننەوە.. بەڕاکردن خۆم گەیاندە لای ماڵیان کۆڵان کەسێکی دی نەدەگرت.. خەجەی دایکی زەهاوی لە ناوەڕاستی کۆڕی شین گێڕان لە خۆی دەدا.. بە دوو مشتی توند لەبەرد گرتوو گرموهۆڕ سنگی خۆی دەکوتی و زەهاوی و دەسگیرانی و خەتاتی و تەیراوەکەی دەلاواندەوەو ژنەکانیش هۆڕ هۆڕ دەگریان، هەر بە غار گەڕامەوە دوکان، عەلی و وەستای گەورەم و وریا هەرکی لەوێ بوون ئەوها دەرگام کردەوەو خۆم بە ژووریٚ دا کرد خەریك بوو وەك جارەکەی دی جامخانە هاڕە بکات.. خۆم بە عەرزی داداو بە قلپی گریانەوە گوتم:
-زەهاوی.. زەهاویە جوانەکە مرد !
ئیدی هەرهەموومان بۆ مەرگی ناوادەی زەهاوی جوانەمەرگ تێر تێر گریاین، وریا هەرکی گۆتی:
-دەمزانی دەمری.. چونکە سەرەتانی مەعیدەی هەبوو.. بەلاٚم جاریٚ زۆر زوو بوو.. بەداخەوە.

## ئەفەندی سیدارە لەسەر

پــۆلی دووی ســـەرەتایی بــووم لەقوتابخانـــەی مـــەریوان.. ســـبەینەیێك ئەفەندییێکی درێژ و باریك و سیدارە لەسەر سندوقێکی وەك باوڵی بەدەستەوە بــوو هاتــە قوتابخانەکــەمان، گوتیــان خــدری نــاوە و هــاتووە بــەدەرزی لێــدان بمانکوتی.

ئەوەبوو پۆل پۆل ریزیان کردین و مام خدری(*) دختـۆریش یـەك یـەك سـەر شانی دەکوتاین و دەیگوت:

– موبارەکت بی.. سبەینێ ئەگەر تات لێهات مەترسێ.. هیچ نییە.

دانەنیشت هەتا هەموومانی کوتا، من لەماڵەوە تایەکی قورسم گـرت.. هـەتا شەو درەنگانێك لەبەر جێی دەرزی ئەستور و بەژان خەوم لێ نەکـەوت.. بـەڵام بۆ بەیانی نەتا مابوو نەژانی سەرشانم.

هەرچەند رۆژێك پاشتر، سێ چوار ئەفەنـدی پەیـدابوون، گوتیـان هەرکـەس لەجێی خۆی دانیشێ، ئەوانە هاتوون (شیر)ی وشك دابەش دەکەن.. هەروا بوو ئاقڵ ئاقڵ دانیشین، بەشـی مـن لەشـیرە وشـکەکە بنـە گوێنیـەك دەبـوو، ئـای خودایـە ئـەوەی چـۆن بگەینمـەوە ماڵـێ.. دواجـار مامۆسـتا (عەبـدولڕەحمان قەساب)ی بەڕێوەبەر بڕیاری دا هەر قوتابیەك لەپۆلی شەشەم یارمەتی قوتابیە بچـووکەکانی وەك ئێمــە بـدەن و شـیرەکەمان بـۆ بگەیێننــە ماڵــەوە.. ئێمــە بەپێشیان دەکـەوتین و هـەرتك هـەرتك ئـەوان بەدوامانـدا هـەتا ماڵـەوە گونیـە شیرییان بەشان دا دەدا و لەبەر دەرگای ماڵێ بەعاردیان دا دەدا و دەڕۆیشتن.

(*) مام (خضر وادی) رەوانشاد، ئەوکاتە فەرمانبەری تەندروسـتی قوتابیـان بوو لەقوتابخانەکان دەگەڕا و دەرزی دژە نەخۆشییەکانی ئەوکاتی لـەقوتابیان دەدا.

## شەهید نەفاسە

جاروبار پیرەژنێکی نوورانی و خوێن شیرین و قسە خۆش و سادە دەهاتە ماڵمان.. پێمان دەگوت (پلە هەمین )، ئەو پلە هەمینە کورپژگەیێکی لەگەڵ دەهات لە تەمەن ئاوزەی من بوو ناوی حەمە سدیق بوو،

سەرەتا وامدەزانی حەمە سدیق کوڕی ئەو پیرێژنەیە، دوایی دایکم تێیگەیاندم کە حەمە سدیق نەوەی پلە هەمینیە، کوڕی کوڕیتی و باوکی عەیامەکە مردیە و دایکیشی هەر زوو بە زوو مێردی کردەوە و ئەو منداڵەشی بەسەر پلکە هەمینی دا بەجێ هێشت.

هەرکە پلکە هەمین و حەمە سدیق دەهاتنە لای مە، من و حەمە بەیەکەوە دەچووینە کۆڵانێ لەگەڵ منداڵان دەکەوتینە ناو دونیای گەمان.. هەرکە منداڵێك قوتابخانە و خوێندنی دەهێنا گۆڕێ، حەمە سدیق هەناسەکی ساردی هەڵدەکێشا دەیگوت:

–وای دەنا ئەمنیش لە مەکتەبی قەید دەکرام و وەکینگۆ دەمخیند.

هەتا رۆژەکی لە ناو ماڵێ هەمووما خڕ بووبووینەوە، ئەو پرسیارەم لە دڵی خۆم نەهێشتو پرسیم:

–ئەرێ پلە هەمین ئەتو لۆ هەتا ئێستا حەمە سدیقت لە مەکتەبێ قەید نەکردیە ؟

پلە هەمین رەنگێکی هێناو رەنگێکی برد و گۆتی:

–ئەیەڕۆ رۆرە لەکن حەمە سدیقی ئەو قسانە نەکەی.. باگێ ی لێ نەبی.

+ئاخر لۆ.. حەمە سدیق چ عەیبی هەیە.

–حەمە سدیق چ عەیبی نییە.. بەس ئەمن بەخۆم حەزناکەم ئەو ناوی لە هیچ دایەرەکی حوکماتی هەبی.. نامەوێ حوکمات بزانی ئەو کوڕە هەشە.

+ئاخر لەبەر چ.. لۆ وە لە حەمە سدیقی دەکەی.

–کورم.. ئەورۆ ناوی بنوسن و لە مەتکەبێ وەریگرن.. سبەینێ گەورە دەبی و رایدەکێشنە عەسکەری.. ئەدی هەینێ ئەمن هەش و قورپی کێنـدەرێ لەسـەری خۆم نێم. نا کورم نا نە ئەو نان و ڕوونە نە ئەو زەبرەقونە.

ماڵی پلە هەمینی لە گـەڕەکی سـێتاقان و لـە پشـت مزگـەوتی سـەید غـەریبی بـوو.. ئێمـەش مـن و دایکـم و بـاوکم زوو زوو بەسـەرمان دەکردنـەوە و دایکـم پێداویستی ناو ماڵ و وشکەی لەگـەڵ دەسـتی خـۆی بـۆ پلکـە هـەمینێ دابـین دەکرد، دراوسێ ی دەرگا بەدەرگای پلکە هەمین ماڵێك بوو لەگەڵ باپیرم خـزم و بنعام بوون.. کە دەچووینە سێتاقان سەرمان لە ماڵی ئەوانیش دەدا.

عەسرێك، من و بـاوکم و دایکـم لەبـەر دەرگـای مـاڵی پلکـە هـەمینی خـەریکی خواحافیزی بووین و دایکم گوتی:

–با لادەینە مارێ زرێخیش.. ئەمە هەر هاتینە با دوایێ گلەیمان لێ نەکا.

بەرەو دەرگای ماڵی وان دەچوین.. لە پر گەنجەکی بالاّ بەرز.. کراسێکی سـپی و شەروالێکی رەشی لەبەر بوو زۆر بەپەلە.. بێ ئەوەی ئاوڕ لە ئێمە بداتـەوە و سلاوێك لە دایك و باوکم بکات خۆی بە ماڵێـدا کـرد و لەبـەر چـاوان بـزر بـوو..

دایکم گوتی: ئەوە چ بوو دەتگـۆت باشـووکەیە رەت بـوو: بـاوکم وەلاّمـی داوە گـوتی: لـە سـاڵحی گـەڕێ.. تێکـەڵی ئیشـی وی نـەبی باشـترە. کەچـووینە ژوورێ.. ژنێکی لە خۆگەڕاوە لە پێشوازیمان دا بوو لەگەڵ دایکم یەکتریان مـاچ کـرد و عـەبای لێـوەرگرت و شـانی بـاوکمی مـاچ کـرد و دوو ماچیشـی لـەولا و ئەولای روومەتی من کرد و بە فەرموون فەرموون و یاخوە بەخێربێن بە پێشمان کەوت.

دانیشتبووین.. چایەمان دەخـواردەوە (سـاڵح )بـە جـل و بـەرگێکی دی هاتـە لامان و بەخێرهاتنی کردین و لەلامان دانیشت. باوکم گوتی:

–کاك سالْح حار و وەزیعەتت.. هەنوکەش وازت لە بەزم و رەزمەکانی خۆت نەهێنایە.

سالْح.. دەست و برد و بەگورجی گوتی:

–وازنایەنم.. هەتا ئەوان وازمان لێ نەینن.. ئەمنیش واز نایەنم.

دایکم بە زمانی سوتای گۆتی:

–ئەدی ئاواز کوە.. ئاگات لێ ی هەیە.

سالْح گوتی:

+چ بەرایتی.. وەختە هاریی.. ئەدی کو ئاگام لێ ی نییە !

دایکم:

–ئەدی بەتەمانی درمان خۆشکەی.. شتابیەکی خۆشمان لۆ بگێڕی و ئەمەش هەندۆکەك لە بۆت ماندی بێن.

–پلە قەدری.. ئەمن عەهەدم لەگەر خوای خۆم کردیە.. هەینێ ئاوازی دەگوازمەوە کە کوردستان ناجیح بوو و کورد هەقی خۆی وەرگرت !

سالْح نەفاسە، بەخۆیو چەند خورتەکی هاوتەمەنی خۆی لە هەولێرێ دەستەی ئیغتیالاتیان درووست کردبوو، سالْح بەخۆی پێشمەرگە بوو و بارەگایان لە تۆقەرەی چیای سەفینی خۆشناوان بوو.. کەچی بە نهێنی دەهاتەوە ناو هەولێر و لەگەڵ کانۆ چاو شین و خولەی برای و خالیدە قوتە و فەلاح ماتۆر و ئەبو زێدی یەکتریان دەگرتەوە و خەڵکێکی خراپ و خۆفرۆشیان دەست نیشان دەکرد، هەینێ رێ و شوێن و هەرکەسە دەوری چ با بە دیاری دەکرا و دەست بەکار دەبوون، کابرای خۆفرۆش بشفرپیبا هەر دەیانکوشت.

سالْح نەفاسە.. لەناو شار، جارێك بە بەدلەی شینی کرێکاری بەنزینخانە دەبینرا و زەمبیلەکی گەورەی بەدەستەوە دەگرت، کەس نەیدەزانی لە ناو ئەو زەمبیلەی غەدارەی پۆرسەعید و قومبەلەی ئەلقەدار شاردراوەتەوە و بۆ کاتی پێویست و دەست وەشاندن.. یان بە قاپوتێکی رەشی درێژ دەبینرا کە

غەدارە و قومبەلەی لە ناو کیسەی چیمەنتۆ دەشاردەوە و لـە بـن قاپوتەکـەی بە مەحکەمی لەگەڵ خۆی دەگێڕا. بە ماتۆڕی فەلاحی دەچونە جێی مەبەست و دەسـتیان دەوەشـاند و دەگەڕانـەوە و سـێتاقان قـوتی دەدان و بـزر بـزر دەبوون.

هەر لە سێتاقان.. سالّح و برادەرانی دەیانەویّ ماڵە رەئیس جاشەکی نازانم چ بەگیان پێ دەگوت.. لە گەڕەکی خۆیان بکەنە ئامانج.. ئیدی پـلان دادەنـێن.. یەکێکیان بە جلی شڕ و بە ناوی شامی نۆك و لۆبیا فرۆشـتن و دەمانچـە لـەناو سەبەتە لە سەر سەری و ئەوی دیش دوور و نزیك لە پارێز بێت تا دەسکەوتێك گەر هەبوو نەجاتی نەدا. بەم شێوە دەگەنە بەر دەرگای ماڵی بەگـە جاشـەکە، جاشێکی یەکە پیاوی بەگ تفەنگ لە شان بەجامی فـافۆنی بـەتاك لێیـان دێتـە پێش تا نۆك و لۆبیایان لیّ بکڕێت.. لەوکاتەدا و دەست و بـرد و مەردانـە لۆبیـا فرۆش سەبەتەی سەر سـەری دادەگریّ و دەسـت دەکاتـە دەمانچـەکەی و بـە چەند گوللەیەك جاشەکە سارد دەکاتەوە.. هاوڕیّ یەکەشی گورج و گـۆڵ و بـە قەڵـەمبازێك دەگاتـە لایـان و تفەنگەکـە هەڵـدەگریّ و هـەردووکیان بـۆی دەردەچن.

سالّح نەفاسـەی داینـەمۆی دەسـتەی ئیغتیـالات.. کـە هـەر خۆشـی پسـپۆری (مین) دروستکردن و دانانەوەی بوو.. لەو پەرە چـیایەی سـەفینی خۆشـناوان، لەکاتی دانانەوەی مین لەسەر رێگای سوپای داگیرکەر بە داخـەوە بـە خـۆی دا دەتەقێتەوە و شەهید دەبێت.

ئاوازی دەستگیرانیشی عەهد و وەفای جیّ بەجیّ کرد لـە پـاش بـەژن و بـالآی نەفاسەکەی خۆی چاوی بە هیچ بەژن و بالآیـەکی دی هەڵنـەهات و بـە کچـینی مایەوە تا کۆچی دوایی کرد.

درووود و ستایش بۆ رۆحی ئەم دوو پەپوولە بیّ مرادە.

# لەبن قەڵاتێ

ئەو ریزە دوکانەی لەبن قەڵاتێ هەبوو، زۆر جوان و سەرنج راکێش بوو، دوکانەکان هەر لەدامێن و خوارەوەی رێگای ئەحمەدییە درێژ دەبۆوە و بن دیوار و بن دیواری قەڵاتێ دەڕۆیی هەتا سەرەتای ئەو رێیەی بەرامبەر بازاڕی گەورەیە و بەرەو دەرگای قەڵاتێ کێل دەبتەوە، بەدوکانەکانی ئەحمەدەفەندی بەناوبانگ بوون.

یەکێك لەدوکانەکان کەبەرامبەر دەرمانخانەی شیمال بوو، خاوەنەکەی مام حاجی قادری جیرانمان بوو، تەهای کوڕی ئاوزەی خۆم و لەکۆڵان گەمەمان بەیەکەوە دەکرد.

زۆرجاران لەگەڵ تەهای دەچووینە دوکانی باوکی و لەوێ دەماینەوە هەتا عەسرێکی درەنگ و لەگەڵ مام قادری دەگەڕاینەوە ماڵێ، لەو ژێر قەڵاتە و لەو دوکانەی مام قادری جیرانمان دوو بیرەوەری تاڵم هەیە:

یەکەمیان: وێنەگرێکی کامیرا سێ پایەکان کەبە (شەمسی) ناو دەبران.. لەبەردەم دوکانی مام قادری و لەپەنا عامودێکی کارەبایی رۆخی جادەی رۆژانە کامێراکەی دادەنا و وێنەی دەگرت، کاسبیەکەی ئەوەبوو، هەموو ئێواران هەر کەبازاڕ چۆڵ دەبوو.. کابرای وێنەگر کامێرایەکەی لەباوەش دەکرد و لەدوکانی مام قادری لەپشت فەردە شەکر و سندوقە چایان دایدەنا و بەیانیانیش دەیبردەوە رۆخی جادەی.. تەنها رۆژانی هەینی نەدەهاتە بازاڕ و دەستی لەکامێرایەکەی نەدەدا.

رۆژێکی هەینی، پاش نیوڕانێ من و تەها لەتەیراوەی را هەڵکشاین و بن قەرات و بن قەرات چووینە دوکانی باوکی.. لەبەرئەوەی زۆر مەراقم بوو بزانم ئەو کامێرایە چۆن ئیش دەکات و بۆ وێنەگرەکە سەری دەخاتە ناو توورەگە رەشەکەی دواوە و ئەو چەکمەجەیەی لاتەنیشتی کامێراکە چی تێدایە هێندە

رایدەکێشــێ و قــەپاتی دەکاتــەوە، وەختێــك مــام قــادر ئێمــەی لــەدوکان بەجێهێشــت و بــەرەو مزگــەوتی نــاو بــازاڕی بەڕێکــەوت تــا نوێــژی عەســرێ بەجەماعەت بکات. من عەجمانم نەما.. ئەوەندەی تەهای برادەرم گوتی:

– کورە نەکەی.. دەست لەو کامێرایەی نەدەی.. با تێك نەچی.

کەچی من گوێم لێنەگرت و چوومە گژ پیرە کامێرای، سەرەتا سەرم لەجۆرکێ نا لەبەر تاریکی و نەبینینی هیچ شتێك تەنگەنەفەس بووم و زوو بــەزوو ســەرم لەتوورەگەی دەرهینا، ئەمجارە دەستم لەو قەپاغەی پێشەوەدا و لێم کـردەوە و دامناوە و لاسایی وێنەگرەکەم دەکـردەوە کەلـەکاتی وێنـەگرتن وای دەکـرد، ئینجا ئەو چەکمەجەی لاتەنیشتم کـردەوە کـەئاوێکی مەیلـەو خەسـت و چـەند پارچە کاغەزێکی رەق و لووسی تێدابوو، دەسـتم لەئاوەکـەی وەردا و وەرەقـە لووسەکانم هەرگێڕ و وەرگێڕ کرد و لەکاتی داخسـتنەوەی چـەکمەجەکە دیـارە بەتـەواوی نەگەڕاوەتـەوە شـوێنی خـۆی و بـەرووناکی بـەردەوام و هـەوای نـاو دوکان زیان بەوێنە نەگیراوەکان و ئاوە خەستەکە کەوتبوو.. هەر زووش زانـیم کەتنێکم کردووە، بۆیە بـە (تـەها)م گـوت بەکـەس نـەڵێی دەسـتمان لـەکامیرا داوە، ئەگەر پرسیشیان دەڵێین:

– ئێمە ئاگامان لەهیچ نییە.

بۆ رۆژی شـەممە هـەر کەوێنـەگر دەچـێت کامێراکـەی بـەباوەش بباتـە رۆخـی جـادە.. دەبینـێ قــەپاغی عەدەسـەکە لێکراوەتـەوە و لـەعاردی کەوتیـە و چەکمەجەکەش بەنیوەکراوەیی بەجێهێڵراوە، لەتاوان شێت دەبێ و لەمام قادر دەپرسێ:

– مامــە.. دوێنــێ کــێ هاتیتــە دوکانــێ و دەسـکاری کامیرەکـەیان کردیمـە.. هەرچی (نێگەتیڤە) سوتاندیتیان بای دە پازدە دیناران زەرەرییان لێداوم.

* وەڵڵاهی برێم چ.. دونێ ئەو دوو قەرپە لێرە بـوون، رەنگـە هـەر ئـەوان ئـەو کەتنەیان کردبی.

پاشتر کەلێیان پرسین ئەنگۆ دەستتان لەکامێرایەکە داوە؟ هەردووکمان نکۆڵیمان لێکرد و خۆمان لەقەرەی کەتنەکە نەدا.
دووەمیان:
هەر حەوت هەشت رۆژێکی پێچوو.. دیسان بەدوان لەدوکانی مام قادر بووین، لەناکاو نازانم بۆ چ مەبەستێك ویستم بچمە ئەوبەری جادەی، بەغار لەناو دوکانێڕا دەرپەڕیم و دوو شەقاو لەولای کامێرا شەمسیەکە ترومبێلێکی جێب زۆر بەتوندی لێیدام و تێیهەڵدامە ناوەڕاستی جادەی، ئیدی من ئاگام لەدونیا نەما و بێ هۆش بووم، هەرکە چاوم کردەوە لەسەر قەرەوێڵەی نەخۆشخانە بووم، دکتۆرێك و سستەرێك بەدیارمەوەن، ئاهێکم هەڵکێشا و بروسکەیەك لەمێشکم بلێسەی دا و لەدڵی خۆمدا گوتم:
– ئەوە خوای کابرای کامیراچیەکەی بوو، تۆڵەی لێکردمەوە.
یەك شەو لەخەستەخانە مامەوە و کابرای شوفێریش هەر ئەو شەوە لەبەندیخانەی قشڵەی گەورە گیرا، هەر کەمنیان بردەوە ماڵێ، یەکسەر بابە حاجی چووە قشڵەو شوفێری عەفو کرد و بەڕەڵا کرا.
ئینجا فیلمەکە لێرەوە دەستی پێکرد، دەبوایە رۆژ نا رۆژێك من ببەنە بنکەی تەندروستی بەرامبەر سینەما سەلاحەدین تا قاچ و سەرم تەداوی بکەن و بمهێننەوە ماڵێ.. ئەمەش دایکم و دایە حاجی نەنکم ئەنجامییان دەدا، دەبوایە بەنۆرە لەباوەشێم بکەن تا دەمبەن و دەمهێننەوە، ئاخر نێوان ماڵی ئێمە لەتەیراوەی هەتا لای سینەما و بنکە تەندروستیەکە دوور بوو و تەواو هیلاك دەبوون.. کەچی من قبوڵم نەدەکرد نەنکم لەباوەشێم بکات و دەگریام و تەنها و تەنها دەچوومە باوەشی دایکم.. نەنکیشم پێی ناخۆش بوو کەئەو تاقە کیژەی هەیە و بەمشێوەیە ماندوو و هیلاك بێ، هەر کەزۆریشی لێدەکردم کەبچمە ئامێزی ئەو و دایە ماندوو بووە.. نەدەچووم و دەمگوت:
– نایێم، بۆنی دایکی خۆم خۆشە و لەئامێزی وی ژانی لاق و سەرم دەشکێ.

# رانکو چۆغەی بەگوو

لەپۆلی یەکی سەرەتایی بووم لەقوتابخانەی (عەرەب) لەگەڕەکی عارەبان و پشت ئەو بنکە تەندروستیەی بەرامبەر سینەما سەلاحەدین بوو.. . تازەش باوکم رانکو چۆغەرێکی مەرەزی بۆ بەدوورین دابووم و گوایە ئەوە جلکی جەژنەمە.

رۆژێکیان، لەشایی و زەماوەندی ژنهێنانی خزمێکمان داوەت کرابووین کەماڵیان لەگەڕەکی بەلاشاوەی بوو، هەر شەوەکەی باوکم پێی گوتم:

- کاکە سبەینێ لۆ مەکتەبێ رانکو چۆغەی لەبەربکە.. وەبی کەنیوڕانێ هاتیەوە تاخیر نەبن.. ئەتوو و پەریزادی خوشکت لەگەڵ محەمەدی مام حوسێنی بەتەکسی وەرن.

هەر واشم کرد، بەیانیەکەی رانکو چۆغەرم لەبەرکرد و پشتێنێکی شلوشۆقم بەست و چوومە قوتابخانە، چونکە قوتابیانی قوتابخانەکەمان تێکەڵەیێك بووین لەمنداڵە کورد و تورکمان و عەرەب و گاور، ئەو رۆژە زۆر بەنەوعێك سەیریان دەکردم، هێندێك دەیانگوت شمەکی کوردیت زۆر جوان لێدێ، ئەوان منداڵە کرمانجەکانی دەشتێ بوون، هەندێکی دی دەهاتنە لام و دەیانپرسی:

ئەو جلکە دڕ نییە؟ قەلبت پێناخورێ؟ ئەوانەش منداڵە عەجولەکانی تەیراوە و لای حەمامی ئەتڵەس بوون، ئەوانی دی هەر تەماشایان دەکردم و لەبن لێوانەوە بزەیان دەهاتێ و روویان لێوەردەگێڕام! ئەوانەش منداڵەکانی قەلاتێ بوون.. منداڵێکی عارەبیش قیچێك کوردی فێر بوو بوو دەیگوت:

- ئەوەل مەڕەیە ببینم گونیە بکرێتە لیبس و لەبەر بکرێ!!

بەهەرحاڵ چوار وانەم بەم بەزمە بەڕێکرد، وانەی پێنجەم هەتا ناوەڕاستی وانە وتنەوەی مامۆستاش وەزعم زۆر ئاسایی بوو، کەچی لەناکاو پێچەك بەزگم

دا هات و غـازات و ژانێکـی سـوك دەسـتیپێکرد، کـەمێك خـۆم گـرت، یـەك دوو جاران ویستم کەلێنێکی بۆ بڵند کەم هەوایێك بەڕەڵا بکەم، کەچی نـەدەوێرام و پەشیمان دەبوومەوە دەترسام قوتابییەکەی تەنیشتم بۆنێکی نـاخۆش بکـات و لێم لەهەڵا بدات.. کەمێکی تـر خـۆم گـرت و وردە وردەش ژانەکـەی زگـم زیـاد دەبوو تەنگاوتری دەکردم.

دەستم بەرز کردەوە و گوتم:

– مامۆستا بچمە ئەدەبێ؟!

* دانیشە هـەتیم دەرێـی ئاغـای گونـدی وەهـا خـۆت رازاندیتـەوە.. دەرس زۆری نەمایە.. هە بزانە جەرەسی لێدا.

ئـای خوایـە گیـان چ بکـەم.. چـۆن خـۆم راگـرم، چـۆن بتـوانم هیچـم لێ بەرنەبێتەوە، بەملی شکام ئەو جلکـە کوردییـەم بـۆ لەبـەر کـرد، ئـاخر حـەیام دەچێ.

جارێکی دی دەستم هەڵبڕی و بەنووزانەوە گوتم:

– مامۆستا.. زگم زۆر دێشی تخوا با بچمە ئەدەبێ.

* دانیشە بێئەدەب، پێمگوتی خۆت راگرە.. هەنوکە جەڕەس لێدەدا.

ژان پتر زك و پشتی گرتمەوە و ئارەقە تك تك لەسەری کـەپووم بـەردەبۆوە سەر رەحلەی، ئیتر ئارامم نـەما و چـیتر نەمـدەتوانی خـۆم راگـرم و کـۆنترۆڵی بارە خراپەکەم بکەم.. هەڵسامەوە و بەپێوە وەستام و دەستم کـردە جانتـای کتێبـەکانم و خـۆم ئامـادە کـرد کەبـەبێ ئیزنـی مامۆسـتا دەرپـەڕم و خـۆم بگەیەنمە خەلایێ، لەهیکڕا زەنگ لێیدا و هەر لەهیکڕاش و بەبێ ئیرادەی خـۆم هەستم کرد ناو رانم تەڕ بوو و تەڕاتیەکی گەرم بەهەردوو لولاقم دا هاتە خوارێ و تا ناو پـێڵاوە تازەکـانم نەوەسـتا، زانـیم قەوماندیتم.. ئیـدی هـەموو شـتێك تـەواو، چـۆن لـەرووم بـێ بچـمە ئاودەسـتخانە؟ کـەپڕ بـوو لـەو قوتابیانـەی

پێویستیان بەوێ هەبوو، ناچار جانتام بەدەستی شۆڕ کردەوە و شرپ شرپ هەنگاوم بەرەو ماڵ هەڵێنا، چونکە ناو پێڵاوەکانم تەڕ بوو بوون لەگەڵ هەنگاو هاویشتن فلقەك لەقۆندەرەکانم دەبیسترا و بۆنێکی زۆر ناخۆش و پیسیش هەراسانی دەکردم، بەم بارە نالەبارە خۆم گەیاندەوە تەیراوە و لەماڵێ بەژوور کەوتم، پەریزاد و محەمەدی مام حوسینی چاوەڕێی منیان دەکرد، کەچی من بەسارد و سڕی و زۆر مردۆخانە لێیان چوومە پێش، ئای خوایە قیامەتم لێهەستا.. هەر کەپەریزادی خوشکم زانی خۆم پیس کردووە ئەو رانکو چۆغەرە جوانەم لەگووی وەردایە شێت بوو، وەرگەڕا سەرم، لێدە کێندەرێت دێشێ، ئیدی رانکیان لەبەر داکەندم و بەسۆندە ئاوی سارد و بەگسکێك کە لە شوڵکە داران دروستکرابوو کەوتە شووشتنی قوون و لاق و لەتەرم و لەهەمان کاتیش هەر دوعای لێدەکردم و لێیدەدام، ئیتر پاکی کردمەوە و رانکو چۆغەری بەگووی تێهەردا پێش بەرمیلی حەوشێ.. بەناچاری جلکی رۆژانی ئاسایی مەکتەبێم لەبەرکرد و بەپرتە و بۆڵەی پەریزادی خوشکم دەرگای حەوشەمان پێوەدا و بەتەکسییەکەی مام محەمەد غەفووری پشت ماڵمان چووینە بووکێ.

## حەمام سیروان

باوکم راهاتبوو، هەموو بەیانیانی دووشەممە و پێنج شەموان و دوای نوێـژی بەیانی.. لەخەو هەڵیدەستاندم و ئەو بوخچە جلکەم هەڵدەگرت کەهـەر شـەوێ ئامادە کرابوو و بەیەکەوە دەچووینە حەمام سیروان.

حەمامەکە هەر لەتەیراوەی لەنزیك ماڵی خۆمان بوو، زۆر حەزم دەکـرد وەك ئـەوانی دی بـەخۆم خـۆم بشـۆم کەچـی بـاوکم لێنەدەگـەڕا و سـەرەتا منـی دەشوشت ئەمما شووشتن، بڕوا بکەن لەلیفکە پێداهێنانێ وەڕس نەدەبوو، من بێزار دەبووم هێندەی لیفکە بەقۆڵ و باسکم دابینی و جێی لیفکەکە سۆر سۆر هەڵدەگەڕا ئـەو بێتاقـەت نـەدەبوو.. تـەنها ئەوکاتـە لیفکـەی بەکـەفی دەدایـە دەست خۆم کەنۆرەی شووشتنی ناو گەڵم دەهات.. زوو زووش دەیگوت:

– دەی کاکە لیفکەکەی توند پێدابینە با بەباشی خاوێن ببیەوە.

جارێك لەو جارانە، کە لە خۆشووشتن تـەواو بـووین و خۆمـان گـۆڕی بـاوکم پارەی حەمامێی دایە دەست مام حوسـێن حەمامچـی و بـەڕێ کـەوتین، لەبـەر دەرگا بووین تەقە و دەنگـی گوللـەیێکی بێـژمار لـەلای مـاڵی ئێمـەوە دەهـات، ئیدی بەپەلە بەرەو ماڵ بووینەوە و بەگورگە لۆقە هەنگاومان نا، ئەو بەیانیە و لەبەردەمی چایخانەی مەلا یاسین و دەوروبەری، قەسابخانەیێکی شەڕی براکان دروست بوو کەهەموو تەیراوەی غەمگین و دڵگران کرد.

خۆمان گەیاندەوە ماڵێ و باوکم لەبەر مشەوەشی بوخچـەی جلکـی پـیس و لیفکە و سابوون و مووس و تاخمی تراشی هـەر لەحەوشـی فـڕەدا و بـەڕاکردن بەرەو شوێنی کارەساتەکە چوو. ئەوکاتە، مارفی برام چوار ساڵە بوو زۆریـش عەجوول بوو، ئێمەش لەبەر تەقە و رووداوەکە مشەوەش بـووین کـەس ئاگـای لەکەس نەما، مارف چووە گژ بوخچە و لیفکەکە لێك دەکاتەوە و تاخمی تراش

و مووسەکە دەردێنێ، من هەر کەسەرنجم دا موسەکەی لەناو مستی بوو و توند گرتبووی، غارم دایێ تا مووسەکەی لێوەرگرم و نەهێڵم چ بقەومێ ئەویش توند توند مووسەکەی بەمشت گرتبوو.

منیش بێئەوەی بیر لەوە بکەمەوە موس تیژە یەکسەر ئەوەندەی کە مووسەکەم لێ دیار بوو گرتم و بەپەلە لەناو دەستیم راکێشا و لێم وەرگرت، بەڵام هەر کەمارف دەستە گچکۆکەکانی کردەوە و زیڕەی لێهەستا و خوێن لەدوولاوە فیچقەی کرد، زانیم کەتنێکم قەوماند.. یەکسەر رامکردە دەرەوە لەترسی دایکم و هەر بەغار خۆم گەیاندە لای قەرەباڵغیەکەی بەردەم چایخانەی مەلا یاسین کەباوکیشم لەوێ بوو، کەگەیشتم تازە مسەلەحەی پۆلیسی گەیشتبووە وێ و پۆلیسەکان تەرمی قوربانییەکانیان بار دەکرد، لەوێش باوکم خۆی لێ تورەکردم و راوی نام و گوتی:

– وا دونیا کاول دەبی سەگباب، چ دەکەی هاتیە ئێرە؟

لەترسان گەڕامەوە ماڵێ و بەغاردان چوومە سەربانێ و لەپەنایێك خۆم حەشاردا، لەخوارێش دایکم و ئەوان دەستی مارفیان تیمار دەکرد و دوعایان لەمن و لە حکوومەت و لەبکوژەکان دەکرد.

## تەکیە و زیکر و بابەشێخ و حەمە رەزا

ماڵی بابە شێخ عەبدولکەریمی دارەخورما لە تەنیشت تەکیەکەیان بوو لە گەڕەکی خانەقا، چونکە باوکم خۆی بە دەروێشی بابە شێخ دەزانی و زوو زوو سەردانی ماڵەوەشی دەکردن و هۆگرییان بوو بوو ناسیاوییان لەگەڵ یەکتر پەیدا کردبوو.

کەچی دایکم حەزی نەدەکرد بچینە ماڵیان و دەیگۆت:

–زێنەبە خانی کچی بابە شێخ زۆر لوت بەرز و بە دەعیەیە، وەکی خزمەتکارەکی تەماشامان دەکات.

وەکی دی.. دایە حاجی (حاجی نازدار) پێی لەماڵی بابە شێخ نەدەبڕی و سەرو بەندەکی حیزبایەتی و پارتایەتی لەگەڵ زێنەبەخانی کچی بابە شێخ هەبوو بەینیان یەکجار خۆش بوو.

لەبیرمە.. پارچەلە بووم.. عەسرەکی درەنگ لە حەوشەی ماڵییان بابە شێخ عەبدولکەریم لەسەر قەروێڵەیەك پاڵکەوتبوو میوانیش لەولاو لەملا دەوریان دابوو.. منیش لە کۆشی باوکم بووم لە هیکڕا ئاگام لێ بوو بابە شێخ تەسبێحەکەی لەدەست بەربۆوە و کەوتە سەر ئەرزی.. منیش بە پڕتاو غارم دایێ و داهاتمەوە تەسبێحەکەم هەڵگرتەوە و یەکسەر قیت بوومەوە تا بیدەمەوە دەست بابە شێخ تومەز ئەویش لەوکاتەدا سەری دانەواندوە تا بزانی تەسبێحەکەی کەوتە کوێ.. لەم سەر هێنانە پێش و قیت بوونەوەی من.. پشتی سەرم بە لووتی بابە شێخ کەوت و ئاخێکی لێ هەڵسا.

–چ بوو.. چ بوو.. کوڕە ئەوە لۆ وەت کرد؟

باوکم گوتی.

بابە شێخ فەرمووی:

–هیچ نەبوو دەروێش عەبدوڵڵا هیچ نەبوو، بەس ئەو کورەی تو کە ئەوها کەللەی لە لووتم دا، کە گەورە بوو یان زۆر دەوڵەمەند دەبێت، یانیش زۆر لات و هەژار.

ئەوە هەر لەبەر قسەی بابە شێخی یە هەنوکەش هەژاری دەستم ماچ دەکات.

هەموو پێنج شەموان.. دوای تاریکی لەگەڵ باوکم بۆ زیکر دەچوینە تەکیەی بابە شێخی لەگەڕەکی خانەقایێ، زۆر جاران (حەمە رەزا) ی شێت دەهات و بەگەڵمان دەکەوت. جا لەناو ترومبێل و لە ڕێگای بەرەو تەکیە.. حەمە رەزا بەم پرسیارانە باوکمی دادەگرت:

–حاجی عەولا ئەم جادەیە ساڵی چەند قیرتاو کراوە.

–حاجی عەولا کارەبا چۆن دەگاتە ئەو هەموو گلۆپانەی سەرجادە.

–حاجی عەولا.. خوا گەورەترە یان شێخ عەبدولقادری گەیلانی.

_حاجی عەولا.. بەغدا خۆشترە یان تارانی حەمە رەزا شا.

ئیدی باوکمی وەبەر پرسیاران دەدا و ئەویش بەگوێرەی زانینی خۆی وەلامی دەدایەوە.. هەندەك جارانیش دەیگۆت:

–حەمە رەزا.. ئەو پرسیارەی مەکە، ئەوە کفرە کفر.. هەر دەبی خوا لە هەموان گەورەتر بی.

کەچی ئەو دەیگوت:

–وەنیە.. غەوسی گەیلانیش گەورەیە.. زۆریش گەورەیە.

ئیدی کە دەچووینە ناو تەکیە و تێکەڵ بە سروتی زیکر دەبووین.. حەمە رەزا هایوو هویەکی دەکرد و سەری رادەوەشاند سەر بەقوڕی بە پێکەنین دەهێنا.

لە تەکیەی.. خەلیفە حوسێنێك هەبوو.. دەنگی وەك زەنگوڵە دەزرینگایەوە.. دەفەشی لێدەدا، من زیاتر کە بەگەر باوکم دەکەوتم و دەچوومە ناو کۆڕی زیکر هەر لەبەر خاتری خەلیفە حوسێن و دەنگە

ئاسمانیەکەی بوو.. لەبیرمە جارێکیان کۆڕی زیکر گەرم بوو دەروێش پرچی درێژیان کردبۆوە و ئارەقەی رەش و شینیان دەردابوو، خەلیفە حوسێن دەیزریکاند و بەمەقام و دەفە ئاگری لە هەناوان بەردا بوو بەخۆشی هۆن هۆن فرمێسك لە چاوی دەڕژا. منیش گەرم بوو بووم.. لا ئیلاهە ئیلاّ لاّم وەها دەگوتەوە هیچ ئاگام لەخۆم نەما بوو.. دوایی باوکم گوتی:

–کاکە کە زیکر تەواو بوو دەبی هەموو دانیشین و بەرێك و پێکی گوێ لە قورئانی پیرۆز بگرین.

تومەز زیکر تەواو بووە و هەموو دەروێشەکان دانیشتوون، کەچی من لە حەماس و لە گەرمیان و لەتاو دەنگی بومەلەرزەی خەلیفە حوسێنی هەر حای و حوو و ساکین نەبوومە، هەتا بەزۆری چاویان گرتوومە و لە شوێنی خۆم دایان نیشاندم.

حەمە رەزا زوو زوو دەهاتەماڵیش، خواردن چی هەبا لەسەر سفرەی خێزان نۆشی دەکرد و سکی برسی تێر دەکرد.. دایکم و پەریزادی خوشکم زۆر بەزەییان پێدا دەهاتەوە بەردەوام گۆشت و برنج و شلەیان زیاتر بۆ ئەو تێدەکرد و لەبەردەمیان دادەنا.

حەمە رەزای ئاوارە، لەسەردەمی کۆماری کوردستان بەسەرۆکایەتی پێشەوا قازی، ئەفسەرێکی دەرەجەدار بووە و یەکێك بووە لە ئەفسەرە تێکۆشەرەکانی کۆمار و مەهاباد، بەداخەوە لەدوای روخانی کۆمار و لەداردانی پێشەوا و هەڤالانی، حەمە رەزا باری دەروونی تێك دەچێت و وەك شێت دەکەوێتە کەژ و کێوان و تا دواجار لە هەولێر دەگیرسێتەوە.

جارێکیان.. هەر لەماڵی خۆمان.. دوای نان خواردنی ئێوارە.. باوکم ریکۆردەرێکی هەبوو لەبەردەم حەمە رەزای دانا گوتی:

–دەوجا تێیهەرکە.. ئەوەی چەند جارە لە ناو ترومبێلی لۆمنی دەرێی.. هەنووکە بیرێوە با تۆماری بکەم.

حەمە رەزا تێیهەرکرد، تێکەڵەیەك لە لاوك و حەیران، بەلام زۆر بەنەشازی دەستی پێکرد، لە گوتن و قسە کردنێش کەمێك گن بوو.. ئیدی بۆ ماوەی چارەگە سەعاتێك هەر منگە منگی لێوە هات و ئێمەش بێدەنگ بەدیاری یەوە حەپەسابووین.. ئەو سەربردەی دروست بوون و رۆژە پڕشنگدارەکانی کۆماری کوردستان و جوامێری پێشەوا و روخانی ئەم خەونەی کوردی بۆ دەگێڕاینەوە، بەلام بەداخەوە بەباشی تێینەدەگەیشتین چ دەڵێ.. دواتریش تۆمارە دەنگیەکەش فەوتا، حەیفێ ئەم پیاوەی ئەفسەری کۆمارە جوانەمەرگەکەی کورد و شێتە خۆشەویستەکەی هەولێرییان، ساڵی(١٩٧٤) لە درەنگە شەوێك داو لە پەنایەکی ئەم شارە بەگوللەی دوژمن و لە کەمینێك کە بۆ (پ. م) داندرابۆوە، شەهید کرا و سەری نایەوە.

شەوەکیان هەر لەتەکیەی بابە شێخی.. دوای ئەوەی تێر گوێبیستی مەقام و موناجاتی خەلیفە حوسێنی بووین، ئێمە ژمارەیەك منداڵی پارچەلە لەوێ بەشداری زیکرمان کردبوو.. لە پڕ کوڕێکی بابە شێخ عەبدولکەریم یەکە یەکە منداڵەکانی هەڵدەستاند و بەدەستەکانی هەردوو گوێی دەگرتین و بەرزی دەکردینەوە و خولە بەدەورەی خۆی پێدەکردین، سێ چوارێکی تەواو کرد منداڵەکان نقەیان لێوەنەهات.. نۆرە هاتە سەر من.. هەردوو گوێ ی گرتم و بەرزی کردمەوە سوڕاندمی.. ئاگر لە ناو چاوم بەرز بووەوە.. ئازارێکی کوشندە لە هەردوو گوێم بۆ تۆقی سەرم هەڵکشا.. لە تاوان دەستم بەهات و هاوارکرد و دادو گریان و فیغانم لێ بەرز بۆوە.. کوڕی بابە شێخی لەسەر ئەرزی دانامەوە و دەستی لە گوێ یەکانم بەردا و هەتا شەقازلە گرتی لە بنا گوێ ی دام و ئاوڕی لە بابم دایەوە و گوتی:

—دەروێش عەبدوڵلا.. ئەو کوڕەی تو زۆر جەبان و گرینۆکە بەرگەی گەرمی و ساردی رۆژگار ناگری.. جارەکی دی نەکەی لەگەرەخۆت بیهێنیە تەکیەی.

## دووكەڵی مێشێ

فەترەیێك، باوكم یەكێك لەژوورەكانی خانووەكەی بەكرێ دایە پیاوێكی عەسكەری ناوی عەبدولڕەحمان بوو.

عەبدولڕەحمان بەئەسڵ سورچی بوو، لەئۆردی ڕێی موسڵێ شوفێری زیلی سەربازی بوو، دوو كچ و كوڕێكی هەبوو، كوڕەكەی هاوزەی من بوو لەگەڵ یەك دەگونجاین.

ئەو عەبدولڕەحمانە راستە سەرباز بوو، لەسەربازیش شوفێر بوو زیلی لێدەخوڕی، بەڵام هەر ئەو شەوانەی لەماڵ بوایە، لەگەڵ باوكم و میوانەكانی دی دادەنیشتن و كۆڕی قسەیان گەرم دەكرد و لەهەموان كورد پەروەرتر و ئاگادارتری شۆڕش و كوردایەتی بوو.

زۆربەی بەیانیان كەبەزیلی سەربازی دەهاتەوە ناو شار سەرێكی ماڵەوەی دەدا و چەند دانەیێك سەمونی عەسكەری دەهێناوە، ئای لەو سەمونە بەتام و لەزەتە، پێخۆری نەدەویست، زۆرجاریش بەهێلكەی كوڵاو تەماتە و پیاز دەمانكردە لەفە و وەریدەگەڕاینێ بەقەمپاران.

لەهاوینێ.. هەر كەمێش و مەگەز پتر هەراسانی دەكردین.. ئەو كاك عەبدولرەحمانە لەئۆردییەوە مەكینەی دوكەڵی مێشێی بەلۆرییەكی عەسكەریەوە رادەكێشا و خۆی دەگەیاندە جادەی تەیراوەی، ئیدی دار و دونیای لەدووكەڵ وەردەدا، ئێمەی منداڵیش بەدوای دەكەوتین و كەیفمان پێدەهات زۆرجاران كاك عەبدولرەحمان لەسەری كۆڵانی خۆمان رایدەگرت، تا من و كوڕەكەی لەلای خۆی سەرخا و دوكەڵەكەش زیاتر بەرەو ماڵ و كۆڵانەكەی ئێمە بێت.

من نا.. منداڵانی كۆڵانی خۆمان بەكوڕەكەی كاك عەبدولڕەحمانیان دەگوت:

– كوڕی دوكەری مێشێ!!

## رۆژانی جەوانیم و یاریی تۆپی پێ

دایکم سوێندی خوارد کە جارێکی دی ئەو شەلوارە قوڕاوییەی من بە دەستی خۆی نەشوات و پاك نەکاتەوە.. ئاخر ناهەقی نەبوو دواوەی شەلوارەکەم کە بۆ یاری تۆپی پێ لەبەرم دەکرد دەتگوت دواوەی تەلەنکتەرە کە لەناو قوڕێکی لینج بەتەناش ڕۆیشتبێ، شەلوارەکەی منیش ئاوا سەرتاپای قوڕ بوو، هەرکە دەگەڕامەوە ماڵ و لەبەرم دەکردەوە بە بەرەوازی هەڵدەواسی و دەمگوت: تا سبەی عەسرێ و گەمەکی دی خوا گەورەیە.

پاش عەسران دەبوایە پاریز وەرگرم، ئەو دەمەی دایکم خەریکی کارێك و دایە حاجی سەرقاڵی شیو لێنان دەبوون.. دەست و برد هەردوو لینگم لە شەرواڵی قوڕاوی هەڵدەکێشا لەماڵێ وەدەردەکەوتم و هەر بەغار بۆ لای گوفەکی بەر دەرگای حەساریێ کە تاکە گۆڕەپانی گەڕەکێ بوو.. ئیدی گەمەی تۆپانێ دادەمەزراو من گۆڵچی و ئەوانی دیش هەریەکە و لەلایەکەوە دەبووە شرپ و هۆڕی تۆپ و قوڕ و چڵپاوی سەر گوفەکێ و شەق بە شەقی دەگوت هێوەڕوو.

ڕەفیقەکانی تۆپانێم (فەوزی و کەژادی کوڕانی معاون ساڵحی، مۆفەق و زەکەریای مام کاکۆ خەیاتی، تۆفیقی وەستا عومەر پەڕەشوتی، ئازاد و دڵشادی مام سابیر سەماوەری، نامیق و ڕەفیقی پلە ڕەحمەتەی، غازی و ئازاد سیسرکەی برای، شێروان و سالمی عەبدوڵلا گەمشۆی، سەدرەدین پیاز خۆری ناو حەساری، عوسمانی پلکە مەلا ژنێ ) بەردەوام لەسەر گوفەکێ ی پێش حەساریێ پاش نیوە ڕۆیانمان بە یاری تۆپی پێ بەسەر دەبرد.

پاشتر کە هەندەك هەراش تر بووین، دەچوین و هاموشۆی بارەگای تیپی (بروسك)مان دەکرد کە لە دوکانێکی ئاسایدا بوو، لەوێ هەمزە کەناس و جەمال مورسەل و عارەب عوسمانمان ناسی و بووین بە ئەندامی یەدەگی تیپەکەیان.. لەکاتی یاری کە تۆپ دەچووە دەرەوەی گۆڕەپان ئێمە دەمانهێنایەوە و زۆریشمان کەیف بەخۆ دەهات.

ئینجا لەگەڵ گەورەکان هاموشۆی گۆڕەپانی گەورەی شارمان دەکرد و لە

کاتێکدا تیپی تۆپی پێ ی هەولێر یاری هەبا لەگەڵ تیپی شارێکی دی دەچووین و خۆمان بەسەیری یاری خەنی دەکرد، هەر لەوێ (شێرۆ خەلیل و خالید رەسوڵ و محەمەد عوسمان و مەمۆ خەلیل و نەریمان محەمەد و شەهاب ئەحمەد و عومەر کەلله و عومەر سەرچێڵ و شەهید سەید مورسەل و نەجات عەبدولواحیدو سەردار محەمەد و دڵشاد تەحسین و شێردل تەحسین و سەمیر عەبدوڵڵا و عەزیز نامیق و عەدنان فەتاح و فاروق تۆفیق و خالص قۆجە و بورهانی مام رەسوول پاقڵاوەچی )مان ناسی.

من زیاتر بە (شێرۆ خەلیل) ی گۆڵچی سەرسام بووم، بۆیە زۆر بە وردی لەکاتی یاری چاودێریم دەکرد و پاشتر کە خۆم دەبوومە گۆڵچی لەکاتی یاریەکانمان لاسایی (شێرۆ)م دەکردەوە.

لێرەوە، من باشتر خولقم لەگەڵ تۆپی پێ کرایەوە.. لە قۆناغی خوێندنی ناوەندی هەر گۆڵچی و ئەندامی هەرە دیاری تیپی ناوەندی جمهوری بووم.. چەندین یاریمان لەگەڵ ناوەندیەکانی دی دەکرد و من ئەو گۆڵچیە چاکە بووم کە بە دەگمەن گۆڵم لێدەکرا.

لەساڵی (١٩٧٤) هەرکە کورد هەموو ڕووی لە شاخ کرد و شەڕ لە نێوان شۆڕش و حکومەتی بەعس هەڵگیرسایەوە. ئێمە لەو دیو لە ئۆردوگای (کانی سپی) وەك پەناهەندە لە ناو خێمەی شێرۆ خورشید گیرساینەوە.. لەوێ تیپێکی تۆپی پێمان پێکهێنا کە جگە لە خۆم وەك گۆڵچی ئەم یاریزانانەمان لەگەڵ بوو (زاهیر کەریم.. مامۆستا سەلام خۆشناو مامۆستا عومەری سلێمانی وەك ڕاهێنەرمان بوو لە تیپەکە.. جەمیل شەقڵاوەیی، تەهای خۆشناوەتی و کوڕە جوانەکانی ڕواندزێ بەداخەوە ناویانم لە بیر نەماوە، ئیدی ڕۆژانە ڕاهێنانمان دەکرد و یاریمان لەگەڵ تیپەکانی دی ساز دەدا.

دوا یاریم و دوا خولیا و وازهێنانم لە یاریی تۆپی پێ.. تیپی ئێمە کە هەر ناوی تیپی تۆپی پێی کانی سپی بوو.. بە میوانی چووینە ئۆردوگای زێوە تا یارییەکی دۆستانە لەگەڵ تیپەکەی ئۆردوگای ئەوێ بکەین.

لەوێ.. چاومان بە کاپتنی تیپی هەڵبژاردەی کوردستان (سەباح شێخ جەلال )

ناسراو بە سەباح سەرسۆر و یاری زانی بەناوبانگی هەولێر (کانەبی حەمباڵ) کەوت کە تازە تیپی (هەڵبژاردەی کوردستان) یان درووست کردبوو، هاتبوونە ئەمدیو تا یاری لەگەڵ تیپی شارە کوردییەکانی رۆژهەڵات بکەن.

لەو یارییەی نێوان ئێمە و تیپی ئۆردوگای زێوە، کانەبی حەمباڵ بووە حەکەم و یارییەکەی بەڕێوە دەبرد.. لە گێمی یەکەم یارییەکە هیچ بە هیچ تەواو بوو و منیش بەرگرییەکی چاکم لە گۆڵەکەم کرد و نەمهێشت گۆڵم لێ بکرێ.

لە گێمی دووەم.. لەبەرگری بەردەوام بووم.. کەچی لە هێرشێکی ئەوان بۆ سەر گۆڵی من.. لەناکاو یاریزانێکی زەبەلاحی ئەوان لە دواوە هەر دوو قۆڵی منی گرت و بە تەواوی بەرزەفتی کردم کە نەمدەتوانی بە هیچ جۆرێك بجوڵێمەوە.. منیش لە تاوان هاوارم کرد و گوتم:

—سەگباب قۆڵم بەردە.

ئیدی لەتاو ئازاری قۆڵەکانم کردمە جنێودان و هات و هاوار.. هەینێ (کانەبی) حەکەممان هاتە پێش و لە جیاتی تۆڵەم بۆ بکاتەوە.. فیکەی لێدا و یاری یەکەی راگرت و منی لەناو گۆڵ وەدەرنا و دەریکردم گوتی:

—دەبی دە دەقە گۆڵ بەڕەلا بکەیت و لەپشت، خەتێ راوەستی.

ئەوە بوو لەماوەی ئەم دە دەقەیە گۆڵێکمان لێکرا و بەو گۆڵەش بووینە دۆڕاوی یارییەکە.

لەکاتی گەڕانەوە و لەناو پاس.. هەموو برادەران بەچەپڵە رێزانەوە گۆرانیان دەگوت و زاهیر کەریمیش لە ناوەڕاستیان هەڵدەپەڕی و بە دوو دەستان لە تاو کەپلی بەجێ ماوی لە هەولێر لەسەری خۆی دەدا.

هەر لەناو پاس و لە کاتێکدا لە ئۆردوگای کانی سپی نزیك بووینەوە.. هەموو برادەرانم لەناو پاسەکە بێدەنگ کرد و ڕامگەیاند:

—برادەرانی خۆشەویست هیوادارم ئێوە لەم یاری یە جوانەتان بەردەوام بن.. بەلاّم من بڕیارم داوە چیتر و ببڕای ببڕ نێمەوە ناو یاری و بەیەکجاری بای بای لە گۆڵە جوانەکەم دەکەم. لە هەینێوە پێم بە هیچ تۆپێك نەکەوتووە

## لەسەرگەڕان و قوربانی

باپیرم، باوکی دایکم کەبە (بابە حاجی) بانگمان دەکرد، پیاوێکی زۆر بێدەخل و نەرمونیان و بێ قسە و قسەلۆك بوو.. ئێمەی نەوەی خۆی زۆر خۆشدەویست.. چیمان بویستبا بۆی فەراهەم دەکردین و قەتاوقەت بەرامبەر بەئێمە (نا)ی نەبوو.

چەندین جار، عەبدولقادری برام بەقەستی خۆی نەخۆش دەکرد و خۆی دەهێنا مەلایێ، بابە حاجی تەنگاو دەبوو دەچووە بن سەری و ماچی دەکرد و دەیلاواندەوە و دەیگوت:

– عەدۆکە، چدەخۆی؟ حەزت لەچییە؟ بچم فەشافیشت لۆ بینم؟

هەینێ عەبدولقادریش چاوی دەکردەوە و دەیگۆت:

– حەزم لەجگەرییە، جگەر خۆشە!

کەلەراستیدا هەر لەبەر (جگەر)ەکەش خۆی بەعاردیدا دەدا و دەچووە ناو جێی، دەنا وەکیدی چ عەلەمی لێنەبوو.

ئینجا بابە حاجی دەلعاز دەچووە لای جەمالی جگەرچی و نەك هەر جگەر.. . چەندین شیش لەجگەر و دڵ و گون و گورچیلە و کەبابی دەهێناوە و لەبەردەمی عەدۆی دادەنا و بەئێمەشی دەگوت:

– کاکۆ وەرن.. زۆرم هینایە بەشی هەمووان دەکات.

ئیدی عەبدولقادر چاك دەبۆوە و ئەمەش تێر جگەر و کەباب دەبووین.

دەیان جار پارەی رۆژانەی خۆم کەهەر لەدایکم وەردەگرت و زوو بەزوو خەرجم دەکرد، ئینجا دەچوومە گژ بابە حاجی لەدوکانێ و درهەم و دوو درهەمم لێوەردەگرت. هەرگیز نەیدەگوت: ئەدی رۆژانەی خۆت وەرنەگرتیە؟ یان بپرسێ: پارەت لۆ چییە؟ چ دەکڕی؟

ئەو بابە حاجیەی مە، یەك تاقە برای لەخۆ گەورەتری هەبوو، مام حوسێن، یەکتریان زۆر خۆشدەویست و رێزیان لەیەکتر دەنا. لەبیرمە (بابە حاجی و دایە حاجی) تازە لەحەج و وڵاتی سعودیە هاتبوونەوە، وا دیارە لەوێ بابە حاجی لەبەر ماندووبوون و شەکەتی رێگا دوور و درێژەکەی نێوان هەولێر مەککە و مەدینە، تووشی نەخۆشییێك بوو هاتە مردنێ و بەپەلەپەل و مەلا فەتحولڵایان بانگ کرد کەسورەتی یاسینی لەسەر بخوێنێ.. لەکاتێکدا ئێمە لەگەڵ دایکم هەموو لەژوورەوە لەبن سەری دانیشتبوین و بۆی دەگریاین، مام حوسینی برا گەورەی لەتاو (حەسەنی) برا بچوکی بەچاوی پڕ لەفرمێسك و بەدەنگی بەرزی (وەی بابەڕۆ.. وەی براڕۆ پشتم نەشکێنی) سێ جاران بەچیچکانەوە لەسەر سەری بابە حاجی سوڕایەوە و خۆی بەقوربان کرد.. ئینجا ناردی حەیوانێکیان بۆ هێنا و گوتی با ئەم حەیوانە ببێتە سندووقە سەری حەسەنی برام و گۆشتەکەیان بەسەر ماڵە جیرانانندا دابەش کرد. ئەوەبوو بابە حاجییە بەرەحمەکەیمە پاش وەرگرتنی دەرمان و چارەسەر نەمرد و وردە وردە تەندروستی چاك بۆوە و هێز و گوڕ و تینی جارانی هاتەوەبەر، سمێر سۆری باپیریشم هەر بۆ خۆشی، پێیدەگوت:

– حاجی حەسەن.. ئەوجارەش نەمردی و کفنت دڕاند.

ئێمەش هەموو لەخۆشیاندا پێدەکەنین.

## وەدیع ئەلسافی لەتەیراوەی

پێشتر ڕۆژانە پیاوێکمان دەدیتماڵیان لەپشت باخچەی کورد و عەرەب بوو و لەناو بازاڕی لەریزە دوکانەکانی ڕۆخ یانەی فەرمانبەران دوکانی سەرتاشی هەبوو.

کەچی کەوردە وردە تەلەفزیۆن لەهەولێرێ کەوتە ماڵان و شەوان بەدیار بەرنامەکانی تاکە کەناڵی تەلەفزیۆنی بەغدایێ دادەنشتین و سەیری گۆرانیبێژە عارەب و فیلمە میسرییەکان و ڕەقسی شەڕقیمان دەکرد.. گۆرانیبێژێك پتر لەهەمووان سەرنجی منی ڕادەکێشا و لەلام نامۆ نەبوو.. هونەرمەندە دەنگ زوڵاڵەکە ناوی (ودیع الصافی) بوو، خەڵکی لوبنان بوو..

کەچی من لەدڵی خۆم دەمگوت:

– ئەمن ئەو پیاوەم لەتەیراوەی دیتییە، هیچ باوەڕ ناکەم ئەوە عارەب بی و خەڵکی لوبنان بێت.

هەینێ بووە مەراقم و لەسەری کۆڵانی لای باخچەی (کورد و عارەب) ڕادەوەستام و چاوەڕێی هاتنە دەرێی (وەدیع سافیم) دەکرد و بەشێوەیەکی زۆر عاجباتیانە تەماشام دەکرد و هەر کەلێشم ڕەت دەبوو هەتا لای سینەما سیروان بەدوایدا دەڕۆیشتم، دیارە ئەویش هەستی کردبوو من ئاوا سەرنجی دەدەم بەدوایدا دەڕۆم، بۆیە بەزەردەخەنەوە لێی دەڕوانیم و بۆم دەگرژییەوە. ئەو زەردەخەنە و گرژینەوە هانیاندام تا جارێکیان هەر کەگەیشتە لای من، سڵاوم لێکرد و گوتم:

– مام وەدیع کوی باشی؟

* مام وەدیع کێیە تۆغلم؟ (کابرا وای وەڵام دامەوە).

– وەدیع سافی ناو تەلەفزیۆنی، ئەدی بەعارەبی گۆرانی و مەوالمان لۆ نارێی؟

هەینێ دیارە ئەو لەمەسەلەکە گەیشت، بۆیە دەستی بەسەرم دا هێنا و هەر بەزەردەخەنە و گوتی:

– کوڕم ئەمن هەونیمە.. ئەمن ناوم ئەحمەدە.. بەئەحمەد بەربەر مەشهورم.. خەڵکی هەولێرمە و منداڵی قەڵاتێمە.. زۆر کەسیش دەڵێن بەوەدیع ئەلسافی دەچی!

## هەر لەتەیراوەی سەر سپیەك

زۆرجـاران، هــەر کەلەکۆڵانەکـەی خۆمــان هەڵدەکشـاین و بـەرەو ئاوبـار پیاسـەمان دەکرد، سـەرنجی مـن بـەلای یـەکێکی سـەر سـپی دا کەمەنـدکێش دەبوو، عەسران ئەو سەر سپیە ئامێرێکی مۆسیقای لـەناو کیفکـە بەدەسـتەوە دەگرت و هەرتك هەرتك بەرەو ناو بازاڕ ملی رێگای دەگرت، مـەراقم بـوو بـزانم ئەو ئامێرە مۆسیقیە چییە بەدەستییەوە و دەچی چ دەکات. لەمـەراقان هـەر لەماڵی خۆمان بەدەبەیێکی باغەی پان و گەورە و بەدارێکی کەمێك مل درێـژ و پان و بەچەند داوە عەمەلیاتی خەسـتەخانان ئـامێرێکی وەك ئـامێری دەسـتی سەر سپیەکەم دروست کـرد و رۆژانـە بەتینگـە تیـنگ خـۆم مەشـغوڵ دەکـرد، هەرکە تینگە تینگی ئامێرە باغەکەم درێـژەی دەکێشـا دایـە حـاجی دەکەوتـە پرتە پرت و دەیگوت:

– پەکوف، خوا قوەتت نەدا، منداری عالەمێ فێرە سەنعاتەکی باش دەبی، کوڕیمەش بەو تینگە تینگە مێشکی سەری بردینە.

مەراقەکـەم پـتر بـوو، لەماڵێکـدا ژمارەیێـك کـەس زۆربـەیان سـەر رەش و ئاسایین، کەچی کچ و کوڕێك.. خوشك و برایێـك لـەناو ئـەو ماڵـە سـەر سـپی و سەرنج راکێشن و هەر حەز دەکەی سەیرییان بکەی.

هەندەیدی مەراقەکەم تـاوی سـەند، دوور و نزیـك بـەدوای ئـەو پیـاوە سـەر سپییە کـەوتم و بینـیم دەچـێتە نـاو بـازاڕ و لەبینایـەیێك لادەدا کـەوردە وردە خەڵکی وەك ئەو ئامێرییان بەدەستەوەیە و لەوێ خڕ دەبنـەوە.. هـەینێ خـۆم گرخاند و چـاوەڕێ و گـوێ قـولاغ بـووم.. لـەهیکرا دەنگـی مۆسـیقا و ئـاوازی بەجۆش ئەو ناوەی خرۆشاند و نـەوەك مـن ئـەوەی بەوێـدا تێدەپـەڕی کـەمێك هەروەستەی دەکرد و عەیامەك گوێی لەمۆسیقا دەگرت و ئینجـا ئـەوێی بـەجێ دەهێشت.

منیش لەماڵێ لەگـەڵ ئـامێرە مۆسـیقییەکەم و بەلاسـایی کردنـەوەی ئـەوان

بەترینگە ترینگ ئامێرەکەم دەژەند، کەچی نەئاوازێك نەئاهەنگێك لەو ئامێزە باغەیەم دەرنەدەچوو.

هەینێ، لەکاتی ئاهەنگ و بووك گواستنەوە لەتەیراوەی، دوای مەولوود و سەڵەوات لێدان و بەخشینەوەی زەرفی پڕ لەبەداملی و نەعناع و چوکلێت و لوقمی بەتام، هەر کەمەلا پایدۆستی لێدەکرد و هێشتا بەتەواوی لینگی ئاودیو نەدەکرد.. لەسەربانی ماڵی زاوا مێز دەڕازایەوە و تاخم و تەدارەکی ئاهەنگ دادەمەزرا و سەرمێزەکان بەمەزە و قاپی ئارەقی مەستەکی و ئەبو کەلەبچە پڕ دەکران و دۆڵکەی پڕ لەبوز و پەرداخی تایبەت بەئارەق ملیان قیت دەکردەوە.

دیسان لەو شەوە ئاهەنگانە، شانبەشانی هونەرمەندان واحید مەرجان و مستەفا رەئوف و جەودەت شاکر، من ئەو سەر سپیەم دەبینی و لەگەڵیاندا دادەمەزرا و جوق و مۆسیقایان ساز و ئامادە دەکرد.. منیش لەکونجێك پتر چاوم زەق دەکردەوە و هەر چاوێکم دەکردە چوار چاوو نەمدەتروکاندن. ئیدی سەرگەرم دەکرا و وردە وردە پێك لەپێك دەدرا و کوڕە گەنجە نزیکەکانی زاواش قسوریان لەخزمەتکردن نەدەکرد.. هەر کەهەموو شتێك باش و لەبار دەبوو، ئینجا مشکۆی بلیمەت و محەمەد ئەحمەدی دەنگ ئاسمانی و جامیلەی سایەق و حاجی جەمیل قاپقاپچی، بەبەستە و مەقامات و قۆریات و کەرەم مەجلیسیان دەهێنایە جۆش و خرۆش، لەگەڵ هەر ئەغام ئەغامێك سەر سپی و رەفیقەکانی پتر دەهاتنە دەست و باشتر و سازتر مۆسیقایان لەگەڵ ئەم دەنگە جوانانە دەگونجاند.

شێرازد سەرسپی رۆژ بەرۆژ لەلای من جوانتر و جیاوازتر لەخەڵکی دی دەهاتە بەرچاو.. هەموو هیوا و ئاواتم نزیك بوونەوە بوو لێی تا یەك دوو قسانی لەگەڵ بکەم.. ئای خودایە پاشان زانیم، ئاشنایەتی و برایەتی لەگەڵ ئەو پیاوە سەرسپی و مۆسیقازان و قسە خۆش و مەجلیس جوانە، چەند بەتام و بەلەزەت و گەورەییبە.

## قەردارەكەی رەفیقی باوكم

رۆژانە گوێبیستی هەواڵی شۆڕش و چالاكیەكانی پێشمەرگە دەبووین، لەناو شاریش دڕندەكانی حەرەس قەومی شەڕیان بەدار و بەرد دەفرۆشت و لەگەڵ كەس بەهەقیان نەدەكرد، خەڵكی هەولێریش بۆیە قوڕەكەی یەكجار خەست بوو چونكە چەند كۆنەپارێز و تۆرانچی زۆڵ و خۆفرۆش، بوو بوونە چاوساغی بەر لەشكری ئەو حەرەس قەومیانە و هەر ئەوانیش خەڵكی كوردپەوەر و دڵسۆزی شۆڕش و جەمەدانی بەسەرییان بۆ دەست نیشان دەكردن و بەقەولی خۆیان (چوغڵیان) دەكردن و بەگرتن و بەلێدانیان دەدان و ئەوانیش لەپەنای حیزبی بەعس و حەرەس قەومییەكە تۆرانچییەتی خۆیان دەكرد و دژی كورد و كوردایەتی قسەی نابەجێیان بڵاو دەكردەوە قەشمەرییان بەكرمانج و خەڵكی دەشتێ دەكرد، هەتا برا توركمانە رەسەنەكەی هەولێرییانیش لێیان پەست و تووڕە بوون، حاشایان لێدەكردن.

ئەوێ رۆژێ.. باوكم شوفێری خەتی (هەولێر- موسڵ) بوو، لەگەڵ (حەسەن قەردار)ی برادەری رۆژانە لەرێی موسڵێ نەفەرییان دەهێنا و دەبرد، حەرەس قەومیش زەبر و زەنگیان لەتامێ دەرچوو بوو.. پاش نیوەرۆیەك هەر كەباوكم و حەسەن قەرداری برادەری نەفەران هەڵدەگرن و لەموسڵێرا بەرەو هەولێر بەرێ دەكەون، ئەو رۆژی لەناو موسڵێ كێشەیەك دروست دەبێت و شێخێكی گەورەی عارەبان دەكوژرێ، لەكاتی بەرێكەوتن و هاتنەوەیان بۆ هەولێر دەبینن.. لەدەروازەی شاری موسڵ حەرس قەومی بازگەیان داناوە، هەر كەدەگەنە ئەو بازگەیەی حەسەن قەردار لەپێشەوەیە و باوكیشم لەدوای.. حەرەس قەومیەكان حەسەن بەرێ دەكەن و نۆبەی باوكم دێ.. كەچی ئەوان دەكەونە لێكۆڵینەوە و مشت و مڕ و لێپێچینەوە لەنەفەرەكان و بەم

شێوەیەش باوکم مەحتەل دەبێت و حەسەن قەرداری برادەریشی ناوێرێ چیتر چاوەڕێی بکات، هەر کەتاریکی دا هات و باوکم چ سەر و سەودای نەبوو، هەر ئەوکاتیش حەسەن قەردار هات و هەواڵی دواکەوتن و دەستگیرکردنی باوکمی پێراگەیاندین.. ئیدی بووە شین و گریان و بابەڕۆیەك وا هەست دەکرا دە پازدە مەیت لەو گۆڕەی کەتیە، من لەهەمووان خراپتر دەگریام لەتاو باوکم خۆم بەدار و دیوار دادەدا.. زوو زووش دایکم دەیگوت:

– تازە لەدەست ئەو زاڵم و کافر بابانە قەت قورتاری نابی و هەر دەیکوژن.

دایە حاجی باگۆی دەداوە:

– هەرچەندە پیاو کوشتن و ئاو خواردنەوەیان لەلا وەکی یێکە، بەران خوا گەورەیە خێرەکی لەخۆمان دەگرین کەبەسەلامەتی لەچنگ ئەو پیاوکوژ و قەسابانە قورتاری ببی.

بەم شێوەیە هەر خزم و ناسیار و دەر و دراوسێ بوون تێك قژقژان و هەموو لەماڵێ مە دەورەیان لەدایك و نەنکم و ئێمە دا، هەتا درەنگی شەوێ لەکۆڵانێ و لەپێش دەرگا شینی بێمەیت گێڕدرا.. دەوری کاتژمێر (١٢)ی شەو لەهیکڕا یەکێك بەهاوار و دەنگی بەرز گوتی:

– وەڵڵا ئەوە قەمەرەکەی کاك عەبدوڵڵایە.. ئەوە هاتەوە.

ئینجا پیرە دۆج لەجادەیڕا رووی لەکۆڵانێ کرد و لەپێش دەرگای ماڵێ راوەستا و باوکم لەناویدا هاتە دەرێ. بووە هەرا.. لەشین و سنگ کوتانێ را بووە خۆشی و شادی و هەلهەلە لێدان و فرمێسکی خۆشی، بێگومان من لەهەمووان زیاتر خۆم لەباوەشی باوکم نا و بەهەردوو باسکم ئامێزم لێوەرینابوو هەتا تێر ماچ نەبووم بەرمنەدا.

# لەفەی هێلکە

لەپڵاو برنج و مەرەگەی فاسۆلیا و پەتاتە و کفتە و دۆڵمە و شفتە هەتا گیپە و پڵاو ساوار بەگۆشتی کەڵەبابی، من لەفەی (سەموون)ی جا هەرچییەکیان بۆ لەناو دانابام سەد قات لەلام خۆشتر و بەلەزەتتر بوو.

هەر کەلەقۆناغی خوێندنی سەرەتایی دەچووینە قوتابخانە، پیاوێکی درێژ عەرەبانەیێکی لەبەرامبەر دەرگای قوتابخانەکەمان رادەگرت، نۆکاو و سەموونی هەبوو، من هەموو رۆژێك نۆکەکەم لەناو سەمونێك دەکرد و دەمدا بەر قەمپاڵان و وردە وردە چەلاوەکەشم لەگەڵ هەڵدەقوڕاند.

دوکانێکی (رۆست) لەژێر قەڵا و لەوبەری بەرامبەر چاپخانەی کوردستانی مامۆستا گیوی موکریانی هەبوو، ئەو کاتەی باسی دەکەم ناوەڕاستی حەفتاکان بەسەرەوەیە.. لەم دوکانە بچووك و باریکە خۆشترین و بەتامترین گۆشتی رۆستیان ئامادە کرد، بەلەفە و بەقاپ پێشکەش دەکرا، دەیانجار چوومەتە گژ بابە حاجی لەدوکانێ کە لەژێر هوتێل سەفین بەرامبەر مەحکەمەی بوو، سێ درهەمم لێوەردەگرت و دەچووم قاپێك رۆست و دوو سەمونم ئەوەندە بەتام دەخوارد هەنوکەش لەزەتەکەی لەژێر زمانمدا ماوە.

دوو دوکان هەورازتر لەرێزە دوکانەکانی بەرامبەر دەرگای سینەما سیروان، کابراییێکی خەڵکی باڵەکایەتی (رۆست)ی ئامادە دەکرد، ئەوەندە بەتام و لەزەت بوو مەراقم کردبوو جارێك بچم و سەری قەرەباڵغ نەبێت و بەکەماڵی ئیسراحەت بڵێم: لەفەکم بدێ. بەهەموو دەمێ شەش حەوت موشتەری چاوەڕوانی وەرگرتنی لەفەی رۆستی خۆیان دەکرد هەتا بەوپەڕی لەزەتەوە بیدەنە بەر قەمپاڵان.

لەسەری کۆڵانی چایخانەی شیرین، بەرامبەر تۆمارگای مشکۆ، پیاوێکی

درێـژ و پـاك و خـاوێن لەفـەی مریشـك و پەتاتـە و هێلکـەی ئامـادە دەکـرد، زەڵاتەکی دروست دەکرد باوەڕناکەم هەتا ئێستاش شتاقە ژن بتوانن زەڵاتـەی وا بەتام دروست بکەن.

هـەر ئـەوان رۆژان، لەپشـت دیـواری دائـیرەی تەلـەفۆناتی هـەولێر لـەنزیك قشـڵەی پۆلیسـان، لەسـەر عارەبانـەیێکی کـەمێك پـانوپۆڕ، وەسـتا (سـابیر) بەتەنێ شفتە و نان و سەمونی هەبوو، بەڵام شفتە بوو نەك گەمە.. شاگردێکی لەبەردەست بوو و هاوکاری دەکرد نـاوی (غـازی) بـوو.. ئـەو شـفتەیە و تـام و لەزەتەکەی قەت لەبیرم ناچێتەوە.

کوبـە خڕەکـەی مـام سـەیدی هـەر مەپرسـە، هـەر کەعەسـران بـەخۆ و بەمەنجەڵی پڕ لەکوبە دەهاتە بەر دەرگـای قەیسـەری، پیـاوم دەویسـت خـۆی پێڕابگیرێ و یەك دوو کوبان ئاودیو نەکات، ئای لەسەر کوبە خڕەکانی مام سە یدی لەناو قەیسەری پیرە هەولێرێ بەدەستی باپیرە خدر سمێـر سـۆرم لێـدان خواردیە کەچی پاش لێدانەکانیش (کوبەی برنجی مام سەید)ی لەلام بەتامتر و بەلەزەتتر دەبوو.

هەتا لەبیرم نەچووە.. کەلەلای (باتا)ی بەسەردەکەوی و لا دەکەیەوە بەلای قەیسـەری لـەبن دیـواری دوکـانی قەسـابەکانی ئەوسـا.. . پیـاوێکی سـادە و ساویلکە و نەرم و نیان، کەمدوو و خاو و خلیسك ناوی عیـزەدین بـوو، لەفـەی هێلکەی کوڵاوی هەبوو، کەهێلکەکەی بەچەقۆ بەخڕی لەناوەڕاسـتەوە دەکـردە دوو کەرتك و سەمونەکەی لێـك دەکـردەوە و هـەردوولای سـەمونی بەهێلکەکـە سـواغ دەدا و تـەڕەپیاز و تەماتـەی لـەناو ڕێـز دەکـرد، لـەقاپێکی پلاسـتیکی گچکۆکەش ئـاوی تورشـیاتی زەردی تێـدەکرد و لەپێشـی دادەنـای، لەفەکـەی هێلکەی کوڵاو و ئەو ئاوە زەردە ترش و مزر و تیژە لـەناو ئـەو قاپـە گچـکۆکە پلاستیکیەی، لەهەموو دونیایێ تام و لەزەتی وابوونی نەبووەو نابێ.

## دڕانی پەردە

ئاگری شەڕی نەگریسی براکان هەموو لایەکی دەسوتاند، مەلایی لەشاخ و سەر چیاکان لەشۆڕشدا بوون و جەلالیەکانیش لەناو شار مەقەڕییان کردبۆوە و کون بەکون بەدوای مەلاییەکاندا دەگەڕان.

هاوین بوو، ئەحمەد حەسەن بەکر لەسەر حوکم بوو، لەتەیراوەی قات و قڕی ئاوێ بوو، ئاو لەکۆڵانەکەی ئێمە و یەك دوو کۆڵانی دی نەدەهات و بێئاوی هەراسانی کردبووین، دەبوایە شەوان مەنجەڵ و پەقرەج و تەنەکە و دەبان لەعارەبانەی بارکەین و بچینە گەڕەکی خوارێ کەئاوییان باش دەهات ئەو کەل و پەلانە پڕ ئاو بکەین و بەپێنج شەشەکان عارەبانەی پاڵ بدەین و ئاوی بگەینیەوە ماڵێ.

ئەوان رۆژان، باوکم لەخەتی رێگای (هەولێر- گەلاڵە) ئیشی دەکرد و نەفەری دەهێنا و دەبرد، زیاتریش ماڵ و منداڵ و خێزانی پێشمەرگەی لەگەڵ باوکم دەچوونە گەلاڵەی و سەرییان لەپیاوەکانیان دەدا و هەر لەگەڵ باوکیشم دەهاتنەوە.

هەر لەجیرانی خۆمان، ماڵێك زاواکەیان پێشمەرگە بوو، کچ و منداڵەکانی زوو زوو لەگەڵ باوکم دەچوون و سەردانیان دەکرد.

جا شەوێکیان لەسەر نۆرە ئاو هێنان و حاجەت پڕکردن ئێمە لەگەڵ کوڕەکەی ئەو جیرانەمان بووە ناخۆشیمان و شەڕە جوێن و دەمەقالێ و چەپەرۆك وەشاندن. تومەز ئەو کوڕەیان بەنهێنی بوویتە جەلالی و هاتووچۆی مەقەرییان دەکات و ئێمەش ئاگامان لەهیچ نییە.. بەس شەوی شەڕەکەی هەڕەشەی لێکردین و گوتی:

- باشە باش لەسەر ئاوێ لەگەڵ من بەشەڕ دێن و نۆبە بڕی ئاوێمان

لێدەکەن، ئەگەر نەمرم لۆنگۆ نامرم.. دەبی کونە رەشتان پێشان بدەم.

یەك دوو رۆژ دواتر، دەمەو عەسر بوو باوکم تازە لەگەڵاڵەی هاتبۆوە، ماندوو هیلاك لەناو حەمامێ بوو خۆی دەشوشت.. لەهیکرا دوو پیکابی پڕ لەچەکدار بەکۆڵانێدا وەربوون و لەدەرگای ماڵی ئێمەیان دا، هاتبوون باوکم ببەن.. ئیدی باوکم بەپەلەپەل لە حەمامێ هاتە دەرەوە و جلکی لەبەرکرد و خستیانە ناو پیکابێك و سویجی قەمەرەکەشیان لێوەرگرت و یەکێك لەخۆیان چووە سەر سوکان و هەرسێ ترومبێل بۆی دەرچوون، بووە شین و گریان و قژ رنینەوەی دایکم و ژنەکانی دی، من هەر بەغار خۆم گەیاندە بابە حاجی، دوکانەکەی لەژێر هوتێل (سەفین)ی بەرامبەر بینای مەحکەمەی بوو.. مەقەری چەکدارەکانیش هەورازتر لەسەری روکنەکەی بوو.. بابە حاجی یەکسەر دەرابەی داداوە و بەگورگە لۆقە خۆی گەیاندە ماڵی باوکی شێخ تاریق کەیەکێك بوو لەسەرکردەی چەکدارەکان لەشاری هەولێر.. بابە حاجی بەینی لەگەڵ باوکی شێخ تاریق و هەروەها دایك و خوشکە گەورەکەی باش بوو، زوو زوو باوکی شێخ تاریق دەهاتە لای لەدوکان و بەیەکەوە چایە عەسرانیان دەخواردەوە.. ئیدی لەدەرگای دا و خۆی گەیاندە باوکی شێخ و گرتنی عەبدوڵڵای زاوای پێراگەیاند و لێی پاڕایەوە بەڵکو هیمەتێك بکات و بەکاکە شێخ تاریقی کوڕی بڵێ زوو بەهانایەوە بچێت.. باوکیشی دڵنەوایدا بەبابە حاجی و گوتی:

– حاجی گیان.. بێ خەمبە بەتاریقی دەڵێم و وەدەکەم بەزووترین کات بەرەڵایکەن..

ئەم بەزووترین کاتە درێژەی کێشا و بۆ پانزە رۆژ لەلایان مایەوە، لەو پازدە رۆژەی باوکم زیندانی بوو لەلایان، بەفەرمانی شێخ و بەئەمری باوکی کەسێك جورئەتی نەکردبوو باوکم ئازار و ئەشکەنجە یاخود ئیهانە بکات، بەڵام

قەمەرەکەیان بەشەو و بەڕۆژ دەڕەتاند و بێرەحمانە بەدار و بەردیان دا دەدا. لەو سەرەوەش دەبوایە هەموو نیوەڕۆیان چەند جۆر لەخواردن لە (برنج و مەرەگە و کفتە و دۆڵمە و شفتە) ئامادە بکرێت و ببرێتە ئەو مەقەڕەی کەباوکم لەژێر زەمینەکەی زیندانی بوو.. کەمێك لەو چێشتە بۆ باوکم دەنێردرایە خوارێ و ئەویدیش چەکدار و کادیرەکانی ناو مەقەر حەپەلوشیان دەکرد، لەلایەکی دیش بابە حاجی دەبوایە زوو زوو وەبیر پیرەمێردی باوکی یاشێخ بهێنێتەوە بەڵکو هیمەتێك بکات و چیدی راینەگرن و ئازادی بکەن، ئێمە خزمی دیشمان لەناو چەکدارەکانو هەر لەهەمان مەقەڕ هەبوو، بەڵام هیچیان خۆیان لێنەکردینە ساحێب و دەیانگوت:

– عەبدوڵڵا جەریمەی کردییە.

کەدەمانپرسی:

– جەریمەی چی کردییە؟

دەیانگۆت:

– ژنە پێشمەرگان دەباتە ناو شۆڕش و دەیانگەیەنێتە ناو گەلاڵەی..

شکایەتەکە ئەوها کرایە، هەتا رۆژێکیان دایە حاجی زۆر تورە بوو گوتی:

– ئاخر رووی رەش بی.. ژنە پێشمەرگەکە هەر خوشکی خۆی بوو لۆ زاوایەکەی بردیە گەلاڵەی.

دواجار پاش ئەوەی باوکی شێخ تاریق گوشارێکی زۆری خستە سەر کوڕەکەی و باوکم لەزیندانی ژێر زەمینی مەقەڕەکەیان یەکجار بێتاقەت و هیلاك بوو و قەمەرەکەیان بۆ کردینە عارەبانە هێندە بەدیواریاندا کێشابوو، ئازادیان کرد و ترومبێلەکەیان بەقۆپاوی و لایت شکاوی داینەوە، لەگەڵ هەندێش کوڕە جیرانەکەمان هێشتا رق و کینی دانەمرکایەوە و ئەمجارە لەئوردی و لەئیستیخباراتی عەسکەری سکالایەکەی نوێ کردەوە.

جارێکی دی، عەسکەر هاتنە کۆڵانێ و بەماڵێ وەربوون و باوکمیان لەقوونی قوتە جێبێکی عەسکەری پەستا و بردییان، ئێمە پتر لەمانگێك لەسۆراخیدا بووین هەتا زانیمان لەزیندانی ئۆردی پشت رەشکینی گیرایە و رۆژی هەینی دادێ دەتوانین بچین و چاومان پێی بکەوێ.

رۆژی هەینی لەگەڵ دایکم و بابە حاجی چووینە موهاجەی باوکم.. هاوین بوو و گەرمای ئەو ساڵی ئاگری دەکردەوە.. ئێمەیان بردە حەوشێك کە ژمارەیێك ژووری سەربان نزم و دەرگای تەسك و باریك و پەنجەرە گچکۆکەیان هەبوو، لەبەر سێبەری لا دیوارێك ئێمە و چەند خێزانێکی دیکەیان دانا و یەك یەك دەرگای ژوورە زیندانییەکانیان دەکردەوە و خەڵکی نیوە رووت لەتاو ئارەقە و گەرمای هاوین و نیوە مردوو رەنگ زەرد و لەڕ و لاواز دەهاتنە دەرەوە و هەریەکەو بۆ لای خێزانی خۆی دەچوو، باوکیشم بەهەمان دەستور هاتە لای ئێمە و لەلامان دانیشت.

لەزاری باوکمەوە ئەوهای تێگەیشتین کە (کوڕە جیرانەکەمان بەو گرتنەی لەمەقەڕی رازی نەبووە، شکایەتەکەی بردیتە ئیستیخباراتی عەسکەری.. ).

باوکم گوتی: لێرە، هەتا یەك هەفتەش وەزعم خراپ نەبوو، یەك دوو جار بۆ لێکۆڵینەوە بانگیان کردم و چەند پرسیارێك و یەك دوو هەڕەشە و گوڕەشە، دەیانناردمەوە ژوورێ، کەچی ئەوێ شەوێ بانگیان کردمەوە.. کابرای زابت دەمولوفتی گۆڕا بوو، توڕە و تووش بوو، گوتی:

– ئەتو دەرێی ئەمن کاسبم و بەنەفەرات ئیشێ دەکەم.. کەچی وا دەرنەچوو و درۆت لەگەڵ من کردیە.

باوکم گوتی وەلامم دایەوە:

– من جگە لەراستی هیچی دیم نەگوتووە، هیچیشم لەخۆم شکنایێ.

باوکم لەگێڕانەوەکەی بۆ ئێمە بەردەوام بوو گوتی: تومەز یەکێك کە

دێوانەیێکی بەناوەکەیەوە بوو لەگەڵاڵە و شۆڕش رایکردووە و هاتیتەوە و تەسلیم بۆتەوە، بۆ لێکۆڵینەوە بانگی ئیستیخباراتی دەکەن، هەر لەکاتی لێکۆڵینەوە ئەفسەرەکە منی بەبیر دێتەوە بەکابرای تەسلیم بوو دەڵێ:

– تۆ لەگەڵاڵە پێشمەرگە بووی، ئێمە شوفێرێکمان گرتووە لەخەتی گەڵاڵەی ئیشی دەکات، بزانە لەوێ ئەو شوفێرەت دیتیە و لەگەڵ کێ هەڵسوکەوتی هەبووە.. تومەز بەبێ ئەوەی من هەست پێبکەم منیان بەو دیوانەیە پێشانداوە و ئەویش گوتبووی:

– ئەوە عەبدوڵلا گێ بەگوارەی شوفێرە، زۆر چاك دەیناسم، هەرچەند جارێکی دەهاتە گەڵاڵەی لەسەربانی بارەگا.. لەگەڵ فەرەنسۆ هەریری پیاسە و قسانیان دەکرد.

باوکم لەگێڕانەوەکەی بەردەوام بوو گوتی: کابرای ئەفسەر هەر پرسیاری دەکرد و لێمدەهاتە پێش، پرسی:

– چ پەیوەندییەکت لەگەڵ فەرەنسۆ هەریری هەیە؟

– هیچ.. هەر ناشیناسم.

– ئەدی چۆن لەسەربانی مەقەری پیاسەتان دەکرد و باسی چیتان دەکرد؟

* باسی هیچمان نەدەکرد.

باوکم گوتی: هەر هەندەمزانی زللەیەك زرمەی لەبنا گوێی راستەم هەستاند، وەمزانی بەپارچە ئاسنێك لێیاندام و ئاگر لەهەردوو چاوم دەرپەڕی.

هەر ئەو زللەیە بووە هۆی دڕانی پەردەی گوێی راستەی و هەتا مردیش دەبوایە هەموو رۆژێ قەترە لەگوێی بکات دەنا پڕ دەبوو لەکێم و جەراحەت.

## سەرخۆشەکانی تەیراوە

ئەو وەختەی ئێمە مێردمندالّ بووین، جار جارە بەدزی دایك و باوکمان جگەرەمان بەقل قل دەکڕی و لەچوونە سینەما سیروان و پیاسەی بن قەلاّتێ بەهەزار ترس و لەرز جگەرەمان دەکێشا و لەوەش دەترساین نەوەك خزمێك ناسیارێك بمانبینێ و لەلای دایك و باوکمان چوغلّمان بکات.

هەر ئەو عەیامەی لەهەولێرێ تاقە یانە (یانەی فەرمانبەران) بوو کەئەفەندی و فەرمانبەر و پیاوماقولاّن شەوانە تیایدا دادەنیشتن و مەیی و شەرابیان دەنۆشی.

ئەوانیدی، کاسبکار و قەساب و فیتەر و گەنجە ئارەق خۆرەکان مەجبوور بوون پاش نیوەڕۆیان دوو دوو و سێ سێ روو لەدەرەوەی شار بکەن، بەتایبەتی رێگای چۆلّی عەنکاوەی تا لەوێ عارەقەکانیان بەلەتێك تەماتە یاخود خیار نۆش بکەن و دوای مڕ بوون و تەواو مەست بوون، هەر لەگەلّ تاریکی شەو جارێکیدی بەپێ دەگەڕانەوە ناو شار.. جا زۆربەی ئەو ئارەقخۆرانە روویان لەتەیراوەی دەکرد، قوڕ بەسەری ئەو ئارەقخۆرەی کەمێك زیاتری دەخواردەوە و تەواو مەست دەبوو لەرۆیشتنێ بەلادا دەهات و بەزائید و ناقیس هەنگاوی دەنا، هەینێ مندالّە وردکەی تەیراوەی بەهۆیها و چەپلّە لێدان بەدوایاندا دەکەوتن و دەبووە گالّتەجاری ئەو مندالاّنە، ئیدی دەبووە هەراییك پتر سەریان لەسەرخۆشە قوڕبەسەرەکە دەشێواند و دەهرییان دەکرد، لەئەنجامدا کاردانەوەی لەلا دروست دەبوو دەستی دەوەشاند، ئەوکاتە مندالّەکان پتر شولیان لێهەلّدەکێشا دەکەوتنە لێدان و بەردبارانی ئەو بەستەزمانە.. لەوێوە گەورەکانیش دەکەوتنە شەق وەشاندن و دەیانگوت:

– لێیدەن.. ئەو سەگبابە گووەکەی خواردیتەوە.. لێیدەن.

ئینجا نۆبەی ئەو ژنانە دەهات کەبەرێکەوت لەبەر دەرگان و جۆگەلە بەگسکەکانیان خاوێن دەکەنەوە، هەرکە دەیاندیت ئەو هەموو خەڵکە لەسەرخۆشێك وەربوونە، ئەوانیش دەست بەگسکەکەوە هێرشیان دەبردو وەردەگەڕانە سەر و گیلاکی سەرخۆشی بەستەزمان و هاوارییان دەکرد.

– ئەنگۆ دوورکەونەوە و لۆ مەی لێگەڕێن. وایلێدەکەین جارەکی دی دەو لەو گوەی نەداتەوە.

ئیدی نەگسکێك و نەدوو هەر هەمووشی لەسەرو گێلاکی دەدرا، هەتا وایلێدەهات کابرای ئارەقخۆر دەبووە تەراح و لەسەر عاردی پێش دەرابەی دوکانە داخراوەکان لێبڕادەکشا و وەك بڵێی ئەمڕۆ نییە ساڵێکە حەیاتی رەشی لێبڕایە، بەمشێوەیە لەبن دەڕابەی دوکانان و هەتا بەیانی لێی دەنوستن و سبەینێش بەسەرو گێلاکی بەخوێن و پانتۆری بەمیز و لەخرتۆرێ وەردراوی بەخەبەر دەهات و بەرەو ماڵ دەبۆوە، تا بۆ جەولەیەکی دی ئێوارە و لەئاقاری عەنکاوە تێهەڵچێتەوە.

# خۆشی و شادیی (١١)ی ئازار

زووتر باسم کردووه باوکم شوفێری ڕێی (هەولێر– گەڵاڵە) بوو، ساڵێك بەر لەبەیانی (١١)ی ئازاری ساڵی (١٩٧٠)، لەگەڵاڵە دەمانچەیێکی (لامەی شۆڕش)ی کڕی بوو، لەناو قەمەرەی شاردبویەوە و هێنایەوە، شەوێ کەتاریك داهات چوو لەحەوت کون و قوژبنان دەمانچەکەی دەرهینا و هێنایەوە ماڵێ.

دایکم گوتی:

– ئەیەڕۆ عەبدوڵڵا ئەو دەمانچەیە چییە؟

دایە حاجی گوتی:

– کوڕم ئەو دوژمنەت لۆ چییە؟ ئەدی نازانی چەك دوژمنە.

دایە بابەی دایکی خۆی گوتی:

– کوڕم.. ئەتو نازانی ئەمە لەناو چ ئاگرێك دەژین، ئەو بەنزینەت لۆ هینایتەوە و ئاگر لەمارێ بەردەدەی.

ئیدی باوکم هەمووانی هێور کردەوە و تێیگەیاندن کەئەو دەمانچەیەی لە (گەڵاڵە) کڕییە.. گوتیشی:

– هابیلە بەقایش و قورشەوە بەنێکی خۆمی وەکەم و خۆمی پێبادەم.

– ئەدی لۆ کڕیتت.. چی لێ دەکەی؟

ئەمە پرسیاری دایکی خۆی بوو.

هەینێ باوکم گوتی:

– قەدە، یەك دوو پارچە پەڕۆو هەندێك لایلۆنم لۆ بینە.

کەدایکم شمەکەکانی بۆ هێنا، باوکم دەمانچەکەی لەناو پەڕۆکێکی چڵکن دەرهینا و سەرەتا جوان جوان سڕیەوە، ئینجا لەپەڕۆییێك و دواتر یەکێکی دیشی وەرپێچا، هەینێ لایلۆنەکانی تێئاڵاند و بەبەنێکی پتەویش توند توند پەڕۆك و لایلۆنی لەدەمانچەکەی شەتەکداو چووە ژووری نوستنی خۆمان و

بەسەر کورسییێك کەوت و دەمانچەکەی لەبن حەسیر و کاریتەی قوژبنی لای بنە بانێی ساپیتە شاردەوە و حەسیرەکەی وەك پێشوو لێکردەوە و لەسەر کورسییەکە هاتە خوارێ و گوتی:

– هەتا رۆژی خۆی دێ، با جارێ لەوێ بی!

جا ئەو شەوەی کەلەئیستگەی کوردستان و ئێستگەکانی بەغدایێ جاڕی رێکەوتن لەنێوان شۆڕشی کورد و حکومەتی بەعسی درا و بەیاننامەی (١١)ی ئازار راگەیەندرا، ئاسمانی هەولێر یەکپارچە بووە ئاگر و تەقەی خۆشی مێشکی بنیادەمی کاس دەکرد، لەهەموو گەڕەك و لەسەر قەڵاتێرا جاش و باش کەوتنە تەقەی خۆشی و گوللە بەئاسمانێ وەنان، باوکیشم قوتە دەمانچەکەی خۆی وەبیر هاتەوە و لەکۆڵانی کەلەگەڵ برادەرەکانی راوەستا بوو کەیف خۆشی خۆیان بەم سەرکەوتنەی کوردستان دەردەبڕی، باوکم بەبرادەرەکانی گوت:

– کاکە ئەمنیش دەمانچەیەکی باشم هەیە، ئەوە دەچم دەیهێنم.. با ئەمەش وەکی ئەو عالەمەی یەك دوو تەقەی خۆشی بکەین. ئەوەبوو لەژووری خۆیان و لەبن حەسیرەکە سەلکە بزۆتەکەی دەرهێنا و ماوەیەك پێوەبوو هەتا بەن و لایلۆن و پەڕۆکی لەدەمانچە لامەکەی شۆڕش کردەوە و بەپەلە خۆی گەیاندەوە رەفیقەکانی و هێشتاش دەنگی تەقەی خۆشی گوێی کەڕ دەکرد و ئاسمانی هەولێرێ گڕی گرتبوو.

باوکم گەیشتە ناوەندی کۆڵانێ و ئێمەش دەورەمان دابوو، دەمانچەی لەبەر کەلەکێ دەرهێنا و هەردوو لاقی لێك دوور کردەوە و شەش ئاگرەکەی سوار کرد و بەرزی کردەوە و لولەی لەئاسمانێ کرد و پلی پێوەنا.. من یەك لەبارە خۆم بەهەردوو دەستم گوێیەکانم گرتبوو گوتم دەمانچەکە ناوی لامەی شۆڕشە حەتمەن دەنگێکی وەك تۆپی هەیە با گوێم کەڕ نەبێت، کەچی نە دەنگ و نە رەنگ، لەگەڵ هەینێش دوکەڵێکی بۆن باڕووتی کەسکون لەجێی یەدەگ و

لوولەکەی بەرز بووەوە.

یەکێك لەبرادەرەکانی هەڵیدایێ و گوتی:

– وەڵڵا بابە دەمانچە خۆش دەمانچە، لەجیاتی تەقە دوکەرێ دەکا!

هەر بۆ سبەینێ لەجادە و کۆڵانان بووە ئاهەنگ گێڕان و شایی و خۆشی و ووتاف لێدانی:

– پێشڕەوی کورد پارتییە.. سەرۆکمان بارزانییە.

– بژی بابی لوقمانی.. شەش خەریتەی لەشانی.

– کێ بوو خۆی کردە شەکر.. ئەحمەد حەسەن ئەلبەکر.

– بارزان بارزان بارزانی.. بەراستی پاڵەوانی.

دەیان دروشم و هوتافی تریش کەوتە سەر زاری خەڵك و لەشایی و رێپۆیشتن و گردبوونەوەکان دەگوترانەوە.

بووە عادەت، ڕۆژانە لەگۆڕەپانی پێش قشڵە و لەسەر سەکۆی شارەوانی هەولێر کەئەوکاتە بەرامبەر قشڵە بوو، خەڵك کۆدەبوونەوە و هەرکەسەو بەئارەزووی خۆی ئەو خۆشیەی دەردەبڕی، لەولاش سەید کەریم و عەدۆی دۆڵەنگێو شاییان دەگێڕا و ژن و پیاو لەم شاییانە دەست لەناو دەست و شان بەشان شاییان دادەبەست، لەبەردەم سەکۆی شارەوانیش خەڵك کۆنگرەیان دەبەست و ژمارەیێکیش لەسەر سەکۆ رادەوەستان و بەشیعر و هۆنراوە کەبەسەر پێشمەرگە و شەهید و خاکی کوردستان و بارزانی دا هەڵدەدرا دەخوێنرایەوە و خەڵکەکەش بەچەپڵەلێدان هانی شاعیرەکانیان دەدا.. من چەند ڕۆژێك لەسەر ئەم سەکۆ پیرۆزە ئەو شیعرانەم بەدەنگی بەرز و بەدەست راوەشاندن دەخوێندەوە کە زووتر ئەزبەرم کردبوون.. زۆریشم کەیف بەخۆم دەهات و دەمگوت:

– ئەمنیش شاعیرێکم هاوشانی ئەوانەی شیعر بۆ خەڵك دەخوێننەوە، هەستیشم دەکرد خەڵکەکە لە خوێندنەوەکانم رازین.

## شەهیدێك، لە پێناو پارێزگاری دایكی كوردان

عەبدوڵڵای كوڕی كانەبی كوڕی شەریف، ناسراو بە وەستا عەبدوڵڵا.. هەر لە منداڵی و مێرد منداڵی یەوە دیاربوو توانای سەركردایەتی و برا گەورەیی و سەردەستەی هاوتەمەنەكانی خۆی هەبوو لە گەڕەك و لە ناوكۆڵان.. هەمیشە بە چاوی برا گەورە سەیرمان دەكرد و هەر لە خۆشەویستییەوە لە ناو خۆمان بە كاكە (عەبۆ) بانگمان دەكرد.

دڵی زۆر باش بوو، لەگەڵ برایەكانی لە ناو فیتەران و ناوچەی پیشەسازی دوكانیان هەبوو كاری ئاسنیان دەكرد، لەوێ ڕۆژێوە بە وەستا عەبدوڵڵا ناسرا.

هێندە برادەر و هاوتەمەنەكانی خۆی لە تەیراوەی خۆشدەویست.. هەر جارەو بەنۆبەت لە دوكانێ بە تێلی سفەیف (ئەوەی فەردەی جلی لەنگەیان پێ دەبەست ) عارەبانەو لۆری و بۆڵبەرین و قەمەرۆكەی بۆ دروست دەكردین و دەیهیناو پێشكەشی دەكردین، كە دەشیبینی ئێمە دڵمان پێی خۆش دەبێ.. ئەویش گەز گەز باڵای دەكرد و كەیفی دەهات.

لەبیرمە لە ناوەڕاستی شەستەكانی سەدەی رابردوو، منداڵ و مێرد منداڵانی گەڕەكی تەیراوە و قەڵات دەبووە شەڕمان، دار لاستیق و بەردەقانی و خوترمە و بەرچیغی تێدا بەكار دەهێنرا، بەڵام چونكە منداڵانی قەڵات جێگەیان بەرز بوو و لەسەر ئێمەی تەیراوەیی زۆر موسەیتەربوون و لە زۆربەی شەڕەكان ئەوان براوە و ئێمە دۆڕاو بووین.

كەچی ئەو كەڕەتانەی وەستا عەبدوڵڵا و بەهادینی عەلی بۆریچی دەبوونە فەرماندەمان و بەچەند قۆڵێك دابەشیان دەكردین و نەخشەی هێرشیان بۆ سەر قەڵات دادەڕێژرا.. وەستا دەستی خراپی لە قەڵاتیان دەوەشاند و بەسەلامەتیش لەودیوی لای خانەقایێ یارم یارم دادەبەزیە خوارێ.

ڕۆژێکیان جۆرێك لە تفەنگی پـێ بـوو، تفـەنگ نـەبوو بـەڵام پارچـە ئاسـنێکی سارد و سڕیش نەبوو.. هەر بەخۆی بەو دەست ڕەنگینیەی کە لەبواری ئاسندا هەیبوو ئەو چەکەی دروست کردبوو هەر ئەو ڕۆژیش لە شەڕی قـەڵاتێ بـەکاری هێنا.

لێم پرسی:

–وەستا عەبدوڵڵا ئەوە چییە ؟نە تفەنگە و نەدەمانچە، ئـێ خـۆ دیـوار بـڕیش نییە ؟!

گوتی:

–ئەوە بەخۆم دروستم کردییە.. ناوم لێنایـە (تفـەنگی شـیش کـوت )، لـەباتی گوللە شیشی گۆشتی داوێ.

ئەو ڕۆژی بەکاری هێناو بەزمـەکی بـە منداڵـە قـەڵاتیان کـرد، زیـڕ و هۆڕییـان دەگەیشتە خوارێ و ئێمـەش بـە فیکوهـۆڕ و چـەپلە لێـدان سـەرکەوتنەکەمان پیرۆزتر کرد.

ساڵان هاتن و ساڵان چوو.. دەست ڕەنگینی وەستا عەبدوڵڵا لەگەڵ ئاسن پتر بەدیاردەکـەوت.. ئـامێری وای دروسـت دەکـرد لـە خـۆی زێـتر کـەس سـەری لێدەرنەدەکرد، زوو زووش پێ ی دەگوتین:

–ئاسن لەکنەنگۆ ئاسنە.. لەکنە مـن ئاسـن لـە لۆکـەش نـەرمترە و لـۆ ئیشـێ خۆشترە.

هەنوکــەش وا لەبەرچــاومە ، ڕۆژی (١١) ی ئــاداری ســاڵی (١٩٩١) هەرکــە هەولێرییەکان ڕاپەڕین و دام و دەزگای ڕژێمی بەعسییان تەفرو تونا کرد، بەرە بــەری نیــوەڕۆ بــوو، فڕۆکەیــەکی هێلــی کۆپتــەر بەســەر ئاسمــانی هــەولێر دەسوڕایەوە و وازی نەدەهێنا. ئەو وەستا عەبدوڵڵایە، لەتەیراوەی لـە جـادەی تەجنیدی و نزیك ماڵی شێرۆ حەلیمی، بە بیکەیسی و هەر بە پێـوە تەقـەی لـە

کۆپتەرەکە دەکرد و نە رستەیەك و نەدوو رستە گوللە، ئیدی کۆپتەرەکەی ناچارکرد بە یەکجاری ئاسمانە ئازادەکەی هەولێری راپەڕیو بەجێ بێلێ و مل بشکێنی و بەرەو مۆلگاکەی بڕواتەوە.

دواتریش، وەستا عەبدوللا وەك پێشمەرگە و فەرماندە لە سوپای کوردستان بەردەوام بوو، هەرکە خاتوو دانیال میترانی هاوسەری سەرۆکی فەڕەنسا بەسەردان هاتە کوردستان و بەدڵ و بەگیان لەگەڵ دۆزی میللەتەکەمان بوو، تاکە هیواو تاکە خەمخۆری کورد بوو، لەو سەردەمە دەستەیەك پێشمەرگەی ئازا و چاونەترسی وەك دەستەی پارێزگاری لە خاتوو میتران کە لە خۆشەویستییەوە کورد کردیانە دایکی خۆیان و بە (دایکی کوردان ) نێوبانگی دەرکرد.. ئەو دەستەیە بە دڵ و بەگیان پارێزگارییان لە دایکی کوردان دەکرد.. ئەوە بوو لەسەرجەم سەردانەکانی لەگەڵی بوون، لە پەرلەمان و لە شار و شارۆچکەکانی کوردستان.

دواجار، لە رێگای گەڕانەوەیان لە هەڵەبجەی شەهیدەوە بۆ شاری سلێمانی، دڵ رەش و خیانەتکار و ئەڵقە لە گوێ یەکانی رژێمی بەعسی فاشست، مینێکیان بە کاروانی ترومبێلەکانی دایکی کوردان دا تەقاندەوە. لە ئاکامدا دایە رزگاری بوو و بە سەلامەتی دەرچوو، بەلام مەخابن وەستا عەبدوللای قارەمان و ژمارەیەك پێشمەرگەی هاوڕێی بە خوێنی خۆیان دایکی کوردانیان پاراست و رزگارییان کرد و بەسەر بەرزی گەیشتنە کاروانی شەهیدانی کوردستان.

درووود بۆ رووحی بەرزە فڕی شەهید وەستا عەبدوللا و هاوڕێکانی.. یادیان بە خێر.

## نەورۆزی ساڵی ١٩٧٠

خۆشی و شادی بەیاننامەی (١١)ی ئازار و گەڕانەوەی هێزی پێشمەرگە بۆ ناو شار رۆژانە بەردەوام بوو، نەورۆز هات و جەژنەکەمان بووە دوو جەژن، هی نەورۆز و هی سەرکەوتن.

بەهۆی ئەوەی راگەیەندرا نەورۆزی هەولێرێ و ئاهەنگ و خۆشی لەبێستانەی بن هەولێر ساز دەکرێت، هەر بەرە بەیانی رۆژی (٢١)ی ئادارێ خەڵکی هەولێر گەورە و بچووك بەمەنجەڵی پڕ لەخواردن و سەماوەر و قۆرییەوە ملیان لەرێگا ناو بێستانە خۆت بگرە هاتین.

ئێمە سبەینەکەی زوو لەخەو رابووین و شمەکی پێویستمان لەسندوقی قەمەرە پەستا، هەموو سواری پیرە دۆجی بووین بارۆ بۆ بێستانەی، ئا با لەبیرم نەچێت هەموو جلك و بەرگی کوردیمان پۆشی.. زێدەتر باوکم دەمانچەکەی کەلامەی شۆڕشیان دەگۆتێ لەبەر پشتێندنا.

شار ئەو وەختی گچکە بوو، هەر لە سنووری شار ئاودیو بووین، گەیشتینە بازگەی پێشمەرگەی، ژمارەیێك پێشمەرگەی خاکی لەبەر و تفەنگ لەشان و تیلاك خوار کەخوشکی خۆیان حەیرانیان دەبوون ئەوەندە جوان بوون، سڵاویان لەخەڵك دەکرد و بەخێرهاتنی میوانانی رێگاکەیان دەکردن و بەفەرموو فەرموو خەڵکەکەیان بەرێ دەکرد، هەر کەئەمە گەیشتینە لایان و باوکم جامی لای خۆی هێنا خوارەوە و سڵاوی لێکردن ئەوانیش سڵاویان سەندەوە، ژنەکانی ناو ترومبێلی ئێمە کردیانە هەلهەلە لێدان و هەزار جار خۆیان بەقوربانی بەژن و باڵا و دەست و تفەنگی برنۆی ئەو پێشمەرگانە کرد و هەتا لێیان تێپەڕین هەلهەلە نەبڕایەوە، کەبەرێ کەتینەوە، باوکم گوتی:

– بەخوای ژنینە ئیشەکی چاکتان کرد، وەعد بی سبەینێ سەر و قەدە

جلەکی جوانتان لۆ بکڕم.

ئیدی لەگەڵ خەڵکی بەڕێکەوتین، ئەوەی بەقەمەرە.. ئەوەی بەجێبە قوتە یاخود تراکتۆر.. هەندێکیش لۆریان پڕ لەخەڵك کردبوو و ملی ڕێیان گرتبووە بەر، هەشبوو بەپایسکل یاخود بەپیادە ڕێی بێستانەیان دەکوتاوە.

یەکەمین زورگ کەلەڕێیە خۆڵەکە گەیشتینێ چەند پێشمەرگەیێك لەسەر بەرزاییێك بەپێوە ڕاوەستابوون و لەبان سەریشیان لولەییێکی درێژ قیت کرابۆوە و ڕووی لەهەولێرێ کرابوو، باوکم گوتی:

– ئای لەخوای گەورە بەزیاد بی، پێشمەرگە و شۆڕش تۆپ و مەدفەعیشیان هەیە.

هەموومان بەبینینی ئەو لوولە عامموودە دوور و درێژە خۆشحاڵ بووین.

ئەوەبوو گەیشتینە بێستانە و وەك ئەو خەڵکە لەناو بەردان و لەو ساکە بەیارەی جێگامان گرتوو ڕایەخ ڕاخرا، لەهەورازیش دیاربوو وەك تەختەی شانۆ سەکۆییێکیان دروست کردبوو، کە بە ئاڵای ڕەنگاوڕەنگ و لافیتەی بەخێرهێنان و دروشمی نەورۆز ڕازێنرابۆوە.

هەر کە ئاهەنگەکە دەستی پێکرد، سەرەتا ڕێڕۆیشتنی هێزەکانی پێشمەرگە لەبەردەم شانۆ بەدروشمی بژی پێشمەرگە، کوردستان یان نەمان ئەو خەڵکەیان جۆشدا و دڵخۆشیان کردین خەڵکەکەش پێشمەرگەکانیان گوڵباران و هەلهەلە باران کرد، دواتر تیپی مۆسیقای هونەرمەندانی هەولێر چوونە سەر سەکۆیەکە و شوێنی خۆیان گرت، ئینجا پیاوێکی خاکی لەبەر دەمانچە بەنێکەوە، تۆزەك تیلاکی خوار کردبوو بەلای چەپ، ئەو خارە بارزانی مەلا خالیدی بوو بەدەنگە زوڵاڵەکەی چەند دروشمێکی خوێندەوە، پاش خوێندنەوەی چەند وتارێك لەلایەن بەرپرسانی پارتی، نۆرەی گۆرانی هات، سەرەتا هونەرمەند فوئاد ئەحمەد بەسرودی ئێمە پێشمەرگەین هەتا ماوین

لەژین و گۆرانیەکانی دی نەورۆزەکەی پیرۆزتر کرد، دواتر نۆبەی حەیران هات و مام رەسوڵ گەردی چووە سەر شانۆ و کردیە بەزم و رەزمی خۆی و بەچاوی خۆم دەمدی پێشمەرگەی برنۆ لەشان لەگەڵ بەندە حەیرانەکانی مام رەسوول گەردی هۆڕ هۆڕ دەگریان، هەتا کاتژمێر دوانزدەی نیوەڕۆ ئاهەنگەکە بەردەوام بوو، کاتی حەسانەوە و نانخواردن هات.. ئێمەش لەگەڵ باوکم گەڕاینەوە لای دایکم و ئەوانیدی و سفرە راخرا و لێی دامەزراین، مەنجەڵی دۆڵمەیان رووکردە ناو سێنی، باوکم دەستی کردە دۆڵمەیێکی گەورە و هەستایە سەرپێ و هەڵدەپەڕی و وتافی دەکێشا:

– قوربانت بم بارزانی.. دۆڵمەت کردە هەرزانی.

## درەوشانەوەی ئەستێرەی بەختی " حەسەن تەشکۆ "

سەرەتای هەفتاکانی سەدەی رابردوو و رێکەوتن و پەخش کردنی بەیاننامەی (١١)ی ئازاری نێوان شۆڕش و حکوومەتی بەعس بووە وێستگە و قۆناغی حەسانەوەی پێشمەرگە گیان لەسەر دەستەکانی شۆڕشی ئەیلول.. هەر لەم قۆناغەش دا کە بە بوژانەوە و حەسانەوە ناسراوە، دەیان پێشمەرگە و کادیری شۆڕش.. ئەوانەی کوڕ بوون و بوخچەی نەکراوە بوون کەوتنە هەڵپەی ژن هێنان و هاوسەرگیری.. بەمشێوەیەش ئاهەنگیان دەکردە دوو، ئاهەنگ و خۆشی سەرکەوتنی شۆرش و بەیانی (١١)ی ئازاری مێژوویی، لەگەڵ ئاهەنگی بووک گواستنەوە و شایی ڕەشبەڵەکی سێ شەو و سێ رۆژە.

جا لەم شایی و ئاهەنگ و خۆشی و بەزم و رەزمانەی تەیراوەی، پاڵەوانانی سەرەکی و هەڵسوڕاوانی شایی و رەشبەڵەک، سەید کەریمی زورنا ژەن و عەدۆی دۆڵەنگێو و حەسەن تەشکۆی سەرچۆپی کێش، داینەمۆی سەرجەم رەشبەڵەکەکان بوون.

حەسەن تەشکۆ، پیاوێکی کورتەك و شەرواڵ رەش لەبەر و جەمەدانی قیت و پشتێنی گرێ گرێی گوڵ گوڵی باڵا بەرز و رەقەڵە و تەمەنی پەنجا ساڵێك دەبوو، هەرکە بەنەزمی ئایشۆکێ و فاتمێ زاڵمێی زورنای سەید کەریمی دەهاتە ناوەڕاستی شایی و خۆی دەلاواندەوە و بەنەزم و بە بەزم دەستێکی لەکەمەری گیردەکرد و بەدەستەکەی دیشی تەسبێحە زەردە بەگوڵێنگەکەی رادەوەشاند ژن و پیاوی ناو شایی حەیرانی دەبوون و باشتر و بەگوڕتر هەڵدەپەڕین و دڵیان خۆشتر و ئاهەنگەکە بەجۆشتر دەبوو.

هەر زوو بەزوو ناو و ناوبانگی (حەسەن تەشکۆ)ی لەتەیراوەی بڵاوبۆوە و لەهەر کێندەرێ شایی و زەماوەند و زیرو هۆڕی زورنای سەید کەریم و رمب و

هۆڕی دۆڵی عەدۆی دۆڵەنگێو بهاتبا.. ئەوا هەربابایە و لەلای خۆیەوە و لەگەڵ دەست گرتنی رێزی شایی چاوییان بۆ حەسەن تەشکۆ دەگێڕا.. سەرچۆپیش لەسەر ئەو تاپۆ دەکرا.. هەتا ئەو سەرچۆپی کێشبا کەسی دی غیرەتی وەی نەدەکرد پڕداتە سەرچۆپی و نەزمی شایی و تەبیعاتی (تەشکۆ) ی بترشێنێ !

ئەوێ رۆژێ وەی لێهات، هەرکە کوڕە پێشمەرگەیەك دەچووە داخوازی کیژە تەیراوەییەك و پێك دەهاتن، با هەموو شتەکیش ببڕاباوە، بەلام ماڵی بووکێ تاکە یەك مەرجیان زۆر بەتوندی لەسەر کاکی زاوا دەسەپاند:

—دەبی شاییەکە بە زوڕنای سەید کەریم و دۆڵی عەدۆی بگەڕێ و سەرچۆپیش مام حەسەن تەشکۆ بیکێشێ.. ئەگەرنا بووك هەرلەماڕێ دەبی و پێ لەدەرکەی حەوشێ ناوێتە دەرێ.

هەر لەو سەر و بەندەش ببوە ئیتقات، هەر شاییەکی بووك و زاوای تەیراوەییان حەسەن تەشکۆ سەرچۆپی نەکێشابا.. واحیساب دەکرا بووك و زاوا مارەییان نەهاتیە و حەرامە لێك نزیك ببنەوە و وەکی خوشك و برایانن.

لەم نێوەندەش، بازاڕی تەشکۆی گەرم بوو، هەرکە دەچووە ناوگەڕی شایی و چاوی بەو هەموو ژنە زەرد و سۆر و بەژن زراڤانە دەکەوت بەگوڕتر هەڵدەپەڕی و باشتر دەیعواند و بێمنەتر مگێزی بۆ دۆی شایی دەبزوا و سەری بەرز دەکردەوە و دەستی رادەوەشاند و هاواری دەکرد:

—هەی دۆۆ.. وەی دۆۆ ! !

دەبوایە دەلعاز ماڵە زاوا کیژوکار و ژنە مێخەك لەمل و گەردن کێلە بۆنخۆشەکان رەوانەی دەستی تەشکۆی بکەن، هەر لەبەرهیچ نا، هەتا کەیف و خۆشی و جۆش و خرۆشی شاییەکەیان سارد و سڕی تێنەکەوێ.

وای لێهاتبوو حەسەن تەشکۆ دەیزانی لە شاییان مەرغووبە و ماڵی بووك و زاوای دەستی لێ بەرنادەن و ئارەزووەکانی جێ بەجێ دەکەن.. جارجارە گران

دەیفرۆشت و مەرجی دادەنا.. مەرجەکەشی هەر ئەوەندە بوو:

– با شاییەکەتان ژن و کیژ زۆر لە پیاوان زیاتر بن.. ئەگەر (سەید کەریم و عەدۆ )مان لەگەڵ نەبێ، ئیشەکە سەلکە توورەکی نایێنی و بەشایی حسێب نییە، لۆخۆتان هەڕوون مەولوودەکی لە مزگەفتێ بخیننەوە و ئاوێ بینن و دەستتان بشۆن و کەسیش ماندی مەکەن.

لە زەماوەندی ئامۆزایەکی دایکم.. کە پاشنیوەڕۆی پێنج شەممەیەك شایی دامەزراو رمب و هۆڕی دەهۆڵ هەناوی کیژ و کارو کوڕە جحێڵانی دەهێنا هەلەکە سەمایێ.. هەتا تاریك داهات لەناو کۆڵانێ و لەبەر دەرکی ماڵی دایە حاجی بەسێی دایکی حەسەن گەردی لەوسەری هەتا ئەوسەری شایی گەرم بوو و حەتمەن پاڵەوانی بێ ڕکابەریش هەر حەسەن تەشکۆ بوو، ئەو ئێوارەیە حەشری بەسەرچۆپی کرد و سەرتاپای لەشی ئاو و ئارەقە بوو و بەدارو بەردیش رانەدەوەستا.

بۆ نانی ئێوارە ماڵی زاوا شلە ساوارییان بۆ مێوانان لێنابوو، ئیدی نان خورا و ژن و پیاو تێرو پڕ بوون.. لەکاتی شەو راشکان، دەستەی پیاوان لە ژوورێکی لاچەپی ماڵی زاوا کەوتنە گەمەی کڵاو کڵاوانێ و دۆزینەوەی ئەنگوستیلە و دەستە گوڵ لێدان.. هەر لە پەناوەش وردە وردە (بیرە)ی سارد هەڵدەقوڕێنرا و سەر گەرم دەکرا.. شەوی وا کێ دەنوێ ؟ بووە نیوە شەو و کوڕگەل برسیان بوو.. چی بکەن و چی بخۆن ؟ بەم نیوە شەوە چ حازر دەکرێ ؟ هەینێش، حەسەن تەشکۆ بەهانایانەوە هات.. لەبیرمە، من و چەند هاوزەیەکم لە ژێر قاڵدرمەی ماڵی زاوای خەریکی قسە و فشقیات بووین.. حەسەن تەشکۆ بە پارێز بەسەربانێ کەوت و هەندەی نەبرد بووە قیژ و هۆڕی مریشکان.. دەست بەجێش تەشکۆ بە دوو مریشکی قەڵەو هەر بە پارێز هاتەوە خوارێ و دەست و برد هەردووکی سەربڕی.. ئێمەش کەوتینە هاریکاری و مەنجەڵ و

تـەدارەکی خواردنێمـان بۆپەیـداکرد.. ئیـدی بـەگورج و گـۆڵی یـەك مەنجـەڵی گەورەی مریشکی بەچەلاوی خۆی پێگەیاند و نانی تیری تەڕکراو پیاز و تەماتە قاش قاش کران، تەشـکۆش بـەخۆ و بەمەنجەڵـەوە بـەناو مەجلیسـیّ کـەوت و وەك ئـەوەی نهێنـی نـەدرکێنی و گوایـە خـواردنی نـاو مەنجەڵەکـە (نیسـکە) و مریشکی دزراو نییە، پیّ دەکەنی و هاواری دەکرد:

–بخـۆن مارەبـاب بخـۆن.. نیسـك و سـەرلەنوو.. رەبـی لەقـەلب و گـەڕیّ تێـر بخۆن.. سبەو دووەی شاییەکی گەورۆنەی رەشبەڵەکمان لە پێشە.

## شێخی وێنەگران و دەروێشی " زیرەك"ی

لە هەولێرێ بە (ئەبو سەباح)یان دەگوت شێخی وێنەگران، چونکە جگە لەوەی زەمانێك بوو وێنەی فۆتۆگرافی دەگرت و وەك سەرچاوەی بژێوی ژیانی کردبویە پیشە، هەروەها ئەو وێنانەی ئەو دەیچرکاندن گاڵتەیان پێنەدەکرا و لەهەموو لایەنێکی هونەرییەوە پێرفێکت بوو.

(محیێ دین تاهیر عەبدوڵلا) کە بە(ئەبو سەباح) ناسراو بوو، لە گوندی " وەرتێ "ی ناحیەی بێتواتەی خۆشناوەتی لەساڵی (١٩٣٥) چاوی بۆ دونیا هەڵێنابوو.. لەتافی لاوییەتی دێتە هەولێر و لە گەڕەکی خانەقا نیشتەجێ دەبێت.

سەرەتا بۆ بژێوی ژیان دەبێتە جاڕدەری فیلمی سینەمایی کە لە سینەماکانی هەولێر پێشاندەدران، لەبیرمە وێنەو تایتلی فیلمەکە بە تابلۆیەکی گەورەو بەرز چەسپ دەکرا کە بەشەپکە دارێك لکێنرابوو دەیخستە سەرشان و بەناوشار دەیگێڕا، ئەبو سەباح لەم جاڕدان و گێڕانەش داهێنانی دەکرد و بەشێوەیەك پڕوپاگەندەی بۆ فیلمەکە دەکرد کە هەر حەز بکەی بەزووترین کات بچیتە سینەماو پلیت ببڕی و بەدیار فیلمەکە دابنیشی.

هەر بەڕێگای سینەماش لەگەڵ (کەماڵە کەڕی) خاوەن ستۆدیۆی "کەمال" یەکتر دەناسن و ئەو پارچە فیلم و وێنە جوانانەی ئەستێرە ناودارەکای فیلمی عەرەبی ئەو زەمانی بۆ "کەمال" دەبرد و بەدەیان دانەیان لێ چاپ دەکردو ئەبو سەباح لەناو بازاڕ دەیفرۆشتنەوە.. پەیوەندییەکەیان لەگەڵ خاوەن ستۆدیۆی (کەمال) بەتینتر دەبێت و لەساڵی (١٩٥٩) دەبێتە شاگردی ستۆدیۆکە و وێنەگرتنی دەرەوەی ستۆدیۆی دەکەوێتە سەرو کەمال دەینێرێتە ئاهەنگەکانی بووك گواستنەوە و ژن هێنان و خوێندنەوەی مەولوود و بۆنە

تایبەتییـــەکان و لـــە هـــەولێر هێنـــدەی دی دەناســـرێت. لـــە هـــەنگاوێکی پێشـــکەوتوتر.. ســـەرەتای شەســـتەکان بـــەهاوکاری وێنـــەگر(زاهیر حەمـــەد ئیبراهیم) روو لە شەقلاوە دەکەن و لقێکی (ستۆدیۆ کەمال) لـەوێ دەکەنـەوەو هاوینان لە شەقلاوە و گەلی عەلی بەگ و جوندیان و بێخاڵ وێنەی گەشتیارانیان دەگرت و هەر لەناو ستۆدیۆکە جۆرە لابورێکیان دروست کردبـوو گـەر یەکـەم رۆژ وێنەکەیان نەداباوە خاوەنەکەی ئەوە رۆژی دواتر وێنـەیان چـاپ دەکـرد و دەیاندایەوە.

هەر لەو سـەرو بەنـدەو ئـەوان رۆژان بـوو، ئـەبو سـەباح عاشـق و دەروێـش و سەوداسەری دەنگە زوڵاڵەکەی (حەسەن زیرەك) دەبێـت.. ئـەو دەمـی لەگـەڵ خزم و هاورێ و کۆنە رەفیقێکی (میرزا کەریم خۆشناو) لەهەولێرەوە قۆناغ بـە قۆناغ بەپێ دەبـڕن و خۆیـان دەگەیەننـە (بانـە) و لـە گازینۆکـەی کـانی مـەلا ئەحمەد بە (حەسەن زیرەك) شاد دەبن و پەیوەندییەکی تونـد و تـۆڵی لەگـەڵ دەبەستن و زۆریش لەگەڵی بەوەفا دەبن، تا لەنەواران حەسەن زیرەك بەفـەخر و شانازییەوە باس لـە دۆسـتایەتی خـۆی لەگـەڵ ئـەبو سـەباح و مـیرزا کـەریم خۆشناوی دەکات.

ئەبو سەباحی بەهرەمەند و بە سەلیقە.. هەر بەتەنها موریدی زیرەك و گۆرانی کـوردی نـەبوو، ئاشـق و سـەودا سـەری دەنـگ و ئـاوازی خانمـە هونەرمەنـد (سەباح)ی لوبنانیش بوو.. هەر بەم هۆیەشەوە خەڵکی هەولێر پێیـان دەگـوت (ئەبو سەباح)، لەکۆتایی هەفتاتاکان هەرکە (سەباح) بـۆ ئاهـەنگ و کۆنسـێرت دێتە عێراق.. ئەبو سەباح لە ئاهەنگەکەی موسڵ خۆی دەگـەیێنێتێ و پـەیامی خۆشەویسـتی خـۆی پێڕادەگەیـەنێ و چـەند وێنەیـەکیش لەسـەر شـانۆکە دەگـرن.. هـەر لـە عیشـق و سەوداسەریشـی بـۆ (سـەباح) لـە سـاڵی ( ١٩٧٧) ستۆدیۆیەك لە تەك سینەما سیروان دەکاتەوە و ناوی دەنێ (ستۆدیۆ سەباح).

ئەبو سەباح لە ساڵی (١٩٧٤) وەك زۆربەی خەڵکە شۆڕشگێڕو بەهەڵوێستەکە دەچێتە ناو شۆڕش و لە چۆمان ستۆدیۆیەکی سەفەری بۆ شۆڕش دەکاتەوە و وێنەی پێشمەرگە قارەمانەکان بەجوانترین شێوە دەچرکێنێ.. دوای نسکۆش ماوەیەك لە ئۆردوگای (شیران) دەگیرسێتەوە و لەوێش لەپای هونەرە بەرزەکەی لە بواری وێنەگرتن وەك خەڵات (قەڵغانێك)ی پێشکەش دەکەن.. لە ساڵی (١٩٧٧) گەڕایەوە هەولێر.. بێ ئیش و بێ کار، چونکە دەست و قەڵەمی جوان بوو کورسی ومێزێك پەیدا دەکاو لەپێش باڵەخانەی قائیمقامیەتی ناوەندی هەولێر کە ئەوکاتە لە تەنیشت گەراجی نەقلیاتی تەیراوە بوو.. لێی دادەمەزرێ و عەریزە بۆ هاووڵاتیان دەنووسێ و بژێوی ژیانی خۆی و خانەوادەکەی پێ دابین دەکات، بەخۆم دەیانجار ئەو پیاوە ماندوو بەدبەختەم دیوە لەڕوو لاواز لەسەر کورسیەك و مێزێك لەپێشی عەریزەی بۆ خەڵکی دەنووسی.. ئەوەندە بەدبەخت و چارەڕەش بوو ئەو زەمانی ئێواران لە گازینۆی شەوانی هەولێر یاری (دۆمبەڵە) دەکرا.. قورشیدی مام عومەری کە ناسیارێکی خۆمانە هەرکە ژمارەکانی دەخوێندەوە، لەجیاتی ژمارە (١٣) دەیگوت (ئەبو سەباح) هەموو یاریچیەکانیش دەیانزانی لەگەڵ ژمارە سیانزەیەتی.

دواتر وەك فەرمانبەری وێنەگر لە بەڕێوەبەرایەتیی ڕۆشنبیریی جەماوەر دامەزرا.. من لەوێ باشتر ناسیم و لەیەك نزیك بووینەوە، پیاوێکی قسە خۆش و دەم بەخەندە و قەدر گران بوو.. توڕەبوون لەفەرهەنگی دا نەبوو، بەڵام کاتێك هەر بۆگاڵتە و کەیف خۆشی یەکێك لە برادەران جوێنێکی بۆ (سەباح)ی گۆرانی بێژ حەواڵە دەکرد هەینێ توڕەو قوشقی دەبوو کوفری عەرد و ئاسمانی دەکرد.

زۆر متوی شانۆگەرییەکانی ئێمە بوو، هەموو ڕۆژەکانی نمایش بە خۆی و

بەکامێرەکەی ئامادە دەبوو هەوڵی دەدا گرتەی هونەری و دانسقەمان بۆ بچرکێنێ.. لە کۆتایی هەموو نمایشێکیش لەگەڵ جەماوەرەکە دەهاتە سەر شانۆ و یەك بەیەکمانی ماچ دەکرد و پیرۆزبایی خۆی بۆتازە دەکردینەوە، بەنواندنی من زۆر سەرسام بوو، بۆیە زیاد لەجارێك ماچی دەکردم و پێی دەگوتم:

–لۆ وەناکەی کوڕی سمێر سۆری.. هەم تەمسیلەکەت جوانە هەم ئەمنیش رەسمی جوانم لۆ گرتی.. با ئەرشیفەکەت دەوڵەمەندبی.

بەمجۆرە.. نەك بەتەنها لەگەڵ من بەڵکو لەگەڵ زۆربەی هونەرمەندانی شانۆ و میوزیك ژەن و گۆرانیبێژ پەیوەندی پتەوی هەبوو و هەموومان (ئەبو سەباح)مان خۆشدەویست و ئەویش بەتەنها هەر هەموومانی خۆشدەویست.

لەساڵی (١٩٩٠) زوو زوو لە (موختەبەر شیمال) هاموشۆی دەکردم و زۆر کەیفی بەو لابورەی شوشتنەوە و چاپکردنی وێنەیە دەهات ودەیگوت:

–ئەو موختەبەرە روویێکی جوانی شارستانی هەولێرییەو دەبی بە هەموومان پاڵپشتی ساحێبەکەی بین.

ئەم پیاوە بەسەلیقە و هونەرمەند و دەست رەنگینە، ئەم عاشق و دەروێشەی (زیرەك و سەباح)، پێڕانەگەیشتین پڕ بەدڵ خزمەتی بکەین و تۆڵەی ئەو هەموو ماندوبوون و قوڕ بەسەرییەی بکەینەوە.. بەداخەوە پەپوولەی رۆحی لە رێکەوتی (٢٩/١/٢٠٠٠) بەیەکجاری هەڵفڕی و چاوی لێکناو کەوتە خەوێکی ئەبەدی.. هەموو هەولێریش بۆی گریا و ماتەم و دڵگرانیان بۆ راگەیاند.. رۆحی شادو یادی گوڵباران.

# گوریی پلکی هەمووممان

لەتەیراوەی، لەجێی ئەو بینایەی کەبووە (تەجنید) و وەك عیزرایلێکی رەزا گان لەترسی سەربازی لێمان دەڕوانی، پێشتر حەسارێکی گەورە بوو، بەدەیان خێزان سەروو ژوورێکیان هەبوو لەوێ دەژیان.. یەك بەلوعەی ئاو لەناوەڕاستی حەسارێ، یەك ئاودەست لەپەنا دەرگا گەورەکەی هاتووچۆ. پلکە گوریێ، بەخۆ و بەمێرد و هەردوو کوڕەکەی لەیەکێك لەژوورەکانی ئەو حەسارە دەژیان.

پلکە گوریێ هەر بەخۆی نان پەیداکار و نان بدەی خێزانەکەی بوو، پیاوەکەی پیرەمێردێکی سەروڕیش درێژ بوو دەیانگوتێ (مام دەروێش)، عەمەلمەندە و دەست و پێ سپی و بێ دەسەڵات، هەر پلکە گوریێ بوو ژیانی وەبەر خێزانەکەی دەنا لێنەدەگەڕا موحتاج و ئیحتیاجی دەستی نامەردان بن.

ژنێکی مەرد و چاو نەترس و قسەزان بوو، ماندوو نەناسانە بەدوای کار و کاسبی و نان پەیداکردن بوو، رۆژگارێك لەبازاڕی ژنانی لای قەیسەری هەولێرێ شمەکی کۆنی ژنان و پیاوانی دەفرۆشت و بڕ و بوزگڕەکانیشی رەواجیان هەبوو، هەر کەلەوێ بێتاقەت دەبوو دەگەڕاوە تەیراوە و لیفکە و خەنە و وەسمە و سابوونی رەقی و گڵەسەر و سپیاوی قەرایی و بنیشتی کوردی و کلی چاوانی لەپێش ژنان رێز دەکرد و دەیفرۆشتن.

ئەو عەیامی هەندێك کەوتبووە ناو ساڵانەوە و پشتی کوڕ بووبۆوە تەبیعاتی تێك چوو بوو، هەر قسە و هەر معامەلە و هەر کڕیارێکی بەدڵ نەبا و سەرودڵی گیرابا، ئەوە تووڕە دەبوو شمەکەکەی لەدەستی موشتەری رادەپسکاند و دەستی بەجوێنان دەکرد، دەیگوت:

– حەسەن زیرەك گۆتەنی بەملوێنەکیش هەرزانە، نایفرۆشم.

بەزم و رەزمی لەگەڵ کوڕوکاڵی کۆڵانێ زۆر خۆش بوو، هەندێجار هەرکە کەیفی ساز با عەلەمی نەدەبوو بەدڵی گەنجەکان قسەی دەکرد و مەسەلەی ژن و پیاو و نێر و مێی هەموو بەگۆڕێ وەردەکرد و بێ پەردە لەگەڵیان دەدوا، وەکیدی هەرکە سەرودڵی تەواو نەبا و سەرفیاتی کەمبا، شەڕی دار و بەردی دەکرد و جوێنی بەگەورە و بچووك دەدا و هاواری دەکرد:

– پیاوی باش هەر باشە.. پیاوی خراپ کراشە، سەد سار خزمەتی بکەی بەلاشە.

لەگەڵ مارفی برام بەینی خۆش بوو، خۆشیدەویست و بەقسەشی دەکرد، زۆرجاران لەسەر داوای مارف، چاوپۆشی لەیەکێك دەکرد و عەلەمی نەدەشکان، هەندێجاری دیش هەر بەقورمیشی مارفی یەکێکی دەگرت و پەتاغی دەردەهێنا و ئارەقەی پێدەکرد.

لەهەموو عێدز بوونەکانیش هەرکە گەنجەکانی گەڕەکێ دەبوونە یەك دەنگ، لەجیاتی پلکە گوریێ.. پێیان دەگوت:

– گوویێ.

هەینێ پلکە گورێی گەورەی هەموان کەدەیزانی زەرەرییەتی و قازانج سەری مایەی دەخوا، بەپێکەنینەوە دەیگوت:

– ئەنگۆ هەمووتان وەکی کوڕەکانمن، هەمووتانم خۆشدەوێ، بەخسوسی ئەو مەعروفە لاواز و رەق و تەقە.

## جەمالێك.. تژی لەعەشق

ئەو چەند ساڵێك لە من گەورەتر بوو، بەڵام لە برادەرایەتی و پەیوەندیمان هیچ کاتێك خۆی لە من بە گەورەتر نە دەزانی.. بە پێچەوانەوە زۆر جاران و لە زۆر مەسەلان پرسی پێدەکردم و ئەلحەقە بە قسەشی دەکردم.

جەمال.. سەرکێش بوو، حەزی لەوەبوو لە ناو هاوڕێ و هاوتەمەنەکانی شاز و جیاواز دیار بێت، هەر هیچ نا لە پۆشینی جلك و بەرگ.

هەرکە لە کۆڵانێ دوو بە دوو تەنیا دەبووین ئارەزوەکانی خۆی بۆ هەڵدەڕشتم.. حەزی دەکرد زوو بە زوو دەوڵەمەند بێت.. جلك و بەرگی جوانی هەبێت.. ئاواتی ئەوەبوو شەوێك بنوێ و سبەینێ چاو بکاتەوە ئەو کیژە خرپنە قوتە پرچ رەشەی خۆشی دەویست بەبوکی لە ناو ماڵێ بێ وبچی.. ئەو رۆژەم باش لە یادە کە پێ ی گوتم:

– زاهیری برام ئەوڕۆ پاش نیوڕانێ دەیبینم.. ئەو لەناو دەرکەی مارێ سەر دەردەینی و ئەمنیش بە کۆرانێدا رەت دەبم و تێر تێر تەماشای دەکەم و داوای رەسمەکی لێکردیمە لۆی فڕێ دەدەم.

لەناو گیرفانی کراسی پێنج وێنەی خۆی دەرهێناو گوتی:

–بە رەئی تو کێهان رەسمی بدەمێ ؟

سەیری وێنەکانم کرد.. یەك لە وێنەکان زۆر جوان بوو، لە ناو ستۆدیۆ بە قات و بۆینباغ گرتبووی.. من ئەو وێنەیەم بۆ هەڵبژارد و ئەویش گوتی:

– بەقسەت دەکەم وەڵڵا.

وێنەکەی جودا کردەوە و لە سەر چۆکی خۆی داناو ئەوانی دیشی خستەوە گیرفانی. ئینجا پاکەتی جگەرەی دیمۆرۆی دەرهێنا و بە دەنکە شقارتەیەك جگەرەیەکی داگیرساند و دوو قوم و نەفەسی دوور و درێژی لێدا، وێنەکەی

خۆی بەدەستەوە گرتوو رێك لەسە لای چەپ و بەرامبەر بە دڵی سەر وێنەکە ئاگری جگەرەی پێوەنا و هەڵینەگرت هەتا سوتووی ئاگری جگەرەکەی لەو دیوی وێنەکە دەرچوو !

گوتم:

– ئەوە چت کرد، ئەو رەسمە جوانەت لۆ ئەوها عەدم کرد ؟

گوتی:

–ئەتو نازانی.. ئەو رەسمەی دەدەمێ یەعنی ها ئەمن ئەوها جەرگ و درم لە بۆت کون بووە و سوتایە.

هەر واشی کرد، وێنە بە جگەرە سوتاو و کون بووەکەی لە لەتە خشتێك بەست و هەرکە ئەو لەناو دەرگا راوەستا و ئەمیش لە بەردەمی رەت دەبێت ئاورێکی خێرای ئەولا و ئەملا دەداتەوە و دڵنیا دەبێت کەس چاوی لێیان نییە یەکسەر وێنە لە خشت پێچراوەکەی بۆ هەڵدەدات و گورج بۆی دەردەچێت و لەبەرچاوان خۆی ون دەکات. پاشان جەمال دەیگوت:

– یارم خەنی بووە بەو رەسمەی بە جغارەی سوتاندم و کونم کرد.. شەوان هەتا رەسمە سوتایەکەی من لەسەر سینگی دانەنێ و بۆنی نەکات شتاقە خەوی لێناکەوی !

جەمالی مام حەمە سالحی کارەباچی زۆر بە زەوق بوو.. بەویبا هەموو کات بیر لە ژیان و لە خۆشی و پێکەنین و گۆرانی و شایی رەشبەڵەك بکەینەوە و قەت مردن و قەبر و کفن و سەر قەبرانمان بە خەیاڵدا نەیێت. کەرەتەك لیم پرسی:

_ جەمال گیان.. ئەگەر من مردم و نەمام، ئەتو ئەو هەموو خەون و خەیاڵ و ئاوات و مگێزانەت لە کن کێ باس دەکەی و هەڵیان دەرێژی ؟

زۆر بە توندی و بەپەلە وەلآمی دامەوە و گوتی:

_ ئەوەلەن خۆ لۆرکەت نەخواردییە هەتا بمری.. دووەم ئەگەر ئەمنت خۆش دەوێ و خاتری منت لەکنە جارەکی دی لەگەر من باسی مردن و قەبر و ئەو

شتە قۆڕانە مەکە.

جەمال.. بۆ ئەوەی باوکی ( مام حەمە ساڵح کارەباچی ) لێ ی رازی بی و چیدی پرتە و بۆڵە نەکاو دایە ( سێوە) لە زمانی مێردە تووڕەکەیەوە بە جەمالی کوڕی نەڵێ:

– کوڕم پیاوبە.. بابم پیاو بەو ئیشەکی بکە و خۆت لە پرتەو بۆڵە و گازاندەی بابت قوتارکە هەتا ئەمنیش هەندەك دڵم سوكنایی پێدا بێت.

بۆیە جەمالی عاشق هەرجارەو کارێکی دەدۆزیەوە کەچی لە بەد بەختی خۆی لەسەر هیچیان بەردەوام نەدەبوو.. فەترەیەك لەلای تەها پاقلاوەچی بووە شاگرد، هەموو دەمێ بۆنی شیلە و پاقلاوەی لێدەهات، کراس و شەڕواڵەکەی رەق رەق بوو بوو وەکی دەفەی ئەوەندە شیلەی شەکریان پێوە نووسابوو !

جارێکی دی.. کەر و عارەبانەییەکی پەیدا کرد و لە جادەی تەیراوەی ئیشی شمەك گواستنەوەی پێدەکرد و ماندی و مردی.. دەیگوت:

–بەس بابم لێم رازی بی هیچی دیم ناوێ.

بە داخەوە جەمالی جوان و عاشق لە دلدارییەکەی شکستی هێنا.. دولبەرەکەی لە چاوەڕوانی و نەچوونە داخوازی بێزار و بێتاقەت دەبێت.. لەولاوەش کوڕێکی دی مەراق لە قوتە و خرپن و قژ رەشەکەی جەمالی عاشق دەدا و دەنێریتە داخوازی و لەسەر هەموو شتێك رێك دەکەون. ئەوە بوو کاکە جەمالی جوان چۆن بەشەوق و هیمەتەوە لەبەر دەرگا وێنە بە جگەرە سوتاو کونەکەی بۆ باوەشی یار هەڵدا، بە هەمان شێوە چووە بەر دەرگاو بە تێکشکاوی‌و بە چاوی بە فرمێسکەوە وێنەکەی خۆی وەرگرتەوە، بەلام بەجگەرە کونێکی دی بۆ زیاد کرابوو..

بە یاری گوتبوو:

–خوا حافیز.. خوا حافیز هەی بێوەفا خواحافیز.

بەم دەستورە هاوڕێ یەتی من و جەماڵە جوان و عاشقەکە بەردەوام بوو، لە

ساڵی (١٩٧٤) من لەگەڵ دایك و باوکم بارگەمان تێکنا و بەرەو شاخ بەرەو رواندز و گەلاڵە و لەوێوە بەرە و ئەو دیو سنور و ئۆردوگاکانی (نەڵیوان و کانی سپی و زێوە ) دوور کەوتینەوە. وابزانم جەمالیش هەر بەهەمان هیمەت لە گەلاڵە و چۆمان و ناوپردان ئەو ساڵەی وەك پێشمەرگە بەرێ کرد.

پاش نسکۆ، ئێمە گەڕاینەوە هەولێرو تەیراوەکەی خۆمان.. هەرکە هاتینەوە و گەیشتمەوە شار.. یەکەم کەس و یەکەم برادەر کە چوومە لای هەر جەمالە جوانەکە بوو.. ئەمجارە جەمال تەکسیەکی پێ بوو بەلاَم بێ هیمەت و باڵ شکاو و بێزار کاری شوفێری دەکرد. لە حاڵ و ئەحواڵ پرسین جەمال گوتی:

—زۆر بێتاقەتم.. وازم لە هەموو شتەکی هینایە.. هەر بەوەندەی دڵم خۆشە هەنووکە بابم زۆر لێم رازییە ئەمنیش هەر ئەوەندەم مەخسەد بوو.

ئەو جەمالە جوانە، ئەو برایە بە زەوق و بە هیمەتە لە سبەینەیەکی زووی ئەم هەولێرە پێنج نەفەر هەڵدەگرێ و بەرەو کەرکوك ناوی خوای لێ دەینێ.. چونکە شوفێرێکی تیژ هاژۆ بوو لە چوارپیانی فلکەی زەعیمی ئەوەندە تیژ داژوا.. لە پڕ لەلای راستیشی لۆریەکی زەبەلاح تیژتر لە ئەو مل دەنێ.. جەمال هەوڵدەدات لە ژێر پیرە لۆری بۆی دەرچێت. بە نەفەرەکانی دەڵێ:

—خۆتان نزم کەن لەبن لۆری دەردەچم !

کەچی لە ساتێکی ترسناك لۆریە زەبەلاحەکە تەکسی جەمالی جوان دەشێلێ. هەرکە هەواڵیان دامێ و بەگریانەوە چوومە سەر تەرمەکەی.. ئەو جەمالە جوانە.. ئەو پیاوە بەهیمەت و عاشقە، سارد سارد چاوی لێکنابوو درێژ درێژ قاچەکانی لێراکێشابوو.. وەك ئەوەی لە ژیانیدا یەك جولە و یەك بزە و یەك عەشقی نەکردبێت.

یادی بە خێر.. جەمالی تژی لە جوانی.. کوڕە عاشقەکەی تەیراوە.

## پلکە مەلاژن

پلکە مەلاژن، ژنێکی گران و سەنگین و هەتا بڵێی روخسار جوان و نورانی بوو، ئێمە هەمووەمان کوڕانی گەڕەك ئاواتە خواز بووین ئەو پلکە مەلاژنە نەنکمان بوایە، دەزانن بۆ؟ لەبەرئەوەی لەو دوکانە گچکۆکەی کە لێیدادەنیشت و شمەکی مندالآنی دەفرۆشت، یەك گوڵەبەڕۆژەی دەداینێ نە ئەوسا و نە هەنوکەش تام و بۆن و لەزەتی ئەو گوڵەبەڕۆژەیە بەهیچ کابانان دروست ناکرێت.

پلکە مەلاژن.. هەمووەمانی خۆشدەویست و وەك کوڕەکانی خۆی حسێب دەکردین، هەرکە بەغاردان لەماڵێڕا دەگەیشتینە بەر دوکانە گچکۆکەکەی، ئەوەندە بەنازداری و بەرووخۆشی پارەکەی لێوەردەگرتین و لولە گوڵەبەڕۆژەکەی دەداینێ هەر لەژنە سەلارێکی وەك خۆی دەوەشاوە، زۆرجاران گەر لەسەر تۆپانێ و پەلیکانی و گەمەکانیدی لەگەڵ عوسمانی کوڕی دەبووە شەڕمان، ئەو ژنانە و مەردانە بەهانامان دەهات و ئاگری شەڕەکەی بە لوولە گوڵەبەڕۆژەیەکی بەتامی دەستە جوانەکانی دادەمرکاندەوە و دڵیشی دانەدەکەوت هەتا هەردوولامان ئێمە و عوسمانی کوڕی دەستمان لەملی یەك نەکردبا و یەکترمان ماچ نەکردبا، هەینێ دەیگوت:

– رەبی لەبەر عومرو مرم.. هەر برایی باشترە لەشەڕ.

# ژنانی کۆڵان

لەسەرەتای ئەو کۆڵانەی بۆ مزگەوتی حاجی مەجید قەرداری هەوراز دەبییەوە،ماڵی پلکە حەلیمی بوو.

پلکە حەلیم، پیرێژنێکی گچکۆکە و بەتەمەن و پاك و خاوێن و بۆنخۆش بوو، پشتی کوڕ بوو بەڵام زندی و زیت و بەهەڵمەت بوو، هەر لەکۆڵانی خۆیان و لەهەورازی مزگەوتێ ماڵی کچێکی ئەو بوو، نەوەکانی ئاوزەی مە بوون، زۆرجاران لەگەڵ (سالم و برایەکانی) کەنەوەی پلکە حەلیم بوون دەبووە شەڕمان.. پلە حەلیم زۆر زوو پێڕادەگەیشت و لەگیرفانی چاکەتە ئەستوورەکەی چوکلاتی دەردەهێنا و سەر و قلێکی لەدووڕ دەستمان دەنا و دەیگوت:

– ئەگەر شەڕێ بکەن.. تام لەچوکلاتەکانی من ناکەن.

ئای خودایە، پلکە حەلیم بۆ رۆژێك لەرۆژان گیرفانی کورتەکە ئەستورەکەی خاڵی نەبوو لەچوکلات.

دایە سەید ئایشێ، کەکۆڵانەکەش هەر بەناوی ئەو دەناسرا و دەیانگوت کۆڵانی ماڵی سەید ئایشێ، دایە سەید ئایشێ ژنێکی گران و سەنگین و سەلار بوو، هەم دکتۆر و هەم مامان بوو، هەموو تەیراوە خۆشیان دەویست و رێز و حورمەتیان لێدەنا.

دایە سەید ئایشێ رەنگە زوو مێردی کۆچی دوایی کردبێت، چونکە ئەوەندەی بیر دەکەمەوە وێنە و ناو و روخساری مێردەکەی دایە سەیدم نایەتەوە بەر چاو، بەڵام کوڕەکانی وەستا عومەر پەڕەشوت و وەستا عەلی و بەکر و شاکرم زۆر چاك لەیاد ماون.

وای ئەو رۆژەی کاکە بەکری دەزگیراندار لەهەرەتی لاویدا جوانەمەرگ بوو،

دەنگو دۆر گەیشتەوە تەیراوە و کۆڵانەکەی خۆمان کەکاکە بەکر جوانەمەرگ بووە.. نەك دایە سەید و کچەکانی و بووك و خزم و کەسەکانی، بەڵکوو هەموو خەڵکی گەڕەك بۆ مەرگی لەناکاوی کاکە بەکری جوان و قیت و قۆز و بەویقار لەشین و گریان و بابەڕۆ و بەکر رۆماندا بووین، حەزمان نەکرد و دڵمان وەبەری نەهات دایە سەید ئایشێ لەم جەرگ سوتانە بەتەنیا جێبهێڵین.

پلکە رەحمەتە گەر سەهو نەبم کیژی دایە سەید ئایشێ بوو، هەر لەسەر دەستی ویش فێرە مامانی و تەرتیباتی ژنان بوو بوو، پلکە رەحمەتە ژنێکی کەڵەگەتی تەبەش جوانی روخسار لەبار بوو، کاتی خۆی ببووە بووکی شەرەبۆتیان و پیاوێکی ئەوێ مێردی بوو، ئەو پلکە رەحمەتەیە منی زۆر خۆشدەویست قەت بەناوی تەواوی خۆم بانگی نەکردوم و بڵێ:

– زاهیر.

هەر دەیگوت:

– زاهیرە.. یان زاهیرۆکە.

هەندێجار، کە لەگەڵ مۆفەقی خوشکەزانی دەبووە شەڕمان و پێك نەدەهاتین، بەعالەمی ئاشکرا لای منی دەگرت و خۆی لەمۆفەقی تورە دەکرد و بەمنی دەگوت:

– زاهیرە.. بابەکەی بابم شەڕێ مەکەن.. لەشەڕێ هیچ دروست نابی.

دادە سۆتێ، نابێ باسی نەکەم و یادی نەکەمەوە، بەس هەر ئەوەندەم لەبیرە.. دایکی وەستا حەمید و وەستا فەتاح بوو.. وەزیرەی بووکی کەژنی وەستا حەمیدی بوو زۆر لەزمانی دەترسا و هەوڵی دەدا عێدز و تورەی نەکات. کەچی هەرکە تورە دەبوو دەرگایماڵیان بەرامبەر دەرگای ماڵی ئێمە بوو، وەها شاڵاوی دەهێنا و جنێوی دەدا، نەك بووکەکانی خۆی.. دایکم و ژنەکانی ناو ماڵی ئێمەش دەرگایان لەسەر خۆ دادەخست و خۆیان کپ دەکرد.

پلە گولیزار، ژنی معاون سالّحی خاوەن تانج و ئەستێرە بوو، ڕۆژگارێك کەدایکی من و ئەو گولیزارە گەنج بوون و ئێمەی منالّەکانیان تولاز و تازە هەڵچوو بووین، دەیان شەڕمان کردووە و شەڕەکە بەرۆکی گولیزار و قەدریەی دایکی منیشی گرتیتەوە هەندێجار کار گەیشتۆتە پۆلیس و شکایەت و شکایەتکاریش، پاش ئەوەی ئێمە گەورە و جحێل بووین، ڕەفاقەت و دۆستایەتیمان یەکجار ڕێك و برایانە بوو، بەتایبەتی من لەگەڵ فەوزی و کەژادی کوڕی.

لەگەڵ فەوزی زۆربەی ڕۆژەکان بەیەکەوە بووین و بەتەواوی هۆگری یەکتر بووین، لەگەڵ کەژادیش (مامۆستا مەهدی) لەسەرەتای کاری هونەریم لەگەڵمدا بوو بەیەکەوە هاموشۆی (تیپی هونەری هەولێر)مان دەکرد و لەیەك دوو بەرهەمیش بەشدار بوو، بەلّام دواتر وازیهێنا و پتر گرنگی بەپیشەی مامۆستایەتی دا.

پاش عومرێکی پڕ لەچەرمەسەری، دوای نەمان و کۆچکردنی یەکجارەکی معاون سالّح و حاجی عەبدوڵڵای باوکم.. ئەو گولیزارە گەورەیە.. ئەو ژنە نازدار و سەلارە، سەرەڕای بارگرانی کوڕ و کچەکانی خۆی، نەك منداڵێك، بەڵکو دوو کچ و کوڕێك، دوو خوشك و براییّکی بێ دایك و باوکی لەئامێز گرت و ، ئەرك و ماندووبوونی بەخێوکردن و گەورە کردنی هەرسێکیانی لەئەستۆ گرت. هەتا بەڕێو جێی خۆیانی گەیاندن بۆیە هەرکە پلکە گولیزار بەیەکجاری چاوی لێکنا و ماڵئاوایی لێکردین، نەك بەتەنها کۆڵانەکەی خۆمان، بەڵکو و هەموو تەیراوە بۆی گریا و خۆمان بەخاوەن پرسە و ماتەم زانی.

## میسری.. بە ساقیتی دام !

تازە بانگی سبەینێی دابوو لە خەو رابوم و لە سەربانێڕا تەماشای حەوشەی ماڵی یارم کرد.. دیتم لەبن دار هەنارەکەی ناو حەوشەیان بەخەبەرەو چاوەڕێم دەکات.

ئیدی ئیشارەت دەستی پێکرد.. تێم گەیاند کە سبەینێ حەزم لێیە بێتە جادەی لای تەجنیدی دیارییەکم بۆ کڕی یە وەبی بتوانم بیدەمێ.. هەر بە ئیشارەت تێیگەیاندم سبەینەکەی سەر لە سبیانێ ناتوانی لە ماڵ دەرچی، چونکە میوانیان هەیە و دەبی شیوی میوانان حازر کات، رەنگە پاش نیوڕانێ بتوانی فورسەت بینی و بێتە دەرێ و شتەکەم لێوەرگری.

بەینی من و میسری خان هەر بەوشێوە ئامـاژە و ئیشـارەتە دەگوزەرا، سەرەتای پەیوەندیەکەشمان هەر ئەوها دەستی پێکرد، عەسرەکی درەنگ من لەسەربان خەریکی دەرس و دەوری خۆم بووم، ئەویش لە حەوشەو لەبن تاقە دار هەنارەکەی ماڵییان راوەستا بوو، لە هیکڕا من لەسەر بان و ئەو لەناو حەوشێ چاومان رێك کەوتە بەرامبەری یەکتری.. ئەو واق وڕما من واق وڕماتر چەند خولەکێك بەم جۆرە.. من دەستم بۆ بڵند کرد بەمەبەستی سڵاو و موحیبەت، ئەویش وەڵامی دامەوە بە ئیشارەتی سڵاو و موحیبەت و دۆستایەتی و عیشق بازی.

لەو رۆژەوە.. من لەسەربان، ئەو لەناو حەوشە.. هەر بە ئاماژەو دەست راوەشاندن دوور بەدووری بۆ یەکتری دەسوتاین.. نازانم ئەو ناوی منی دەزانی یان نا ؟ بەس من دەمزانی ئەو ناوی میسری یە و تاقە کیژی ماڵە بابیتی و دایکێکی نەخۆش و باوکێکی کاسب و برایەکی لە خۆی گچکۆکەتری هەبوو.

میسری نازدار بوو، هەرکە عەسران دەچووە ژێر سێبەری دار هەنارەکەی ناو

حەوشەیان و پرچی بەسەر شان و ملی دا پەخشان دەکرد و بە زەردە خەنەوە سەری بەرز دەکردەوە بۆ سەربانێ و بـەلای منـی دەڕوانـی وامـدەزانی هـەموو دونیا هی منە.. ئیدی دەکەوتینە ئیشارەت و گفتوگۆی دوورا و دوور.

من دەمگوت:

–برۆ ماکسییە سۆرەکەت لەبەر بکە، چونکە هەر بەو ماکسییە سۆرەی جوانتر دەردەکەوی.

ئەو دەیگوت:

–بەچاوان.. (دەچوو، بزر دەبوو.. دەهاتـەوە ماکسـییە سـۆرەکەی دەیکـردە یەکپارچە ئاگر و بەردەبووە هەناوی من.

ئەو جارە ئەو دەیگوت:

–لۆ بلوزە قۆلٚ درێژەکەت لەبەر نییە ؟ برۆ خۆت بگۆڕە دەنا دەڕۆم !

من بە پەلەپەل و هەڵەهەل دەچووم چیم لەبـەربوو فـڕێم دەدا، جـل و بـەرگی ناو کەنتۆرەکەم هەموو هەر دەدا دەرێ هەتا بلوزە قۆلٚ درێژەکەم دەدیتەوە و بەپەلە لەبەرخۆم هەردەکێشـاو گـورج دەهاتمـەوە بەرامبـەری و خـۆم پێشـان دەدا. ئیدی ئەو بەدەست ماچ بارانی دەکردم و حەیرانم دەبوو، ئەمنیش مـاچ بـارانم دەکـردەوە و هـەر بـە ئیشـارەت تکـام لێـدەکرد جـارێ زووە، بـن دار هەنارەکە جێ نەهێڵێ و نەڕوا.

ڕۆژێکیان من لەسەری کۆڵان لە بۆسە دابووم بێوو بـەدوای کـەوم، چـونکە بـە ئامـاژە تێیگەیانـدم کـە شـتێکی لایـە دەبـێ بمـداتێ.. هـات و خـۆی لـە عەباڕەشەکەی وەرپێچابوو بەگورجی بێ ئـەوەی ئاوڕیشـم لێبداتـەوە، دەتگۆ کچە مەکسی سۆرەکەی بن دار هەنارەکەش نییە.. لێم تێپەڕی و رابورد بـەرەو جادەی تەجنیدی و وەکی کوچ کوچەی کەوتمە دوای، شۆڕ بۆوە ئەمنیش شۆڕ بوومـەوە، بایـداوە لای مـاڵی موختـاری ئـەمنیش هـەر لـە دوای بـووم لـەناکاو

دەستی لەبن عەبای دەرهیناو شتەکی فڕیّ دا عەرزی و بۆی دەرچوو.. من بەهەشتاو گەیشتمە سەر شتەکەو هەڵمگرتەوە.. نازانم ئەو کێوە چوو چۆن گەڕایەوە مالّ.. بەلاّم من بەهەشتاوی شتەکەم لە مشتم توندکرد و هەربەغار گەڕامەوە مالیّ.. چوومە ژووری خۆمان.. شتەکەم دەرهینا.. شتێك بوو وەك نوشتە هەڵمپچڕاند، پارچە کاغەزێك بوو بە قەڵەمێکی سور وێنەی دلّ و تیر و خوێن و ئاخ و ئۆفی لەسەر نەخشێنرابوو.. لەسەرەوەی ناوی خۆی (م) و لەبنەوەش ناوی من بە (هەناوم) نووسرابوو. کەواتە ناوی من نازانی هەر بەهەناوم بانگم دەکاو دەمناسی.

لەو بەزمەدا لە پۆلی یەکی ناوەندی بووم، نەئاگام لە دەرس مابوو نە لەکتێب و تاقی کردنەوە و نە لە سەعی، هەموو دونیام تەنیا هەر دوو چاوی میسری و بەژن و بالاّ و زەردە خەنەکەی بن تاقەدار هەنارەکەی ناو حەوشەیان بوو، هەر ئەوها خوێندن بەرەو کۆتایی سالّ دەرچوو، رۆژەك بە ئیشارەت و بە غەمباری تێیگەیاندم کە مالّیان بار دەکات و دەگوازنەوە.. دونیام بەسەردا رووخا، چیبکەم.. چۆن لەمەودوا بتوانم بچمە سەربانی مالّەوەمان و سەیری ناو حەوشەی هەواری خالّی بن دارهەنارەکە بکەم و بەرگە بگرم ؟

مالّیان باری کرد، بەتاقیب زانیم چونەتە گەڕەکێکی قەراغ شار.. بەدەفتەر و کتێب و قەڵەم و مەستەڕەوە دەچووم و بەرامبەر مالّەکەیان لەو ساکەبەیارە پیاسەم دەکرد و هاتووچووم دەکرد بەلّکو بێتە بە دەرگاو چاوێکم پێ ی بکەویّ و دلّە شێتەکەم ساکێن بێت.

عەشقێکی سەیر بوو.. جگە لە ئامازە و دەست راوەشاندن و چاو و برۆ بزواندن یەك کەلیمە قسەمان لەگەلّ یەك نەکرد !

خەنی لە خۆم من ناوی ئەوم دەزانی.. کەچی ئەو ناویشمی نەدەزانی.. کەوتمە دونیای خەیالّ و عیشق و سوتان، تاکە یادگاریم کە بۆ مایەوە ئەو پارچە

کاغەزەکە بوو کە دڵە بەتیر کونکراوەکە خوێنی لێ دەتکا.. ئەم پارچە کاغەزە پیرۆزە سوکنایی بەدڵ و دەروونم دەبەخشی.. کۆتایی ساڵی خوێندنی پۆلی یەکی ناوەندیم بوو. نەئاگام لە سەعی و نە لەخوێندن و نەلە دەرس و دەورمابوو.

لە بیرمە، سبەینەیەك بە یادی جاران لەخەو رابووم تەماشایەکی ئەو بەری و حەوشەو دارهەنارەکەم کرد و لە هەواری خاڵیم دەروانی.. ئەم دێرە شیعرەم لە خەیاڵدا چەسپی:

سەرم خستە سەرسەرین

ئاورم داوە بەدڵێکی غەمگین

ئیدی کاروپیشەم بووە راوەستان بەرامبەر ماڵیان و هات و چۆی کۆڵانیان.. رۆژی چەندین جار دەچووم و دەمدیت و نەمدەدی.. دوکاندارێکی رەزا قورس لەسەری کۆڵانەکەیان دیقەتی منی دابوو تاقیبی دەکردم.. نیوەرۆیەك بە بەردەم دوکانەکەی رەت بووم بانگی کردم:

-وەرە وەرە.. چت هەیە لەو کۆڵانەی.. لۆ ئەوەندە جرت و فرتتە.. ئەتو داك و خوشکت نییە ؟

من زمانم تێك ئالاً و نەمزانی چۆنی وەلاّم بدەمەوە و چ بڵێم ؟ یێخەی کراسی گرتم و رایوەشاندم و نەڕاندی:

-مل ترتڕۆکی چورچە و پیس دەزانم ئەو جرتوفرتەت لە چییە.. برۆ دەفنبە جارەکی دی لەو کۆڵانەی بتبینمەوە خراپت بەسەر دەینم. خوا خوام بوو بەرمدا و لەبن دەستی قوتار بم.

ئەو ساڵی هەرکە کارتمان وەرگرتەوە، جگە لە وانەکانی وەرزش و کوردی و هونەر لە هەموو وانەکانی دی گولاّڵە سوورەم بۆ نەخشێنرا بوو و ئەو ساڵی خوێندم بە ساقیتی لەسەر میسری یە خانم و عەشقە بێ دەنگەکەی دانا.

# تەلەفزیۆنی رەش و سپی

پێشتر بەر لەپەیدابوونی کەناڵی کوردی لەکەرکووك، تەلەفزیۆنی بەغدایێ هەبوو، لەهەولێرێ ژمارەیەکی کەم خێزان ئامێری تەلەفزیۆنیان هەبوو شەوان بەدیار بەرنامە عەرەبیەکانەوە دادەنیشتن، ئێمە ئەوکاتی تەلەفزیۆنمان لەماڵێ دا نەبوو، هەر کەجار جارەش دەچووینە ماڵی خزمێك کەتەلەفزیۆنیان هەبوو، هەوڵمان دەدا هەر زوو بەزوو ئێوارەکەی بگەینە ئەو ماڵە تا فیلمە کارتۆنەکانی (پاپایی و دوو قەلەکە)مان لەکیس نەچێ، زۆرجاران هەر کەدەگەیشتینە ماڵەکە ئەوان هێشتا نانی ئێوارەیان نەخواردبوو، بۆیە روویان لێ گرژ دەکردین و بەچوونەکەمان هەراسان دەبوون و وایان نیشاندەدا کەبەچوونەکەمان دڵخۆش نینە و وەزعەکەمان لێ تێك داون، هەندێ جار خانەخوێ لەرقی ئێمە تەلەفزیۆنەکەیانی دەکوژاندەوە و نەیدەهێشت نەئێمە و نەمنداڵەکانی خۆشی فیلمە کارتۆنەکان ببینین! ! ئەم رەفتارە ناخۆشە چەند بارە بووەوە، هەینێ تازەش کەناڵە کوردیەکەی تەلەفزیۆنی کەرکوك پەخشی یەك چارەکە سەعاتی دەست پێکردبوو، باوکم لەو رەفتارانەی هەندێ لەخزمان زۆر تورە بوو، هەتا رۆژێك لەناکاو تەلەفزیۆنێکی هێنایەوە ماڵێ و لەسەربانێ ئەنتێن دامەزرا و وایەر بەحەوشەیدا بردرا ژووری دانیشتنمان، ئێمەش خوا خوامان بوو ئێوارە دابێت و لەدیار تەلەفزیۆنی خۆمان تۆتکە بگرین و تێر تێر پاپا و دوو قەلەرەشە عەجولەکە ببینین و گوڵەبەرۆژە بقرتێنین و (چا)یەی بەسەردا بکەین و چیدی منەتمان بەماڵی کەس نەبێت.

خەنی بووین، ئێواران بەدیار تەلەفزیۆن لەداڵەکەی دەست پێکەوە هەتا داڵی کۆتایی چاومان لەسەر شاشە نەدەتروکاند و ئاگامان لەوانە و دەرس و دەوری قوتابخانە هەر نەما، هەتا وردە وردە پەخشی کەناڵە کوردییەکەی

کەرکوك زیادی کرد، ئێواران بەدیار فیلمی کارتۆن و پاشتر بەسەیرکردنی گۆرانیەکانی کوردی و کە شەویش رادەکشا دەمانگۆڕییە کەناڵی بەغدا و بەدیار فیلمە عەرەبییەکانی میسری هەڵدەکورماین.

پەریزادی خوشکم دەفتەرێکی شەست پەڕی هەبوو، هەرکە فیلمەکە دەستی پێدەکرد ئەو سەیری تایتلی دەکرد و ناونیشانی فیلمەکە و ناوی پاڵەوان و ئەکتەرەکان و دەرهێنەری تۆمار دەکرد. هەر زوو بەزووش لەئاکاوتنی شێوەزاری ئەکتەرە میسرییەکان شارەزا بووین و تێیان دەگەیشتین، دەیانجار بەدیار کەمال شناوی و شادیە کەدوو عاشقی سەرسەخت و سووتاوی یەك بوون و دواتر و لەکۆتایی ئاشکرا دەبوو کە (کەمال شناوی– ئەحمەد و شادیە– ئامال) بەئەسڵ خوشك و برای یەکترن و رۆژگار و ناکۆکیەکانی دایك و باوکیان لێکی دابڕاون و بەبەڵگە و بەشاهێدی خزم و ناسیاوان، خوشك و برا دەردەچوون و عیشق و دڵدارییەکەیان دەبووە بڵقی سەر ئاو و ئێمەش بەدیارییانەوە دەگریاین.. . پەریزادیش لەهەمووان پتر فرمێسکی دادەباراند.

ئەدی دایکم بۆ ناڵێی، ئەوەندە لەگەڵ ئێمە سەیری فیلمەکانی کرد تا زۆر بەئاسانی لەفیلمە میسرییەکان دەگەیشت، کەچی تەقەی سەری لەعەرەبییەکەی عێراق دەهات.

گۆرانییەکانی عەبدولحەلیم حافز بووە نان و ئاومان، لەگەڵ گۆرانی (مەوعود و یا خەلیل قەلب و بتلومونی لیّ) و دەیانی دی دەتواینەوە، وای لێهات بەدوان دەچوینە بازاڕ و لەکتێبخانەکان گۆڤاری (مەوعێد و شەبەکە و مشوار و ئەلکەواکب و سەباح و لخەیر)مان دەکڕی لەماڵێ بەنۆبەت دەمانخوێندنەوە، هەرکە گۆرانی (مەوعود و قارێئەت و لفینجان و زەیلهەوا و گەبار) بەدەنگ بڵاو دەبونەوە بەکەچە موسەجەلەکەی ماڵێ لێمان دەدا و حەیرانی دەنگە ئاسمانیەکەی حەلیم دەبووین، کە ئێمە لەگەڵ عەبدولحەلیم

دەمانگوت (یا وەلەدی) سمێری سۆری باپیرمان بەگاڵتەو قەشمەری بەتۆنێکی تەنز ئامێز لێی وەردەگرتینەوە و دەیگوت: (یا قوزەڵقورت) بەمشێوەیە سات بەسات و رۆژ بەرۆژ لەوانەکان و دەرس و دەور دوور دەکەوتینەوە و بووینە موریدی بەردەم شاشەی تەلەفزیۆن، هەتا وای لێهات خوشکم لەپۆلی شەشەمی سەرەتایی و منیش لەپۆلی پێنجەم لەکۆتایی ساڵ دەرنەچووین و ساقیت بووین، هەینێ باوکم لەرۆژێکی قوڕ و باران کڕیارێکی هێناوە ماڵێ و لەبەرچاوی ئێمە کابرای کڕیار تەلەفزیۆنەکەمانی بردە دەرێ، ئەوەندەی ئێمە گریاین و پاڕاینەوە و دایە واستەی بۆ کردین، بەڵام بێسوود بوو، کابرا تەلەفزیۆنەکەی لەباوەش گرت و بەرەو دەرگای حەوشە ملی لێنا، هەینێ دایکم گوتی:

– برۆ بیبە، بەران ئینشائەڵڵاە خێری لێ نابینی و دەسووتێ.

کابرا ئاوڕی نەك لەدایکم لەهەمووماں دایەوە کەلەناوەڕاستی حەوشە واق وڕماو لەبەرێکردنی تەلەفزیۆنەکەماندا بووین، گوتی:

– لۆ خوشکم لۆ دوعای ئەوهامان لێ دەکەی؟ ئەمن بەپارە لەکاك عەبدوڵڵام کڕییە، خۆ نایدزم؟

بەم شێوەیە، شیوەن و ماتەم لەماڵی ئێمە بەردەوام بوو، کەچی من کەیفم بەوە دەهات (ئالێری) سەربانێ هەر لەجێی خۆی بوو، کابرای کڕیار نەیبرد، لەدڵی خۆم دەمگوت:

– مادام ئالێرەکەی نەبرد، هە بزانە باوکم تەلەفزیۆنێکی دیکەی لۆ کڕین!

هەرواش بوو، دوای قەدەر عەیامێك، لەئێمە بەڵێن کەدەور و دەرسەکەمان بەقوربانی تەلەفزیۆن نەکەین و لەباوکیشم هیمەت، تەلەفزیۆنێکی لەجاران گەورەتری هێنایەوە و هەموومانی دڵخۆش کرد، ئێمەش تا سەعی و دەور و وانەمان هەبا تخونی تەلەفزیۆن نەدەکەوتین و ساڵی دواتر هەمووماں بەسەرکەوتوویی لەپۆلەکانمان دەرچووین.

## بووزاویك.. ئاشوبیكی كوژاندەوە !

رەمەزانە، پاش عەسرێکی درەنـگ بەپەلـە چـوومە ژووریَ و هـەڵمکوتا سـەر دایکم کە خەریکی دورمان بوو:

–دایە دایە.. دە فلسم بدیَ دەچم دوو شیش فاتەڕەشی دەکڕم.

دایکم لەسەر مەکینەی دورمانیَ هەستاو چوو لە قۆدیەکەی ناو دەلاقەی پێنج فلسی دەرهیناو لە دوورِ دەستی نام و گۆتی:

–ها بگرە یەك شیشت بەسە.. با شیوەکەشت پێبخوریَ.

ئیدی دەرپـەڕیم، لەسـەری کـۆلآنیَ فاتـەڕەش فرۆشـەك بەبرسـیان دەورە درا بوو، ئەویش لێکە لێکە فاتەڕەشـی دەبرژانـد، منـیش پـارەم وێرکـرد و نۆبـەی خۆم گرت، دیمەنی برژاندی فاتەڕەش لەسەر ئـاگری رەژووەکـە و چـۆڕانەوەی ئەو خوێن و خیزاوەی دەکەوتە سەر پۆڵوە خەڵوزان و چزەی لێـوە هەڵدەسـتا نەوسی هارکردم.. لە دڵی خۆم گۆتم:

–بە رۆژی بوونی چ.. هەرکە شیشی برژام وەرگرت یەکسەر دەچمە ماریَ و بـە تەماتە و پیازی پاروەکی ئەستوری پێدەکەم و دەیخۆم.. برسـیمە و چـاوەڕیَ ی بەربانگی ناکەم، جاریَ زۆری مایە.

نۆبەم هاتوو شیشی خۆم وەرگرت و هەر بەغار بۆ ماڵیَ، هەرکـە دایکـم چـاوی پێمکەوت زانیی نیازم خراپە لێنەگەڕا هیچ بکەم.. گوتی:

–بینە لەسـەر مەنجـەری نـانی دانـیَ، هەنـدەی نەمایـە هـەر بزانـە بـانگی دا.. هەینیَ بیخۆ.

لێمان بووە مل ملانێی نەوسە تاو سەندوەکەی من و نەکەی و نەخۆی دایکم و نێستا نا نێسـتای بـانگی مـەلا و رۆژ و بشـکێنم و فاتەڕەشـەکەم بخـۆم.. ئـەو بەزمە درێژەی کێشا، هەرکە بە درەنگیشەوە بـانگی دا فاتەڕەشـەکەم تـەڕاتی

پێوە نەما بوو وەك لاستیقی هیشك و برینگی لێهاتبوو، لە داخان دەمم لێنەدا.. لە هەینێوە فێربووم، لە ماڵێ بە رۆژ و بووم.. لە دەرەوەش بەدزی لەلای (گالە)ی بەرامبەر دەرگای سینەما سیروان لەفەی تەڕی (سیپەلاك و جگەرم ) دەخوارد و هەرکە دەگەڕامەوە ماڵێش خۆم بە برسی و هیلاك و تێنوو پێشان دەدا.

ئەو هاوینەی باسی دەکەم و مانگی رەمەزانێ ی تیا گوزەرا.. دونیا زۆر گەرم بوو، هەینێ تەنیا پشت بە سەهۆلی کڕین دەبەسترا بۆ سارکردنەوەی ئاو و ماستاو و شەربەت.. سەلاجە لە مالآن پەیدا نەبوو بوو.. بەمجۆرە ئێواران نیو کاتژمێر پێش بەربانگی دەبووە ڕاکە ڕاکەی پەیداکردنی بوز لە تەیراوەی هەر مام هاشم دوکانی بوز فرۆشتنی هەبوو لە تەنیشت ئەنوەر حەلاقی و بەرامبەر ماڵی مام عەزیز کەندێ بوو.. لەبەردەم دوکانێ دەبووە هەرا و خەپسەك هەتا نیو کێل بەفرت بەردەکەوت دەکەوتیە ناو ئاو و ئارەقەی ڕەش و شین.

ماڵی ئێمە چونکە قەرەباڵغ بوو، کەشی پارشێوان و بەربانگمان زۆر خۆش و بەجۆش و خرۆش بوو، لە پارشێوان هەموو بەیەکەوە هەتا ئێمەی گچکەش بە ئاگا دەهاتین و لەسەر یەك خوان خڕ دەبووینەوە، جا ئەو پارشێوەی بانگیان نەکردبام سبەینەکەی تێر و پڕ دەگریام.. بابە حاجی دەیگۆت:

–کاکۆ ئەتو جارێ منداری.. لەمەودوا هەرت دەستێنین و پارشێوی بکە.. بەس دەبی هەتا نیوڕانێ بە رۆژی بی و بیشکێنە، رۆژەکی دیش هەتا نیوڕانێ ئەوجا هەردوکت لۆ لەیەکدی گرێ دەدەین.. ئەوهای رازی کردم و ئێوارانیش نییەتی پێدەهێنام و دەیگوت:

من چیم گوت لە دوام بیڵێوە.. دەمگوت باشە، دەیگوت:

–نییەتم هەیە سبیانێ.. لە مانگی رەمەزانێ، لەساری ئەو سارەکە بەرۆژی بم هەتا نیوڕانێ.. نیوڕانێش بکەومە سەر تەشتەکی نانێ.

نیو سەعات بەر لە بانگ و رۆژو و شکان، بابە خدرم لەبەر تینوێتی و برسیەتی ئۆقرەی لێهەڵدەگیرا و شەڕی داروبەردی دەکرد، بەسەر قاڵدرمەی سەربانێ دەکەوت و هەستی رادەگرت.. دەبوایە یەك لە کچەکان جامە بەفراوەکی کەللە تەزێن و دوو دەنکە خورمای لەسەر دەستی حازر و ئامادە بکات تا لەگەڵ (اللە اکبر) ی مەلای مزگەوتی حاجی مەجید قەرداری بابە مەحتەل نەبێت و یەکسەر رۆژووەکەی بشکێنێ.. ئیدی لە چاوەڕوانی بانگ و دواکەوتنی، ئەو ددانی جیڕ دەکردەوە و دەینەڕاند:

–دەترسێم مەلا خەوی لێ کەوتبێ و ئاگای لە دونیایێ نەمابی.. چ بوو هەر بانگی نەدا، دەبانگ بدە ئاخر خنکام لە تێنان هەی مەلای نا مەلا.

هەینێ مامم ئەنوەر لە رۆژانی رەمەزان شەکرلەمە و لوقمە قازی و پاقلاوە درێژ و بە شیلاوەکانی زۆر بەتام و لەزەت درووست دەکرد و ئێواران لەبەردەم دوکانێ ی دادەنا، تا بانگی دەدا بۆ خۆمان بە پڕە پڕ چەند دانەیەك لە شەکرلەمە و لوقمەقازی و پاقلاوە بە شیلاوە دەمایەوە.

پاش فتاریش.. لەبەردەم چایخانەکانی تەیراوەی دەبووە یاری و گەمەی سێنی و زەرف و شیرینی و شەربەت و تککە و کەباب و فەشافیش دەخورا.. هەر ئەو دەمیش دمبك لێدەدراو گۆرانی کوردی و تورکی و جارجارە عەرەبیش دەگوترا.. ناو بە ناویش تیمی یاریزانانی کەرکووك یاخود پردێ دەهاتن و گەمەکەیان گەرم و گوڕتر دەکرد و دەبووە پێشبڕکێ و قۆریات و بەستەی یار زەینەب زەینەب و حەیران تێکەڵ دەکران و تا لەگەڵ ڕمب و هۆڕی دەنگی دەهۆڵیش هەموو بەیەکەوە پارشێویان دەکرد و هەولێریە تەیراوەییەکان یاریزانە کەرکووکییە تەپەیی و موسەلاّییەکانیان بە روو خۆشی بەڕێ دەکرد و بۆ یاری و شەوێکی دی، ژوان لە چایخانەیەکی تەپەی مەلا عەبدوڵلاّی کەرکوکێ دیاری دەکرا.

بەزمی مامم ئەنوەر و مام هاشم بوزفرۆش عەجایب بوو.. رەفیقی یەك بوون و شەوان پێکەوە مەست و خەیاڵ دەبوون، لە دوکانەکەی مام هاشمی ئەو سندوقە گەورەیەی بۆ کێلە بوزانی دانا بوو، لەلای بنەبانێ لەگەڵ دیواری کەلێن و مەجالی دانیشتنی دوو کەسی لە بەرامبەر یەك دانیشتووی هێشتبۆوە.. ئەمەیان بۆ ئێواران بوو هەرکە کێلە بوزەکان سەفت دەکران، ئەودیو زۆر فێنك و دلگیر دەبوو.. ئیدی مامم ئەنوەر و مام هاشم لەوێ دوو بە دوو بەرامبەر بەیەك دادەنیشتن و پێکیان دەکرد و هەڵیاندەقوڕاند و خۆیان لە گەرمای سوتێنەری هاوینی هەولێرێ دەدزی یەوە.. . بێگومان ئەم بەزمە لە پێش و پاش مانگی رەمەزانێ بوو، دەنا لەگەڵ نییەتی رەمەزانێ دەمییان لێ نەدەدا.

جارێکیان، بابە خدر ئیشی بە مامم ئەنوەری هەبوو، منی بەدوادا نارد.. کە چووم لە فڕنی خۆی نەبوو، گەڕامەوە گوتم لەوێ نەبوو.. باپیرم گوتی:

–بڕۆ دوکانی هاشمی بوزفرۆش هەوکە دوو بە دوو لەوێ دانیشتینە قوزەڵقورتەکەی دەخۆنەوە.. پێی بڕێ با بێتەوە ئیشم پێیتی.

کە چووم کەس لە دوکانێ نەبوو.. تەنیشتا و تەنیشت چوومە ناو دوکانێ ئەوجا لە پشتەوە ڕا گوێم لە دەنگیان بوو.. مام هاشم دەیگۆت:

–ئەبو ئەمیر ئەو عالەمە زۆر باغنیشە.. هاوینان چونکە گەرمایە وموحتاجی بوزینە کە دەمبینن تەحییەم لێ دەکەن و پێم دەڵێن: کاك هاشم حەیاتم سان!، وەکی دی لە زستانان لێم با دەدەنەوە و پێم دەڵێن (هاشم سچەنە). "سچەنە بە زمانی تورکی واتە مشك".. خەڵکی تەیراوەی ئەوەندە مام هاشمیان خۆشدەویست پێیان دەگوت: هاشم سچەنە. ئەدی هەر لەبەر خۆشەویستی نەبوو هەولێری بە حاجی شەوکەتی لە پاش مەرگمیشیان دەگوت: مشکۆ ؟

ئەو ڕەمەزانەش کە کەوتە چلەی هاوینێ.. هەولێر زۆر گەرم بوو، دەکولا.. بە عادەت عەسران سەهۆڵ بە لۆری دەگەیەنرایە پێش دوکانی مام هاشمی و لە ناو سندوقی سەفت دەکرا و دەست و برد هەرکەسە و بەشی خۆی دەکڕی و دەیبردەوە، ڕۆژەکیان گەرمایەکە تاقەت پڕوکێن بوو.. قیری جادەی شل کرد بووە و پێڵاوی تێدا نقوم دەبوو.. عەسر داهات و خەڵك هێدی هێدی خڕ بوونەوە، بەر دوکانی بوزی جمەی دەهات، کەچی لۆرییە بۆر چ خەبەری نەبوو.. خەڵك لەبەردەم دوکانێ و مام هاشمیش لەسەر تەختەی دەستی بە سمێڵی دادەهیناو چاوەڕێ ی لۆرییان دەکرد.. کەچی لۆری هەر نەگەیشت.. قوڕگەکان وشکتربوون، گەرماگەرمتر.. کەس ئاگای لە ڕەمەزان و لە ڕۆژ و نەما.. کەمێك پێش بەربانگ خەبەرهات مەعمەلی بەفرەکە شکایە و ئەوڕۆ بوز نییە، لەگەڵ خەبەرەکەش دەنگی مەلا و بەربانگ و ڕۆژ و شکاندن تێکەڵاو بوو.. خەڵکەکە هیلاك و تێنوو برسی، بووە غەڵبە غەڵب و جنێودان و دەست راوەشاندن.. لۆی هەبوو خراپ بقەومێ، هەینێش ئەو هاشم سچەنە مەرد و مەردانە هاتە دەست و بە هانای خەڵکەکە هات و یەك پەقرەج بوزاوی لەسەر تەختەی دوکانێ دانا و هاواری کرد:

–سلاوات لە پێغەمبەری نازدار بدەن و یەك یەك وەرن ڕۆژیتان بشکێنن، لۆ سبەی هێواریش خوا ئەڕحەمولڕاحمینە.

ئیدی خەڵکەکە هێور هێور بە بووزاوی کەللە تەزێن ڕۆژیان شکاند و بەرو ماڵ بوونەوە.

ئای خودایە. ئەو بووزاوە چ سحرێکی تێدا بوو، ڕۆژوانانی بوژاندەوە و ئاشوبی شەڕێکی سەختی کوژاندەوە. مام هاشمی بووز فرۆشیش یادی بەخێر و ڕۆحی هەمیشە شاد.

## تەیراوە.. زستانان لافاو، هاوینان قات و قڕی

زستانی ساڵی (١٩٦٨) لە تەیراوەی لە راستی مزگەوتی حاجی عەبدوڵڵای حەمامچی پاش بارینی بارانێکی یەکشەو و رۆژی لافاو ئەوها هەستا بە هەردوو چاوی خۆم بینیم لانکی منداڵ و کاریتەی خانیان و بەرمیلی بەتاڵی نەوت بەسەر ئاویَ کەوتبوون و گوڕەیان دەهات و بەرەو خوار ملی لای کەندەکەی حەمامی ئەتڵەسیان گرتبوو.. پیرەژنێك گوتی:

– خوایە لۆخاتری گەورەو عەزەمەتی خۆت.. ئەو لانکە بەتار بی و چ منداری تێدا نەبی.

ئێمە، باوکم و دایکم و خزم و کەس بەپەلە و بەهیمەت بەرەو لای مزگەوتی حاجی عەبدوڵڵا چووین، چونکە لەو کۆڵانەی ماڵی عوسمان حەیران و پلکە عەیشێ ی ژنی لە پێشەوە بوو، ماڵی فەقیَ سمایلی خزمی نزیکی باوکمی لیَ بوو زۆر دەترساین ئەوانیش بەر ئەم لافاوە نفوراتە کەوتبن.

دایە حاجی بە هەناسە برکیَ وە دەیگوت:

–ئاو و ئاگر لەکەس نەبی حازر.

بەزم و رەزمی زستانان و لافاو و زیان لێکەوتووانی تەیراوەییان بەهۆی لافاوەوە تەواو نابێت. بەڵام خەڵکی رەش و رووتی تەیراوە قۆڵی مەردایەتییان لیَ هەڵدەماڵی و هەرکەسەو بە گوێرەی بەرك و باغەری بەشداری ئەو کۆمەك و دەستگیرۆییەیان دەکرد کە بۆ زیان لێکەوتووان خڕ دەکرایەوە.

هاوینیش، لەسەری کۆڵانی تەجنیدەوە تا دەگەیشتە ئەو کۆڵانەی بەماڵی خەلیفە سەعۆ کۆتایی دەهات دەبووە قات و قڕی ئاو و بەلۆعەکانمان گەروویان وشك دەبوو تلَپی تەڕاتیان لیَ نەدەهاتە خواریَ.

ئاو بۆ خواردنەوەش بەدەست نەدەکەوت، چ جای ئاو هەبیَ خۆمانی پیَ

بشۆین یان پیرەمێرد و پیریژنـەکانمان تـارەتی پـێ بکـەن و دەسـتنوێژی پـێ هەلگرن.

ئیدی هەر ماڵە و بەرێگایەك هەوڵی پەیداکردنی چەند پەقرەجێك ئـاوی دەدا و دەبووایە شەو و رۆژێك بیست و چوار سەعات ئاوەکەیان بەش بکات.

لە کۆڵانی ئێمە گەنجەکان (محەمەدی مام حسێنی وفارسی حـاجی کـەریمی و زەکەریای کاکۆ خـەیاتی و رەمـزی معـاون سـاڵحی ) و ئێمـەی مێـرد منـداڵیش (ئەزو مۆفەقی برای زەکەریا و کەژادی برای رەمزی و مزەفەری مام مـەولوودی و سەرداری دادە عیسمەتی ) مەنجەڵ و تەنەکە و پـەقرەج و نیـوە بـەرمیلمان خڕ دەکردەوە و لە عارەبانە درێژەکەی (سەدرەدین پیاز خۆر)مان بـاردەکردن و لە جادەی تەجنیدی شۆڕ دەبووینەوە و بەرەو کەندێ و بۆ بەر دەرگای ماڵی مام حەمیدی قەساب.. چونکە خانووەکـەیان لـە قـۆرتێ بـوو بەلوعەکـەی وان ئاوی باش رادەکێشا.

ئیدی دەبووە سرەی ئاوێ.. بەنۆبەت و یەك لە دوای یەك کەلوپەلەکانی سـەر عارەبانەمان پڕ ئاو دەکرد و هەر دەکشاینەوە بۆ لای ماڵێ.

بێگومان ئەو ئاو پەیداکردن و عارەبانە پاڵدان و راکێشانە بێ گێچەڵ و کێشـە و تەشقەڵەنە دەچووە سەر. سێ شەڕو چەقە چەقی ئاو پەیـداکرن و عارەبانـە پاڵدانتان بۆ دەگێڕمەوە:

یەکەم: هەرکە عارەبانە بە باری پـەقرەج و بـەرمیل و مەنجەڵـەوە دەگەیشـتە بەردەم ماڵی حەمیدی قەساب و دەبووە بینە و بـەردەی گەنجـەکان، کیـژەکی خرپن ماڵیان بەرامبەر ماڵی قەسـاب بـوو دەهاتـە بـەدەرگا و چـاوبازی لەگـەڵ محەمەدی مام حوسێن و فارسی حاجی کەریمی دەکرد.. ئەوانیش بە ئیشارەت و دەسـت لـە پـرچ دان دەیاندوانـد، فـارس سـەعاتەکەی مەچـەکی بـەرەواژی لەدەست دەکرد کـە ئـەو کاتـە عاشـقەکان سـەعاتییان وا لـە دەسـت دەکـرد.

شەوێك لەسەر كیژەی خرپن (محەمەد و فارس ) بووە شەڕییان و ئەو سۆندەی ئاومان پێ ڕادەكێشایە سەر عارەبانەی بووە ئامێری شەڕ و هەردوكیان یەكتریان شل و كوت كرد.. كیژەش دوور بە دووری بەهەردووكیان پێدەكەنی و ئەو شەوی ماڵەكانی كۆڵانیمە بێئاو سەریان نایەوە.

دووەم: شەوێكیدی، هەركە گەیشتینە بەردەم ماڵی بە ئاو، دەست و برد مام حەمیدی قەساب هاتە دەرێ و ئەمری پێكردین مەنجەڵ و پەقرەج و بەرمیل لەسەر عارەبانە بینینە خوارێ.. بەڵێ باشە وامان كرد، ئەویش چووە ژوورێ و هەندەكی پێچوو بە مەیمونی لە باوەشەوە هاتە دەرێ و بە گورجی هاویشتیە سەر عارەبانەی و یەك دوو گەنجی بەگەرە خۆی دا گوتی:

–یەڵلا بازۆن لۆ گەڕەكی سەیداوەی. ئیدی گەنجەكانی مە بەگەری كەوتن و لێخوڕە بۆ سەیداوە.

ئێمەش لەوێ ماینەوە و چاوەڕێی گەڕانەوەی عارەبانەی بووین.. زوو زووش ڕەمزی دەیگوت:

–زاهیر بڕۆ بزانە ئاو نەبڕایە.

دەچووم و بەلۆعەكەم دەكردەوە و دڵنیا دەبووم ئاو هەر دێ.

ئاخر سەیداوە زۆر دوور بوو، هەتا چوون و مەیمونیان لە ماڵێكی سەیداوەییان بەجێهێشت و هاتنەوە زۆریان پێچوو. هەركە گەیشتنەوە لای مەو هەتا مەنجەڵ و پەقرەج و نیوە بەرمیل لەسەر عارەبانە گیرسانەوە.. ئاوە حەیاتەكەش بڕاوچۆڕ بڕ بوو.. ئەمەش بە بەتاڵی هەركشاینەوە لای ماڵێ. بەلام هەنوكەش نەمزانی مام حەمیدی قەساب ئەو مەیمونە مێیەی لۆ بردە ماڵێكی سەیداوەییان.. ئایا فرۆشتبووی یان ژن و منداڵەكانی چیدی لێیان قبوڵ نەكرد مەیمون لەناو ئەوان بە خێو بكات ؟!

سێیەم: شەوەكیان ئاو چۆڕ چۆڕ دەهات، وەك شەوەكانی تر بە گوڕ نەبوو..

ئیدی هەر هەموومان لە پڕکردنی ئەو هەموو حاجەتە زۆر ماندو هیلاك بووین، لەگەڕانەوە و هەڵکشان بە جادە ڕکەکەی تەجنیدی لە نیوەی ڕێگا عەرەبانە بەگا و بەگ گەڕایەوە و کەس هێزی ئەوەی تیا نەمابوو بەر لە بەدواوە گەڕانەوەکەی بگرێ و تا عەرەبانە لە ڕۆخی ڕەسیفێك چەقی و بووە شڵپوهۆڕی ڕژانی ئاوێ و تریقوهۆڕی مەنجەڵ و پەقرەج و تەنەکەکان.. هەرچی ئاو هەبوو بەو جادەی تەجنیدیدا شۆڕ بۆوە و نەبووینە خاوەنی جامە ئاوەکیش.. ئەو شەویش خەڵکی کۆڵانی مە بێ ئاو و هەناسە سارد شەوییان بەڕێ کرد.

عەنتیکەکە لێرەیە.. ئەم قات و قڕیەی ئاوێ چەند هاوینێك لەسەر یەك دووبارە دەبۆوە.. کەچی هێندە فەقیر و کەمزان و هیچ نەزان بووین.. ئاقڵێکمان لێ هەڵنەکەوت بڵێ:

(کاکە با سەردانێکی دایەرەی ئاو.. یاخود شارەوانی هەولێرێ بکەین.. تا کێشەی بێ ئاوی ئەم چەند کۆڵانەی تەیراوەمان بۆ چارەسەر بکەن ).

وای کە غەریب حاڵ بووین و کەسەکێ نەبوو نەسیحەتەکێن لێبکات

## پێشبڕکێی ژن

ئەو پشووی هاوینەی باسی دەکەم، باوکم لەخەمی ئەوەدا بوو کەکوڕە گەورەکەی دەستوپێ سپی دەرنەچێت، بۆیە هەر لەتەیراوە لەلای مام حەمەدەمین حەلاقی خاوەنی سەرتاشخانەی (قوباد) دایانم بەڵکو ئەوە خوایە فێرە سەرتاشین ببم میهنەیێکم هەبێت، چونکە بەقەولی باوکم میهنە بازنی زێڕە.

حەمەدەمین حەلاقی وەستام لەمەسەلەی ژنان زۆر تامەزرۆ و تینوو بوو، بەهەوەنتە دانەدەمرکا، سەرەڕای ڕێز و حورمەت و بەدینی و خواپەرستی زۆریش حەزی لەژنان بوو، با دوو دیاردەی هەینێی تەیراوە و بیروباوەڕی ئەوکاتی تەیراوەییان بکەمە نموونە:

یەکەم: لەناکاو پارچە کاغەزێکی چوار گۆشە لەتەیراوەی ئەو دەست و ئەمدەستی دەکرد و دەیانگوت:

– بێوەژنێکی قیت و قۆز و زەخم و ڕەش ئەسمەر.. ئەو خەریتەی بڵاو کردیتەوە و بەتەمای خانیەکی دوو قاتە.. دەیەوێ بزانی کێ دەتانی لەسەر ئەو خەریتەیەی ئاو و کارەبا لۆ هەردوو قاتان ڕاکێشێ و هیچ خەتێك وەبەر خەتەکەی دی نەکەوێ و ئاو بەلایەك و کارەبا بەلایەکەی دی لێك گیر نەبن، هەر کەوەستام کاغەزە خەت خەتە چوارگۆشەکەی وەرگرت، پرسی:

– ئێ باشە، ئەوە ئاومان بەئایری و کارەبام بەجێیەکیدیدا ڕاکێشا، هەینێ چ دەبی؟

کابرای دەلاڵ و چەرچی گوتی:

– کو چ دەبی؟ ئەوە خەریتەی خانی بێوەژنەکی زەخمی ڕەش ئەسمەرە، عەهدی لەگەر خوای خۆی کردیە، هەر کەسەك ئەو خەریتەیەی ئاو و کارەبا

بەبێ کێشە لۆ هەردوو قاتی خانیەکەی راکێشی.. ئەوە بەکراسی بەری مێردی پێدەکات و خۆی لەقەبەری دەکا!!

ئەو وەرەقە و خەریتەیەی ئاو و کارەبای خانووی دوو قاتی بێوەژنێ بووە خەو و خولیای وەستا حەمەدەمینەکەی من، رۆژ هەتا درەنگانی شەو نە دۆمینە و نە ئەزنیفی لەبیر مابوو، یەك پاکەت جگەرەی لۆکسی لەپێش خۆی دادەنا و هەر وەرەقەی رەش دەکردەوە و پێی رازی نەدەبوو دەیدڕاند و وەرەقەیێکی دی دەردەهێنا و سەرلەنوێ دەستی پێدەکردەوە.

خەڵکی ئەوکاتە و لەتەیراوەی، هێندە سادە و ساکار بوون، جارێك بەخەیاڵیاندا نەهات، بڵێن:

– ئەرێ ئەو ژنە چ کەسە؟ماڵیان لەکوێیە؟ کێ دەیناسی و کەخەریتەکەمان بێکێشە دروستکرد و ئاو و کارەبامان بەبێ سەرهێشان بۆ هەردوو نهۆم راکێشا، نەخشەکەمان بدەینە کێ و کێ رادەستی بێوەژنە رەش ئەسمەر و تەڕ و بڕ و زەخمەکەی دەکات؟

هەر لەبەر هەندێش، پاش عەیامێکی زۆر دەنگ، باسی بێوەژنە تەڕ و گەردن کێلەکە بووە بەردی بن گۆمێ و بلۆکێکی لەسەر داندرا و ئەوانەی زۆریان کات بەهەدەردا و جگەرەیان بەدیار نەخشەی ئاو و کارەباکە کێشا، رەنج بەخەسار بوون!

دووەم:

هەر لەتەیراوەی، لەناو تەیراوەییان پارچە کاغەزێك بەزمانی عارەبی و لەشێوەی ئایەتی قورئان بڵاوکرایەوە.

قسەکە وابوو، هەرکەسێك ئەم نوسراوە لەسەر (١٠) پارچە کاغەزی چوارگۆشە بنوسێتەوە و بیداتە (١٠) کەسیدی، ئەوا بێجگە لەوەی لەئاگری دۆزەخ بەدوور دەبێ، لەهەمان کاتیشدا پێغەمبەری خوا، موحەمەدەل

موستەفا دێتە خەونی و چیبوێ بۆی جێبەجێ دەکات!

ئەوەبوو هەر بابای قەڵەم بەدەست بوو، ئەوانەی قیچە خوێندەوارییێکی نەقوستانیشیان هەبوو، دەست و قەڵەمیان شەڕ بوو، (١٠) دانەیان لەبەر ئەو نووسینە عارەبییە دەنووسییەوە و دابەشیان دەکرد، جاری وا هەبوو کەسێك کەوەرەقەییێك لەم نوسینەی دەدرایێ، دەیگوت:

– کاکە وەڵڵاهی وەختە شێت بم، ئەورۆ ئەوە بیستەمین کەسە ئەو وەرەقە بێسەنگ و پڕ لەغەڵەتەم دەداتێ!

## له جه‌ژندا.. به‌ره‌و سلێمانی

پێشمه‌رگه‌یه‌كی خه‌ڵكی سلێمانی ناوی (مه‌جید) بوو، گه‌نجێكی كه‌ڵه‌گه‌ت و روخسار جوان.. له‌ ده‌ڤه‌ری گه‌لاڵه‌ و حاجی ئۆمه‌ران به‌ (سالار) ناوی ده‌ركردبوو، ئه‌و سالاره‌ له‌گه‌ڵ باوكم دۆستایه‌تی په‌یداكردبوو.. له‌هاتوچۆی نێوان (گه‌لاڵه‌ – هه‌ولێر) باوكمی راده‌سپارد كه‌لوپه‌لی پێویستی بۆ بكڕێت و بۆی بگه‌یه‌نێته‌ گه‌لاڵه‌.

په‌یوه‌ندی سالار و باوكم هێنده‌ پته‌و بوو، باوكم ده‌یزانی ماڵی باوكی سالار له‌ شاری سلێمانی له‌ چ گه‌ڕه‌كێكه‌ و كێ و كێ خزمه‌ دڵسۆزه‌كانی ئه‌ون له‌ناو شار.

سالار پێشمه‌رگه‌یه‌كی سه‌ركه‌ش و ئازاو به‌غیره‌ت بوو، جار جاره‌ ده‌هاته‌ ناو هه‌ولێر و به‌ده‌مانچه‌ و چوار پێنج نارنجۆكی ئه‌ڵقه‌دار خۆی ده‌كرد به‌ ماڵماندا، چه‌ند رۆژێك ده‌مایه‌وه‌ و یه‌ك دوو چالاكی پێویستی ئه‌نجامده‌دا و ده‌گه‌ڕایه‌وه‌ شاخ.

تا دواجار له‌كاتی ئه‌نجامدانی یه‌كێك له‌ چالاكییه‌كانی له‌سه‌ر جاده‌ی شه‌ست مه‌تری ده‌كه‌وێته‌ ناو كه‌مینی جاشان و به‌ برینداری ده‌یگرن و راده‌ستی مه‌عسكه‌ری هه‌ولێرێی ده‌كه‌ن كه‌ زیندانه‌كه‌یان له‌ پشت گوندی ره‌شكێن بوو.
ئیدی باوكم زۆر بۆی په‌رۆش بوو. خه‌فه‌تی بۆ ده‌خوارد.

دوای گیرانی به‌چه‌ند هه‌فته‌یه‌ك جه‌ژنی قوربانی ئه‌و ساڵه‌ (١٩٦٩) هاته‌ پێشێ.. نانی به‌یانی جه‌ژنمان له‌ماڵه‌وه‌ خوارد و هه‌ر به‌و به‌یانیه‌ زووه‌ باوكم بڕیاری دا به‌خاو خێزانه‌وه‌ بچینه‌ سلێمانی و سه‌رێك له‌ماڵی باوكی كاك سالاری به‌ندكراو بده‌ین.

ئه‌وه‌بوو به‌قه‌مه‌ره‌ دۆج پلایمۆته‌كه‌ی به‌رێگای كه‌ركووك ملی رێگامان گرته‌ به‌ر، له‌ ئاڵتون كۆپری دوای په‌ڕینه‌وه‌ له‌ یه‌كه‌مین پرد لاماندا.. گازینۆیه‌كی جوان به‌كه‌لوپه‌لی فۆلكلۆری رازابووه‌وه‌ و بۆ فرۆشتن داندرابوون، لاماندا و

کەمێك حەساینەوە. دواتر بەرەو کەرکووك.. هەرکە گەیشتینە ناو شاری بابە گوڕگوڕ لە پێچێکدا ترومبێل پەکی کەوت و کوژایەوە و باوکم زۆر هەوڵی دا بەگەڕ نەکەتەوە.. ئێمەش هەر لەناو ترومبێل مات و مەلوول بە جلکی جەژنەوە لە چاوەڕوانیدا بووین، جادەکە دوو ساید بوو لەو بەری قەڵەباڵغیەك کەوتە بەرچاومان دیار بوو کۆمەڵێك کەس بەدارە مەیتێکەوە بەرەو گۆڕستان بەدادو فیغانەوە دەڕۆیشتن.. لەپێش جەنازەکەش دوو کەس چووبوونە ژێر باڵی پیاوێك کە زۆر بەزەحمەت هەنگاوی دەنا.

ئێمە ئاگامان لە پەککەوتنی ترومبێل هەرنەمابوو کە لەناکاو بە ئیش کەوتەوە و باوکم بۆنیتی دادایەوەو لەگەڵ پیاوێك کە لەلای راوەستا بوو دەستی یەکترییان گوشی و هاتە سەر ستێرن و گێڕی گۆڕی و گوتی:

—ئەڵلاهـ.. بەناوت.

هەرکە بەرێکەوتین.. باوکم رووی دەمی لە دایکم کردو گوتی:

—قەدە.. دەزانی ئەو جەنازەی لەوبەری دەیانبردە قەبرستانێ.. ئەو پیاوەی بە دوو کەسان بن پیلیان گرتبوو وابزانم کاك کامیلی برادەرم بوو.. بەران لەبەر کێشەی ترومبێلی خۆم لێ نەکردە ساحێب.

دایکیشم گوتی:

—ئەیەڕۆ.. داخوە کێیان مردییە، ئەتو مارییان پێ دەزانی هەرکە لە سلێمانی گەڕاینەوە سەرەکیان لێ دەدەین لۆ سەرە خۆشی.

ئیدی لە رێگای بەرەو سلێمانیش جارێکی دی دۆجە قیت پەکی کەوتەوە و هەتا بەگەرکەوتەوە و گەیشتینە سلێمانی تاریکی داهات، لەبەر هەندێ باوکم هەڵیدایێ و گوتی:

—تازە بەو تاریکییەی کەلکی مارانمان نییە، ئەوشۆ دەچینە ئوتێلی.. سبەینێ بە چاوی روناکی دەچینە ماری سالاری.

ئەوەبوو لە شەقامی (کاوە) شۆربووینەوە، لە ئەسحابە سپی لەبەردەم ئوتێل

هەورامان رایگرتوو هەموومان دابەزین و بە قاڵدرمەکی سەرکەوتینە سەرەوە..
دوای نانی ئێوارە کە باوکم چوو هێنای هەموومان لە ژوورێکی کەمێك گەورە
ئەوەی لەسەر قەرویڵە ئەوەی لەسەر دۆشەکی زیادە لەسەر ئەرزەکە کەوتینە
خەویٚ. نیوە شەو بە دەنگی شلّپ و هۆڕی ئاویٚ بەخەبەر هاتین، ژورەکەمان
پڕ ئاو بوو بوو دۆشەك و بالیف و بەتانی هەموو لە ئاویٚ هەڵکێشرابوون..
تومەز ئاوی توالێتەکان بەکراوەیی هێڵرابوونەوە و ئاوی تانکی سەرەوە
هەمووی بە ژوورەکەماندا وەربوو.. ئیدی هەڵساین و بووە مشەوەشی..
دۆشەك و بالیف و بەتانیمان هەڵدا دەرەوە ئاو منجەی دەکرد لە ژووریٚ.
دایکم بە کابرای خاوەن ئوتێلی گوت:
–کاکە زەحمەت نەبی گێسکتان هەیە.
+بەم شەوە و بەم لێقەومانە خوشکیٚ گیسکت بۆچی یە.
–کاکە گیسك نا.. گێسك.. گێسك.
دواتر دایکم بە ئاماژە تێیگەیاند کە داوای چی دەکات، ئینجا کابرا گوتی:
–ئەها.. دەوا بڵیٚ تۆ گسکت ئەویٚ.
چوو گسکی هێناو دایکم ئاوەکەی رادا دەرەوە و سەر لەنویٚ.. دۆشەك و
بالیف و بەتانی وشکمان بۆ هات و خەوتینەوە.
بەیانی دووەم رۆژی جەژن، پاش ئەوەی لەخەو هەڵساین.. من و باوکم
چووینە ناو بازاڕ تا خواردنێك بکڕین بۆ نانی بەیانی. من لەلام سەیر بوو..
هەر یەك دووکەس دەگەیشتنە یەك.. یەکتریان ماچ دەکرد و بە یەکترییان
دەگوت (خوا موبارەکی بکات ) من لە خەیاڵی منداڵی خۆم وامزانی ئەوانە
هەموو تازە ژنیان هێناوە و پیرۆزبایی لەیەك دەکەن.. هەرکە ئەو بابەتەم
لەلای باوکم درکاند، زۆر پێکەنی و گوتی:
–کاکە ئەدی جێژنە نییە.. کو ئەمە لە هەولێریٚ بەیەکدی دەریٚن جێژنەت
پیرۆز بی.. بەهەزاری جێژنان بی.. لێرەش لە سلێمانی بەیەکتری دەریٚن خوا

موبارەکی بکات.. یەعنی جێژنەت لێ پیرۆزبێت.

پاش نانی بەیانی، بەڕێکەوتین بۆ ماڵی کاکە سالاری زیندانی، بیرم نەماوە لە چ گەڕەکێك بوون، بەڵام لەبەر چاومە خانووەکان حکومی بوون و هەموویان لەسەر یەك نەخشە دروستکرابوون. کە چووین تەنیا دایکێك و خوشکێکی عازەبی سالار لە ماڵێ بوون.. زۆر بەگەرمی پێشوازییان لێکردین.. ناردییان خزم و کەس بێنە لامان.. هێندەی پێنەچوو دوو گەنج لێمان بەژوور کەوتن.. یەکێکیان ئەو کاکە حەمە سەعید حەسەنەی خۆمان بوو کە دواتر بووە ئەو شاعیر و نووسەر و تەنز نووسە بە توانایە.. ئەویتریان گەر هەڵە نەبم ناوی فازیل بوو.

ئەو رۆژە من لەگەڵ ئەو دوو برایە هاتینە ناوشار.. لەبەردەرکی سەرا لەسەر تەختەیەکی گەورە وێنەی فڕۆکەی هەلیکۆپتەرێکیان دروستکرد بوو، خەڵك لە شوێنی شوفێری وێنەیان لەگەڵ دەگرت. منیش وێنەیەکم لەگەڵ ئەو فڕۆکەیە گرت و دواتر لەگەڵ وێنەیەکی تر کە بەخێزانیەوە چووینە سەرچنار و کاك حەمە سەعید و فازیلیشمان لەگەڵ دەرچووە.. کە بەداخەوە ئەم وێنەیەم لێ وون بووە.. بەڵام وێنەی ناو فڕۆکەکەم بۆ هاتەوە هەولێر و کاك حەمە سەعید بەدەست و خەتە جوانەکەی خۆی لە پشتی وێنەکە نووسیویەتی:

سلێمانیە.. دووەم رۆژی جەژن وێنەی کاك زاهیر عبداللە (٦٩/٢/٢٨).

دوو رۆژ لە سلێمانییە حەیاتەکە ماینەوە و هەر بە کەرکوکدا گەڕاینەوە و لاماندا ماڵی کاك کامل کەرکوکی کە مردووەکە برایەکی گەنجی ئەو بوو، بەیانی رۆژی جەژن دەچێتە ناو گەرماو خۆی بشوات.. دیارە بەبۆن و دووکەڵی تەباغ خنکابوو و درەنگ پێیان زانی بوو.

سالاریش یان مەجیدی سلێمانی تا لە لێبوردنی سەروبەندی بەیاننامەی (١١)ی ئازاری ساڵی (١٩٧٠) لە زیندان مایەوە.. هەنووکەش لە شاری سۆران دەژی و لەوێش هەر بە(مەجیدی سلێمانی ) بەناوبانگە.

# سەرینی باداری

هەر ئەوان رۆژان و بەرێکەوت، رۆژێك لەبن قەلاتێ بووم، پیکابێك بەموکەبیرەیێکی گەورەوە بەشەقامی موزەفەریە هەڵدەگەڕا و پڕوپاگەندەی بۆ شانۆگەرییێك دەکرد بەناوی (سەرینی باداری).

سەرینی باداری شانۆگەری بوو، شانۆکارانی شاری سلێمانی هێنابوویان بۆ هەولێر و لەهۆڵی (گەل) نمایشیان دەکرد، لەبیرمە.. ناوی ئەحمەد دەنگ گەورە و سمکۆ عەزیز و حەمە رەشید هەرەس دەهێنرا، مەراقم کرد، دەبێ شانۆگەری چیبێت و ئەو کابرایە دەنگ گەورەیە چدەنگێکی قەبە و نەقۆلای هەبێ و لەهۆڵی (گەل) چیبکەن.

لێم بووە مەراق، رۆژی دیاریکراو بەرەو هۆڵی گەل چووم..

کەچووم نیمچە قەرەباڵغییێك لەبەر دەرگا هەبوو، خەڵکی دوو دوو سێ سێ راوەستابوون و گفتوگۆیان دەکرد، سەرنجمدا لەدەلاقەیەکی چوارگۆشە یەکێك سەری دیارە و خەڵکەکە یەك یەك دەست لەبەرکیان رادەکەن و پارە دەردێنن و دەستی بەپارە دەبەنە ناو دەلاقەکە و پارچە کاغەزێك وەردەگرن و لەوێ دوور دەکەونەوە..

هەینێ زانیم پەڕینەوە لەدەرگا گەورەکەی هۆڵی گەل بەپارەیە و هەتا بلیت نەبڕی فیل نییە بتوانێ بتباتە ژوورەوە و شانۆگەریی (سەرینی باداری) ببینی، ئەیهاوار خۆ من عانەیێکم پێ نییە! تا بێمنەت بتوانم پلیت ببڕم بچمە ژوورەوە، خۆ هەتا هەینێش نەمدەزانی لەژوورەوە چ هەیە و شانۆگەری چۆنە و چ دەقەومێ.

ئیدی، وردە وردە خەڵکەکە بەم پارچە وەرەقەیەی دەستیان دەچوونە ژوورەوە تاوای لێهات بەر دەرگا چۆڵ بوو، تەنیا من مامەوە.. زۆر دڵم بەخۆم

سووتا، گریان گورگی گرتم و چەند فرمێسکەکیش لەچاوانم هاتن خوارێ و رووەمەتە چورچەکەیان تەڕ کردم، بەڵام چونکە مەراقم بوو بزانم لەژوورێ، لەو هۆڵەی ئەو حەشاماتەی لێ گردبوویتەوە، چ دەگوزەرێ؟ مامەوە و چاوەڕێم کرد و خۆم گرخاند، ئەو سەر و ئەمسەرم دەکرد و شەقم لەوردە بەردەکانی پێش دەرگا هەڵدەدا، هەتا لەهیکرا دەرگا کرایەوە و خەڵك بەپرتاو بەرەو دەرەوە هورژمیان هێنا.

ئای خوایە لەکێ بپرسم لەژوورێ چیان دیت و چ قەوما؟ سەرەتا سەرلێشێواو غیرەتم نەکرد لەکەس بپرسم، لەکۆتایدا یەکێکی لەخۆم چورچەتر و پەرپوترم وەچەنگی کەوت و لێم پرسی:

– لەژۆرێ چتان کرد؟

گوتی:

* هیچ.. تەمسیلمان بینی، زۆر عەنتیکە و خۆش بوو.

– چیان دەکرد؟!

* چیان دەکرد چییە؟ تەمسیل بوو تەمسیل، ئەمن بەخۆم وەخت بوو لەو تاریکییە و لەو نەڕە نەڕەی جاروبار بەدیار دەکەوتن زەندەقم چوو بوو!

ئەو رۆژە، بەدڵێکی شکاو، بەچاوی پڕ لەفرمێسك، بەگیرفانی بەتاڵ، بەڵام بەمێشك و وورە و هیوایێکی پڕاوپڕ لەسەرچڵی هۆڵی (گەل)م بەجێ هێشت و هۆری هۆری گەڕامەوە تەیراوە و ماڵێ، نەمدەزانی ئەحمەد دەنگ گەورەی قەت نابینم، بەڵام پاش چەندین ساڵ لەشاری سلێمانی و لەفیلم و بەرنامەکانی تەلەفزیۆنی (بەسێ خانم و بەرنامەی بەرنامە و بەرهەمەکانیدی تەلەفزیۆنی، لەتەك هونەرمەندانی گەورە (سمکۆ عەزیز و حەمە رەشید هەرەس) دەبمە هاوکوفییان و شانازیشییان پێوە دەکەم.

## دەرویش سدیق.. پۆلیسیش بوو!

زوو بە گەنجی هەر لەم هەولێرە لەسەر دەستی شێخ عەبدولکەریمی دارە خورما، مام سدیقی برا بچوکی باپیرە خدر سمێر سۆرم دەبێتە دەروێش و سەر و پرچێکی درێژ بەردەداتەوە و لە کۆڕی زیکری دەروێشان حایوحوو دەکات و زەرگ و شیر لە خۆی دەدات و دەگاتە لوتکە بێئاگایی و بەهەموو دەمێ لەتەکیەی بابە شێخی لە گەڕەکی خانەقایێ وەك دەروێش و مرید ژیان بەسەر دەبات.

کەڕەتێکیان لەگەرمەی زیکر و خواپەرستی دەروێشێکی دی بە شمشێر گەردنی مام سدیقی دەبرێت و دەکەوێتە گۆڕێ و ئەمڕۆ نەمردیە و سەد ساڵە حەیاتی لێ بڕایە.. دەروێشەکان لە دەوری کۆدەبنەوە و کۆڕ گەرم دەکەن و بە (ئەڵلاهـ.. ئەڵلاهـ) ئەڵقەی زیکری لەدەور دەگێڕن، کەچی دەروێش سدیق هەر بێ هەست و خوست دەبێ.. هەواڵ بەبابە شێخ دەگەیەنن کە دەروێشێکیان سەربڕیوە و چاك نابێتەوە و دەبێ بەفریای بکەوێ.. کە بابە شێخ دێتە سەر تەرمەکە دەفەرموێ:

—ئۆهـ.. ئەوە دیسان سدیقە شێتۆکەیە ؟

بەدەروێشەکان دەڵێ:

—بڕۆنە دواوەو لێمان دووركەونەوە.

هەینێ بابە شێخ عەبایە رەشەکەی بەسەر دەروێش سدیق دادەدا و بە زاریش هەر ورتەی لێوە دێ و دەستی لەسەر برینە قوڵەکەی ملی دادەنێ.. ئیدی لەهیکڕا دەروێشە شێتە هەڵدەستێتەوە و عەلەمی لێ نامێنێ ! ئاوایان بۆ ئێمە دەگێڕایەوە.

پاش ئەم رووداوە، خدری برا گەورەی چوونە تەکیەی لێ قەدەغە دەکات و

سەر و پرچی سووك دەكات و بڕیار دەدات وەك خۆی بەپۆلیس دایمەزرێنێ.
كە بەپۆلیسیش دامەزرا، نەقڵی رانیەیان كرد، لەوێش ماڵی مام مەولوود پێ پانی چایەچی برای بۆی دەبنە خانەخوێ و لەلایان دەگیرسێتەوە، هەرلەوێش كچێكی ئێرانی بەناوی (ئایشێ)ی بۆ دەخوازن و دەیكەنە زاوا.
بەم شێوەیە ژیان بەپۆلیسی دەگوزەرێنێ و لەگەڵ (ئایشێ)ی ژنی تەلاری ژن و مێردایەتی بە چوار كچ و دوو كوڕ دەڕازێننەوە.
من یەكەمین جار مام سدیقی مامی باوكم لەساڵی (١٩٦٧) لە بەندیخانەی سلێمانی بینی.. چیرۆكەكەشی بەم شێوەیە بوو:
مام سدیق وەك مەئمور، تاوانبارێك لە رانیەوە دەباتە شاری سلێمانی بەمەبەستی دادگایی كردنی.. كەچی لەرێگا تاوانبارەكە لە دەرفەتێكدا خۆی لەمام سدیق بزر دەكات و رادەكات. بەم شێوەیە مام سدیق سزا دەدەن و لە بەندیخانەی سلێمانی زیندانی دەكەن. هەركە هەواڵ گەیشتە هەولێر و بابە خدری باپیرم بڕیاریدا بچین و لە بەندیخانە سەردانی بكەین. بەقەمەرە دۆجەكەی باوكم ، من و بابە خدر و دایكم چووینە سلێمانی. لەرێگا باپیرەم گوتی:
—لە سلێمانی دەچینە ماڵی (سەعیدی سەمونچی) دۆستم، ئەمن كە لە سلێمانی چەند ساڵێكی پۆلیسیم بەسەربرد، كرێچی ئەو ماڵە بووم زۆر خانەدان و ئەسڵزادەن.
هەر واشمان كرد، شەو لەماڵی وان بووین، بۆ بەیانی چووینە بەر دەرگای بەندیخانە كە خەڵكی شار بە (سجنی سەرەوە) ناو زەدییان كردبوو، ئیدی كاتێك دەرگاكرایەوە چووینە حەوشێكی گەورە و هەر خێزانە و لەكونجێك چاوەڕێی كەسی زیندانی خۆیان دەكرد.. دەرگای سەرەكی سجن كرایەوە زیندانیەكان هاتنە لامان، ئێمەش بەمام سدیق شادبووینەوە.. ئیدی كەوتینە

قسە و باس و گفتوگۆ.. من پیاوێکی کراس سپی و شەرواڵ ڕەش سەرنجی ڕاکێشام.. یەك یەك دەچووە لای میوانی زیندانیان و حاڵ و ئەحواڵی دەپرسین و قسەی خۆشی بۆ دەکردن و بە قاقا پێ دەکەنی.. دیارە باوکیشم هەمان سەرنجی لەسەر ئەم پیاوە هەبوو.. بۆیە پرسی:

–ئەرێ مامە گیان.. ئەو پیاوە کێیە ؟ ئەوها سەر لە هەموان دەدات و کردیتیە بەزم و ڕەزمی خۆی.. دەڵێی هەمووان دەناسی.

مام سدیق گۆتی:

–کوڕە وەڵلاهی دڵەکمان بەو پیاوەی خۆشە.. دەنا لەو سجنەی و لەو بێ کەسیەی هەر درمان دەتەقی.

باوکم پرسی:

–ئەوە کێیە ؟ چ کەسە ؟

مام باگۆی داوە:

–ئەوە ناوی (حەسەن زیرەك)ـە کوردی ئێرانییە.. دەنگی زۆر خۆشە و گۆرانییان دەرێ.. یەك دوو ساڵە لێرە لە سلێمانی دەژی.. . ئیدی (زیرەك)هاتە لای ئێمەش و بە (نۆکەرم و بە خولامتان بم ) مەجلیسی ئێمەشی گەرم کرد و چووە لایەکی دی.

نازانم مام سدیق ماوەی چەند لە زیندانێدا مایەوە.. دواتر وەك سزا لە پۆلیسی لایاندا و ئازادیان کرد.

بەم شێوەیە، مام سدیق بەخاوخێزانەوە هاتەوە هەولێر.. سەرەتا هەر لە کۆلانەکەی ئێمە بە کرێ لە خانوێك دابوون.. کاکە نەوزادی کوڕە گەورەی کە یەك دوو ساڵ لەمن گەورەتر بوو لەگەڵ من لە قوتابخانەی مەریوانی سەرەتایی قەیدکراو پێکەوە دەچووینە قوتابخانەو دەهاتینەوە.. پاشان مام سدیق خانوێکی لە گەڕەکی (کوران)ی سەر ڕێگای مەخموور کڕی.. هەرلەوێش

چایخانەیەکی بە هەرمێنی داناو بووە چایەچی.. ئەوکاتانەی دڵم کاکە نەوزادی بویستبا بە پاسکیلەکەم دەچوومە چایخانەو وەك شاگرد لەبەردەستی مام سدیقی هەر دەسوڕام. مام سدیقیش هەموو جارێ دەیگوت:

–ئەوە هاتی بابی بابم.. وەرە ئەوە کێك.. ئەوە شەکرللەمە.. ئەوە دۆندرمە.. ئەوە کاستەر و محەلەبی، چت حەز لێیە بەبێ پرسی من بیانخۆ.

مام سدیق فریشتەیەك بوو بۆخۆی.. ئەوێ ڕۆژێ باو باوی (عەدنان قەیسی) بوو، شەوان لەتەلەفزیۆنی پێشان دەدرا. یەك لەوشەوانە پاسکیلەکەم لەپەنا دەرابەی چایخانە ڕاگرتبوو.. چایخانە بەدیار زۆرانبازی عەدنان قەیسی و جۆن فرێری جمەی دەهات، کەیاری تەواو بوو خەڵك پەرتەیان کرد منیش بەنیازی چوونەوە تەیراوەی هاتمە دەرەوە کەچی پاسکیلەکەم لە شوێنی خۆی نەمابوو.. ئەولا پاسکیل ئەملا پاسکیل.. مشەوەش بووین تا یەکێك گوتی:

–ئەمن پاسکیلەکم لە دەست (دیلەی فیدایی) دیت.. وابزانم پاسکیلەکەی تۆ بوو.

بۆ سبەینێ باوکم پۆلیسی تێگەیاند و تاقیب تاقیب پێکەتین (دیلە) ماڵە پورێکی لە گوندی (مورتکە)ی هەولێرێیە و چویتە وێ.. لەگەڵ پۆلیسان چووینە گوندی و پۆلیس (دیلە)یان بەجلك و بەرگی فیدایی فەڵەستینی گرت و کەلەبچەیان کرد، منیش بە پاسکیلی خۆم شاد بوومەوە.

هەرلەم چایخانەیەش.. بۆ یەکەمینجار لەگەڵ (شێرزاد حەسەن)ی چیرۆکنووس و (نازم دڵبەند)ی شاعیر و ڕۆژنامەنووس یەکترمان ناسی کە ئەوکاتە هەردووکیان ماڵیان لە گەڕەکی کووران بوو.

هەمیشە مام سدیقی فریشتە و مرۆڤ یادی بەخێر و گوڵباران.

## حەربیە.. دایکێك بۆ هەردووکمان

-زاهیر کورم ئەتو هەستە برۆ لە ئاخیر رەحلەی بن دیواری دانیشە، بلێ لۆ ؟ چونکی ئەتو زەعیف و باریك و درێژی !! شەمال ئەتوش هەستە وەرە لە پێشەوە دانیشە، چونکی ئەتو خەپە و قوتەی.

ئەوە، قسەی مامۆستا (وەلی حەسەن ڕەزا ) بوو، لەیەکەمین ڕۆژی پاش یەکەمین هەفتەی خوێندن لە ناوەندی جمهوری، هەفتەی یەکەم هەر ئەو مامۆستایە چەند قوتابیەکی پۆلی یەکەمی ناوەندی هۆبەی (ب) ی دایە بەر شەق.. تا سەرجەم قوتابییەکانی دی چاو ترسێن بکات و سلّی لێ بکەینەوە و لە قسەی دەرنەچین. ئەو مامۆستایە سەر پەرشتی هەر سێ هۆبەکای (ا. ب. ج )ی پۆلی یەکی لە ناوەندی جمهوری دەکرد (گەر خێوایێ سەربردەی ئەو مامۆستایە زۆر و زەوەندە و لە (تەیراوە.. . هەربەپیاسە) دیمەن و بەسەرهاتەکانی دی وێنا دەکەمەوە).

من و شەماڵ.. دوو هاوڕێ.. دوو برا.. دوو دوانەی دایك و باوك جیا بووین و بەقودرەتی قادر هۆگری یەکتر بووین و بەس شەوان بۆ خەوتن لێك جیادەبووینەوە.

من لە قوتابخانەی مەریوانی سەرەتاییەوە چووم بۆ ناوەندی جمهوری.. نازانم شەماڵیش لەکام سەرەتاییەوە هاتبوو مەبەستمە بڵێم لە سەرەتاییەوە پێکەوە نەبووین، ئەوان چەند قوتابیەك بوون مەیلی شوعیەتیان هەبوو و نەشیان دەشاردەوە، جگە لە شەماڵ.. سالم و میعاز و دەشتی مەلا عەباسی بوستانی و ماجدی مامۆستا عەبدولکەریم، کە هەمیشە نمونەی قوتابی زیرەك و ئاقڵ و بێ کێشە و جەریدە بە دەست بوون، من لە سۆنگەی ئەوەی لەگەڵ شەماڵ هۆگر و هاوهەست بووین، ڕەفاقەتم لەگەڵ ئەوانیش دەکرد و لە کاتی پشوو

پێکەوە بووین و لێیان دانەدەبڕام، هەر لەبەر خۆشەویستی شەماڵە چاو جوانەکەشم.. هەرکە هەفتەی جارێك سالم کەریمی کۆمەنیست هەفتەنامەی (بیری نوێ) ی دەهێنا، کە لەحیزبەوە فەرمانی پێکرا بوو بە بەلاش بەسەر ئەو قوتابیانەی دابەش بکات کە پەرۆشی خوێندنەوەن.. ئەو زاڵم بابە بە پارە دانەیەکی دەدا من، منیش هەر لەبەر پەرۆشیم بۆ خوێندنەوە دەمکڕی و نەمدەزانی (بیری نوێ ) بەلاشە و حیزب بە پارە نایفرۆشی.

لەلایەکی دیش.. من لە یەکێتیی قوتابیانی کوردستان و یەکێتیی لاوانی کوردستان ناوم نوسرابوو ئەندام بووم، ئەوە جگە لەوەی ئەندامێکی شانەی کاك (سەید موحسین ) ی تەیراوەیی پارتی بووم و بەردەوام کۆبونەوەی پێ دەکردین.

هەینێ کە من وا متووی ئەو برادەرە شوعیانە بووم لەبەر خاتری شەماڵە چاو جوانەکەم بوو.. وەکو وان پانتۆڕ و کراسی سۆریشم لەبەر دەکرد و قوتابییە پارتییەکانی لەگەڵ خۆشمان دڵیان لێم کرمێ بوو بوو گوتبوویان هەبێ و نەبێ زاهیر بویتە شوعی و لەگەڵ شەماڵیە و شوعییەکی زۆر پیسە، ئەدی نابینن پانتۆڕی سۆر سۆر لەبەر دەکات.

ئەو پەلار و ڕەخنەو گلەییەم لە زاری هاوپۆلم (جەمال توتمەیی) بیستەوە، هەرکە لە ساڵی (١٩٧٤) هەردووکمان دوو قوتابی پەراگەندە و گیرفان بەتاڵ و سەرگەردان بووین و لە ناو شۆڕش لە ژێر ڕەحمەتی بارانی زۆری مانگی سێی ئەو ساڵە لە نێوان (گەلاڵە و ناو پردان و چۆمان ) جرتوفرتمان بوو تا لێژنەی دابەش کردنی مووچەی قوتابییان ببینینەوە و مووچەکەمان کە شۆڕش بۆ قوتابیانی بڕی بۆوە وەرگرین.

لەگەڵ شەماڵ چاوجوان، تێکەڵاویمان هەر لە سنووری ناوەندی جمهوری نەما، پەڕیەوە دەرێ بۆ ناوماڵەکانمان، ئەو دەهاتە ماڵمان و وەك کوڕی ماڵ

لەسەر سفرە و خوانی گەورەی خێزانەکەمان نانی دەخوارد و گاڵتەو گەپی لەگەڵ خوشك و برایەکانم دەکرد.. خوشك و برایەکانیشمان بوو بوونە هاوڕێی یەکتر، منیش بەهەمان شێوە هاموشۆی ماڵی ئەوانم دەکرد، زۆر جاران (حەربیە) ی دایکی دەیگوت:

– شەماڵ.. نیوڕانێ دۆڵمەی دەکەم.. زاهیری بینە، لەبیرت نەچی.

ئای خودایە.. ئەو دۆڵمەیەی دەستاوی دایە حەربیە بۆ هێندە تەڕ و تیژ و ترش و بەتام بوو، ئەوها لەگەڵ ئەو مەخلوقاتە تێکەڵ بووم کە ئەندامانی خێزانی شەماڵەکەی من. (پەیمان و ڕێزان، کامەران و هیوا) لەولاشەوە پیاوە بە ویقارەکە.. کاك عەباسی ساڵح چەخماخچی باوکی شەماڵ سەری مەجلیسێی دەگرت، هەرکە مەنجەڵی دۆڵمە لەسەر سینی ڕوو دەکرا.. یەکسەر حەربیە دەیگۆت:

–کەس ملاکی لێ نەدات.. پەیمان کیژم مەنجەڵە گچکۆکەکەی بینە.. دوو پیاز و بیبەرەك و تەماتەك و خیار و دوو کودی و دوو باینجان و پێنج شەش سلقی تێکە، ئەو نانە تیریەشی بەسەر دادە، ئەوە لۆ زاهیریە هەتا بیباتەوە و هێواریێ لەگەڵ قەدریەی داکی و پەریزادی خوشکی بیخۆن. وای دایە حەربیە بەو دۆڵمە تەڕ و بەتامانەت چ وەفا و یادگاری و سۆزەکت لە ناخمدا ڕواند.

ساڵی (١٩٧٧) هەرکە لە قاهیرەی هونەر و جوانی هەواڵی مەرگی هونەرمەند (عەبدولحەلیم حافز) بلاوکرایەوە.. لێرە لە تەیراوەی پەیمانی خوشکی شەماڵ و پەریزادی خوشکی من، بۆ مەرگی (حەلیم) ئەوها دەستیان لە ملی یەکتر کرد و لە پرمەی گریانێیان دا خەڵك هەر ئەوها شین و واوەیلا بۆ دۆست و ئازیزانی دەکات.. هەینێ سێ ڕۆژان لەماڵیمە دانیشتن و کیژ و کاری تەیراوەی بۆ سەرە خۆشی سەردانیان دەکرن و پەژارەی لە دەست دانی حەلیمیان بۆ دەردەبڕین.

لەگەڵ شەماڵ بەردەوام بووم، لەگەڵی بووم هەرکە باوکی نەخۆش کەوت

عەباسە چاو جوان و جوامێرەکەمان لە نەخۆشخانەی جمهوری کەوت و هێندەی نەبرد ماڵئاوایی لێکردین، شەڕی شومی (عێراق – ئێران) بەڕۆکی گرتین کامەرانی لاو.. کامەرانی برای، بووە خۆراکی ئەم جەنگە نەگریسەو هەر بە جوانە مەرگی سەری نایەوە، لەماڵی حەربیەی ڕێزانەك هەبوو لە هەموو ڕێزانان ناسکترو جوان تر.. ئەویش بە نەخۆشیەکی کت و پڕ لەبەر چاوان بزر بوو و بەیەك جاری جەرگی دایە حەربیەیان ئاگر تێبەردا.

ئەوێ ڕۆژێ کە شەماڵ لە دوا قۆناغی پەیمانگەی تەکنیکی بوو لە بەغدا و تەواوی کرد و هاتەوە، منیش تازە لە زیندانی هەیئەی کەرکوك ئازاد بوو بووم و سەر و گێلاك ناشیرن و فەسڵکراو لە خوێندن، شەوێك لە (سەمەر قەند) تێر مەی.. تێر قسە.. تێر گریان بووین.. ئەو بڕیاری دابوو بڕوات و بچێتە ناو هێزی پێشمەرگەی حیزبی شوعی.. ئەو شەوە بەحوزنەوە ماڵئاواییمان لە یەکتر کرد و ئەو بۆ شاخ و ناوی بووە (سەرکەوت) و منیش پاشتر بەرەو سماقووڵی گرتکی ملمنا، دڵبریندار و سەرگەردان.. کەچی لەوێ چەکدارێکی نابەپرس، دوور لە مۆڕاڵی شۆڕشگێڕانە هەندێك قسەی بەرز و نزمی لەگەڵدا کردم و میزاجی تێکدام.. بۆیە هەموو شتێکم لەبەر چاوکەوت و دوای ماوەیەك گەڕامەوە هەولێر و تەیراوەکەم.

هەینێش سۆزی دایە حەربیە، ئەو ژنە سەلار و جەرگ سووتاوە شەو و ڕۆژ بەرۆکی بەر نەدەدام، شەوان لە خەونم دا میوانە جوان و گەورە و نورانیە هەمیشەییەکەم بوو.. ڕاستە هەواڵی شەماڵم لە شاخ نەدەزانی.. نەمدەزانی لە کوشتارگەی (قرناقا و پشت ئاشان) بەبەر کەوتوە یان ڕزگاری بووە، بەڵام هەموو دەم چاو بەگریان.. بەڕۆژ بۆ یادی جارانمان و بەشەویش لەخەونە ناخۆش و ترسناکەکان کە دایە (حەربیە) بۆ شەماڵەکەی خۆی لە شین و گریان دابوو.. منیش لە خەو ڕادەبووم و فرمێسك بالیفەکەی تەڕ تەڕ دەکردم.

سەرەتای رۆژانی ڕاپەڕین بۆ مـن دوو جەژنـە بـوو، هـەم ڕاپـەڕین.. هـەم بـە شەماڵە چاوجوانەکەم بەڕێگای بنیادی دکتـۆر مـارف خەزنـەدار شـادبوومەوە، لەلای چایخانەی مەچکۆی بووم بنیاد هاتە لام و گوتی:

-شەماڵەکەت وا لە بارەگای حیزبی شوعیە و لێت دەپرسێت.

+بەڕاستتە؟؟؟

-گەر باوەڕ ناکەی وەرە لەگەڵم.

لەگەڵی چووم.. ئای خوایە ئەوە شەماڵەکەمە لەناو بارەگا و بە جلکـی خـاکی و کەتافەوە، بەس چ چەکی پێ نەبوو.. دوای ئەحواڵ پرسین کە زانی هەنووکە کچەك و کوڕەکم هەیە، لەگەڵم هات و چووینە ماڵێ هەر لە بـازاڕی تـەیراوەی.. گەمەکی کوڕان و یەکەکی کچانی بۆ (رۆشنا)ی کچـم و (لاوێـن)ی کـوڕم کـڕی.. ئەوجا چووینەوە و خۆی هاویشـتە باوەشـی دایـە قەدریەکـەی کـە لەمێـژ بـوو غەریبی دەکرد.

هەر هەینێش دەم و دەست لەگەڵ شـەماڵی چـوومە حـزوری دایـە حەربیـەی، ئەو حەربیەیەی لە دووری شەماڵی سەدان شەو دەهاتە خەونم و هەرکە لە خەو رادەبووم وەك منداڵ بۆی دەگریام.. ئۆخەی دایە حەربیە.

هەنووکـە.. مـن لێرەم لەتـەیراوەی.. شـەماڵ لـە ئەڵمانیایـە.. حەربیـەش لـە گـەڕەکی نـەورۆزە، داخـی گـرانم قەدریەکـەی مـن مـەرگ ڕای پێچـا و ڕۆیـی و نایبینمەوە، بەڵام لە ئێستادا من و شەماڵ بەهـەردووکمان دایکـەکمان بەسـە.. ئەویش دایە حەربیەیە. خودایە ئەو دایکەشمان لێنەستێنی.

## سەید و جانتایە قاوەییەکەی

پارچەلە بووین، مـن و ئـەمیری ئـامۆزام و شـێرزادی پلـە ناجیـەی، کـاتی سـونەت و هەرامـە برینمـان هـاتبوو، ڕۆژێکیـان هەرسـێکمان (مـن و ئـەمیر و شێرزاد)یان لـەژووری بنـەبانێ پەسـتا و گوتیـان لێـرە ناچـنە دەرەوە! گـوێم لێبوو لەدوای محەمەدی حـاجی بەگمێشـدا چـوو بـوون و ئـەو ترسـنۆکە خـۆی شاردبۆوە.. تومەز زانیبووی مەسەلە چییە.

ئەوەبوو لەهیکڕا پیاوێك کەپێیان دەگوت مـام سـەید بـەخۆ و بـەجانتایێکی قاوەیی کەبەدەستیەوە گرتبـوو، لێمـان بـەژووریێ کـەوت، گـەورەکان کردیانـە چەپڵە لێدان و مام جبرائیل هـەڵیکردە قۆریـات و کـەرەم خوێنـدن و لەهـەمان کات چوار کەس چوارگۆشەی پەردەیێکی پانوپۆڕیان گرتبوو و بـەرز و نزمیـان دەکردەوە و ئێمەش هەرسێکمان دیشداشە لەبەر لەسـەر پشـت ڕاکشـێنراین و چاوەڕێی ڕەحمەتی مام سەیدی قورمساغمان دەکرد، پەردەکە باییێکی فێنکـی بۆ دەهێناین، مام جبرائیل بەقۆریات گریانی بەر بێنگی لێدەگەڕاندینـەوە، مـام سەید دەست بەبرەڕ و مقەست و پەمۆ و دەرمانێکی ڕەنـگ سـۆر لێمـان هاتـە پێش، چارەمان نـەما.. خۆمـان مـات و بێـدەنگ کـرد، هـەر جـارەو بەنۆبـەت یـەکێکمانی برینـدار کـرد و لـەکاتی بـڕین و مقەسـت لێـدان.. مـام جبرائیـل دەیگوت:

– کورم.. بزانە ئەو کێشکەیەکە دەچتە کێ؟

هەرکە ئێمە سەرمان بەرز دەکردەوە و چاومان لەکێشکە دەگێڕا و ئاگامـان لەمقەستەکەی مام سەید نەدەما.. ئەو زۆر لێزانانە و دەست و برد کاری خـۆی ئـەنجام دەدا و بەلـەفافێکی سـپی سـەری برینەکـەی دەپێچـا و تونـد تونـد دەیبەست و دەیگوت:

– خێر دەداتەوە ئینشائەڵلا..

هەر کەئێمە هەرسێکمان بووینە بریندار ی دەستی مام سەید و لەناو جێ کەوتین، ئێوارە بەدرەنگ وەختەوە محەمەدی حاجی بەگمێ پەیدا بۆوە و یەك یەك دیشداشەکانمانی هەڵدەدایەوە و تەماشایێکی برینەکانمانی دەکرد و دەیگوت:

– لۆ چما هەر ئەوەندۆکەی لێ دەکەنەوە؟ ئەمن وەمزانی لەبن و بۆتکەوە دەیبڕن، لۆیێ خۆم شاردەوە؟!

# پەشیمانم زۆریش پەشیمان

سەرەتای هەفتاکانی سەدەی ڕابردوو، خەڵکی قەلاتێ.. ئەوانەی زیاتر بە تورکی دەدوان و خۆیان بەتورکمان دەزانی وردە وردە و تاك تاکە ماڵیان لە قەلات دەهێنایە خوارێ و زیاتریش ڕوویان لە گەڕەکی تەیراوە و خانەقاو شۆڕش کە تازە پەرەی دەسەند دەکرد، دەوڵەمەندەکان خانوویان دەکڕی و کەم دەرامەتەکانیش بەکرێ لە خانووێك ستر دەبوون.

لە تەیراوەی ئەوەندەی لەبیرم بێت.. دووماڵ لە کۆڵانی مە خستیان، یەکێکیان خانووی خۆیان کڕی و هاتنە ناوی.. ئەوی دیشیان لە ژوور و هەیوانەکی بەکرێ لەگەڵ ماڵی مام کەریمە گڕەی دانیشتن.

عوسمان قەساب و دادە رەمزیەی خێزانی بوونە کرێچیو ئەوەندە لەگەڵ ماڵی کەریمە گڕە تێکەڵ بوون وەکی خزمیان لێ هاتبوو، سەیرەکەش لەوەدابوو ئەندامانی خێزانی مام کەریمی لەناوخۆیان بەکوردی و بگرە بە کرمانجەتی دەشتی قەراج و کەندێناوە دەدوان، کەچی مام عوسمان قەساب و خێزان و کچ و کوڕەکانی بەتورکی لەناو خۆیاندا قسەیان دەکرد.. هەردوو خێزانیش لەیەکتر دەگەیشتن و هیچ کێشەیەکی گفتوگۆ و وتووێژییان نەبوو.

جەعفەری مام عوسمانی قەساب هاوتەمەنم بوو لە کۆڵانێ برادەرایەتی یەکترمان دەکرد، زۆرجاران گەر وشەیەك یان دەستەواژەیەکی بەزمانی کوردی نەزانیبا دەگەڕایەوە سەر تورکیەکەی قەلاتێ و وەها قسەی دەکرد دەتگۆت هێشتا ماڵیان لە قەلاتێیە و ئەمەش وەکی وی لە تورکی دەگەین.. کەچی ئێمە پێی پێدەکەنین و گاڵتەمان پێ دەکرد و دەمانگوت:

– قەلاتی، لەبەر تەیراوەی هەلاتی.

ئەویش تووڕە دەبوو و بە نوزەنوز دەچۆوە ماڵێ.

کەڕەتێکیان، زۆر بیرم نەماوە لەسەرچی بوو، من و جەعفەری مام عوسمانی قەساب بووە شەڕو هەرامان.. ئەو کاتی عەیامەك بوو ئەو مام عوسمانە جگە لە قەسابی کرابووە موختاری تەیراوە و خەڵك ئیشیان پێ دەکەوت.

جا لەعانی شەڕەکەمان.. من سێ چوار جوێنی مزرم بەجەعفەرداو بۆ یەك چووین کە لێك بدەین، لەوکاتەدا و لەبەخت و نیوچەوانی خۆم مام عوسمان بە قایش و قوڕش و چەقۆوە لە پشتم پەیدابوو، ئەو ویستی پشتی ملم بگرێت و بەرزەفتم بکات و منیش خۆم راپسکاند و بۆی دەرچووم، دیار بوو گوێی لە هەموو جوێنەکانی من بوو کە بەجەعفەری کوڕیم گوتبوو، بۆیە هەرکە لەبەردەستی رزگارم بوو کەوتە هات و هاوار و دەیگوت:

-کۆپە ج.. کولی من سەگبابە یان ئەتو.. بەس بتگرم و بکەویتە بەردەستم وەکی کولی مەری سەرت دەبرم.

بەم شێوەیە بوغزوکین لە نێوان من و جەعفەر درێژەی کێشا.. هەتا رۆژێك لەلایماڵی خەلیفە سەعۆ سێ چوار شەلاتی ویستیان غەدر لە جەعفەر بکەن، منیش بەخۆم نەوەستام و لەسەر کوڕی کۆڵانی خۆمانم کردەوە.. بەدوان شەڕێکی باشمان کرد، بەڵام جەعفەر زەبرێکی بەر قاچی راستی کەوت و بەشەلە شەل و منیش بەسەری شکاوی بەخوێن بەرەو ماڵ بووینەوە، هەر لە ماڵی وان و بەدەستی دادە رەمزیە برینی سەری من تیمارکرا و نیونمەکیش بۆلاقی راستەی جەعفەر گیرایەوە و لەسەر جێی زەبر پێکەوتوییان داناو بەستیانەوە.

لە هەینێوە، من و جەعفەر بووینە دوو هاوڕێ.. دوو برای گیانی بەگیانی، تەنیا لەسەر یەك شت ناکۆك بووین، ئەو زیاتر بەتورکی قسەی دەکرد و منیش هەر بەکوردی.

لەپاش ئەم شەڕە.. مام عوسمانیش هەڵسوکەوتی لەگەڵم گۆڕا بوو.. دیارە

جەعفەر شەڕەکە و ماجەرای شەڕەکەی بۆ باوکی گێڕابۆوە.. بۆیە کەلە کۆلانێ دەگەیشتە من.. دەیگوت:

-کولی من.. جەعفەر برات دەبیتەوە.. قەت شەڕێ نەکەن وغەدر و غدور لەیەك نەکەن.

وا ڕۆیی.. بووینە برا.. بەهیچ شێوەیەك جارێکی دی بیرمان لەشەڕ نەکردەوە.. بەلام ئێمە نەمانتوانی وەك منالەکانی کەریمە گڕە بکەین و خۆمان فێرە تورکی بکەین.. ئەوان بەتایبەتی کچەکانی (شوکریە و نیهایەت و قانعە) کە جارێ کیژ بوون لەناو مالێ بەتورکی قسەیان لەگەلێ دادە رەمزیە و کچەکانی دەکرد بەتایبەتی شوکریەی کیژە کرمانج وەکی بولبولی بەتورکی قسەی دەکرد. کەچی ئێمە لە کەمزانی و لەدەمارگیری خۆمان نەك هەولمان نەدا فێرە ئەو زمانە پێویستەی ژمارەیەکی زۆر لە پێکهاتەی شارەکەمان ببین، کەچی بەداخەوە دژایەتیشمان دەکردن وگالتەشمان پێدەکردن و بە (کولم کولم و ئیشتەم و مالەوەدان ) قەشمەریشمان پێدەکردن.

دواتر زانیم کە چ دەرفەتێکی زێڕینم لە دەستداوە و نەمتوانیوە یان نەمویستوە فێرە زمانی تورکی بم لەگەلێ جەعفەری برادەرم و کوڕە تورکمانەکانی دی کۆلانێ.. هەنوکەش بەو پەڕی راستگۆیی دەلێم: لەخۆفێرنەکردنی ئەم زمانە پێویستەی هەولێرێ.. دونیایەك پەشیمانم.. تازەش بەو تەمەنەوە دەرفەتی فێربوونی هیچ شتێکم نەماوە.. نەك زمان.. بەداخەوە.

## عیشق و هونەر و حەلیم

لەتەیراوە، راستە خەڵکی کاسبکار و ماندوو کەم نەبوون، ئەنوەرە کۆر و مام تاهیر بەزاز و مام رەسوڵی کڵاو لباد لەوانە بوون کەبەخاوەن پارە و قیچەك دەوڵەمەند ناسرا بوون، بەڵام دەوڵەمەندی قەبەی هەینێی تەیراوە مام حاجی هاشمی بەزاز بوو، دەیانگوت ملیۆنێرە و لەپارە ژماردنێ چەند بەردەست و خولامێکی هەیە تا بەتەواوی بتوانێ پارەکەی بژمێرێ و لێی تێکەر و پێکەر نەبێ. دوکانێکی گەورەی قوماش فرۆشی لەتەیراوەی هەبوو کەشتاقە دوکان نەیدەگەیشتنێ.

کوڕی ئەو حاجی هاشمە دەوڵەمەند و ملیۆنێرەی ناوی (موسا) بوو، عاشقی دەنگ و رەنگی عەبدولحەلیم حافزی هونەرمەند بوو، هەر روخسار و قژ داهێنان و هەڵسوکەوتیشی عەینەن حەلیم بوو..

ئەو کوڕە گەنجە و عاشقەی دەنگ و سەدای عەبدولحەلیمی، بەزەبری پارەی باوکی خۆی گەیاندە قاهیرەی پایتەختی میسر و هەرچۆنێك بووە بەدیداری عەبدولحەلیم حافز شاد دەبێت.

لەدیدارە چەند خولەکیەکەدا.. موسا سەعاتێکی دەستی گرانبەها پێشکەش بەهونەرمەندە دڵخوازەکەی دەکات.

لەکاتی خۆ ناساندن و رادەست کردنی دیارییەکەی حەلیم دەپرسێ:

– تۆ لەکوێ هاتووی؟ خەڵکی کوێی؟ موسای عاشق بەدەنگەکەی دەڵێ:

* یا سیدی.. أنا من کردستان العراق، من محافظة اربیل.

حەلیم لەوەڵامدا یەکسەر دەڵێ:

– ئەیوە.. . ئەیوە.. . ئەنتە بتاع مولا مستەفا بارزانی.

چەند وێنەیێکیش بۆ یادگاری و لەسەر داوای موسای مام حاجی هاشمی

بەراز دەگرن.

هەرکـە موسـا گەڕایـەوە هـەولێر، وێنـەکانی لـەنێوان قوماشـە بـەباق و بریقـەکانی دوکانـێ دا هەڵواسـی، بـەردەوامیش لەتەسـجیلێکی گـەورەوە گۆرانیەکانی حەلیمۆی پەخش دەکرد و دەنگی بەرز دەکردەوە، ئێمـەی تـازە گەنج و عاشق بەگۆرانییەکانی حەلیم و فەرید و ئوم کەلسوم و عەبدولوەهاب، زوو زوو دەچـوینە دوکانـێ و سـەیری ئـەو وێنانـەمان دەکـرد کەموسـای مـام هاشمی ملیۆنێر لەگـەڵ عەبدولحـەلیم حـافز گرتبـووی، لەوێنەیەکیانـدا تۆقـەی لەگەڵ کردبـوو و لەیـەکێکی دی قوتـوی سـەعاتەکەی بۆ راگرتـووە و ئـەویش زەردەخەنەییێك لەسەر لێوانێتی.

ئای ئەو رۆژانە چەند حەسوودیمان بەموسای رەحمەتیەوە دەبرد.

## دایە بەقوربانت دەبم.. بابە بەقوربانت دەبم

جارێکیان ئێمەی بزۆز و عەجول نازانم چۆن گەیشتبوینە ناو گۆڕەپانی قوتابخانەی زانین، دوای یاری کردن و قەشمەرییات، لەپڕ دەنگێك هاواری لێکردین:

– سەگبابینە.. چ دەکەن لەناو مەکتەبێ، هەنوکە هەمووتان بەحەپسکردن دەدەم.

کەس نەبووە برای کەس، هەر بابا بوو بەسەر دیوار و بەسەر دەرگا هەوڵی خۆ دەربازکردنی دەدا، من کەوتمە لای ئەو دەرگایەی بەسەر جادەی جووت سایدی بەحرکەدا دەکرایەوە، زۆرم هەوڵدا خۆم قورتار کەم، غیرەت نەیدەکرد و لەسەر تۆقەرەی دەرگا دوو دەرییە گەورەکە عاسێ بووم، لەکاتێکدا زۆربەی برادەرەکانم رزگارییان بوو بوو و بۆی دەرچووبوون، منیش لەترسان دەنوزامەوە و هاوارم دەکرد:

– دایە بەقوربانت دەبم، بابە بەقوربانت دەبم.

نەمدەتوانی خۆم لەسەر ئەو دەرگایە ئاودیو بکەم و رزگارم ببێ.

هەنوکەش هەر وام لەشوێنی بەرز و عاسێ دەترسم و سەرم دەسوڕێ و چاوم رەشکە و پێشکەی دەکات.

محەمەدی مام حوسێنی، کوڕی عەیشە بسك شۆڕی، کەچە پاسکیلێکی شڕی هەبوو، پێی دەهات و دەچوو، بەلام دڵی پێخۆش نەبوو، حەزی لەپاسکیلێکی باشتر و بڵندتر بوو. رۆژێك لەپشتەوە سواری کردم و بازۆ بن قەلاتێ، محەمەد قسەی دەکرد و منیش بەدڵی ئەو وەلامم دەدایەوە و پشت گیریم دەکرد.

گەیشتبووینە بن قەلاتێ و تازە لەو رێیە تێدەپەڕین کەبەرەو دەرگای

ئەحمەدییە هەڵدەکشێ و رووومان لەحەمام سیروان محەمەد بۆ ئەوێ پەیدانی لێدەدا، لەپڕ گوتی:

– ئەگەر بابم باخچەکانی هیرانێ بفرۆشی و پارەی بێتە دەستی، دەبێ سەیارەییێکی شین شین بکرێ.

منیش لەو کاتەدا، وا بەعەقڵم دا هات بڵێم:

* سەیارەی دۆج پلایمۆت کەسك و سپییەکەی جوانە، شینەکەی هیچ مەرغوب نییە.

ئەویش دەیگوت: نەخێر شینەکەی زۆر جوانە.

منیش بەنەخێر وەڵامم دەداوە و دەمگوت:

– کەسك و سپییەکەی زۆر بەشەخسیاتە.

لەم کاتەدا و لەناکاو پێم کەوتە بەر زنجیری پایسکلەکەی، وامزانی محەمەد بەئەنقەست وایلێکردم تا ئەزیەتم بدات چونکە بەدڵی ئەو قسان ناکەم، منیش لەتاو ئازاری قاچم و بۆ ئەوەی دڵی محەمەد لەخۆم رازی بکەم و واز لەئەزیەتدانی قاچم بێنێ.. هاوارم دەکرد:

– بەسەری بابم شینە.. وەڵڵا قەمەرەکەت شینە! بەسەری بابم شین شینە!!

## لەنگە و قەیسەری

لەپشووی هاوین یەیێکی قۆناغی خوێندنی سەرەتاییم باوکم بڕیاری دا بچمە لای باپیرم سمێر سۆر کە دوکانی لەنگەی لەناو قەیسەری هەبوو.

زۆربەی بەیانیان کەزوو لەخەو هەڵدەستاین بەجادەی تەیراوەی لەگەڵ باپیرم بۆ ناو بازاڕ هەڵدەکشاین، دوکاندارەکانی ئەولا و ئەملای جادەکە تازە دوکانیان دەکردەوە و شمەکیان لەپێش دوکانی ڕیز دەکرد، لەچایخانەکەی دەستە ڕاستیشی شاگرد بەردەم دوکانەکەیان ئاوڕشێن دەکرد و لەرادیۆش دەنگ و سەدای (عەبدولباست عەبدولسەمەد) ئەم ناوەی دەهەژاند.

لەناو قەیسەریش لەگوزەرەکەی ئێمە دونیاییێکی زۆر تایبەت خولقابوو، دوکاندارە جیرانەکانمان هەموویان بەپارێزەوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ باپیرم دەکرد و دەیانگوت:

– جگە لەوەی پیاوێکی بەتەمەنە، زۆر زۆریش تووڕە و توشە و دایمەی خوا لەشەڕە. بۆیە لەجیاتی ئەو مۆڕەیان لەمن دەکرد و منیان دەبوغزاند.

نیوەڕۆیان ناخواردنمان لەدوکانێ بوو، دەوروبەری سەعات (١٢)ی نیوەڕۆ، باپیرم پارەی دەدامێ و دەیگوت:

– بڕۆ کەبابی بینە.

منیش هەر بەغار خۆم دەگەیاندە کەبابخانەکەی حاجی عەلی کەلەگوزەری پرمێزچییان بوو، سێ شیش کەباب و نان و سماق و پیاز و تەماتەیان بۆ لەسەر سێنیەك دادەنام و هەر بەغار دەگەڕامەوە دوکانێ و لێی دادەمەزراین، دوو کەباب هی باپیرم بوو و کەبابێکیش من دەمخوارد، بەڵام کەباب کەباب بوو نەك گەمەی منداڵان.

هەموو ئێوارانیش بەر لەدوکان داخستن و چوونەوە ماڵ، باپیرم (١٠) فلسی

بۆ دەخستمە ناو ئەو دەخیلەیەی کەلەدەلاقەکەی دوکانێی دانابوو، ئەمە رۆژانەی شاگردییەکەم بوو.

عەسران، مام سەیدێکی خەڵکی قەلاتێ بەخۆ و بەمەنجەڵی پڕ لەکوبەی خڕ خڕ پەیدا دەبوو، لەزارکی قەیسەری مەنجەڵی لەسەر تەپڵەکێکی بچوك دادەنا و سەری مەنجەڵەکەی لادەبرد و بۆن و بەرامی کوبە بەناو قەیسەری دا بڵاو دەبۆوە و موشتەرییە برسییەکان هورژمیان بۆ دەبرد.

عەسرێکیان تازە باپیرم بۆ نوێژێ چووبووە مزگەوتی ناو بازاڕی، مام سەید و مەنجەڵی کوبەی پەیدا بوون، سەری مەنجەڵێی لابرد و بۆن و بەرامی کوبەی شێت و هاری کردم و نەوسم تاویدا، چوومە ناو دوکان و بەو تاقە کورسیەی کەتەنها سمێر سۆر بۆی هەبوو لەسەری دانیشێ سەرکەوتم و دەخیلەکەم پڕدایێ و هاتمە خوارێ، لەدڵی خۆمدا گوتم:

– پارەی خۆمی تێدایە و هەقی خۆمە کوی خەرجکەم.

بەڵام چۆن بتوانم لەم کونە بچوکە (١٠) فلس دەربهێنم و باپیرم هەست پێنەکات، بەنوکی دەرنافیس هەوڵمدا ئەو (١٠) فلسیەی لەزارکی دەخیلەی لێم دیار بوو دەربهێنم، کەچی نەدەخێوایێ، پتر هەوڵمدا و زەختم لێکرد لەپڕ پارچەیێك، لەزارکی دەخیلەکە شکا و چەند (١٠) فلسیێك بەگوڕێ وەربوون، هەمووم خڕ کردنەوە و تەنها یەکێکیانم لەباغەری نا و پارچە دەخیلە شکاوەکەم لەشوێنی خۆی داناوە و چوومە سەر کورسی و دەخیلەکەم لەدەلاقەی داناوە، هەر بەغار خۆم گەیاندە سەر مەنجەری کوببان و یەکێکم هەڵگرت و پارەم لەدەستی مام سەید نا و بەقەمپاران وەرگەڕامە کوبە خواردنێ ئۆخەی خۆ دڵم داکەوت و نەوسەکەم کوشت، ئەوجا چ دەبێت با ببێت!

سمێر سۆر لەنوێژی عەسرێ گەڕاوە و چ لەگۆڕێ نەبوو، کاتی چوونەماڵەوە

و دوکان داخستن، دەستی لەگیرفانی شەرواڵی راکرد و (١٠) فلسـی دەرهێنـا و دەسـتی بـرد دەخیلەکـە داگـرێ تـا رۆژانەکـەمی بخاتـە نـاو لـەهیکڕا پارچـە شـکاوەکەی زارکـی بـەربۆوە و کەوتـە ئـەرزی! بـاپیرم ئـاوڕی لێمدایـەوە و بەغەزەبەوە گوتی:

– ئەوە چییە؟ زاهیر کێ دەسکاری ئەو دەخیلەی کردییە و شکاندیتی؟

بەترس و لەرزەوە گوتم:

* بەخوای ئاگام لێنیە، نازانم کێ شکاندیتی.

هەینێ هەر بەیەکجاری دەهری بوو و نەڕاندی:

– مادام ئاگات لەدەخیلەی خۆت نییە، مەعنای وایـە ئاگـات لـەدوکانێ هـەر نییە.

پارەکەی خستە ناو دەخیلە و پارچە شـکاوەکەی لەشـوێنی خـۆی چەسـپ کـردەوە و لەدەلاقەکـەی دانـاوە و ئـاوڕی دایـەوە و بـەددان جیڕکردنـەوەوە سەیرێکی کردم و گوتی:

– باشە باش، عیلاجت دەکەم.

چەند رۆژێـك پاشـتر، لەبەغـدایێ را دوو سـێ فـەردە لەنگـەی بـۆ هـات، لـە دوکانێی دانان و فەردەیێکی راکێشـا و سـفەیفەکانی بەمقەسـت پسـاند و زاری فەردەی لێکردەوە هەمووی قاپووتی زستانە بوو، ئیدی یێك یێـك هەڵیـدەگرتن و هەموو گیرفانەکان دەگەڕا کە دەیزانی هیچیان تێدا نییە من لێم وەردەگرت و لەناو دوکانێ لەسەر یەك ڕێکم دەخسـتن، نـۆرە هاتـە سـەر سـاقۆییێکی ژنانـە، دەستی لەباغەری دیوی ژووریێ راکـرد و دەرهێنـا سـەعاتێکی زنجـیری ژنانـەی بەدەستەوە بوو بەدڵخۆشییەوە گوتی:

– ها بگرە ئەو سەعاتەی لەناو چەکمەجەکەی سەرەوە دانێ.

لێم وەرگرت و لەچـەکمەجەم دانـا، دەنـگ و دۆر لـەناو قەیسـەری بڵاوبـۆوە

کەمام خدر سەعاتێکی ژنانەی لەناو قاپوتێکی ژنان دۆزیوەتـەوە زۆر جوانـە و لەقیمـەت نایـێ، بـەڵام کەسـییان زاتـی ئـەوەیان نـەکرد بـێن بڵـێن مـام خـدر سەعاتەکەمان پێشان بدە بزانین چۆنە، ئیدی ئەو لەسەر تـەفتیش کردنـی قاپوتەکانی بەردەوام بوو هەتا بانگی عەسرێیدا، هەینێ لەجێی خۆی هەستا و بەمنی گوت:

– دەچمە نوێژێ و زوو دێمەوە، وەرە لـەجێی مـن دانیشـە، دەسـت لـەهیچ نەدەی.. ئاگاشت لەدوکانێبی.

ئەو رۆیشت و من قیت قیـت لەجێگەکـەی دانیشـتم، لـەناکاو مـام (رەمـزی) تەنیشتمان هات و گوتی:

– کا زاهیر بزانم ئەو سەعاتەی دیتتانەوە جوانە.

منیش هەڵسام لەناو چەکمەجەکە سەعاتەم دایە دەست مام رەمزی و گورج لەجێی خۆم دانیشتمەوە، ئیدی سەعاتە زنجیردارە ژنانیەکە ئەم دەست و ئەو دەستی کرد و هەر بابا بـوو وەریـدەگرت و سـەیریان دەکـرد، لـەناکاو بـاپیرم گەڕایەوە و من هەڵسام و ئەو لەشـوێنی خـۆی دانیشـتەوە، هـەینێ مـام عـەوڵا بـەترس و لـەرزەوە دوور بـەدووری سـەعاتەی بەدەسـتەوە گرتبـوو دایـەوە باپیرەم و بۆی دەرچوو! ! !

سمێر سۆر زانی کەتنێکە و من کردوومـە بەچـاوی پـڕ لەغەزەبـەوە سـەیری دەکردم و لەداخانیش هەر لێـوی خـۆی دەکرۆشـت، قاپوتـەکانی تـەواو کـرد و فەردەی بەتاڵی بەلانا و فەردەیەکی تازەی دی راکێشا و بەمنیشی گوت:

– ئەو مقەستەم بدێ.

من مقەستم بۆ هێنا و بەدەستێکی مقەستەکەی لێوەرگرتم و بەدەسـتەکەی دیشی مەچەکی گرتم و هەر لەناو دوکانێ و بەمقەستان وەرگەڕا من.. نـەجارێك و نەدوو، پاشان بەپێلەقان کەوتە سەرم منیش هەوڵمدەدا خۆم لەبەر دەسـتی

قورتارکەم، هەرکە تەواو ماندوو بوو هەینێ دەستی لێبەردام و بەرەڵای کردم.. منیش بەسەری بەخوێن و بەشەلەشەل بۆی دەرچووم و تەیراوە خۆت بگرە وا هاتمەوە، هەتا دووڕ ماڵێ رانەوەستام.

کەچی نەباوکم و نەدایکم زاتی ئەوەیان نەکرد پێی بڵێن: ئەرێ کابرا ئەو کوڕەت لۆ ئەوها مارکوژ کردیە؟

زستان داهات، زستانێکی سارد و تاقەت پڕوکێن، قەیسەریش سارد و سڕتر، دوکاندارەکانی جیران هەریەکەو بەسۆبە یاخود تەباخێك خۆیان گەرم دەکردەوە، کەچی باپیرم تەنەکە رۆنێکی راعی بەتاڵی کون کون کردبوو، رۆژانە بەپارچە پەڕۆك و مقەبا و جلکە کۆنەی بێکەڵکی لەنگە تەنەکەکەی پڕ دەکرد و ئاگری تێبەردەدا، چڕە دوکەڵ و بۆنی ناخۆشی ئاگری ناو تەنەکە هەموو جیرانەکانی هەراسان دەکرد و لەژیانی خۆیان بێزار دەبوون، سارد و سەرمایەکەش ناخۆشی کردبوو، منیش بەو لەڕ و لاوازییەم رۆژێك و دوو رۆژ نەبوو سەرما لێیدام و نەخۆش بووم، چەند رۆژێك لەناو جێکەوتم و بەدەرزی و دەرمانان چارەسەر دەکرام، هەر کەتەندروستیم باش بۆوە، پێم لەعاردی چەقاند و بەباوکم گوت:

– بشم کوژن ناچمەوە قەیسەری.. تەواو تاقەتم نەما.

بەمجۆرە، نەخۆشییەکەم لێبووە خێر و بەرەکەت و وازیان لێهێنام و نەچوومەوە ناو قەیسەری بۆ لای باپیرم، پارەی ناو دەخیلە شکاوەکەشم ئێوە خۆش! ئەوێ رۆژێش گەندەڵی هەر هەبوو..

## سینەما.. مزگەوتی شەیتانی

منداڵی کۆڵانیمە، زۆر نەبوو دەمانزانی سینەما هەیە، یەکەمین رۆژی جەژن بەجلك و بەرگی تازە دەچووینە سینەما سیروان، چونکە لەماڵی هەموومان و لەگەڕەکی تەیراوەی نزیك بوو، رۆژی یەکەمی جەژنە و پێش دەرگای سینەما قەرەباڵغە و کونی بلیت بڕین قەرەباڵغتر، ئێمەش بەردەوام فەوزی کوڕی معاون ساڵحمان رادەسپارد و پارەی بیتاقەمان دەدایێ و دەمانگۆت:

– ئەتو بڕۆ بیتاقەمان لۆ ببڕە.

هەرواش بوو، زوو بەزوو فەوزی بیتاقەی بۆ دەبڕین و دەهاتەوە و هەریەکەو دانەی خۆی دەداینێ.. هەینێ دەچووینە پێش دوکانی گالەی، گالە جەرگ و سیپەلاك و لەتکە تەماتە و قاشی پیازی تێکەڵ دەکرد و بەدۆشاوی تەماتەوە لەرۆنی سوور دەکردەوە و یەك یەك بەلەفەی سەمونی دەیدایە دەستمان و پازدە فلسمان لەدووڕ دەستی دەنا و وەردەگەڕاینەوە سەر ئەو لەفە بەتام و بەلەزەتەی.

هەرکە لەبینینی فیلمەکەش دەبووینەوە، بەتێروپڕی دەگەڕاینەوە تەیراوەکەی خۆمان، هار دەبووین.. یەکێکمان شەڕی بەگەنجێکی کۆلانی خۆمان دەفرۆشت کەهیچ حەزی لەسینەما نەبوو.. ئەوی دی شەڕی لەگەڵ بوز فرۆشەکەی سەری کۆڵانێ دەکرد و دەیگۆت:

– ئەو ئاگرەی لەدڵ و دەروونی مەیە، بەبوزی تۆ دانامرکێتەوە.

– فەوزی معاون ساڵحیش بەگژ مام حاجی قادرەکەی جیرانماندا دەهات و لەکاتی قورئان خوێندن سەری لێدەشێواند و مشەوەشی دەکرد، تا لەکۆتاییدا مام حاجی قادری قورئان خوێنی پێش دەرگای دوکانێ و سەر جادە، لەحەژمەتان دەیگوت:

– بڕۆ کوڕم بڕۆ، ئەنگۆ کەچوونە مزگەوتی شەیتانی (مەبەستی سینەما بوو)، تازە چ درەکمان پێتان خۆشبی، زندیق.. هەر زندیقە !

## برینی چەناگەم

لەتەنیشت ماڵی بابە حاجی و باجی حەپسەی لەکۆڵانی مزگەوتی حاجی مەجید قەرداری، ماڵی مام کەریم کێشکەی بوو، ئەو پیاوە لەگەراجی (هەولێر– بەغدا) دەلاڵ بوو، من ئەوکاتی هاوڕێ و هاوتەمەنی کوڕەکانی بووم و زۆربەی کاتەکان بەیەکەوە بووین، رۆژێك لەدالآنەکەی ماڵی ئەوان یاریمان دەکرد و پەلکەشووتی ناو تەنەکەمان هەڵدەگرتەوە و لەناو دالآنەکە و لەسەر چیمەنتۆ لوس و بێگرێ و گۆڵەکە پەلکەشوتیەکەمان دەمەونخون دەکردەوە هەردوو دەستمان لەسەر دادەنا و بەخشکە لەبنەبانێڕا بەرەو بەر دەرگا دەچووین، جارێك لەو جارانە دەستم لەسەر پەلکە شوتیەکە خزی و دەمەو روو لمووز و شەویلاکم بەر چیمەنتۆ کەوت و خوێن لەچەناگەم فیچقەی کرد، ئەوەبوو بەترس و لەرز و گریان و فیچقەی خوێن خۆم گەیاندەوە ماڵێ، دایکم یەکسەر بەپارچە پەڕۆکێکی خاوێن برینەکەمی داپۆشی و لەباوەشیێ کردم و لەماڵێ دەرپەڕی، هەر بەغار بۆ بن قەڵاتێ و لەوێش بۆ دوکانی حەلاقی ئیبۆ بەربەری، لەوێ دەستە فریشتەییەکەی مام ئیبۆ بەربەر بەهانام هات و خوێنی برینەکەمی راگرت و بەسێ تەقەڵیش دوورییەوە، چەند رۆژێکیش دایکم لەباوەشی دەکردم و دەیبردمە دوکانەکەی تا بۆم تەداوی بکات و پاشانیش داوی برینەکەی دەرهێنا. لەهەینێوە و دواتریش کەباڵام کرد و گەورە بووم و لەخۆم دەخەفت، هەرگیز هەستم بەناشیرینی و شوێنەواری ئەم برینەم نەدەکرد، تا ئەو رۆژەی هەر لەتەیراوەی لەتەمەنی دیاریکراو دەبوایە (دەفتەر خدمەی) سەربازی وەرگرین، چوومە بەردەمی کابرای نووسەر و دەفتەری بۆ پڕ دەکردمەوە، لەخاڵی (عەلامات فارقە) بۆی نووسیم (جەرح قەدیم ڤ عونقهی)، تومەز ئەو لەسەر کورسی دانیشتبوو لەسەر مێزێك دەینووسی، منیش لەڕ و لاواز و درێژ درێژ لەسەر سەری راوەستابووم، لەم خاڵەدا سەری بەرز کردەوە و برینەکەی دیم و ئەو (جەرحەی) لەدەفتەر خدمەی عەسکەری بۆ چەسپاندم.

## مامۆستاکانم.. کوانووی کوردایەتی و هونەر و وەرزش

ئــەوێ رۆژێ مامۆســتا رێــز و ســامی خــۆی هــەبوو.. هەرکــە لــەدەرەوەی قوتابخانە، لەناو بازاڕ.. لە سەر جادە مامۆستایەکمان دەدیت یەکسەر خۆمـان لێ ی دەشاردەوە و لە بەرچاوان بزر دەبووین.

لــە قوتابخانــەی مــەریوانی ســەرەتایی، مامۆســتا بــە شــکۆ و نازدارەکانمــان ئەوەندە خەمخۆر و دڵسۆز و بە کولافە بوون بەرامبەرمان، من یەك لەبارە خۆم هیچ هەستم نەدەکرد ئەو مامۆستایانە بەمن بێگانەن.. بەڵکو هەموو دەمــێ لــە جێ ی باب و کاك و مامێکی گەورەی خۆم دادەنان.

ئەو سەردەمەی باسی دەکەم، من لە پۆلی چواری ســەرەتایی بــووم و هەســتم بــە هەنــدێك مەســەلەی کوردایــەتی و ئــەدەب و هونــەر و رۆشــنبیری و وەرزش دەکرد.

ئەو کاتە بەڕێوەبەرمان پیاوێکی بەویقار و بــاڵا بــەرز و روخســار جــوان بــوو.. مامۆستا عەبدولڕەحمانمان پێ دەگوت.. ئەو مامۆســتا (عەبـدولڕەحمان نـوری تالیـب) ـە کـە بـە عەبـدولڕەحمان قەسـاب بـەناوبانگ بـوو، لەگـەڵ قوتابیـان بـاوکێکی بـەڕەحم و مامۆسـتایەکی سـەر ڕاسـت و بـرا گەورەیـەکی شایسـتەی قوتابخانەکەمان بوو.

بەبێ هۆ نەلێمان توڕە دەبوو.. نە لێ ی دەداین.. نە هاتوو هاواری لەسەرمان دەکـرد، بەپێچـەوانەوە هێنــدە بــەڕەحم بــوو زۆر جــاران دەسـتی باوکایــەتی بەسەرمان دا دەهێنا، بەتایبەتی گرنگییەکی تایبــەتی بــەو قوتابیانــە دەدا کــە باوکیــان پێشــمەرگە بــوو.. یــاخود لــە زینــدان بــوون لەســەر سیاســەت و کوردایــەتی.. یــان دوورخرابوونــەوەو بێبــەش کرابــوون لــە دیــدەنی و ئــەرکی باوکایەتی.

هێندە بێ فەرق و جیاواز بوو بەو دووچاوانەی خۆم دیومە لەسەر هەڵە گەر جارێك سزای قوتابییەکی دابێت ئەوا بە دووقات سزای (ئازاد) ی برازای خۆی دەدا کە ئەویش قوتابی بوو لەگەڵمان.

مامۆستامان زۆر بوون.. هەندێکیان:

- مامۆستا حەوێز.. وانەی مێژووی پێدەوتین.. هێندە مەردانە و بوێرانە مێژووی کورد و خەباتی شاخ و دەردەسەری میللەتەکەمانی تێکەڵ بە مێژووی نیمچە دوورگەی عەرەب دەکرد.. هەر هەموومان عاشقی وانەی مێژوو و دەروێشی مامۆستا حەوێز بوو بووین.

-مامۆستا رەشاد ئیسماعیل.. ئەو مامۆستایەی خودا بۆ وەرزش خوڵقاندبووی، کەچی بەوەندە وازی لێنە هێنابوو دەنگیشی خۆش کردبوو، ئەو مامۆستا هەولێرییە لە قۆریات و چڕینی (کەرەم) هاوتای نەبوو.. برادەری باوکم بوو، ئەویش ماڵیان لە تەیراوەی بوو.. مام جبرائیلیش کە برا گەورەی مامۆستا بوو دەنگی خۆش بوو لە قۆریات و بەستەی تورکی و کوردی زۆر مەعلان و لێزان بوو.. زۆر جاران باوکم مامۆستا رەشادی تووڕە دەکرد و دەیگۆت: جانم دەنگی تو لە چاو دەنگی جبرائیلی کاکت هەر هیچ نییە.. ئەویش بێ سێ و دوو بە قۆریاتەك دەنگی هەڵدەبڕی وەهای رێك دەخست بە تورکی یەعنی ها هەر گوڵێك بۆنی خۆی لێ دێ.

مامۆستا رەشاد لەبواری وەرزش چاوێکی تایبەتی لەسەر من بوو، هەموو قوتابیەك بە (کەشافە) وەرنەدەگیرا.. چونکە دەبوایە قوتابی کەشافە چەند مواسەفاتێکی هەبێ.. لە تەندروستی و رەنگ و ڕوو و چوست و چالاکی و بەژن و باڵا.. ئەو منی لە کەشافە ناونووس کرد، ئەو ئەزمونەی چەند هەفتەیەك لە کاتی کەشافە بوون بینیم بووە هەوێنی ئەوەی کە پشت بە خۆم ببەستم و بەرگەی دووری دایە و بابە و برسییەتی بگرم و گرنگی بە پاك و خاوێنی و

تەندروستی خۆم بدەم.. لە پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بە هاندانی ئەوەوە توانیم بەشداری پێشبڕکێ ی سەد مەتری بکەم و کاسی یەکەم لەناو قوتابیە بەشدار بووەکان وەرگرم.

-مامۆستا زاهیر کۆیی.. پیاوەکی کەڵەگەتی چوار شانەی تەبەش پان و روخسار سپی و جوان بوو، وانەی زیندەوەرزانی پێدەوتین.. هەرکە لە قوتابیەك تورە دەبوو پێ ی دەگوت (جگ سز، هێلکەی کەرێ).. ئەو کۆییە شەهمە وێنە و نیگارکێشانی لا خۆشەویست کردم. لە پۆلی شەشەم بووین، تابلۆیەکی رەنگا و رەنگی (بۆقێك) ی سەوز باوم کەلەسەر بەردێك دەیقڕاند کێشا.. ئەو ساڵە تابلۆیەکەی من بووە یەکێك لەو تابلۆ زۆرانەی لە پێشەنگەی سالآنەی قوتابخانەکان نمایش کرا.. هەنوکەش لە دڵم دەرناچێ بۆ نەچووم بۆ ئەو پێشەنگەیە و تابلۆکەی خۆم بە هەڵواسراوی ببینم.. قوتابیە هاورێکانم چوو بوون و دیبوویان، کە هاتنەوە بۆیان گێڕامەوە کە (بۆقە) کەی من بینەری زۆر بووە ! بە داخەوە نازانم تابلۆکەم چی بەسەر هات.

-مامۆستا موحسینێکمان هەبوو.. ئەویش وەرزشوان بوو، لەوانەی وەرزش مەراقی یاری سەللە بوو.. من زۆرم خۆشدەویست.. هەرکە لەوانەی وەرزش لەگەڵمان ماندوو دەبوو زۆر دیقەتم دەدایێ وەك ئەوەی کاکی گەورەم.. خزمێکی نزیکم.. یاخود کورە جحێڵی گەڕەکی خۆمان بێت.

بەداخەوە دوای راپەڕین باری دەروونی تێك چوو، دواتریش هەر بەم نەخۆشیە سەری نایەوە.

-مامۆستا محەمەد حەسەن مەنگوڕی.. پیاوەکی بالآ مامناوەندی.. لاواز.. دەم بەخەندە.. جگەرە کێشێکی عەجایب بوو، چونکە بەخۆی نوسەر و رۆشنبیر بوو.. گرنگیەکی زۆر زۆری بەو قوتابیانە دەدا کە شیعر و هۆنراوەی کوردییان ئەزبەر دەکرد، لە رۆژانی پێنج شەممە هەرکە بەیانیان زوو لە

گۆڕەپانی قوتابخانە گرد دەبووینەوە، لەکاتی شیعر خوێندنەوە گەر یەکەم نەبام دووەم قوتابی بووم مامۆستا مەنگوڕی بانگی دەکردم و دەیگوت:

—دەی زاهیر.. بزانم چت لۆ حازر کردینە ؟

منیش دەهاتمە ناوەندی گردبوونەوەکەو لە بەرچاوی ئەو هەموو قوتابی و مامۆستایانە بە نواندنەوە و بەدەنگی بەرز و بە دەست راوەشاندن.. هاوارم دەکرد: بیست و حەوت ساڵە من رەنجبەری تۆم.. بە نان و ئاو و جل و بەرگی خۆم.. ئیدی خۆم شین و مۆر دەکرد و بە هەموو قورگم ئەم شیعرە بەرزەی فایەق بێکەسم درێژە پێ دەدا، لەکۆتاییش دەمگوت: هۆنراوەی فایەق بێکەس.

ئیدی دەبووە چەپڵە رێزان و مامۆستا مەنگوڕیش بەتیچاو سەیری دەکردم و سەری رەزامەندی بۆ رادەوەشاندم و هەرکە دەچووینەوە پۆلیش لە بەرچاوی قوتابیانی پۆلەکەم تەباشیرێکی ساغی دەدامێ و هانی دەدام و دەیگوت: زاهیر تۆ دەبیە مومەسیلەکی سەرکەوت و فەنانەکی بەناوبانگ.

هەموو ئەو مامۆستایانە هەزار جار یادییان بەخێر کە رۆژگارێك رۆشنکەرەوەی رێگای ژیانی ئێمە بوون لە بواری کوردایەتی و هونەر و ئەدەب و وەرزش.. رۆحیان شاد.

## ئەحرارەكانی چایخانە لەتەیراوەی

چەند چایخانەیێك لەتەیراوەی هەبوون كەچەند دانەیێكیان بوو بوونە مەكۆی كوردایەتی و پاش عەسران گەنجە خوێن گەرم و پیاو ماقوڵان لێی دادەنیشتن و دوو دوو و سێ سێ سەرییان بەیەكەوە دەنا و باس و خواسی كوردایەتی و كاروباری پارتایەتیان تاوتوێ دەكرد، یەك لەو چایخانانە لەناو تەیراوەییان بەچایخانەی (ئەحرار) ناسرا بوو كەخاوەنەكەی كاك فاروق چایەچی بوو.

چایخانەی ئەحرار بۆ تەیراوەییان، ئەوانەی لە رێكخستنی حیزبی كارییان دەكرد وەك سەلوایێك وابوو، چونكە بێترس دادەنیشتن و بێمنەت گفتوگۆكانیان ئەنجامدەدا و پشتیشیان بەخاوەنەكەی قایم بوو، دەیانگوت:

– لۆیێ بەدری خۆمان قسان دەكەین و لەهیچ ناترسێین، چونكە كاك فاروقیش لەخۆمانە و لۆ كاروباری حیزبایەتی و رێكخستن هاوكاریمان دەكات و هەر نەشرە و نوسراو و نامەك لەشۆرشەوە بێت، ئەوە دەگاتە دەستی وی، ئەو بەسەر هەموومانی دابەش دەكات.

عەسران، باپیرە خدرم دوای ئەوەی بەقاتە كوردییە رەنگ ئەفسەرییەكەی خۆی پۆشتە دەكرد و كڵاو و جەمەدانی دەبەست و سمێڵە سورە جوانەكانی قیت دەكردەوە یاغر یاغر شۆڕ دەبۆوە بۆ چایخانەی ئەحرار، لەچایخانەش شوێنی تایبەتی مام خدر سمێر سۆری لەتەنیشت مام فاروق چایەچی بوو. هەركە لەچایخانەی بەژوور دەكەوت یەكسەر دەچووە سەر ئەو كورسیەی كەلەتەنیشت كورسی مام فاروقی بوو و لێیدادەنیشت، هەینی وەستا بانگی شاگردە چست و چالاكەكەی دەكرد و دەیگوت:

– كازم، چایەكی خەست و خۆر لەقۆریە سۆرە گور گورییەكەی لۆ مام خدری بینە.

زۆربەی ئەو رۆژانەش كەباوكم پاش نیوەڕۆیان لەگەلاڵەوە دەگەیشتەوە

ماڵێ، هەر زوو بەزوو شمەکی ئیشێی فڕە دەدا و ئاوێکی بەخۆیدا دەکرد و کورتەك و شەلواری دەپۆشی و دەردەپەڕییە دەرێ، کەدایکم دەیگوت:

– کێوە دەچی؟ ماندی و مردی لۆ نایێی ئیسراحەتەکی بکەی و چایەکی خۆشت لۆ لێنێم؟

باوکم ئاوڕی لێدەدایەوە و دەیگوت:

– چایەی چایخانەی خۆشە، دەچمە کن کاك فاروقی هەم چایەی خۆشە و هەم قسەکانیشی خۆشتر.. هەر لەوێش ئیسراحەت دەکەم و ماندی بوونم دەحەسێتەوە، ئینجا دەچوو لەچایخانەی لەگەڵ حەسەن قەردار و لەتیف سەرکار و مستەفا مامە و محەمەد نەقاڕ و رەحمانی مەلا ملگەز و عەدۆی دۆلەنگێو دادەنیشت و چایەیان هەڵدەقوڕاند. هەر لەوێ جار جارە و بەپستە پست لەگەڵ مام فاروقی دەدوا و هەواڵی گەڵاڵە و راسپاردەکانی کاك فەرەنسۆ هەریری پێڕادەگەیاند و بەدزی نامە و نەشرەکانی شۆڕشی بۆ لەبن قاوەچاغەی دادەنا.

هەرکە لەگەڵ تاریکیش بەکەیف خۆشی دەهاتەوە ماڵێ، دایکم دەیدواند و پێی دەگوت:

– ها.. تێر چایەی چایخانەی بووی؟

باوکم بەهەمان دڵخۆشیەوە دەیگوت:

– هەر تێر چایە.. وەڵڵا لەگەڵ کاك فاروق و برادەران تێر قسەش بووم.

هەینێ بەرژدتر سەری لەبن گوێی دایکم دەنا و دەیگوت:

– بەراستی ئەو پیاوە بەهیمەتە، جوامێرە، باوەڕناکەم کون لەجەرگی ئەو کاك فاروقەی هەبی.. لۆ کوردایەتی و پارتایەتی منەتی بەهیچ شتەکی نییە.

ئەو کاتی من تازە لاو بووم، مەراقم بوو ئەو قسەیەی باوکم پشتڕاست بکەمەوە، زۆرجاران بەشەرمەوە دەچوومە چایخانەکە و مام فاروقی بەویقار و جوانپۆش و بەهیمەتم دەدیت و سەرم بۆ قسەکەی باوکم دەلەقاند، بەراستی هەینێ تەیراوە پیاوی جوان و بەهیمەتی لێبوو.

# پەنجاو پێنج.. بەرخۆکە

لە تەیراوەی ژمارەیەك شێت هەبوون ئەوەندە هۆگری تەیراوەییان بوو بوون وەك رەمز و هێمایەك سەیر دەکران. وەکیدی شتاقیان بە ئەسڵ هی تەیراوەی نەبوون.. حەسەن پەنجا و پێنج لەلای رواندزێ ڕا هاتبوو، بەرخۆکەش لە خۆشناوەتی و لە گوندی چیوێ ڕا وێڵ و سەرگەردانی تەیراوەی بوو بوو.

ئەم دوو فریشتەیە، حەسەن پەنجاو پێنج و بەرخۆکە.. حەمە رەزاشیان لەگەڵ هاموشۆی ماڵی ئێمەیان دەکرد و هەر بەناو یەك بەیەکی خێزانەکەی منیان دەناسی و لە شێنەیی قسە و باسی خۆشیان لەگەڵمان دەکرد.

هەر یەکێك لەوانە عەیبێکی هەبوو، حەسەن هەرکە منداڵە وردکە سەرییان دەخستە سەری و هەراسانیان دەکرد وەها تووڕە دەبوو هەر منالێکی بکەوتایەتە بەردەست تێك و پێکی دەشکاند.

بەیانیەکیان.. من و ئەمیری ئامۆزام لەماڵی خۆمان بەدەرکەوتین و ملی رێی بازاڕ و ناو قەیسەریمان گرتەبەر.. هەر لە کۆڵانی خۆمان ئاودیو بووین و لە هەورازی ماڵی (سەعدیە لۆری ) و رێك لەبەردەرگای ماڵی مام جبرائیلی قۆریات و کەرەم خوێن، چاومان بەحەسەن پەنجاو پێنجی کەوت لە حاڵەتی هەڵچوون و قوشقی بوونەکەی.. ئەو بەهەر چوار لادا خڕکە بەردی رادەوەشاند و منداڵانیش دوور بەدووری هۆی هایان لێدەکرد و بەیەك دەنگ دەیانگوت:

–پەنجاو پێنج کەرێ خۆیتن، قەراسە و کورتانیش لە خۆیتن.. هۆی ها، هۆی ها.

سات لە دوای سات حەسەن بەگوڕتر و خڕکە بەردی گەورەتری رادەوەشاند.. منیش بە متمانە بەخۆبوون و لە خۆم ڕادیت کە دەتوانم ئاوێك بەم ئاگرەدا بکەم.. وردە وردە لە پەنجا و پێنج چوومە پێش و بانگم دەکرد(کاك

حەسەن.. مام حەسەن) ئەویش پتر دەینەڕاند و دا دەهاتەوە و خڕکە بەردی هەڵدەگرتەوە و گورجتر دەیهاویشت.. لەگەڵ بانگ کردنی من و بیستنی دەنگم، ئاوڕدانەوە و بەرد هەڵگرتنەوە و قیت بوونەوەی یەك بوو، منیش زانیم دەقەومێ دەست و برد پشتم تێکرد و بۆ پتر دوورکەوتنەوە لەئەو تێم تەقاند.. چەند هەنگاوێکم بڕی و زرمە لەپشتەسەرم هەڵستاو لەپەوڕوو بەدەمدا کەوتم.. هەینێش لەترسی پەلامارێکی دی و نەبادا بکەومە بەر دەستی و تێکم بشکێنێ هەڵسانەوە و قوچاندم یەك بوو و ئەمیری ئامۆزاشم بەحریت و هۆڕو پێکەنینەوە بەدوامدا غاری دەدا، رانەوەستاین و هەتا لە کۆلانێکی لاچەپ و دوور لە چاوی حەسەن پەنجاو پێنجی بەرد وەشێن خۆمان گرتەوە.. ئینجا بەدەست لە پشت سەردانم زانیم قەوارەیەکی گەورە لە برینی جێ بەردەکە وا خوێنی لێ دەچۆڕێ و جۆگەلەی خوێن بە پشتە مل و کراس و شەرواڵمدا شۆڕبوویتەوە.. بەپەلە خۆمان گەیاندە مزگەوتی ئەوقاف و بە ئاوی سارد پشتە سەرم خاوێن کردەوە و کراس و شەرواڵم شوشت.. کەچی سەرم گێژ بوو بوو بەزەحمەت خۆم بۆ رادەگیرا.. ئیدی نازانم چۆن گەیەنرابوومە لای شێخ عومەر شەریفی دکتۆرە مەعلانەکەی تەیراوە و پشتە سەری بە سێ تەقەلان دوریمەوە و لەفافی سپی لەسەر وەرپێچام و گوتی:

—وا ئەتوشم کردە مەلا.. لەمەودوا ئاقڵ بە مەلا زاهیر.

پاش یەك دوو رۆژان، هەرکە دوای مەغریبێك حەسەن پەنجاو پێنج وەك کوچ کوچەی بە دوای باوکمدا کەوتبوو بۆ نانخواردنی ئێوارە خۆی بەماڵی ئێمەدا کرد.. سەیرم کرد نەبای دیوە نەباران.. من هێشتا مەلام و لەفافی سپی بەسەرمەوەیە، کەچی حەسەن هەر خۆشی لەگوێ نەبرد.. هەرکە پێشم گوت:

—مام حەسەن ئەو بەردەت لۆ بەسەری منداڵ، خۆ ئەمن وەکی ئەوانیدی قەشمەریم پێ نەدەکردی.. لەجیاتی هەمووان زەبرەکەت لەمن وەشاند.

مام حەسەن گوتی:

–کاکە شەرمەزارم.. بەس ئەتو نزانی ئەو مندارانە کو ئەقری لەسەری پیاوی ناهێڵن.

بەرخۆکەش بەزمی خۆشی هەبوو، هەرکە پەیدا دەبوو هەموومان.. ژن و پیاو.. گەورە و گچکە لە کۆڵانێ لەسەر سەکۆیەك داماندەناو دەورەمان لێ دەدا، لەمە پرسیاری بێتام و لەویش وەلامی بەتام و بەشەرتی پێکەنین.. تەسبێحێکی دەنك گەورەی بەدەستەوە دەگرت.. هەرکە یەکێك لێی دەپرسی بەرخۆکە چەند شێت لە هەولێرێ هەیە ؟ دەیگوت:

–زۆرن.. زۆر هەمووش برایێ منن.

دەمانگوت:

–بیانژمێرە.

ئیدی.. یەك یەك و قل قل دەنکە تەسبێحی ئاودیو دەکرد و ناوی شێتێکی دەهێنا.. دوا قلیش ناوی خوای لێ دەهێنا و تەماشای هەموومانی دەکرد و دەیگوت:

–بەرخۆکە.. ئەزیش هەر شێتم.

بەداخەوە.. ئەم فریشتە بێزەرە.. رۆژانێك کەسەری پێشمەرگە پارەی دەکرد و پلە و پۆستی لە دایەرەی ئەمنی بەعسیان پێوەردەگیرا، هەر ئەو رۆژانەش گەلە جاشێك زەفەر بەبەرخۆکە دەبەن و گۆشاو گۆش سەری دەبڕن و دەیبەنە بەردەم جەلادەکانی بەعس و بەسەری پێشمەرگە مامەڵە و سەودای پێ دەکەن.. کەچی هەنووکەش لەکەسەکم نەبیست بڵێ: بەرخۆکە شەهیدە و قوربانی دەستی خۆ فرۆش و جاشانە.

## فەرهەنگی هەڵبەست

ئەو ساڵەی لەلای مام حەمەدەمین حەلاقی خاوەن (سەرتاشخانەی قوباد) شاگرد بووم، رێکەوتی ئەو گفتوگۆ و هودنەیەی بەینی شۆڕش و حکومەتی عێراق بوو کەچەند مانگێکی خایاند و من هەر لەوێ شاگرد بووم.

پێشمەرگە روویان لەشار کردەوە و برادەرە پێشمەرگەکانی وەستام و عەلی مام برایمی خەلفەی، هاموشۆی دوکانەکەیان دەکردین و لەگەڵ وەستام دەکەوتنە گفتوگۆ و باسی شۆڕش و چالاکییەکانیان و بەسەرهاتی ئەو چەند ساڵەیان لەناو شۆڕش بۆ دەکردین، منیش ورد ورد گوێم بۆ رادەگرتن و لەزەتم لەقسەکانیان وەردەگرت.

یەکێك لەو پێشمەرگانە کە تەیراوەیی بوو، دیارە ئەهلی کتێب و خوێندنەوە بوو، هەر کەدەهاتە دوکانێ کتێب و بڵاوکراوەی شۆڕشی لەگەڵ دەستی خۆی بۆ دەهێنایان، منیش سەیرم دەکردن و دەمخوێندنەوە و هۆگری کتێبەکان بووم.

هەر ئەو عەیامیش کەدەچوومە بازاڕ و بەبەردەم چاپخانەکەی مام گیویدا تێدەپەڕیم سەیری ئەو کتێبانەم دەکرد کە لە جامخانەی چاپخانەکە داندرابوون.

ئەمانە هەموو وایان لێکردم کەهۆگری کتێب بم و بیر بکەمەوە و بڵێم: وادیارە جگە لەکتێبەکانی قوتابخانە، کتێبی دیش هەن شیعر و چیرۆك و مێژوون و خوێندنەوەیان لەزەتی خۆی هەیە.

هەر ئەو رۆژانە لەمەکتەبەی عەسکەری کتێبێکم بەرچاو کەوت و ناونیشانەکەی سەرنجی راکێشام، (فەرهەنگی هەڵبەست) کەدیوانە شیعری (ئەحمەد رەشوانی) بوو، یەکسەر کتێبەکەم هەڵگرت و سەیری نرخەکەیم کرد،

خۆشبەختانە ئەوەندەم پارە پێبوو کەبتوانم بیکڕم، بەم جۆرە یەکەمین کتێب کەبووە موڵکی خۆم جگە لەکتێبەکانی قوتابخانە، (فەرهەنگی هەڵبەست) بوو، هەر ئەویش یەکەمین کتێب بوو کە لەلاپەڕەی یەکەمەوە تا دوا لاپەڕە خوێندبێتمەوە، هەنووکەش ماوەمە و بەرگێکی ئەستووریشم بۆ بەرادان دا.

## پیشەکانی سەردەمی مێرد منداڵیم

جگە لەشاگردیم لەسەرتاشخانەی قوباد و بەزم و رەزمی خۆم و باپیرم خدر سمێر سۆر کەلەبەشەکانی دی باسم کردووە.. ئەم پیشانەشم تاقیکردۆتەوە.

لەبەرئەوەی باوکم حەزی نەدەکرد من هیچ کارێك بکەم و دەیگوت:

- دەبی بەتەنێ خەریکی خیندنەکەت بی، دوا رۆژێکی باش بۆ خۆت مسۆگەر بکەیت، ئەوە نییە ئەمن ئیشێ دەکەم.

بۆیە ماوەیەك بەدزی باوکم دەچووم لەدوکانێکی شیرنەمەنی نزیك ماڵی خۆمان کێکی بەعەینەگم دەهێنا و لەسەر سێنێ لەکۆڵانەکانی تەیراوەی دەمگێرا و دەمفرۆشت، هەتا رۆژێکیان بەرێکەوت چەند دانەیەك لەکێکەم مابوو، ماندوویبووم لەبەر دەرگای ماڵەوە دانیشتم و سێنیەکەم لەسەر کۆشی خۆم دانابوو.. لەپڕ باوکم بەقەمەرەوە گەیشتەوە کۆڵانێ و هاتەوە بەر دەرگا، پێرانەگەیشتم سێنیە کێك بشارمەوە، ئە و دابەزی و یەکسەر رووی لەمن کرد و گوتی:

- ئەوە چییە کاکە؟ ئەو سینیە کێکەت لۆ پێیە؟

- کێکی دەفرۆشم.

- لۆ؟ کێ گۆتی کێکی بفرۆشە؟ داکت؟

منیش لەترسان گوتم:

- ئەرێ وەڵڵا.. داکم گۆتی لۆ خۆت کێکی بفرۆشە.

ئیدی ئاگری گرت.. جگە لەوەی شەرێکی خراپی لەگەڵ دایکم کرد، کێك فرۆشتنیشی لێ قەدەغە کردم.

عەیامەکیش مەقارە و شیش و خەڵووزم کڕی و سبەینان زوو بەپاسکلی دەچوومە بازاڕی و لەناو قەسابان فاتەڕەشم دەکڕی و دەمهێناوە و لەسەری

کۆلانی خۆمان فاتەڕەشم دەفرۆشت.

چەند مانگێکیش شاگردە چایەچی بووم لەلای مام قادر خۆشناوی چایەچی، وام لێهاتبوو پێنج شەش بنەپیالە و ئیستیکانی پڕ لەچایەم بەیەك دەستی هەڵدەگرت و بۆ موشتەریەکانم دەبردن.

جارێکیش، حەزی ئیش و کار وای لێکردم، لەگەڵ هونەرمەند ئەنوەر عەزیزی هاوڕێم بچمە ئیشێ، برادەرێکی ئەنوەر وەستای کاشی بوو بەناوی (وەستا خالید) سبەینەیێکی زوو چووینە سەر ئەو خانووەی کەوەستا ئیشی کاشی تیادا دەکرد، لەبەدبەختی من خانووەکە دوو نهۆم بوو، کاری من بردنی کاشی بوو بۆ نهۆمی سەرەوە، سەرەتا بەگوڕ و تین سێ سێ و چوار چوار کاشیم دەخستە سەر شانم و دەمبردە سەرەوە، بەڵام چونکە لەڕ و لاواز و بێهێز بووم سەبر سەبر ماندوو و هیلاك بووم، هەناسەم تەنگ بوو، چۆك لەرزین و دەست لەرزینم دەست پێکرد، دەوروبەری سەعات یانزەی پێش نیوەڕۆ سەرودڵم تێك چوو هێلنجم دەهاتێ، تینم بۆ هات و لەپڕ بەبێ ئەوەی ئەنوەری هاوڕێشم ئاگادار بکەمەوە، لەسەر ئیشەکە خۆم دزییەوە و تێم تەقاند و هەتا ماڵەوە گیر نەبووم، یەك دوو رۆژیش لەماڵەوە نەخۆش کەوتم و دواتر هێواش هێواش هاتمەوە سەر خۆم.

رۆژگارێکیش بوومە شاگردە خەیات، لەلای پیاوێکی سورچی ناوی (عەبدوڵلا خەیات) بوو، دوکانەکەی لەو ریزە دوکانانە بوو کەبەرامبەر قەلا و لەنزیك باڵەخانەی دادگا بوو، لەوێ زۆر نەمامەوە، چونکە وەستایەکەم خوشکەزاییێکی هاوتەمەنی خۆمی لەلا بوو، ئەویش بەحیساب هەر شاگرد بوو، رۆژانە شەڕی پێدەفرۆشتم و بەردەوام چەقە چەقمان بوو، بۆیە دوکان و دونیای بەرگدووریم بەجێ هێشت و نەمتوانی لەگەڵ هەتیوە خوشکەزایەکەی وەستام هەڵکەم.

## کتێبی مێژوویی و بیرەوەری

کتێبی دووەم کەکڕیم و چەند جارێکم خوێندەوە، کتێبێکی مێژوویی بیرەوەری بوو بەناوی (چیم دی) بەرگی یەکەم، هی نووسەر ئەحمەد خواجە بوو.

ئەم کتێبەم زۆر خۆشدەویست و کەیفم پێدەهات. حەزم لێبوو هاوڕێ و هاوپۆلەکانیشم لەقۆناغی ناوەندی بیخوێننەوە، بۆیە هەر کە لەگەڵیان دادەنیشتم باسی کتێبەکەم دەکرد و هانم دەدان بیخوێننەوە.. چەند هاوپۆلێکم داوایان کرد و بۆم دەبردن و دەیانخوێندەوە و لێم وەردەگرتنەوە.

یەکێك لەهاوڕێکانم کە زۆر هۆگری یەك بووین و یەکترمان خۆشدەویست، ناوی (کەمال عەبدوڵڵا) بوو.. ڕۆژێکیان هەر کەباسی کتێبی (چیم دی)م لەلای کرد و سەرسامی خۆم بەرامبەر بەنووسەرەکەی و ڕاستگۆییەکەی نیشاندا، داوای لێکردم کەکتێبەکەی بدەمێ تا بیخوێنێتەوە، بۆ بەیانی بۆم برد و چەند ڕۆژێکی لەلا مایەوە و خوێندبوویەوە، ڕۆژێك کەدەوامامان پاش نیوەڕۆیان بوو بۆی هینامەوە و لەکاتی وانەی مێژوو کەمامۆستا (قەرەنی ئەسوەد) وانەکەی پێدەگوتین، لەناوەڕاستی وانە وتنەوەی مامۆستا بووین، کەمال بەبیری هاتەوە کەکتێبەکەی بۆ هیناومەتەوە.. لەناکاو جانتاکەی بەشرپەوە هاویشتەوە سەر ڕەحلەکەی بەردەمی و کتێبەکەی دەرهێنا و دایەوە دەستم، لەو کاتەدا مامۆستا قەرەنی سەرنجی لەلای ئێمە بوو هاتە لامان و گوتی:

– ئەو کتێبە چییە؟

گوتم:

* مامۆستا.. ئەوە کتێبی خۆمە دابوومە کەمالی و هەنووکەش هینایتیەوە.

گوتی:

– کا بزانم چ کتێبەکە؟

لێیوەرگرتم و سەیرێکی ناونیشان و ناوی نووسەرەکەی کرد و گوتی:

– ئۆی، ئەوە کتێبێکی باشە، ئافەرین ئەم جۆرە کتێبانە دەخوێننەوە.. دەتوانم ئەمنیش بیبەم و بیخوێنمەوە.

گوتم:

* بەسەرچاو مامۆستا با لەلات بێ.

ئیدی هەر ئەو بردنە بوو بردی و بۆی نەهێنامەوە.. هەنووکەش هەرچەند جارێ ئەو کتێبەم بەبیر دێتەوە خەم دامدەگرێ و دڵم توند دەبێت و وا هەست دەکەم شتێکی گرانبەهام لەدەست چووە.

کەمال عەبدوڵڵاش، پتر بووە برادەرم و دادەنیشتین و باسی شیعر و گۆرانی و کتێبانمان لەگەڵ یەك دەکرد، تا لەگەڵ دەست پێکردنەوەی شەڕ لەساڵی (١٩٧٤)، ئێمە بەخانەوادەوە چووینە رواندوز، (کەمال)یش وەك گەنجێکی خوێن گەرم بەتاقی تەنیا هاتە دەرەوە و بووە پێشمەرگە و لەخولی تۆپی سەر جێبە قوتەکان بەشدار بوو، بەسەرکەوتوویی خولەکەی تەواو کرد و زۆر دڵی پێخۆش بوو، بووە یەکێك لەو پێشمەرگە لێزانانەی کەبەباشترین شێوە چەکەکەی بەکاردەهێنا و مۆڵگای دوژمنی دەپێکا.

سوپای داگیرکەر لەبەرەی شەڕ، لەقوڵی چیای کۆڕەك و حەوزی رواندوز گوشاری زۆری بۆ سەر هێزی پێشمەرگە دەهێنا، لەشەڕێکی نا بەرامبەر و بەپاڵپشتی هێزی ئاسمانی و فڕۆکەی سیخۆی، دوای داستانێکی قارەمانانە کەژمارەیەك پێشمەرگە شەهید بوون و ژمارەییەکی زۆرتریش بریندار بوون، بەداخەوە یەکێك لەشەهیدەکان (کەمال عەبدوڵڵا)ی هاوڕێم بوو.

هەنوکەش کە قسە و بیرەوەرییەکانی ئەم شەهیدەم دێتەوە یاد، کزە لەجەرگم هەڵدەستێ، نە (کەمال)ی شەهیدم بیر دەچێتەوە نە ئەو کتێبەی مامۆستا قەرەنی نەسوەد لێیوەرگرتم و نەیگەڕاندەوە.

## قۆناغەکانی سەرەتایی و ناوەندیم

لەقۆناغی خوێندنی سەرەتاییم، جگە لەبیرکاری لەوانەکانیدیدا باش بووم و مامۆستاکان خۆشیان دەویستم، لەپۆلی پێنجەمی سەرەتایی لەدوا ساتدا من و چەند هاوپۆلێکم بەپێدانی چەند نمرەیێك لەوانەی بیرکاری وایانکرد دەرچین و بچینە پۆلی شەشەم.

لەپۆلی شەشەم هەر لەسەرەتاوە چ خزم و کەس و چ مامۆستاکانمان زراوییان بردین و هەموو دەیانگۆت:

– ئەو سارەکە دەبی زۆر خۆتان ماندی بکەن.

کە دەمگوت:

– لۆ.. فەرقی سارەکانی پێشتر و ئەو ساری سنفی شەش چییە؟

دەیانگوت:

– ئەو سارەکە بەکەلۆرییە، دەزانی بەکەلۆری چییە؟

هەر بەجارەکی زەندەقیان دەبردم.

پاش ئەوەی ناسنامەی بەشداربوونم لەتاقیکردنەوەی بەکالۆریا وەرگرت و بۆ سەعی کردن رەوانەی ماڵەوە کراینەوە.. رۆژی بەر لەتاقیکردنەوە دەست پێبکات سبەینەکەی لەکۆڵانێ، من و هاورێیانی کۆڵانی لەپێش دەرگای حەسارێ و لەسەر ئەو گوفەکەی لەخۆڵ و خاشاکی چوار پێنج کۆڵانان خڕ دەبووەوە گەمەمان دەکرد و ئاگامان لەخوێندن و دەرس و دەور هەر نەبوو، لەپڕ جۆری یاریەکەمان گۆڕا، قوتێکی بچوکی دۆشاوی تەماتەی کەپرمان کرد بوو لەنەوت و کونێکمان لەقەپاغەکەی کردبوو ئاگرمان دا، دەنگێکی وەك گرە گرێ پرێمزی لێوە دەهات و پڕ بەکونی قەپاغەکەش ئاگر دەهاتە دەرێ، منیش دەستم کردە قوتە دارێك و قوتوەکەم وەرگێڕا و خستمە سەر تەنیشت و بەدارەکەش دەمهێنا و دەمبرد و یاریم پێدەکرد، لەنکاوڕا گرمەیێك

لەقوتوەکە هەستا.. زەندەقمان چوو، بەڵام زەرەرمەندی سەرەکی تەنها من بووم! لەپشتی دەستمەوە هەتا سەر شانی چەپەم یەکپارچە ئاگر سوتاندنی، ئاورم دایەوە کەس لەهاوڕێکانم لەدەورم نەمابوو، یەکسەر قوتە دارەکەم فڕێدا و هەڕێ بۆ ماڵێ، هەتا دایە و دایە حاجیم تێگەیاند قۆڵ و باسك و دەستی چەپەم سوتایە درەنگ کەوتەوە، هەینێ دایە بردمیە لای برین پێچێك کەچی لەوێ نەبوو دەرگاکەی داخرا بوو.. لەگەڕانەوەمان بۆ ماڵەوە پلکە رەحمەتەی دایکی سدیق و نامیقی گەیشتە لامان، پرسی:

– ها قەدریە خوشکم لۆ وەها مشەوەشی؟

دایکم گوتی:

– بەملی شکای زاهیر گەمەی بەئاگری کردیە، نابینی قۆر و باسکی کو برژایە؟ چووینە کن عەبدولقادری موزەمید لەوێ نەبوو، خوشکەکەم نازانم چیلێبکەم؟

پلە رەحمەتە گوتی:

– هیچ نییە، خۆت مشەوەش مەکە، بیبەوە ماڕێ.. ئەگەر مەرەکەبتان هەیە، جوان جوان بەقۆر و باسکی داکە بەدوو رۆژان هیشکی دەکا و سێیەمین رۆژ قەتماغەی دەگری و وردە وردە قەتماغەکەش فڕێ دەدا.

لەبەدبەختی من، پلکە رەحمەتە چی گوت دایکم وای کرد و هەر کەگەیشتینەوە ماڵێ، منی بەدایە حاجی سپارد و بەخۆی هەر بەغار چووە ماڵی هاوسێیەکەمان و شووشەیێکی مەرەکەبی هێنا و هاتەوە، سەری شوشەی بادا و کردییەوە و هەرچی لەناو بوو بەقۆڵ و باسکیدا کردم، سەرتاپای دەست و باسك و شانم لەرەنگی مۆر وەردرا.

ئەوجا بۆ بەیانی بەم دەستە مۆر و شین هەڵگەڕاوەوە چوومە هۆڵی تاقیکردنەوە و بەشداریم لەبەکەلۆری کرد، حەتمەن دەرناچم و ساقیت دەبم، ساقیت بووم!! ساڵێکی دیکەم خولاندەوە و لەشەشی سەرەتایدا مامەوە، بۆ

ساڵی دووەم ئاقڵتر بووم، لەهاوینەکەی شاگردی (سەرتاشخانەی قوباد) بووم و کەسانی وەك حەمەدەمین حەلاق و عەلی مام برایم و مەلا یاسینی چایەچی و وریا هەرکی و عەزیز زەهاوی و جەماله سۆری سی و جگەرچی و مام وسوی کەبابچی و مام رەسوول کلاولبادی نانەوا و ملازم حەسەن خۆشناوی بوزفرۆش و ئاورەحمانی دارتاش و ئەنوەرە کۆری دوکاندارم ناسی و لەهەریەکێکیان شتێك فێربووم، خۆشبەختانە لەگەڵ دەرچوون و پەڕینەوەم بۆ ناوەندی، بەیانی (١١)ی ئازاریش بڵاوکرایەوە و شۆڕشی کورد گەیشتە قۆناغی پشوودان و ئاهەنگ و شایی و هەڵپەڕکێ، بۆ من بووە دوو جەژن و دوو ئاهەنگ، خۆشی دەرچوونم لەشەشەمی سەرەتاییەوە بۆ یەکی ناوەندی و بڵاوبوونەوەی بەیاننامەی یازدەی ئازار، هەتا هەینێش من کەمێك سەروبەندم لەگەڵ شیعر و کتێب و گۆرانی پەیدا کردبوو، منیش لەگەڵ رژانی خەڵکی جۆش سەندو بەخۆشی سەرکەوتنی شۆڕش.. رۆژانە دەچووینە سەر جادە و کۆڵان و پێش قشڵەی بن قەڵاتێ و ئەو شیعرانەی لەبەرم کردبوون لەگردبوونەوەی پێش قشڵە و لەناو ئاپۆرەی جەماوەر دەمخوێندنەوە و چەپڵەم بۆ لێدەدرا.

لەپۆلی یەکی ناوەندی ساڵی یەکەمم بەجرەجر تەواو کرد و چومە دووی ناوەندی، لەدووی ناوەندی بوو بەشداری یەکەمین شانۆگەریم کرد و ئاشنایەتیم لەگەڵ مامۆستای گەورەم (سەباح عەبدولڕەحمان) دروستکرد، کەچی لەم پۆلەش (دووی ناوەندی) تەناشم لێدا و دەرنەچووم.. بۆ ساڵێکی دی مامەوە.. هەینێش بارزانی نەمر زانی سەدام لێی بەفێڵە و لەرێکەوتنەکەی پەشیمان بوویەتەوە، شەڕی کورد و حکوومەتی بەعس دەستی پێکردەوە، من لەئۆردوگای زێوەی رۆژهەڵاتی کوردستان درێژەم بەخوێندنەکەم دا و پاش ساڵێك، هەر کەدوای نسکۆ گەڕاینەوە ئینجا دووی ناوەندیم تێپەڕاند و رزگارم بوو.

## بەیانی (١١)ی ئازار و جموجۆڵی من

لەبەرئەوەی کوڕی گەورەی باوکم بووم زۆر حەزی دەکرد زوو پێڕا بگەم و گەورە بم.. هەر چەند مانگێك دوای راگەیاندنی رێککەوتننامەی (١١)ی ئازار، ئێوارەیەکیان لەسەری کۆلانێمان باوکم و کەسێکی لەخۆی گەنجتر راوەستابوون، بەدوای منی نارد و چوومە لایان.. هەینێ تێیگەیاندم لەمەودوا من ئەندامێکی پارتی دیموکراتی کوردستانم و ئەو پیاوەش کەناوی (سەید موحسین)ە بەرپرسمە و دەبی پابەندی ئامۆژگار و راسپاردە حیزبییەکانی بم.. من ئەوکاتە زۆر بەجۆشەوە حەزم لەکوردایەتی بوو.

بەتەواوی ئامادەی کاری حیزبی و خزمەت کردن بووم،

ئەوانەی لەکۆبوونەوەکان کەمانگانە بوو لەگەڵمان دادەنیشتن و بەشدار دەبوون (ئەبوبەکری مەلا ئیسماعیل نانەکەلی و مامۆستا موحسین کەدواتر بەمامۆستا کاروان زیاتر ناسرا و چەند گەنجێکی دی بوون)، هەر ئەو عەیامیش لەرێکخراوی قوتابیان و لەلاوانی سەر بە پارتی دیموکراتی کوردستان ناوم تۆمارکرا و هەستم دەکرد کە کوردایەتیەکەم تەواو بەدڵی باوکمە و مەزبووتم.. هەر لەو سەروبەندیش جار جارە باوکم دەستی لەملم دەکرد و بەگوێدا دەچرپاندم و دەیگوت:

– کاکە خێرت لێدەبینم؟

منیش بەدڵی ئەو وەلامم دەداوە و دەمگوت:

– ئینشائەڵلا.. بابە ئینشائەڵلا.

وەلامەکەم بەدڵی ئەو بوو و بەگوێرەی ویستی ئەو بوو، چونکە پێشتر تێیگەیاندم گەر هاتوو ئەم پرسیارەی لێکردم، دەبێ ئەوها وەلامی بدەمەوە. ئیدی دەکەوتە ماچکردنم و بە (ئینشائەڵلا)یەکەم خەنی دەبوو.

## لەومرزش و تۆپێندا

باشترین گۆڵچی تەیراوە و کۆڵانی خۆمان بووم، بەمەزەندەی خۆم نەك گۆڵچیەکانی دونیایی و عێراق، بەڵکو شێرۆ خەلیلیش لەگۆڵچیاتی ناگاتە من، من باشترین گۆڵچی تەیراوەم.

لەسەر گۆڵچیاتی ململانێم لەگەڵ رەفیقەکانم دەکرد، ئاخر فەوزی کوڕی معاون سالّحی لەمن بالآبەرزتر و بەهەیکەلتر و بەهێزتر بوو، کەچی هەرکە مەسەلە دەگەیشتە سەر گۆڵچی فەریقی کۆڵانی ناوی من دەهات و ئەویان پەراوێز دەخست، هەر بەراستیش گۆلچیەکی مەعلان و بەتوانا بووم بەتایبەتی ئەو رۆژانەی بەر لەدەست پێکردنی یاری لەبەردەم گۆڕەپانی حەسارێی خوار ماڵمان، یەك دوو کێکی بەعەینەگم بخواردبا، بۆچی فیلیش دەیتوانی گۆلم لێبکات؟

کەڕەتەکیان، چونکە تیپی ئێمە کە لەوبەر جادەی بەرامبەر جۆت سایدی بەحرکە بووین جیاواز بوو لەتیپەکەی تۆپی پێی ئەوبەری جادە بەلای حەمامی سیروان و باخچەی کورد و عەرەب، کەفەرهاد پیربال سەرپەرشتی تیپەکەیانی دەکرد.

عەسر بوو، هەردوولا خڕ بووینەوە لەگۆڕەپانی پێش حەسارێی مابەینی هەردوو تیپ، بەس فەرهاد دیار نەبوو! کەمێك خۆمان دواخست و فەرهاد بەخۆ و بەچەند شمشێرێکی دەستی پەیدا بوو، هەر هاتە ناو گۆڕەپانەکە و گوتی:

– ئەورۆ تۆپانێ ناکەین، ئەورۆ شەڕە قلینجانێ دەکەین، خوا بەکێی دا ئەو براوەیە.

منیش بەحیساب نزیکترین هاوڕێی فەرهادم لێی چوومە پێش و گوتم:

– کاکە شەڕە قلینج هەرگرە لۆ رۆژەکی دی، ئەورۆ تۆپانێ دەکەین.

نەخێر، قلینجەکەی بەرز کردەوە و گوتی:

- کێ لەگەڕ تۆپانێی حیزە و کێ لەگەڕ قلینجانێی مەردانە؟

لەم کاتەدا من دەستم بۆ شمشێرەکەی برد و لەناوەڕاستدا گرتم، فەرهاد نەیکردە نامەردی و یەك بەهێزی خۆی شمشێرەکەی لەناو دەستم راکێشا.. خوێن لەناو لەپی دەستم فچقەی کرد و گۆمی خوێن لەناو دەستم جۆگەلەی بەست.. پاشترێم بیر نەمایە، تۆپانێمان کرد یان قلینجانێ؟

لەقۆناغی ناوەندیش هەر کە لەناو قوتابیان تیپ چێبوو، من ناوم بە گۆلچییێکی ئەمین و هەڵدەبژێردرام، یاریشمان دەکرد و شتاقە تۆپیش لەگۆلی من رەت نەدەبوو.

لەئاوارەییش.. لەئۆردوگا و دوورە تەیراوەش، هەر گۆلچی و کوڕە بەئەمەکەکەی گۆلی تۆپەکەمان بووم. رەنگە لەجێ و بەشی تر باسی ئەم گۆلچیاتەم هاتبێ.. وەلێ مەبەستمە بڵێم، لەگەڵ نسکۆی شۆڕشی ئەیلوول و قوڕبەسەریمان، منیش وازم نەك لەتۆپی پێ.. بەڵکوو لەگۆلچیاتیش هێنا و گۆلێکی گەورە و گرانم بۆ هونەر و نواندن و نووسین بەجێ هێشت.

## وەلی فیتەر

یەکەمین رۆژی پۆلی یەکەمی ناوەندیم لەناوەندی (جمهوری) و یەکەمین وانە و دانیشتنمان لەپۆل، مامۆستاییکی رەقەڵە و لاواز و رەشەسمەر هاتە پۆل.. هەر لەسەرەتاوە بەگرژ و مۆن و تووڕە خۆی نواند، پاش ئەوەی هێوری کردینەوە و چەند جارێك بەناو پۆلدا هات و چوو لەبەرەخۆیەوە پرتە پرتی بوو، لەناکاو پشتەملی قوتابییێکی گچکۆکەی گرت و هینایە پێشەوە و لەلای سەبوورەی وەریگەڕایێ و چینێکی باشی لێدا، سەیرێکی هەمووشمانی کرد و گوتی:

– ئەمن تەلەبەی عەجوول و سەرسەریم ناوێ، نابی کەس لەدەرسی من فززەی لێوەبێ.

ئینجا رووی لەقوتابیە تێهەڵدراوەکە کرد و دەفتەرێکی بچووکی لەگیرفانی ناوەوەی چاکەتەکەی دەرهێنا و قەڵەم جافێکی لەبەرکی کراسەکەی راکێشا و پێی گوت:

– قەشمەر ناوی خۆت و بابە قەشمەرەکەت چییە؟

قوتابیەکەش کەبەئاستەم نوزەمان گوێ لێ بوو ناوی خۆی و باوکی پێگوت و ئەویش لەدەفتەرە بچوکەکەی شتێکی نووسی.. ئینجا بەقوتابیەکەی گوت:

– دەبڕۆ لەجێی خۆت سکتربە.

سەیرێکی ئێمەشی کرد و گوتی:

– دیتتان؟ ئەوە مەسیری تەلەبەی موشاغیبە، هەر تەلەبەك لەدەرسی من بجوڵێتەوە ئەوهای لێدەکەم.. تێگەیشتن؟

بەم شێوەیە ویستی هەموومان جووچکە ترسێن بکات، بەڵام وا دەرنەچوو!! قوتابی وامان لەپۆل لەگەڵدا بوو بەقەڵافەت و بەژن و باڵا لەئێمە

گەورەتر و ساقیتی پار بوون فشەیان بەقسەکانی دەهات.

ئەو مامۆستایە یادی بەخێر ناوی (وەلی) بوو.. قوتابیەکان ناویان نابوو (وەلی فیتەر).. یەکەم لەبەرئەوەی پیاوێکی رەش و برش و لەڕ و لاواز بوو، دوایش هەر کەبەتەباشیر لەسەر سەبورە شتێکی دەنووسی و تەباشیرەکەی دادەناوە پەنجەکانی بەزمانی دادەهێنا و تۆزی تەباشیرەکەی لەپەنجەکانی دەکردەوە.

وەلیە فەندی بەزمی خۆش بوو، هەر کەلەقوتابییێك تووڕە دەبوو دەیگوت:

– بڕۆ دانیشە تەمبەڵ، سفرِ دەدەم موستەقبەلت دەکەم بەرەژوو.

قوتابیە هاروهاج و گەورەکانیش قسوریان لەتووڕەکردنی نەدەکرد.. رەفتاری وایان دەنواند وەلیە فەندی دەهری دەبوو جوێنی هەرە سادەی (ماکەر) بوو کەبەو قوتابیانەی دەگوت.

رۆژێك وانەی ئەم مامۆستایەمان هەبوو، لەپێشووەکە قوتابییێك لەچەند جێیێکی دیواری پۆلەکەمان و بەتەباشیر و بەگەورەیی نووسی (وەلی فیتەر)، جگە لەم نووسینە شتی تریش پێشتر لەسەر هەرسێ لا دیواری پۆلەکەمان نووسرا بوو، ئیدی هەر کەوەلیە فەندی هاتە پۆل و چاوی بەدیوارەکاندا خشاند و ئەم هەموو (وەلی فیتەر)ەی بینی، یەکسەر گوتی:

– کێهان ماکەر موراقیبە.

قوتابییێکی قەڵەو و بەهەیکەلمان هەبوو ناوێکی سەیریشی لێبوو، گورج هەڵساوە و گوتی:

* بەرێ مامۆستا.. ئەمن موراقیبم.

وەلییە فەندی گوتی:

– موراقیب کۆرە بووی تەوە.. ؟ نابینی دیوارەکان بەنووسینی تەباشیر پیس بووە؟ یەڵڵا دەستکە مساحەی ئەو نووسینانە بسترە.

موراقیبیش دەستی کردە مساحە و هەرچی نوسینی پێشتر هەبوو هـەمووی رەشـکردەوە بەتـەنها (وەلی فیتـەر)ەکانی هێشـتەوە و مسـاحەکەی لەشـوێنی خۆی داناوە و چووە سەر رەحلەکەی و لێی دانیشت..

وەلییە فەندی بەیەکجاری دەهری بوو هاواری لێکرد:

− قەشمەر.. ماکەر.. نابینی ئەمنیان جووندایە؟ هەستەوە بسترە..

ئێمەش لەژێرەوە پێدەکەنین و هەر هەندە نەبوو میزی بەخۆمان داکەین.

لەرۆژانی تاقیکردنەوە، دەبوایە هەموومان کتێبی مێژوو ببەینـە بـن دیـواری ژێـر سـەبوورە و لـەوێیان دانـێین، بەخۆشـی دەچـووە سـەر رەحلـەی پێشـی پێشـەوە و بـەپێوە رادەوەسـتا و چـاوێکی دەکـرد چـوار چـاو و موراقەبـەی دەکردین و دەیگوت:

− قۆپیە مەمنووعە.. هەر ماکەرێك قۆپیەی بکات بەشەق دەیهاوێمـە دەرێ وسفری لۆ دادەنێم و موستەقبەلی دەکەم بەرەژوو.

کەچـی قوتابییـە گـەورەکان هـەر بەئاشـکرا قۆپیـەیان دەکـرد و ئـەویش نەیدەوێرا فرزەیان لەگەڵ بکات، وابزانم لەژیاندا نەماوە خوا لێی خـۆش بێـت و دوا مەنزڵی بەهەشت بێت.

## بەئەنجامی پوولپەرستی.. دەستمان پێکرد

هەنووکەشی لەگەڵ دابێت، لە ژمێرياری و لە وانەی زمانی ئینگلیزی بیرکۆڵ و قەلەندەر و تەمبەڵم، هەتا لە پارە ژماردنیّ گەر (٢٠) پێنج هەزاریم بدەنیّ بژمێرم بەدوو سیّ جاران یەڵلا بەتەواوەتی بۆم مەیسەر دەبێت.. لە ئینگلیزیش هێندە بیّ سەواد بووم لە قۆناغی ناوەندی مامۆستا جەعفەر عەبدولواحید کە مامۆستای زمانی ئینگلیزیمان بوو کە ناوی دەخوێندینەوە لە پۆل هەربە: زیرۆ عەبدوڵلاّ بانگی دەکردم، چونکە چ لە چالاکیی رۆژانە یاخود تاقیکردنەوەی سەر کاغەز بەردەوام (سفر)م وەردەگرت.. وابزانم زیرۆش واتە سفر. هەر ئەو مامۆستایە لەلای خزمێکی دوورمان باسی کردبووم و گوتبوی:

–چۆن نابێتە زیرۆ.. لە داڵەوە تا داڵی کۆتایی لە دیار تەلەفزیۆن هەڵناستیّ.. ئەی کەی سەعی بکات. (ئەو کاتە بەرنامەکانی تەلەفزیۆنی کەرکوك بە داڵەکەی عێراق دەکرایەوە و لە کۆتایش دوای تەواو بوونی فیلمی شەو هەر بەدال کۆتایی بەبەرنامەکانی دەهێنا).

لەوانەکانی دی باش و مەعلان بووم، مامۆستاکان خۆشیان دەویستم.. هەر ئەو دەورو زەمانیش مگیزی خوێندنەوە و بینینی شانۆگەری و دراما ڕەش و سپییەکانی تیڤی کەرکووك و فیلمە میسرییەکانم سەیر دەکرد. هەرکە ئەکتەرە کوردەکانم لە درامایەکان دەبینی خەونم بەوەوە دەبینی کە دەبیّ رۆژێك بیّ و منیش ئاوا بتوانم بەشداربم و ببمە ئەکتەرو رۆڵ ببینم.

هەر ئەو رۆژانە کە لەگەڵ برادەرەکانم دەچووینە سینەما سیروان و فیلمێکمان دەبینی.. بۆ بەیانی لە خوار کۆڵانی خۆمان لە پێش دەرگای حەساری هەریەکەمان لاسایی ئەکتەرێکی فیلمەکەمان دەکردەوە و منداڵ و تواڵیش لەدەورمان کۆدەبوونەوە و چەپڵەیان بۆ لێدەدایین.

هەینیَ لە قۆناغی ناوەندی جگە لە وانەکان، خوێنەرێکی سەر سەختی شیعر و کتێبە مێژووییەکان بووم، جار جارە شیعر.. شیعریشم دەنووسی.. رۆژێك دوو مامۆستا لەگەڵ مامۆستا (فەرهاد حەسەن حوسنی) بەڕێوەبەرمان هاتنە پۆلەکەمان.. ئیدی تێیانگەیاندین کە ئەوانەی بەهرەی گۆرانی و تەمسیلیان هەیە ناوی دەنوسین و بەشداری لە حەفلە و تەمسیلیەکانیان دەکەین.. من ئەو رۆژە ناوم بۆ گۆرانی گوتن نووسی کە یەکێك لەو دوو مامۆستایە، هونەرمەندی گەورە مامۆستا (تەحسین تەها) بوو.

بۆ رۆژی دواتر هەموو ئەوانەی ناومان نوسرابوو لە هۆڵی ناوەندیی جمهوری خڕکراینەوە یەك یەك ناومان خوێندرایەوە چووینە بەردەم ئەو دوو مامۆستایە و بەهرەکانمان پێشان دەدا. هەرکە ناوی من خوێندرایەوە و چوومە بەردەمیان و ناوی خوام لیَ هێنا.. گۆرانییەکی بەدڵی خۆم زۆر باشم بۆ خوێندن و بەدڵی وانیش هەر سفر.

لە ئەنجامدا.. ناوی بەهرەدارەکان بە دیواریَ دا هەڵواسراو چووین سەیرمان کردوو ئەوەی ناوی دەرچوو بوو خەنی و ئەوەی دەریش نەچوو بوو گەنی و هەناسە سارد پاشەکشەیان لێکرد.. من نە ئەمیان بووم و نە ئەویان.. بەڵیَ ناوم دەرچوو بوو، بەڵام نەك لەبەشی گۆرانی بەڵکو لەبەشی شانۆ.. لێم یەقین بوو کە هەڵەیەك هەیە بۆیە راستەوخۆ ملی رێم گرت و چوومە گژ بەڕێوەبەری، کەچووم و دەرگام کردەوە جگە لە بەڕێوەبەرمان هەردوو مامۆستایەکەش لەویَ دانیشتبوون.. منیش بە پەشۆکاوی حاڵی خۆم بۆ باسکردن، کە چۆن دەنگ خۆشەکی وەك من لە بەشی گۆرانی ناوی نەنووسرایە و ناوم لە شانۆ دەرچووە. هەینیَ یەکێك لە مامۆستایەکان لێم هاتە پێش و دەستی لەسەر شانم دانا و گوتی:

–نا ئەتو گۆرانی مەڵیَ.. ئەتو دەبی تەمسیل بکەی.. واز لە گۆرانی بێنە بۆ

دەنگخۆشەکان.

هەرواش بوو، وازم لە گۆرانی هێنا.. ژمارەیەك قوتابی و هاوپۆلەکانم لەگەڵ مامۆستای گەورەم (سەباح عەبدولڕەحمان) کەوتینە پرۆڤەکردن لە دەقێکی شانۆیی بەناوی (ئەنجامی پولپەرستی).

پرۆڤەمان لە هۆڵی قوتابخانەکەی خۆمان بوو وەك دەستپێك.. دواتریش دەچووینە هۆڵی (گەل).. لەوێ هەموو ئەو رۆژە جوان و بەسوود و بە چێژەمان لەگەڵ ئەم هونەرمەند و مامۆستا گەورەیە بەڕێ دەکرد کە من لەلای خۆمەوە هەرچی وشەیەکی لەدەم دەردەچوو لەسەر پەڕەی دڵ دەمنوسیەوە و ئەزبەرم دەکرد.

کاتێکیش وادەی ئەوە هات بەرهەمەکەمان پێشکەش بکەین، بەڕێوەبەرایەتی چالاکیی قوتابخانەکان وایان بەباش زانی هەر لە هۆڵی ناوەندی خۆمان و لەکاتی کۆبوونەوەی مامۆستایان و لەگەڵ باوکی قوتابیان پێشکەشی بکەین.

ئیدی هەفتەیەك پێشتر بە هیمەتی مامۆستا سەباح و بە هاوکاریی مامۆستا (ئەکرەم عەلاف) و چەند هونەرمەندێکی تیپی هونەری هەولێر.. شانۆ لە بنەبانێی هۆڵی ناوەندیی جمهوری قیت کرایەوە و دیکۆری شانۆگەرییەکەش ساز و ئامادەکرا.

پاش نیوەڕۆی پێنج شەممە (١٩٧٢/١٢/٤) کە کۆبوونەوەی باوکان و مامۆستایان بوو.. ئێمە لە پشتی شانۆ و لە درزی پەردە و کون و کەلەبەران سەیری ناو هۆڵمان دەکرد و هەرکەسە و هەوڵی دەدا بزانێ باوکی هاتووە یان نا.. تا ئەو چرکە ساتەش من گاڵتەم بەم بەزم و ڕەزمە دەهات و لەلام وەك ئاو خواردنەوە وابوو، بەڵام هەرکە لە درزی پەردە چاوم بە باوکم کەوت لەبەردەم مام حوسێنی باوکی سەرکەوتی هاوپۆلم دانیشتووە هەردوو ئەژنۆم کەوتە لەرزین، حاڵێکم بەسەرهات لە هیچ شوێنێك تۆتکەم نەدەگرت.. دەمویست

کەیف خۆش بم گریانم دەهات.. هەوڵمدا بگریم کەچی دڵ خۆش بووم بە هاتنی باوکم.

لە پشت دیکۆر ئەکتەرەکان جلك و بەرگمان گۆڕی و یەکە یەکە دەچووینە بەردەم مامۆستا سەباح و ئەویش ماکیاژی پێویستی دەکردین و لە هەمان کاتیش هەردوو هونەرمەند (فەیسەڵ محەمەد ساڵح و جەلال بەیار )بەتوانج و قسەی گاڵتە ئامێز بۆ هاندانی ئێمە تەخسیریان نەدەکرد، لەناو هۆڵیش، مەراسیمی ئاهەنگەکە دەستی پێکرد و مامۆستای شەهید (جەعفەر عەبدولواحید ) بەلێهاتوویی و شارەزایی لەم بوارەدا ئاهەنگ و کۆبوونەوەکەی دەگێڕا.. بەدەم پێشکەشکردنی گۆرانی و خوێندنەوەی ناوی قوتابیانی بەشدار بوو لە گۆرانی بێژان و کۆرس و چەندین نوکتە و بەسەرهاتی بەتام و چێژی کۆیبیانەی گێڕایەوە کە ئەو پێشکەشکردن و گێڕانەوانە هەر لە خۆی وەك گەنجێکی جوان و چاوشین و بالا بەرز و قۆز دەهات.

نۆرە هاتە سەر ئێمە.. لەکاتژمێر سێ و پێنج خولەك لە ڕێکەوتی (١٩٧٢/١٢/٤) شانۆگەری (ئەنجامی پووڵپەرستی)مان پێشکەش کرد، من ڕۆڵی حاجی پوولپەرست و ڕەزیلەکەم بینی کە ڕۆڵێکی سەرەکی بوو لە شانۆگەریەکە.. هەرئەمەش یەکەمین بەشداربوونم و یەکەمین دەرکەوتنمە لەسەر شانۆ و کەبەشانازییەوە مامۆستام (سەباح عەبدولڕەحمان )یش بەیەکەمین مامۆستا و ڕابەری هونەری خۆم دەزانم.

چەند دیمەنێکی لەبیر نەچووم لەو ڕۆژەو ڕۆژی دواتر:

یەکەم: ئاهەنگەکە تەواو بوو، بۆ هاندانی بەهرەکانمان.. هەر قوتابیەکی بەشداربوو (کاسێك)ێکی پێشکەش کرا.. بەناو خوێندنەوە و چوونە سەر شانۆ و کاس وەرگرتنەوە. کە دواتر باوکم زۆر شانازی بەو کاسەوە دەکرد و هەر میوانێکمان بهاتبا کاسی گۆرینی پێشان دەدا و بەشانازییەوە. دەیگوت:

ئەوە پێشکەش بە زاهیری کوڕم کرا، چونکە تەمسیلەکی زۆر باشی کرد.
دووەم: من بۆ خۆم لە نزیکەوە پەیوەندی برایانە و هاوڕێیەتیم لەگەڵ شانۆکاران (عەلی ئەحمەد و فەیسەڵ محەمەد ساڵح و جەلال بەیار و سوبحی کۆیی و ئەکرەم عەلاف و وشیار سەید ئەحمەدو عەبدولرزاق شەمسەدین‌و سەلام کۆیی و غازی غەفور) دروستکرد کە ئەم زاتانە هەر هەموویان ئەوکاتە ناسراو و بەتوانا بوون.
سێیەم: ئەو ڕۆژە شەهید و مامۆستا (جەعفەر عەبدولواحید) بەشێوەیەك ئاهەنگەکەی گێڕا.. بووە ڕۆژی مێژووی و بیرچوونەوەی مەحاڵە.
ڕۆژی دواتر.. لەناو پۆل.. ئەم دوو دیمەنەم لەبیر ناچێ:
یەکەم: لەوانەی ئینگلیزی مامۆستا جەعفەر کە هاتە ژوورەوە یەکسەر هاتە لام و وتی:
-ئافەرین زاهیر.. دەست خۆشیت لێدەکەم.. لەتەمسیل بەردەوام بە دوا ڕۆژەکی پڕشنگدارت دەبی.
دووەم: مامۆستا (جەلیل سابیر سوڵتان دامیرچی) مامۆستای وانەی عەرەبی بوو هەرکە هاتە ژووری و بەر لە دەست پێکردنی وتنەوەی وانەکەی هاتە لای من و گوتی:
-حاجی ڕەزیل.. یەحیا شاهینت بەقوربان بی.
ئای کە خۆش بوو، کە ئاهەنگ تەواو بوو، باوکەکان پرسیاری کوڕیان لە مامۆستایەکان دەکرد.. باوکم بە مامۆستا فەرهادی گوتبوو:
-زاهیر کوە.. رات لێیە.
مامۆستا فەرهاد گوتبووی:
+نابینی زاهیر چ ئاگرەکی کردیتەوە.. ماڵەوەدان.

## شارستۆنی سۆر

هـەر لەناوەنـدی جمهـوری.. زۆربـەی قوتابییـە رەفیقـەکانم هـەر بەبنەماڵـە کۆمەنیست بوون، زۆر کەم هاوڕێی پارتیم هـەبوو.. لەقوتابیـە کۆمەنیستەکان (دەشـتی و میعـازی مـەلا عەباسـی بوسـتانی، سـالم کـەریم، شـەماڵ عـەباس، ماجیـد عەبدولکـەریم و سـەلاح مـەزن و چـەندانی دی کـەناویانم بـیر نـەماوە، لەپارتیەکانیش جەمال توتمەو کەمال عەبدوڵلا و خالید حامیدی حاجی مەجیـد قەرداری، سەرەتا جەمال توتمە زۆر لێم نزیك دەبووە و برادەرایەتیمان گەرم و گوڕ بـوو، بـەڵام کـەدیتی مـن پـتر لەگـەڵ قوتابیـە کۆمەنیسـتەکان رەفاقـەتی دەکـەم و هاتووچـونم لەگــەڵ ئەوانــە، بەتایبــەتی ئــەو رۆژانــە پــانتۆرێکی شارســتۆنی سـۆرم هــەبوو لەبـەرم دەکـرد، بەمەزەنـدەی جـەمالی ئـەمنیش شیوعیمە و سەبر سەبر لێم دوور دەکەوتەوە، هەر ئەوکاتیش ئیتیحاد تەلەبەی بەعسییان هەبوو کەبەرپرسـەکەیان کـوڕێکی تـەیراوەیی بـوو بـاوکی بەوەسـتا بانگ دەکرا، ئـەویش چـونکە دەیناسـیم حـەزی نـەدەکرد لەگـەڵ شـیوعیەکان رەفاقـــەتی بکـــەم و زوو زووش کێشـــەی بـــۆ دروســـت دەکـــردم. هەینێش من پتر گرنگیم بەخوێندنەوە دەدا و جار جارە شیعریشـم دەنووسـی، لەناوەنــدیی جمهــوری قوتابییــان چــالاکییان دەنوانــد.. کــەپتر قوتابییــە شـیوعییەکان پێیهەڵدەسـتان، بڵاوکـراوەی دیـوار ئەوکاتـە بـاو بـوو، لەیـەکێك لەژمارەکان هۆنراوەیێکی منیان بڵاوکردەوە، هۆنراوەکـە ئـاگرین بـوو بـەرەمز باسـی کـورد و خـاك و شـەهید و زینـدانی بـەدناوی موسـڵ و بـەرگری و ئـەم بابەتانە بوو، لەناو قوتابیان باش دەنگی دایەوە و دەستخۆشـیان لێدەکردم.. هەتا مامۆسـتا شـەهید جەعفـەریش خوێندبوویـەوە و لابـەلا دەسـت خۆشـی و ئافــەرینی لێکــردم، کەچــی تەلەبــە ئیتیحادییــەکان بەتایبــەتی بەرپرســە

تەیراوەییەکەیان لەناو قوتابیان بوختانی بۆ هەڵدەبەستم و دەیگوت: زاهیر لەگەڵ خۆمانە با هەر شیعری ئەوها بنووسی بەکەلك نایێ.

بەڵام قوتابیە رەفیقەکانم دەیانزانی درۆ و بوختانە بەمنی دەکات.. دەیانگۆت:

- ئەوە زگی دێشی و بەشیعرەکە قەڵس بووە، لۆیێ وەدەرێ.

ساڵ رۆیی، لە (١٩٧٤) کەیەکەمجار من لەگەڵ باوکم چوومە گەڵاڵە و شەڕی نێوان پێشمەرگە و حکومەتی بەعس هەلگیرساوە، ئەو (جەمال توتمە)یەی رەفیقم لەوێ دیتەوە و بەینمان گەرمی تێکەوتەوە زوو زوو دەیگوت:

- وەڵڵاهی لەبەر شارستۆنە سۆرەکەت هەر وام زانی بوویە شیوعی، لۆیێ رکم لێت دەبۆوە.

لەناو شۆڕش، ئێمەی قوتابی بەپێشمەرگە وەرنەگیراین، گوتیان پێشمەرگەمان زۆرە، با قوتابیەکان لێرەش بچنەوە قوتابخانە و خوێندن تەواو بکەن و پێویستمان بەخاوەن بڕوانامە هەیە، مانگانەش موچەیێکیان بۆ قوتابیەکانی ناو شۆڕش بڕیبۆوە.

جارێکیان، من و جەمال توتمە زۆر بێپارە و گیرفان بەتاڵ بووین، سەری مانگێ رۆژەکەی کە مووچە دابەش دەکرا رۆژێکی بارانـاوی و سارد و سەرما بوو، شەهید کاردۆ گەلاڵی مووچەکەی دابەش دەکرد، گوتیان وا لەناو پردانە برۆنە وێ، لەگەڵاڵەیرا چووینە ناو پردان لەوێ نەبوو.. پرسیمان گوتیان چویتە چۆمان، هەرتك هەرتك خۆمان گەیاندە چۆمان لەوێش نەبوو، دیارە کاردۆ گەلاڵی بەمەبەستی زوو دابەشکردنی مووچەکە سەردانی زۆر شوێنی دەکرد و لەجێگاییێك نەدەگیرسایەوە، دۆزینەوەی زەحمەت بوو، ئەو رۆژەش باران دەتگوت بەتەشت دەباری لەئاوێ هەڵکێشرا بووین، مات و مەلول لەراستەڕێی ناو چۆمان بەرەو ناو پردان دەگەڕاینەوە لەپڕ جێبە قوتەیێك کەهەر

شوفێرەکە و پێشمەرگەیێکی لەتەك دانیشتبوو بۆی راگرتین و ئێمەش لەخوامان دەویست بەپەلە دەرگای دواوەمان کردەوە و بەجلکی تەڕەوە خۆمان هەڵدا ناو جێبی، کەبەڕێکەوتەوە و بەخێرهاتنیان لێکردین، من نازانم لەکوێ ناوی ئەو فەرماندەیەم بیستبوو، بەجەماڵی هاوڕێم گوت:

– لەهەمووی باشترە خۆمان بگەیەنینە کن نەقیب حەسەن بارزانی، بەڵکو ئەو عیلاجەکمان بکات.

یەکسەر شوفێرەکە لێم بەجواب هات و گوتی:

* ئەتو لەکێ نەقیب حەسەن بارزانیت دیتیە و کو دەیناسی؟

منیش گوتم:

– وەڵڵا نەدیتیتم و نەدەشی ناسم.. بەس ناویم بیستییە و دەرێن پیاوەکی باشە.

بارانیش هەر بەگوڕ دەباری و جێبە قوتەش هەر دەڕوا، گەیشتینە ناو پردان گوتمان ئێمە لێرە دادەبەزین.. شوفێرەکە راینەگرت و گوتی:

– نا بەو بارانەی چ دەکەن لێرە.. لەگەڵەمە وەرن.

راینەگرت و رۆیی، من و جەمال سەیری یەکمان کرد، بەراستی من ترسام گوتم بەزمانی خۆم خۆمان تووش کرد.

لەناو پردان دەرچووین ماوەیێکی پێچوو بەلای دەستە راست لەرێزانۆکی مەلا برایمی بەسەر گردێکدا هەڵکشا، لەشوێنێکی کەبە (کانی سماق) بەناوبانگە بارەگای بەتالیۆنی یێکی زۆزکی لێبوو، کەگەیشتین داری بازگەیان قیت کردەوە و جێبە قوتە رەت بوو لەبەر دەرگای هۆلێکی گەورە رایگرت، دوکەڵی سۆبەی داریش لەسەربانی هۆڵەکەوە دەچووە تۆقەرەی ئاسمانێ، شوفێر و پێشمەرگەکە دابەزین، ئێمەش بەناچاری لەگەڵیان هاتینە خوارێ.. شوفێرەکە فەرمووی لێکردین و بەپێشە خۆی داین بۆ ناو هۆڵەکە، کەچووینە

ژوورەوە گوتی:

– جارێ برۆنە بەر سۆبەکە و خۆتان گەرم کەنەوە، ئەوجا قسان دەکەین.

ئێمەش واق وڕماو و رارا بەناچاری چووینە سەر ئەو دوو کورسییەی لەنزیک سۆبەکە داندرا بوو خۆمان دا بەر گەرمایێ، شوفێرەکەش دیار بوو هەر ئەمری دەکرد، بەوی دەگوت چای حازرکەن! بەیەکێکی دی دەگوت برۆن بزانن چ هەیە بیخۆین بۆمان بێنن، بەخۆشی لەدووری ئێمە لەسەر کورسییەك دانیشت و دوو سێ پێشمەرگەش هەر بەپێوە دەورەیان لێدا.

لەسەر سێنیەك قاپێك ماست و چایە و نانی گەرمییان هێنا و لەسەر مێزێکیان دانا، شوفێرەکە فەرمووی لێکردین و بەخۆشی لەگەڵمان کەوتە نان و ماست خواردنێ و چامان بەسەردا کرد کە هەنووکەشی لەگەڵدا بێت تام و چێژی ئەو نان و ماستەم لەبیر ناچێتەوە هێندە بەلەزەت بوو، پاش ئەوەی تەواو گەرم بووینەوە و گەدەمان پڕ کرد و برسییەتیمان رەواندەوە، ئینجا کابرای شوفێر گوتی:

– ئێ.. دەوجا قسان بکەن.. چتان لەنەقیب حەسەن بارزانی دەوێ؟

منیش بەترس و لەرزەوە گوتم:

– کاکە ئەمە قوتابین.. بێ پارە و پوولین.. ئەورۆ هاتین معاشی ئەو مانگەی وەرگرین.. کەچی لەسبەینێوە بەدوای لیژنەی دابەشکردنی مووچەی قوتابیاندا دەگەڕێین، نەلەناو پردان نە لە چۆمان نەماندیتنەوە هەتا موچەکەمان بدەنێ.

لەم کاتەدا پێشمەرگەیەك بە دەفتەرێکی گەورەی بن هەنگلێیەوە هاتە ژوورێ، کەتەماشام کرد ناسیمەوە.. مام کەریمی خزمی خۆمان بوو، برای مام برایمی مێردی پورمە، ئۆخەی ئەگەر غەڵەتیشمان کردبێ ئەوە مام کەریم شەفاعەتەکمان هەر بۆ دەکات.

مام کەریم لەشوفێرەکە نزیك بۆوە و دەفتەرە زلەکەی لەبەردەم دانا و گوتی:

– کاك حەسەن.. ئەوەش ناوی ئەو پێشمەرگانەی تازە هاتوون.

مام کەریم ئاوڕی لەئێمەش دایەوە و منی بینی و لێم هاتە پێش و گوتی:

– ها کاکە زاهیر ئەوە چ دەکەی لێرە، ئەتووش هاتی ببیە پێشمەرگە؟

هەینێ شوفێرەکە پێکەنی و ڕووی لەئێمە کرد و گوتی:

– کاکۆ، ئەمن نەقیب حەسەن بارزانیمە.. فەرموو بزانم چتان لەمن دەوێ؟

منیش بەواق وڕماوی گوتم:

– وەڵڵا بەخۆشم نازانم چمان لەتو دەوێ، بەران لەبەر باران و سەرما و تەڕبوونمان لەتاوان ئەو قسەیەم بەدەمدا هات.

ئیتر بووە پێکەنین.. جەنابی نەقیب حەسەن بارزانی گوتی:

– ئەنگۆ قوتابین، چاو و موستەقبەلی ئەو شۆڕشەن، چتان بوێ ئەمن لەخزمەتم.

کاغەزێکی نووسی و دایە دەست مام کەریمی و بەئێمەشی گوت:

– لەگەڵ ئەو پێشمەرگەیەی بڕۆن با هەندەك گیرفانتان گەرم کاتەوە، ئەوە بارەگای منیشتان پێزانی هەر ئیشەکتان هەبوو شەرمێ مەکەن.. وەرن بەچاوان.

سوپاسمان کرد و لەگەڵ مام کەریمی چووینە ژوورێکی دی، لەوێ هەریەکەو شتێك پارەمان وەرگرت.. خەنی بووین، مام کەریممان ماچ کرد و گەڕاینەوە مزگەوتی گەورەی گەلاڵەی.

## مزگەوتی گەلاڵە

پێشتر باسم کردووە، دوای ئەوەی سەرکردایەتی شۆڕشی کورد لەگفتوگۆ و دانوساندن لەگەڵ ڕژێمی بەعس دڕدۆنگ بوو زانی چیتر گفتوگۆ کەڵکی درێژەپێدانی نییە، وردە وردە پێشمەرگە خۆیان کۆ دەکردەوە و خەڵکەکەش بەرەو ناوچەی ئازاد هەڵدەکشان بەتایبەتی بۆ دەڤەری باڵەکایەتی، من ئەوکاتە پۆلی دووی ناوەندی بووم، ڕۆژێك باوکم هاتەوە و گوتی:

– کاکە خۆت خڕکەوە سبەینێ زوو دەچینە گەلاڵەی و ماوەیەك لەوێ دەبین تا بزانین ئەم وەزعە بەچ دەگات.

باوڵێکی شینی گچکۆکەم هەبوو پڕم کرد لەکتێب و دەفتەر و قەڵەم و خۆم ساز و ئامادە کرد، بەیانی زوو لەتەك باوکم و بەقوتە مارسدیسەکەی چووینە گەلاڵە.. باوکم لەگەڵ چەند شوفێرێکی دی کەهەر هەموویان لەخەتی (هەولێر–گەلاڵە) ئیشیان دەکرد و نەفەرییان دەگواستەوە جێی حەوانەوە و خەوتنیان لەیەکێك لەچایخانەکانی سەرپردی گەلاڵە بوو، بەلام من بەهۆی چەند برادەرێکمەوە بۆ گەلاڵە هەرکشام و شەوانەش لەناو مزگەوتەکەی گەلاڵە دەنوستین کەپڕ بوو لەخەڵك.

لەناو مزگەوتی گەلاڵە بۆ یەکەمین جار بەدیداری شاعیری گەورە شێرکۆ بێکەس شاد بووم، جگە لەو چەندین نووسەر و شاعیر و ڕۆشنبیر و هونەرمەند شەوانە لەوێ دەخەوتن، ڕێك جێگەی مینبەری مەلا ببووە جێدانیشتنی مامۆستا شێرکۆ بێکەس و شەوان لەوێ مەجلیسی دەبەست و برادەران دەوریان دەدا، من جێگە خەوتنم لەتەك کاك خالید جوتیاری ڕەحمەتی بوو، لەتەنیشتەکەی دیشم کوڕێکی لەخۆم بەتەمەنتر دەخەوت ناوی (سامی قادر) بوو، جا کەشەوان باوڵە شینەکەم دەکردەوە و کتێبێکم بۆ خوێندنەوە دەردەهێنا، یان دەفتەرێکم دەردەهێنا و گوایە شیعر دەنوسم! ئەو سامی قادرە لێم دەهاتە پێشێ و دەکەوتینە گفتوگۆ، هەر ئەویش خەڵکە دیارەکانی

ناو مزگەوتێی پێ دەناساندم کەیەکێك لەوان کاك خالید جوتیاری تەکم بوو، کەسەرنجی شیعرەکانی ناو دەفتەرەکەی دەدام و دەیزانی هەموو شیعری کرچ و کاڵن و هەڵچونێکی گەنجانەیە سەری بادەدا و دەفتەرەکەی دەدایەوە دەستم، بەڵام قەت نەیدەشکاندمەوە، بەڵکو هانی دەدام و دەیگوت جارێ زیاتر بخوێنەوە و کەمتر بنووسە، هەروەها دەیگوت: سەیرکە ئەو هەموو برادەرە نووسەر و شاعیرە لێرەن هەموومان وەك تۆ بەم مەرحەلەیەدا تێپەڕیوین، بەڵام بەخوێندنەوە و قوڵ بوونەوە و پرسیار کردن بووینە ئەو کەسانەی کەئێستا حسابمان بۆ دەکرێت، ئیتر باوڵە شێن بوو بووە نیشانەی من و لەچوونە دەر و هاتنە ژوورەوەی مزگەوت بەدەستمەوە دەگرت و هۆگری بووم، هەر بەقسەی کاك سامی قادریشم کرد و وازم لەشیعر نووسین هێنا و وەك مۆرانە بەدوای خوێندنەوەی کتێبان کەوتم.

ڕۆژانەش قوتە دەمانچەکەی باوکم، ئەها ئەوەی لەشەوی بڵاوبوونەوەی بەیانی (١١)ی ئادار لەژێر ساپیتەی ماڵێ دەریهێنا تا وەك خەڵکی دی ئەویش تەقەی خۆشی بکات کەچی چروکی کرد و هیچ تەقەیێکی لێوە نەهات، ئەو دەمانچەیەم لەنێکی دەبەست و خۆم پێبادەدا و باولە گچکەکەشم هەر بەدەستەوە بوو، نیوەڕۆیانیش بۆ نانخواردن دەچوومە سەر پردی گەلاڵە و لەگەڵ باوکم و برادەرەکانی نانم دەخوارد.

نیوەڕۆیەکیان کەچووم دوای نان خواردن باوکم گوتی:

– کاکە، ئەوە ئەو برادەرەمان دەچیتەوە هەولێرێ و ئیشەکی هەیە، قەڵەم و کاغەزێکی دەربینە و نامەیێك بۆ دایکت بنووسە با ئەویش لەگەڵ منداران بێن، چونکە تازە کار لەکار ترازایە.

ئەو ڕۆژە بوو کەوەفدی دانوسکاری شۆڕش بەسەرۆکایەتی ڕەوانشاد کاك ئیدریس بارزانی لەبەغدا گەڕابوونەوە و لەگەڵ حکومەت نەگەیشتبوونە هیچ ئەنجامێك.

نامەم نوسی و دامە دەست باوکم، بەڵام چونکە نەخوێندەوار بوو دایەوە دەست خۆم و گوتی:

– دەلۆم بخینەوە بزانم چت لۆ داکت نوسییە؟

لەم کاتەدا ئەو برادەرەی باوکم دەچۆوە هەولێر هات لەتەنیشت باوکم دانیشت و گوتی:

– کاک عەبدوڵڵا بینە کاغەزەکەم بدێ با لەوەندە زیاتر تاخیر نەبم.

باوکم گوتی:

– با زاهێری کورم لۆمان بخینتەوە بزانم چی نوسیە.. ئەوجا دەتدەمێ و بیبە تەسلیمی خارم حاجی حەسەنی بکە دوکانەکەی هەر لەسەری کۆڵانی خۆمانە.

دەستم بەخوێندنەوەی نامەکە کرد و دوای دوعا و سەلام و چاك و چۆنی و داوای خۆ خڕکردنەوە و هاتنیان بۆ ڕەواندوز، لەخوێندنەوەکە چ عەیبم نەبوو، لەدوا بڕگەدا نووسیبووم (دایەگیان زۆر غەریبیتان دەکەم.. غەریبی تەیراوە و برادەرەکانم دەکەم.. غەریبی شامینۆك و لۆبیای سبەینانی تەیراوەکەم دەکەم) لەگەڵ خوێندنەوەی ئەم بڕگەیە گریان هەوکی گرتم و زۆرم هەوڵدا پێمەوە دیار نەبێت هەر هیچ نا لەشەرمی ئەو پیاوەی کەلەگەڵماندا دانیشتووە، کەچی خۆم پێڕانەگیرا و لەپرمەی گریانێمدا، کەسەرم بەرز کردەوە دەبینم باوکیشم وەك من فرمێسك لەچاوەکانی دەڕژێ و سەری بەبەر خۆیدا شۆڕ کردۆتەوە.

کابرا هەڵساوە و نامەکەی لەدەستم ڕاپسکاند و قەدی کرد و لەگیرفانی نا و بەتەوسەوەش گوتی:

– های های.. وەڵڵا بابە هەر ئەنگۆ شۆڕشی لۆ کوردان بکەن.

لێیدا ڕۆیشت و بەجێی هێشتین.. ئێمەش من و باوکم نەئەو دەنگ و نەمن دەنگ هەڵسام و گەڕامەوە مزگەوتەکەی گەلاڵە.

## لە ناوپردان

ماوەیێك لەگەڵ فەوزی کوڕی معاون ساڵحی لە ناوپردان لەبارەگایێکی پێشمەرگە مامەوە، فەوزی پێشمەرگە بوو لەوێ و منیش میوان.

بارەگاکە کەوتبووە رۆخ ئەو چۆمەی بە ناوپرداندا دەڕوات، بارەگاکە بەندیخانەی هەبوو و پێشمەرگەکان پاسەوانیان لێدەکرد.

لەوێ، ئەو کەسە کۆمەنیستە رۆستییە دەست بەسەر بوو و بەڵام لەگەڵ ئێمە دەخەوت و دەیخوارد کەماوەیێك لەنێوان هەردوو رۆژنامەی (برایی) و (تەریق ئەلشەعب) ببووە سەردێڕی هەواڵەکانیان، کابرا شیوعی بوو بەبڕیاری شۆڕش لەلای پێشمەرگە و بەندیخانەی ناوپردان دەست بەسەر بوو. بەڵام نەمدی هیچ رۆژێك بیخەنە ناو زیندان.

رۆژنامەی (تەریق ئەلشەعب) زمانحاڵی حیزبی شیوعی عێراقی بوو و لەبەغدا دەردەچوو، لەیەکێك لەژمارەکانیدا هەواڵی بەکوژراوی بڵاوکردەوە گوایە بەئەمری شۆڕش کوژراوە، رۆژنامەی (برایی)ش کەزمانحاڵی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو و لەبەغدا دەردەچوو سەرلەبەری هەواڵەکەی رەت کردەوە و نووسیبووی هاوڕێ شیوعییەکە ساغ و سەلامەتە.

ئەو رۆژەشم لەبیرە کەپەیامنێری رۆژنامەی (برایی) هات و وێنەی کابرای گرت و ئەو ژمارەیەی رۆژنامەی (تەریق ئەلشەعب)یشیان دایە دەستی کەهەواڵی کوژرانی تیا بڵاوکرابۆوە و لەسەر سینگی راگرت و وێنەیان گرت، بۆ ژمارەی داهاتوو وێنە و هەواڵی سپ و ساغی لەلاپەڕەی یەکەمی رۆژنامەی (برایی) بڵاوکرایەوە و رۆژی دواتر چەند دانەیێك لەرۆژنامەکەیان بۆ ئەو هاوڕێیە هێنایەوە کەلەئێستادا بەداخەوە ناوەکەیم لەیاد کردووە.

هەر لەوێ، یەکێك کەبەنازانم چ (بارۆك) بانگیان دەکرد لەسەر کاری نابەجێ

دەستگیر کرابوو و لەزیندانەکەی لای ئێمە بوو، کابرا بەپیشە پێشمەرگە بوو، هەر کەشەڕ لەنێوان پێشمەرگە و سوپا هەڵگیرسایەوە، لەچیای کورەك رەبایەیێکی عەسکەری هەبوو بەتۆپباران و تەقە رواندز و دەوروبەری هەراسان کردبوو، کابرای زیندانی داوای کرد ئازادی بکەن بۆ ئەوەی بچێتە رواندز، گەر شۆڕش رێگەی بدات دەتوانێ ئەو رەبایە تەفر و تونا بکات.

هەرواشیان کرد، ئازادکرا و چۆوە رواندزێ، شەوێك بەتەنها دەچێتە گژ رەبیەکە و بەنارنجۆك دایدەبێژێ و هەڵیدەتەکێنێ و سەربازەکانیش هەموو دەکوژێ و بەخۆ و بەدەمانچەیێك و چەند تفەنگێکی کلاشینکۆف دەگەرێتەوە.

لەهەینێوە، کابرا پلەی بەرزبۆوە و لەبەندییەکی لەزیندان توندکراوەوە بووە مەسئوولێکی سەربازی پۆشتە و پەرداخ و حیساب بۆ کراو لەگەڵ من و فەوزی برادەرم بەینی خۆش بوو، جار جارە لەناو چۆمان دەماندی بەرانکوچۆغەی کر و دەمانچەی چواردە خۆر لەنێك و تیلاك خواری، بەهەموو دەمێش سێ چوار پێشمەرگەی بەدواوە بوو و حیمایەیان دەکرد.

## گەردە گەردی رواندزی

شەو و رۆژێکی خایاند، بەدەستوری رۆژانیدی بۆ نیوەڕۆ چوومە لای باوکم، یەکسەر پێی گوتم:

– با نانەکی بەعەجەلە بخۆین و بچینە رواندزێ داکتوان هاتینە.

لەخۆشیان هیچم پێنەخورا و خواخوام بوو باوکم زوو نانەکەی تەواوکات و برۆین، کەچووین لەرێگا باوکم گوتی:

– لەرواندزێ برادەرێکی عەزیزم هەیە ناوی حاجی حەمە شەریفە و مارییان لەگەردە گەردێیە، وەکی پیاوان ژۆرەکی لۆ بەتار کردینە مندار لەوێنە.

لەکاولۆکان رەت بووین، بۆ لۆفەکان سووڕاینەوە، ئای خوایەگیان جاران ئەو لۆفانە ئەوەندە زۆر نەبوون چ بوو هەر تەواو نەبوو، هەر کەگەیشتینە سەرەوە، بەلای دەستە راست دەروێش ئیسماعیلی عەلە شێتی لەسەر رەسیفی پێش خانووی خۆیان راوەستابوو باوکم بۆی راگرت و ئەویش لێمان هاتە پێشێ و گوتی:

– گێ بەگوار مزگێنی بی داکا زاهیری وا لەمارا حاجی حەمە شەریفی چاوەڕێت ئەکا.

پێکەنین و ملمان لێنا بۆ گەردە گەردێ، لەسەری کۆلانێ بەنزیخانەیێك هەبوو، باوکم سورایەوە دیتم وا (مارف و عەبدولقادر) لەکۆلانێ لەگەڵ مندالان گەمان دەکەن، هەر باوکم رایگرتوو من دەرگای لای خۆم کردەوە و بەهەشتاو خۆم بەهەردوو برایەکانمدا دا و تێر ماچ و بۆنم کردن.. چووینە ژوورەوە دایە و عارف و تاهیر لەگەڵ خێزانی مام حاجی و روپاکی کچیان لەبەر هەیوانێ دانیشتبوون، هەر لەدووڕا هاوارم کرد:

– دایە گیان.

ئەویش وەڵامی دامەوە و گوتی:

- گیانی دایەی.

خۆم پێدادا و بۆنە سیحراوییەکەی بەبەر هەناسەم کەوت و لەباوەشێی کردم.. ئۆخەی سەد ئۆخەی جارێکیدیش خۆم لەئامێزی دایەکەی خۆم دیتەوە.

دوو شەوان باوکم لەلامان مایەوە و پاشان چۆوە گەلاڵە و لەوێ مایەوە و جار جارە سەری لێدەداینەوە، منیش ناوم لەناوەندیەکەی هەورازی گەردە گەردێی بەرامبەر قەبرستانێ نووسی و بوومەوە قوتابی پۆلی دووەمی ناوەندی.

بەڕێوەبەرەکەمان پیاوێکی کەلەگەتی قەڵەو بوو بەداخەوە ناویم بیر نەماوە.. لەمامۆستایانیش مامۆستای بیرکاری مامۆستا (فوئاد زوبێر)م لەیادە زۆر زیرەك بوو وانەی بیرکاری بەشێوەیێکی یەکجار ساکار دەوتەوە.

ئەو ماوەیەی لەرواندوز ماینەوە لەڕۆژە هەرە خۆشەکانمان بوو و ماڵ و منداڵی مام حاجی حەمە شەریفیش لەگەڵمان زۆر باش بوون و قسوریان نەبوو.

بەڵام خۆشییەکەمان زۆری نەخایاند، بەهۆی تۆپبارانی سوپای داگیرکەری رژێم کەلەچیای کۆڕەکەوە لەرواندوز و دەوروبەری دەدا و رۆژانەش فڕۆکەی سیخۆی هەراسانیان دەکردین، دەرگای قوتابخانەکەمان داخرا لەپێناو سەلامەتیی قوتابییان، منیش باوڵە شینەکەم هەڵگرت و شۆڕ بوومەوە خوارێ بۆ ناو (حامیە)ی رواندزی کەقوتابیەکانی دەرەوەی رواندزێ لەوێ دەخەوتن، لەژوورێکدا لەناو حامیە لەگەڵ هاوڕێیانم (لوقمان بەرزنجی و حیسامی ئامۆزای و کوڕێك بەناوی سالم کەزۆر کەم کوردی دەزانی گیرسامەوە.. ) رۆژانە لەدەوروبەری حامیە و شەوانەش لەژوورەوە دەمانکردە بەزم و رەزم، بەتایبەتی هاوڕێی خۆشەویستم لوقمان بەرزنجی نەك بەئێمە بەدار و دیواریشی

رادەبوارد.. هەر بۆ خۆشمان خواردنمان ئامادە دەکرد و قاپ و حاجەتەکانمان بەنۆرە دەشوشت.. بۆ خۆشوشتنیش دەچووینە ناو خەرەند و بەئاوە سازگارەکەی حەمامەمان دەکرد.

پێش نیوەڕۆییێك، من و ڕەفیقێکم بڕیارماندا بچینە رواندز و نانی نیوەڕۆ لەلای دایە بخۆین، بەپێ و بەقەدبڕ هەڵگژاینە سەر لۆفەکان، دوو لۆفەمان بڕیبوو لەناکاو دەنگی فڕۆکە لەئاسمانێڕا کاسی کردین و ئەوەندەی نەبرد گەیشتە سەرمان، خۆمان بەعەردی دادا و متەقمان لەخۆ بڕی.. هەر ئێمە نەبووین خەڵکی دیش لەدەوروبەرمان هەروەك ئێمەیان کرد، لەبەرامبەر لۆفەکان لەوبەری گردێك هەیە کەپاشماوەی قەڵای میری گەورەی سۆران لەسەر تۆقەرەکەیەتی، پێشمەرگە لەناو ئەم کەلاوەیە دۆشکەیان دانابوو، دۆشکە وەك برێشکە کەوتە تەق و تۆق و لەفڕۆکەکەی دەگرت، فڕۆکەکەش هەر کەزانی تەقەی لێدەکەن بەرزبۆوە و لەتۆقەرەی ئاسمانێ جارێکیدی سووڕایەوە، دۆشکەکەش لەسەر قرم و هۆڕی خۆی هەر بەردەوام بوو، فڕۆکە رووی بۆ لای گردەکە سووڕاندەوە و کەوتە تەقەکردن هەر لەدامێنی گردەکەوە بێژایی و بەسەرکەوت هەتا لەناوەڕاستی قەڵاکەی دا و دۆشکەکەی بێدەنگ کرد، هەینێ ملی خۆی شکاند و ئاسمانی رواندزیی بەجێهێشت.

وایلێهات لەترسی فڕۆکە و تۆپباران رواندز چۆڵ کرا، ماڵی ئێمە گواستیانەوە بۆ قەسرێ و لەرێزە دوکانێك کەهەر لەسەرەتای قەسرێ بوو لەیەکێك لەدوکانەکان گیرسانەوە، رێك بەرامبەر ماڵەکەشمان کەلەناو دوکانێك بووین، لەتەختاییەکە تۆپێکی تەیارە شکێن چاڵیان بۆ هەڵکەندبوو بەگوشی پڕ لەخۆر بەبازنەیی دەوریان گرتبوو بەردەوام سێ چوار پێشمەرگەی لێبوو.

منیش جارێ لەگەڵ برادەرەکانم هەر لەحامیەم، شەوێك بووە دەنگۆ کەدەبێ حامیە چۆڵکەین، چونکە سبەینێ لەگەڵ گەردی بەیانی فڕۆکە دێ و

حامیەکەمان دادەبێژی، کەس نەبووە برای کەس، هەر بابا بوو خۆی خڕ دەکردەوە و بەپێیان بەرەو چۆمان ملی دەنا..

منیش جانتا شینەکەم هەڵگرت و هاتمە سەر ئەو جادەیەی بەرەو ناوپردان و چۆمان درێژ دەبێتەوە، جار جارەش ترومبێلێک ڕەت دەبوو و ئاوڕی لەم هەموو قوتابیە سەرگەردان و پیادەڕۆیە نەدەدایەوە، چونکە پڕ بوون لەنەفەر، ماوەیێکی باش بەپێ ڕۆیشتم، هەستم کرد وا ترومبێلێک دوور بەدووری بەلایتە کزەکانی دێ ڕەت بێت، چوومە ڕۆخی جادەکە و خۆم ئامادەکرد و هەر کەگەیشتە نزیکم دەستم بۆ بەرز کردەوە تا ڕاگرێ و سەرکەوم کەچی جێبە قوتە ڕەت بوو سەد مەترێکیش لێم دوور کەوتەوە، کەچی لەناکاو ڕایگرت و شوفێرەکە دابەزی!

بانگی کردم و گوتی:

– زاهیر.. زاهیر ئەوە چ دەکەی لێرە، زووبە وەرە.

بەراکردن خۆم گەیاندێ، کەدەبینم برادەری تەیراوەم (شێروانی کوڕی مام عەبدوڵڵا گەمشۆیە)، یەکترمان ماچ کرد و حاڵ و ئەحواڵی خۆم تێگەیاند و گوتم:

– دەچمە قەسرێ..ماڵمان لەوێیە.

گوتی:

– وەڵڵاهی زاهیر وا بەچاوی خۆت دەبینی نەفەر و شمەکم زۆر پێیە و جێم نییە، بەس نابی بەجێت بێڵم.

دەرکەی پشتەوەی لای خوارێی کردەوە و هەردوو لای بەزنجیرەکە ڕاگرت و گوتی:

– ئەگەر دەتانی لەسەر دەرکەی ڕاوەستی و خۆت بگری و بەرنەبیەوە؟ سەرکەوە.

زۆر مـەمنونی بـووم و باوڵەکـەم لەبـەر پـێم دانـا و خـۆم چەسـپ کـرد و بەهەردوو دەستم سەقفی جێبم گرت و گۆتم:

– برۆ باژۆ.. هەر هەتا جسری رەژدووری لەگەڵت دێم لەوێ راگـرە بـەپێیان دەڕۆم، قەسریَ نزیکە.

کاکە شێروان وەك فریشتە لێم پەیدا بوو و هەتا پردی رەژدوور رانەوەسـتا، لـەوێ رایگـرت و دابـەزیم و سوپاسـم کـرد و بـەپێیان خـۆم گەیانـدە قەسـرێ، کەگەیشتمە ماڵێ.. . بـاوکم لـەدەرەوە بـوو تەڵەیـەکی گـەورەی بەدەسـتەوە بوو.

گوتم:

– بابە گیان ئەوە چ دەکەی؟

گوتی:

– کاکە مشك هەراسانیان کردینە!! وا لەهێوارێوە بیست مشکم زیـاتر بـەو تەڵەیەی گرتیە، کەچی هەروا جرت و فرتیانە، ئەو شەوی هەتا سـبەینێ لەبـەر راوە مشك کەسمان خەو نەچووە چاوی.

# زدی جەو

چەند ڕۆژێك لەو دوكانەی قەسریێ ماینەوە، باری دەروونی هەموومان خراپ بوو، جگە لەهەراسان بوونمان بەمشكەكان بۆ دەستەبەركردنی ئاوی خواردنەوەش زۆر پەرێشان بووین، جگە لەوەش مامم ئەنوەریش بەخۆی و بەكوڕ و كچەكانی هاتنە لامان و ئەو چەند ڕۆژەی ئەوێ سەرمان پێكەوەنا.

سبەینەییێك دەوروبەری سەعات (١٠) بەیانی لەگەڵ دەنگە دەنگی خەڵكانێك بەئاگا هاتین، سەیرمان كرد پێشمەرگەنە و كەسێكی كابۆ لەبەری بەشێوە ئەجنەبی كامێرا لەشانیان لەگەڵدایە و لەلای زدی جەوەكە خڕ بووبوونەوە، ئێمەش وا سەیرییان دەكەین.

دیاربوو كامێرا لەشانەكە ڕۆژنامەنووس بوو هێنابوویان تا وێنەی زدی جەوەكە بگرێ و چاوپێكەوتن لەگەڵ پێشمەرگەكاندا بكات، ئەو لەسەر ڕۆخی ڕەبیەكە و لەسەر گونیە خۆڵەكان ڕاوەستا بوو و خەریكی وێنەگرتن بوو، لەناكاو دەنگی فڕۆكە بەئاگای هێناین و گەیشتە ئاسمانی سەرئاوایی، ئیدی بووە مشەوەشی و پێشمەرگەكان چوونە سەر زدی جەوەكە و ڕۆژنامەنووسەكەش هەر بەردەوام بوو لەوێنەگرتن، كەسەیرمان كرد دوو فڕۆكە بەدوای یەكدا لەئاسمانێ دەسوڕانەوە.. دزی جەو كەوتە تەقەكردن و لەبەر دەنگ و لەرینەوەی فەردە خۆڵەكان كابرای ڕۆژنامەنووس بەلای پشتەوە كەوتە تەقلە كەچی كامێراكەی لەچاوی نەكردەوە و هەستایەوە و كەوتەوە وێنەگرتنی فڕۆكەكان و زدی جەوەكە و فڕۆكەكانیش بۆمبیان بۆ شوێنێكی لەلای ئێمە دوورتر بەردەدایەوە، ڕۆژنامەنووسەكەش چۆوە سەر گونیە خۆڵەكان و لەوێنەگرتن كۆڵی نەدا!

## بەرەو سنور

لەقەسرێ مشك و فڕۆكە بەتەواوی هەراسانیان كردین، ڕۆژ بەڕۆژیش شەڕەكە سەختتر و تۆپباران چڕتر دەبوو، دەروازەی سنوری نێوان ئێران و عێراق لەحاجی ئۆمەران كرایەوە و كەم كەم لێدەگەڕان ژن و منداڵ و خێزان ئاودیو بن و لەئۆردوگاكان نیشتەجێ بن.

سبەینێیەك دایكم چوو كەڵەشێرێكی كڕی و هێنایەوە بۆ ژەمی نیوەڕۆ كەباوكیشم لەگەڵاڵەڕا دەهاتەوە تا بەیەكەوە لەسەر یەكخوان كۆببینەوە، هێشتا دایكم كەڵەشێرەكەی نەخستبووە سەر ئاگر، باوكم هاتەوە، مشەوەش بوو گوتی:

– خۆتان خڕكەنەوە دەبی بڕۆین.

دایكم گوتی:

* بڕۆینە كێندەر؟

باوكم وەڵامی دایەوە:

– ئەنگۆ ئاگاتان لەهیچ نییە.. خەرك هەموو ئاودیو بوو، ئەوەی ماڵ و منداڵی لەگەڵە دەیانباتە ئێرانێ و بەخۆی دەبێ بگەڕێتەوە، ئەمنیش وەكی خەركی ئەنگۆ دەبەمە ئەودیوی و بەخۆشم دەگەڕێمەوە، ئەوە ئەمری شۆڕشە.

ئیدی هەموومان كەوتینە خۆ و بڕوبوزگوڕمان خڕكردەوە لەسندوق و سەر چەنچەی پیرە مارسیدسی جێمان كردنەوە.. هەینێ دایكم گوتی:

– ئەدی ئەو كەرەبابەی چلێ بكەین؟

* ئەگەر نەتكوراندیە، لەگەر خۆمان دەیبەین، شەرت نییە ئەوڕۆ دەمودەست لێبگەڕێن ئاودیو بین، لەسەر حدودی دەیخۆین.

هەموومان سواری قەمەرەی بووین بازۆ بۆ حاجی ئۆمەران.. كەگەیشتین سەیر دەكەین حەشامات هەستایە و دەڵێی ڕۆژی حەشرێیە!! بەسەدان خێزان لەسەر سنوور بەدیوی لای خۆمان لەو ناوە پەرت بووینە و بار و بارگەیان

خستیيە، ئێمەش لەلایەکی ڕێگاکە لاماندا و شمەکی پێویستمان لەعاردی وەرکرد، دیسان دایکم گوتی:

– چ لەو کەرەبابەی بکەین؟

باوکم گوتی:

– وا وردە وردە برسیمان دەبی.. لۆ نانی هێواریێ بەپراو ساوارەکی تەڕ حەمی دەکەین.

هەینێ دایکم بەخۆکەوت و دەست و برد کەوتە شیو لێنانێ، هێشتا بەتەواوی تاریك دانەهاتبوو سفرە راخرا و شیو لەقاپان کرا، پلاوساوار و شلەی پەتاتە و گۆشتی کەڵەشێرێکمان بەپیاز و نانی تیری خوارد کەبەحەیاتم نەپێشتر و نەپاشتر و ئێستاشی لەگەڵدا بێت پلاو ساواری ئەوها بەلەزەتم تام نەکردییە.

شەوێ لەو ساکەگۆڕەی جێڕاخرا و کەوتینە خەوێ، سبەینێ لەگەڵ گزنگی بەدەنگە دەنگی جەندرمەی ئێرانی وەئاگا هاتین کەلەسەر خەڵکەکە دەسوڕانەوە، یەکێکیان کورد بوو لەدایکمی پرسی:

– خوشکێ چدەکەن لێرە، بۆ لێرە خەوتوون.

دایکم گوتی:

* وەڵڵا لەترسی تەیارەی هەراتینە.

جەندرمەکە گوتی:

– لەترسی تەیارەی هەلاتووی؟ بۆیە ئەو پەتووە سۆرەت بەخۆ داداوە، خۆ ئەلعان تەیارە بێ و ئەو هەموو کەس و سورەی ببینی هەر خەلاس و دەکات.

دەوروبەری سەعات (٩)ی بەیانی سنور کرایەوە و خەڵکەکە هورژمی برد، نەناو نوسین و نەپرسیار و وەڵام یەك یەك ترومبێل ئاودیو دەکران و لەلۆفەکانی ئەودیوی شۆڕ دەبوونەوە بۆ خانێ.. نۆرەی ئێمەش هات و ئاودیو بووین و شۆڕ بووینەوە، باوکم لەخانی (پیرانشەهر) راینەگرتوو بەرەو شنۆیێ لێی خوڕی.. لەرێگاش گوتی:

– دەچینە شنۆیێ.. هەندەك لەحدودی دوورترە.. برادەرەکانیشم هەر وایان کردییە.. خانە سەر حدودە و جێی مەترسییە.

لەشنۆیێ لایدا و هەر لەلای پێشەوەی دەروازەی ئاوایی و لەناو کاولە ئاشێکدا ژوورێك و هەیوانێکی بەکرێ گرت و بڕوبوزگوڕمان بردە ژوورێ، بووینە شنۆیی. بۆ ئێوارە و پاش نوێژی مەغریب، دوو پیاوی شنۆیی کەیەکێکیان ناوی مام برایم بوو دوکانەکەی بەرامبەرماڵەکەمان لەوبەری جادەی بوو، ئەوی دی خاڵ رەسول ماڵی لەسەری کۆڵانێی ئاشەکە بوو، بۆ بەخێرهێنانمان هاتن و باوکم پێشوازی لێکردن و دانیشتن، ئێمەش هەر بەدایکمان دەگوت:

– دایە برسیمانە، چ بخۆین؟

دایکم چای لێنا و بەدیشلەمە لەپێش مێوانانی دانا.. بۆ ئێمەش لەلای خوارەوە سفرەی راخست و نانی تەڕکرد و وەرگەڕاینە سەر نان و ماستی.. هەتا تێر بووین، سفرە هەڵگیرا، هەینێ لەدەرگا درا چووین دەرگامان کردەوە کوڕێك و کچێکی مام برایمی بوون هەریەکەو سێنیەکی گەورەی پڕ لەقاپی برنج و گۆشت و خورمە سەبزییان هێنا ژوورێ، ئینجا مام برایم فەرمووی لێکردین بۆ نانخواردن.

باوکم خۆی بۆ نەگیرا و گوتی:

– مام برایم، مادام ئەو بەزمەت لەبن سەری بوو لۆ نەتگۆت خۆتان بەنان و ماستی تێر مەکەن ئەمە شیومان لۆ کردینە؟

مام برایم گوتی:

– وەڵڵا حاجیاغا شەرمەندەم، منداڵەکان و هێندە برسی بوون دڵم وەبەر نەهات بڵێم چ مەخۆن ئەلعان خواردن و بۆ دێنن.

باوکم گوتی:

– وەڵڵا لەشنۆیێ بوومە ئاغاش.

هەموو پێکەنین و کەوتینە سەر ئەو برنج و کشمیش و گۆشتە بەلەزەتەی، هەتا رەباز بووین.

## سفر كەين؟!

بيرم چوو، هەر كەلەقەسرێ بووين.. رۆژێك ئەميرى ئامۆزام گوتى:

– زاهير.. لۆ نايێى بچينە كن ئەو حەلاقەى، سەرى خۆمان سفر كەين؟

گوتم:

* لۆ.. لۆ سفرى بكەين؟

گوتى:

– كوڕە ئەدى چييە.. پرچمان زۆر بووە و لێرەش مەجالى خۆشوشتنمان نييە با رشك و ئەسپێ نەكەويتە سەرمان.

يەكسەر قسەكەى ئەميرم چووە ئەقڵێ، لێماندا چووينە سەرتاشخانەكەى ناو بازاڕى قەسرێ، لەوێش ئەمير گوتى:

– ئەوەلجار ئەتو دانيشە، دوايێ ئەمن.

يەكسەر دانيشتم و سەرم سفر كرا، هەر كەتەواو بووين و ئەمير ئەوها منى بەسەرى سفرەوە ديت و زانى چەند ناشيرين بوومە، ئەو پەشيمان بۆوە و هەر بەغاردان ناو سەرتاشخانەى بەجێهێشت و خۆى رزگاركرد!

جا بەو سەرە سفرە و بەو درێويەوە من گەيشتمە شنۆيێ!!!

## وەرزی عیشق

لەشنۆیێ و لەناو ئەو کاولە ئاشەی، ئێمە و ماڵی مامم ئەنوەر بەخۆیی و سێ کوڕ و دوو کچ دەژیاین.. مامم جار جارە دەچۆوە ئەو دیو و خەریکی نانەوایی بوو لەگەڵ عەلی مەحمودی برادەر و هاوبەشی، هەروەك چۆن باوکیشم دەڕۆیشت و پێنج شەممە و هەینی هەموو هەفتەیەك دەگەڕایەوە لامان.

لەهەورازی ئاشەکە دەرگاییێکی گەورەی هەمیشە کراوە هەبوو ڕێگاکەی دەچۆوە ناو باغ و بێستانێکی پڕ لەدار سێو و هەلۆژە و هەنار و خۆخ و هەرمێ، بەیانیان لەو ڕێگایەوە کیژێکی شنۆیی باڵابەرزی ناسك و تەبەش خڕ و جوان هاموشۆی دەکردین و هۆگرمان بوو بوو و لەگەڵ زارای ئامۆزام بوو بوونە دەستەخوشك، نێوی (پەری)(*) بوو.. ئەو پەرییە کە دەگەیشتە لامان حاڵ و وەزعیەتمان تەواو دەگۆڕا، کیژێکی بەهەڵمەت و جۆش و خرۆش بوو نەیدەزانی راوەستان چییە و هەمیشە لەجوڵەدا بوو.. بەقسەی ئەمیری ئامۆزام گوایە لەلای ئەو باسی منی کردووە و گوتویەتی بەم سەرە سفر و کەچەڵەوە زۆر ناشیرین و دزێوە، کەچی هەر کەدەگەیشتە هەوارێی مە دەکەوتە تیر و توانج هاویشتن و تەشقەڵەی پێ دەکردم و چاوی لێدادەگرتم و هەر بخێوابوایێ دەستی توند توند دەگرتم بۆ لای خۆی رادەکێشام.

پێش نیوەڕۆیەك دایکم چوو بووە ناو بازاڕ بۆ کڕینی پێداویستنی نانی نیوەڕۆ، ئەوانی دی هەموو بەخەبەر بوون و منیش لەسەر جێگاکەم خەوتبووم، دیارە پەری دەگاتە کنەمە و لەمن دەپرسێ.. پێی دەڵێن خەوتووە ئەویش چارشێو فرێ دەدا و دەچێ پەقرەجێك پڕ ئاو دەکات و دەیهێنێتە ژوورەوە.. من لەشیرینی خەودا بووم و هەر ئەوەندەم زانی بەگوڕ و لەناکاو لەگەڵ شڵپەی ئاوێکی بەتین بەئاگا هاتم چاوم کردەوە و سەرم بەرز کردەوە بینیم وا پەری

بەخۆ و بەپەقرەجەوە لەسەر سەرم وەستاوە.. لێی قیت بوومەوە و بۆی چووم دەرپەڕییە دەرەوە ئاواش رای نەدەکرد کەنەیگەمێ.. لەناوەڕاستی حەوشە گرتم و لەباوەشێم کرد و ئەویش خۆی شل کرد.. سەرەتا رووبەڕوو باسکم لەکەمەری گیر کرد و کەوتینە ماچ گۆڕینەوە تا شل بوو.. ئەمجارە خۆی وەرگێڕا و هاتەوە باوەشم و منیش هەردوو دەستم لەشەمامە توند و خڕ و خۆڵەی گیرکرد و جارێکی دی بەخۆمەوە نوساند، لەم کاتەدا دایکم هاتەوە و ئەو دیمەنە سەیر و سەمەرەی دیت و عەبای فڕێ دا و شمەکەکانی لەدەست کەوتە خوارەوە و هاواری کرد:

– ئەیەڕۆ زاهیر ئەوە چ دەکەی؟

ئێمە لەیەك بووینەوە و ئەو چارشێوی لەخۆی وەرپێچا و رای کردەوە ناو باخەکەیان، منیش ئارەقەی شەرمم لێ دەچۆڕا.. دایکم زۆر سەرزەنشتی کردم گوایە ئێمە ئاوارەین ئەوە کیژە ئاغایە و باوکی دەوڵەمەندە و نابێ ئەو بەزمەی بکەم نەك هەڵەیە بەڵکو کفریشە، لەپاش هەینێ گەر بمانویستبا یەکتر ببینین من دەچوومە ناو باخەکەیان و لەلاچەپێك دەگەیشتینە یەکتر و وەك لاولاو لەیەك دەئاڵاین.

کوڕێکی گەنجی شنۆیی کاروباری ئاشەکەی هەڵدەسووڕاند ناوی (سدیق) بوو، ببووە هاوڕێم و زۆربەی کاتەکان بەیەکەوە بووین.. زۆر حەزی دەکرد فێرە نووسین و خوێندنەوەی زمانی کوردی ببێ، هەمووجار دەیگوت:

– وەرە دڵت نەتەقی، من کوردم و بەحەوت پشتان خەڵکی ئەم شنۆیەین کەچی نازانم بەکوردی بخوێنم و بنووسم.

رۆژێك رێکەوتین من ئەو فێرە خوێندنەوە و نووسینی کوردی بکەم و ئەویش من فێرە خوێندنەوە و نووسینی فارسی بکات، قەدەر عەیامەك خەریکی یەك بووین کەچی بەداخەوە نەئەو فێرە زمانی دایکی خۆی بوو

بەنووسین و خوێندنەوە نەمنیش فێری زمانی فارسی بووم بەقسەکردن و نووسین و خوێندنەوە.

لەبەرامبەر ماڵمان لەوبەری ڕێگاکە ریزە دوکانێك هەبوو، یەکێکیان شیرینی فرۆشێك بوو.. بۆ یەکەمینجار لەم دوکانە بەتامی (قەنادی) ئاشنا بووم، ئای خوایە ئەو قەنادییە تەڕ و شیرینە بەنۆشابا رەنگ نارنجییەکە چەندە بەتام و لەزەت بوو، لەهەینێوە عەودالی قەنادیم بەڵام هەر نەگەیشتمەوە ئەو قەنادییەی جاری ئەوەل خواردم.

لەهەورازی ئاشەکەش ریزە دوکانێك هەبوو، ئەوەی تەك ماڵمان قەسابێك بوو گۆشتی دەفرۆشت، لەوێ بەعادەتی (جگەر)ی ئاژەڵیان نەدەحوباند و زۆر کەم دەیانخوارد، کابرای قەساب هەموو بەیانیان نیو تەشت جگەر و فاتەڕەشەی دەداینێ و دەیگوت:

– ئەمە بۆ ئێوە باشە ئێراقینە.. بخۆن رەبی لەقەلب و گەڕێ.

هەر کەدایکم دەچووە بازاڕ هەر شتێکمان نەقوستان بوایە دەیکڕی و وردە وردە ناو ماڵمان لەکەم و کوڕی دەڕەخسا.

بەیانیەکیان هاتەوە، دۆشەگێکی ئیسفەنجی زۆر ئەستوری کڕی بوو پێیان دەگوت (زەختلعالی) زۆر دڵمان پێی خۆش بوو بەڵام دایکم لەسەر نوینانی دانا و کەسمان بۆمان نەبوو لەسەری بخەوین.

پاش چەند رۆژێك، وەختی عەسرێ حەمە کەریم هەورامی پەیدا بوو.. بەتەنیا بوو هێشتا ماڵ و منداڵی نەهاتبوون، زۆر بەهاتنەکەی دڵخۆش بووین، دایکم بۆ ئێوارە خواردنێکی شاهانەی بۆ دروست کرد، شەویش بۆ یەکەمین جار دۆشەگە گەورەکەی هێنا خوارەوە و بۆ ئەوی راخست.. حەمە کەریم گوتی:

– ئای باوکە ! ! براژن من لەسەر ئەم دۆشەگە بەرز و نەرم و نیانە بخەوم؟

دایکم گوتی:

– لۆ کاکە لەتو عەزیزترمان هەیە؟ ئەرێ وەڵڵا ئەو دۆشەگە هەر لۆ عەزیز و برا گەوران رادەخسترێ. ئاخر دایکم و باوکم ئەویان زۆر لەلا گەورە و عەزیز بوو. بۆ رۆژی دوایی منیش لەگەڵی چووینە تەرمینالٚ وادیارە برادەرانی خۆی لەوێ چاوەڕێیان دەکردو لەناویاندا هەر برای شاعیر موحسین ئاوارە و شەهید محەمەد سەر سپی و شێخ عەزیزی هەرەجەییم لەیادە، لەشنۆیی را چووینە مەهاباد. لەمەهاباد سەردانی کتێبخانەی (ئەیوبیانیان) کرد و لەگەڵ سەیدی ئەیوبیان کەوتنە دەمەتەقێ و گفتوگۆ و پاشترین جگە لەمن هەموویان لەدەفتەرێك کەئاغای سەیدی ئەیوبیان بۆی دانان بیرەوەری و ئەم سەردانەیان تۆمار کرد.

*کیژە شنۆییەکە ناوێکیدی هەبوو، پەری نەبوو

## ئەشکەوتی گەلاڵە

سەرە مانگێك، ڕۆژی هەینی بوو لەگەڵ باوکم گەڕامەوە کوردستان.. ئەوم لەسەر پردی گەلاڵە بەجێ هێشت و خۆشم بەجێیێکی نەفەرات چوومە گەلاڵە.

هەینێ ئاوارەکان لەئەشکەوتێك دەژیان کەپڕ بوو لەخێزان و ماڵ و مناڵ.. ماڵی پلکم ناجیە و مام برایم و منداڵەکانی و خزمانی دی لەو ئەشکەوتە دەژیان و لەترسی بۆردومانی فڕۆکە لەوێ خۆیان حەشاردا بوو، چوومە لای ئەوان، هەر کەگەیشتم و دەنگی فڕۆکەی سیخۆی پەیدا بوو.. نەخێر لەخوارەوە و لەسەر پردی گەلاڵە کەوتە (ناپاڵم) وەشاندن.. دواتریش هەوراز بۆوە و گەلاڵەشی بۆردومان کرد، کەبەداخەوە لەنزیك ئەشکەوتەکەی ئێمە تیابووین ساچمەیەك بەر برادەرێکی باوکم کەوت و دەلعاز شەهیدی کرد کەناوی (عەبدوڵلا کەشخە) بوو، دوای بۆردومانەکە هەر کەچووینە شوێنی کارەساتەکە شەهید عەبدوڵلا لەبن دیوارێك گیانی سپارد بوو وادیارە ساچمەکە بەر سکی کەوتبوو و بەر لەشەهید بوون بەدەستەکانی برینەکەی گرتبوو پاشتر بەر لەتەواو بوونی دەستی بەدیوارەکە داهێنابوو و شوێنەواری چوار پەنجەی دەستی بەخوێن بەدیوارەکەوە چەسپاند بوو.

لەخوارەوەش لەسەر پردی گەلاڵە، کارەسات روویدا بوو.. دەیان شەهید و بریندار بەهۆی ناپاڵمەوە لەم ناوەوە کەوتبوون.

باوکیشم بەچەند چرکەیەك بەر لەبۆردومانەکە لەگەڵ جێبێك سەردەکەوێت و دێتە گەلاڵە خۆ ئەگەر لەوێ بمابوایە حەتمەن بەر بۆردومانەکە دەکەوت.. هەر کەگەیشتە لای ئێمەش لەئەشکەوتەکە زۆر خەمبار و بەپەرۆش بوو بەشەهید بوونی (عەبدوڵلا کەشخە)ی برادەری و دەیگوت: کاکە ئەوەندە کەشخە بوو، هەر زێنەت بوو تەماشای بکەی.

بۆ شەوەکەی هەر خێزانەو لەوەندە شوێنەی کەبۆی داندراوە گیرسانەوە و

من و باوکیشم لەگەڵ ماڵی پورە ناجیە بووین.. ئەشکەوتەکە یەکجار گەورە و فراوان بوو.. ماڵی پوورم و خزمەکان لەبنەبانی ئەشکەوتێ گیرسابوونەوە، ئێوارە شلەساوار تێکرا و خەریکی خواردن بووین، گوتیان میوان هاتن، میوان کێن؟

سەیر دەکەین کاك کەریمی برا بچوکی کاکە حەسەن گەردییە (حەسەنی بەسێ)، هیلاك و ماندوو و بەبەرگی خاکی پێشمەرگە و قوتە بڕنۆ و فیشەك دانەوە و بزنێکی پەتك کرای بەدوای خۆیدا کێش دەکرد و هەرکشا لای ئێمە، ئیتر بەیەك شاد و شوکر بووینەوە و ئەو گوتی:

– لەدەشتی هەولێرێ بووین زۆر خراپمان لێقەوما، جاش و جەیش هجومیان لۆ کردین، چ لەگۆڕێ نەبوو هەموو بڕیاری شەڕماندا بوو، وەختەکی بووە هەرێ هات!! کەس نەبووە برای کەس.. هەر بابا بوو خۆی قورتار کرد.

هەر کەلێمان پرسی:

– ئەدی کاکە حەسەن گەردی.. کا لۆ ئەو نەهات.

گوتی:

– لێك دابڕاین، ئەو لەگەڵ کاك فارس باوە و برادەران بوو نازانم چیان لێ بەسەرهات.. کاکە شکانەکە وەها نەبوو لەچ جێیان خۆمان نەگرتەوە.. هاتینە هیرانێ هەر هەرێ هات بوو، لەوێ ئەو بزنە سەرگەردان و بەتەنێ مابۆوە وا لەگەڵ خۆم هێنایە.

هەینێ، شلە ساوار لە مەنجەرێ کرایەوە و بزنی بەستەزمانیان لەعەردی دا و سەریان بڕی و کەولیان کرد و گۆشتەکەی بەسەر خێزانەکانی ناو ئەشکەوتێ دابەش کرا، پلکم و ژنەکانی دی هێندەی بلێی یەك و دوو گۆشتیان بەئاوی خۆی بەسەرنا و درەنگی شەوێ کەوتینە سەر خواردنی گۆشتی بزنێ بەچەلاوی خۆی.. ئەو شەوەمان ناو لێنا شەوی بزنێ.

## عیشقێکی ناکام و زیرەك و چایخانە

هەر لەشنۆیێ لەگەڵ ئەحمەدی خاڵ برایمی جیرانمان بووینە برادەر، ئەویش قوتابی بوو.. بەڵام زۆر کز و بێ خولق و کەم دوو بوو بەردەوام داڵغەی لێدەدا و بەلاشە لەلای من بوو بەخەیاڵ لەشوێنێکی دی، ئەوەندەی دەشمپرسی چ خێرتە هیچی بۆ نەدەدرکاندم.

هەر بەیەکەوەش دەچووینە چایخانەیەك لەشنۆیێ کابرای چایەچی بەشەکری قەند و چایەی تاڵ دایدەگرتین، ئێمەش دە دەنکە کلۆی قەندمان بەیەك پیاڵە چا خەلاس دەکرد و سەیری تەلەفزیۆنمان دەکرد، هەر لەوێ بۆ یەکەمینجار گۆرانییێکی هونەرمەندی گەورە (حەسەن زیرەك)م بینی کەبەوێنە و دەنگ پێشان دەدرا و زیرەك بەسەر و شەدە و بەرگی کوردی و عەینەکێکی رەش لەچاو، یەڵڵا شوفێری دەخوێند. هاموشۆی ماڵی خاڵ برایمان دەکرد و نێوانمان زۆر خۆشبوو، رۆژێکی هەینی تازە باوکم هاتبۆوە بۆ ئێوارەکەی لەماڵی خاڵ برایمی داوەت بووین.

دونیا هەر سادە و بەفر و باران بوو.. جگە لەدۆکولێو خوانیان بەچەندین جۆر برنج و گۆشت و خورمەسەبزی رازاندبووەوە، باپیرم خدر سمێر سۆریش لەهەولێرەوە هاتبوو ئەویشمان لەگەڵ بوو.. پاش نانخواردن و هەڵقوڕاندنی دیشلەمە، من و ئەحمەد چووینە ژوورەکەی خۆی.. رادیۆی داگیرساند و خستیە سەر ئێستگەی کوردی لەتاران، ئیدی گۆرانی بوو پاشتر بێژەرەکە کەوتە قسان و ئەحمەدیش هەموو گیانی کردبووە گوێ و هەستی لەقسەکانی بێژەر راگرتبوو، وا دیار بوو بەرنامەیەك بوو وەڵامی نامەی خەڵکی دەدایەوە، وەختێك ناوی (ئەحمەد)ێکی هێنا و دەنگەکەم وا بیست:

– ئاغای ئەحمەد لەشاری شنۆیێ.. ئەو کارەی تۆ ساز نابێت و وازبهێنی بۆ

خۆت و بۆ دولبەرەکەشت باشترە.

کەئەحمەد گوێ بیستی ئەوەندە قسەیە بوو ئاخێکی لەناخەوە هەڵکێشا و رادیۆکەی خامۆش کرد و کەوتە خەیاڵان.. منیش بەعادەتی هیچم لێ نەپرسی چونکە دەمزانی هیچم بۆ نادرکێنێ، درەنگانی شەو ئێمە چووینەوە کاولە ئاشێ و لێی خەوتین، بۆ بەیانی لەگەڵ دەنگە دەنگ و شین و واوەیلای کۆڵانی بەئاگاهاتین، چییە؟ چی بووە؟ چ قەومایە؟

گوتیان:

– ئەحمەدی خاڵ برایمی ئەمشەو مەرگەمووشی خواردووە و خۆی کوشتووە!!

تومەز هەر شەوەکەی پاش ئەوەی ئێمە بەجێمان هێشتن.. ئەحمەد شووشەیێك ژەهر هەڵدەگرێ و دەچێتە بەرزاییەکانی نەلیوان کەهێشتا بەبەفر داپۆشرا بوو، لەوێ ژەهرەکە دەخوات و لەناو بەفرەکە دەگەوزێ تا رۆحی دەردەچێ.

ئێمە زۆر دڵگران و خەمبار بووین، لەپرسەکەی وەك کەسی نزیکی جوانەمەرگ بەشدار بووین.. هەتا چلەشی چوو چەشنی ماڵە باوکی بەرگی رەشمان پۆشی، هەفتەی دوای جوانەمەرگ بوونەکەی ئەحمەدی عاشق، بابە خدرم عارفی برامی برد و چۆوە هەولێرێ، ئێمەش دوای چلەکەی باروبارگەمان تێك نا و چیتر چاومان بەرایی نەدا لەوێ بمێنینەوە، خۆمان ناونووس کرد و چووینە (ئۆردوگای نەلیوان) کەخێمەی شێرۆ خورشیدییان بۆ هەڵدابووین.

## ماملیٚ.. لەحەمامی شنۆییٚ

ئەو ماوەیەی لەشنۆییٚ ماینەوە بۆ خۆشووشتن دەچووینە حەمامی بازاڕی، خاوەنەکەی کاك حەسەنی ماملێی برای هونەرمەندی گەورە محەمەدی ماملیٚ بوو، ئەویش دەنگی خۆش بوو گۆرانی دەخوێند.

حەسەنی ماملیٚ لەگەڵ باوکم دۆستایەتیان زۆر خۆش بوو، کە دەچووین لەپێش خۆشووشتنیٚ باوکم لەلای دادەنیشت و باسی عەرش و قوڕشیان دەکرد، کاك حەسەن زۆر رقی لەحەمەرەزا شا دەبۆوە و قسەی خراپی دەرهەق دەکرد و دەیگوت:

– حاجی عەولاّ ئەوە لەکنەتو دەوێرم بیدرکێنم، شا جێی بەقایێ نییە و قەت دۆستی کورد نییە، خۆ ئەگەر کوردی خۆش دەویٚ ئەدی ئەمەش کورد نینە.. بۆ لەگەڵ ئێمە خراپ و دڕندەیە و لەگەڵ کوردی ئێراقیش باش و فریشتەیە.

هەینیٚ لەشنۆییٚ ئەو حەمامە ژوور ژووری بەتەنیٚ بوو بەدوو دیودا لایەکی هی پیاوان بوو و لایەکەی دی هی ژنان.

لەبیرمە، کەکارەساتی نسکۆمان بەسەردا هات ئێمە ماڵمان لەئۆردوگای (زێوە) بوو، لەگەڕانەوەمان بۆ ئەو دیو کەگەیشتینە شنۆییٚ، باوکم لای دا حەمامیٚ و سەرێکی کاك حەسەنی ماملێی دا.. دیسان باوکمی بردە لایەك و بەچرپە پێی گوت:

– حاجی عەولاّ چم پێگۆتی؟ نەمگوت ئەو شایە سەگبابە جێی بەقایێ نییە.. ئەوە قسەکەم هاتە دی.. هەنوکەش هەتا زووە بڕۆنەوە و لێرە خۆ ماتەڵ مەکەن، با زەبرەکی دیو لێنەدا!

# نەڵیوان

لەئۆردوگای نەڵیوان و لەبن خێمەکانی شێرۆ خورشید حاڵمان زۆر شڕ بوو، لەلایەك ئێمە ژمارەمان زۆر بوو چونکە مامم و منداڵەکانیشی لەگەڵ ئێمە بوون و هەر یەك خێمەشیان دابوینێ و جێگەمان بۆ حەوانەوە زۆر سەخڵەت بوو.

دایکم زۆر پێمانەوە ماندوو دەبوو، لەجلك شووشتن و شیو لێنان و ئیشی ناو ماڵێ، جار جارە من یارمەتیم دەدا و لێنەدەگەڕام چێشت لێبنێ، هەر بەخۆم یان هێلکە و رۆنم حازر دەکرد بۆ هەموان یان پەتاتەم دەکوڵاند و دەمپلیشاندەوە و پیازم لەناو رۆنی دەقرچاندەوە و پەتاتەکەم بەسەردا دەکرد و جوان جوان سۆرم دەکردەوە و بەنانی تیری دەمانخوارد.

مانگی دووەممان بوو لەئۆردوگای نەلیوان، رۆژێك دایکم لەکاتی کۆرکردن و جلك شوشتنی هەموومان ماندوو و هیلاك دەبێت و لەپڕ دەکەوێتە سەر ئەرز و لەهۆش خۆی دەچێت، ژنەکانی لەگەڵی بوون دەیبەنە نەخۆشخانەکەی ئۆردوگا لەوێ زانیان لەئەنجامی هیلاکی منالّی لەبارچووە و نەزیفی خوێن بووە، جا لەکاتی گواستنەوەی بۆ نەخۆشخانە ژنێکی جیرانی قەدیمی تەیراوەمان دایکم بەو حاڵەوە دەبینێ پاشتر کەدەچێتەوە هەولێر هەواڵ بە (دایك و باوکی) دایە دەدات و دەڵێت:

– ئەمن بەچاوی خۆم بەمردیەتی قەدریەم دیت دەیانبردە خەستەخانەی.

دەنگ و دۆر لەهەولێر و لەتەیراوە لەناو خزمان وا بڵاو دەبێتەوە کە (قەدریە) بەسەر منداڵەوە چووە و هەر لەوێش لەگۆرستانی غەریبان ناشتیتیان.

دایکم چەند رۆژێك لەنەخۆشخانەی ئۆردوگا خەوێنرا، باوك و مامیشم لەودیو لەگەڵاڵە و چۆمان بوون و ئێمەش سەلکە و بنکە بێ سەرپەرشت مابووینەوە..

. گەورەکەیان من بووم، منیش لە (پەتاتە) سۆرکردنەوە بترازێ هیچی دیم نەدەزانی، جا کەخۆم خەریك دەکرد و پەتاتەم دەخستە سەر ئاگری، ئەمیری ئامۆزام قوشقی دەبوو و دەیگوت:

– زاهیر.. بەپەتاتە و روونی چەور و نانی تیری مەعیدەی هەلا هەلا کردین!

ئەو رۆژەی دایکم لەنەخۆشخانە دەرچوو و هاتەوە لامان کردمانە جەژن.. یێکەك دەستی ماچ دەکرد، ئەوی دی روومەتی رادەموسی و گچکۆکەکان چووبوونە ئامێزی.. منیش کەویبوومە سەر پێی و پێیەکانیم بۆن دەکرد و ماچم دەکرد.. رۆژ بەرۆژ باری تەندروستی دایەی بەرەو چاکی دەرۆیشت و زەردی روخساری نەما و کولمەکانی وەك جاران سۆر بوونەوە و هەتا باوکم لەو دیو هاتەوە، بووەوە قەدە جوانەکەی جاران.

## بەرەو (كانی سپی)

تا دەهات ئۆردوگای نەلیوان قەرەباڵغ دەبوو، بڕیاردرا ژمارەیێك خێزان بۆ ئۆردوگایێکی تازە بگوازنەوە، ئێمەش خۆمان ناونووس کرد لەبەرئەوەی لەنەلیوان یەك خێمەیان پێدابووین و زۆر بەزەحمەت جێگامان دەبۆوە، هاوین بوو زیلی سەربازی هات و هەر خێزانێك و دووان بەبڕ و بوزگوڕەوە لەزیلێك بار دەکران و لێخوڕە بۆ ئۆردوگای تازە کەناویان لێنا (ئۆردوگانی کانی سپی).

ماڵی ئێمە و ماڵی کاك ئیبراهیم شێروانی کەئەویش هەر خەڵکی هەولێر بوو و جگە لەهاوسەر و منداڵەکانی دایك و باوك و خوشکەکانیشی لەگەڵدا بوون.

شمەکی هەردوو ماڵ لەزیلێك بارکران و نەفەرەکانیش هەر لەسەر کەل و پەلەکان جێگیرکران، من و کاك ئیبراهیم شێروانیش لەپێشەوە لەگەڵ شوفێرە سەربازەکە دانیشتین و زیل بەڕێ کەوت.

هەتا ڕێگاکە قیڕ بوو چ مەسەلەیەك نەبوو، زیلەکان بەکاروان یەك لەدوای یەك ڕێگایان دەبڕی، زۆری نەبرد ڕێگا بووە خۆڵەپۆك و چاڵ و چۆڵی، ئەم هەموو زیلە سەربازییە بەدوای یەکەوە تەپ و تۆزێکیان دروست کرد هەر لەخۆتەوە دڵت توند دەبوو.

لەڕێگا سەربازی شوفێر بەفارسی و بەتورکی و عەجەمی و ئێمەش بەکوردی و شڕە تورکییەك کەوتینە قسان.. ئەوەندەی تێیگەیشتم شوفێرەکە لەقەبی (تەبا تەبایی) بوو و خەڵکی ورمێ بوو، ئەو دەیگوت (ڕەزاییە) سەڵت بوو بەڵام دەزگیراندار و چاوەڕێی دەکرد تا ماوەی خزمەتی سەربازی تەواو بێت و ببێتە زاوا.

زۆر ڕۆیشتین و چەند گوندێکمان بەجێ هێشت و دوور بەدووری ئاپۆرەی خەڵك و خێمە سپییەکانی شێر و خورشید بەدەرکەوتن و گەیشتینە ناو ئۆردوگا.

هەر کەدابەزین، سەیر دەکەین ئەوانەی دواوە کەلەسەر شمەکەکان

دانیشتبوون حاڵیان زۆر ناجۆرە.. سەر و چاو و جلك و بەرگیان لەخۆڵ دا نقوم بووە. هەر لەگەڵ دابەزین ئەوان سەیری یەکتریان دەکرد و لەبەرامبەر یەکدی لەقاقای پێکەنینیان دەدا و بەیەکتر پێدەکەنین، دواتر زانیان هەر هەموویان وەك یەك خۆڵ سەر و سەکوتیان نەهێشتوون.

پاش ئەوەی کەلوپەلی ناو ماڵمان داگرت، ریزی پیاوان و ژنان بەسترا و یەك یەك ناومان دەنوسرا و هەر خێزانێك خێمەیێکی بۆ دەست نیشان دەکرا و پسولەیەکیان دەدرایێ.

ئەوەی ناوی دەنووسین سەربازێکی فارس بوو، ئێمەش رێچکەمان بەستبوو یەك یەك دەچووینە بەردەمی و ناو و تەمەنی لێدەپرسین، بەرێکەوت پیاوێك لەپێشەمن بوو ناوی (شەریف) بوو. کابرای فارس لێی پرسی:

– ئیسمی شەریفت؟

کابراش بەگورجی وەڵامی دایەوە:

* هەر شەریف.

بووە پێکەنین و مام شەریفیش لەهەمووان زیاتر تریقایەوە، ئێمە خۆمان بەدوو خێزان ناونووس کرد و دوو خێمەمان وەرگرت، کە پاشتر ماڵی مامم ئەنوەر گواسترانەوە (ئۆردوگای رەبات) لەلای سەردەشتێ، هەردوو خێمەکە بۆ خۆمان مایەوە و دایکم یەکێکی بۆ دانیشتن و خەوتن تەرخان کرد و ئەوی دیشکی وەك ناندین بەکاردەهێنا.

لەئۆردوگای کانی سپی گۆرەپانێکی یاری تۆپی پێ هەبوو، ئێمەی گەنجەکان ئێواران لەوێ خڕ دەبووینەوە و یاریمان دەکرد تا وایلێهات بەهاندانی مامۆستا قادرێك کەوەرزشوان بوو و خەڵکی سلێمانی بوو تیپێکی تۆپی پێمان دروست کرد و بەکۆمەکی هەموان جاك و بەرگی وەرزش و لاپچین و تۆپ کڕا و وەك تیپێکی دیار و ناسراو بەیانیان مەشقمان دەکرد و ئێوارانیش یاری دوو گۆڵی، من (گۆڵچی) بووم بەڵام گۆڵچییێکی زۆر باش.. ئەوانەی لەم تیپە لەگەڵمان بوون و ناوەکانیانم لەبیر ماوە (زاهیر کەریم.. مامۆستا

عەبدولسەلام، جەمیلێك دیانی شەقڵاوەی بوو، دڵداری مەلا ئەحمەدی و چەندانی دی کەبەداخەوە ناویانم لەیاد نەماوە.

لەئۆردوگای کانی سپی مەراقم کەوتە سەر رادیۆ، بەپارەیێك کەلەرۆژانەکەم کۆمکردبۆوە رادیۆییێکی دەستی دووم کڕی و عەسران دەمخستە سەر ئێستگەی کوردی کرماشان و گوێم لەبەرنامەی (گوڵزاری شیعر)ی مامۆستا شوکروڵڵای بابان رادەگرت، حەیرانی دەنگی بوو بووم و زۆرجارانیش لاسام دەکردەوە.

هەر لەم ئۆردوگایە بووین، رۆژێك بابە حاجی بەهەڵەداوان پەیدا بوو، باوکی دایکم.. بەدوای هەواڵی مردنی دایکمدا هاتبوو کەژنە تەیراوەییەکە لەئۆردوگای نەلیوان دایکمی دیتبوو وا بەبەتانی دەیگوازنەوە بۆ نەخۆشخانە و ئەویش چووبۆوە هەولێرێ و هەواڵەکەی بەمردوویی گەیاندبووە خزم و کەسان. ئیدی کەبابە حاجی هات و بینی کیژەکەی زیندووە و چ عەلەمی لێ نییە لەخۆشیان نەیدەزانی چ بکات و چ بڵێ. چەند رۆژێك لەلامان مایەوە و بەرێگای حاجییێك کەوەك موختاری ناو ئۆردوگا هەڵسوکەوتی دەکرد، دوو سەد دیناری ئێراقی کردە خێر و پێی گوت بەسەر خەڵکی ئێرەیدا دابەش بکە، خوا قبوڵ ناکات کابرای موختار پارەکەی زۆر بەخراپی بەشییەوە و هیشکە پارەییێکی باشی بۆ خۆی گلّ دایە! هەینێش گەندەڵی هەر هەبوو.

ماوەیەك وەك کرێکاری دابەشکردنی نەوت بەسەر خێزانەکانی ناو ئۆردوگا دامەزرام، من و چەند گەنجێکی دی بووین و زێبارییەك بەرپرسی دابەشکردنی نەوتەکە بوو.

لەبەر ئەوەی ئەو ناوچەیەی ئۆردوگای (کانی سپی) لێ بوو، زستانان بەفرێکی زۆری لێدەباری و بەکەڵکی ژیان و ئاوەدانی نەدەهات، بەر لەوەی سەرما و سۆڵە دەست پێ بکات هەموو خەڵکەکەیان گواستەوە بۆ خانوو و قاعەکانی سەر بەجەملۆنی (ئۆردوگای زیوە).

## ئۆردوگای زێوە

لەئۆردوگای زێوە خێمە بوونی نەبوو، هەمووی هۆڵ هۆڵ قیت کرابوونەوە و سەرییان بەجەمەلۆن گرتبوون.. لەناو هەر هۆڵێکیش ژمارەیێك ژوور بەدوو ڕیز دروستکرابوون و هەر ژوورە و درایە خێزانێك.

ئێمە لەهۆڵی ژمارە (٩) بووین کەلەدەرگای گەورە دەچووینە ژوورەوە بەلای دەستە چەپ وەردەسوڕای و لەبنەبانێ و لەتەنیشت دووا ژووری هۆڵەکە ماڵی ئێمە بوو، ڕێك بەرامبەرمان ماڵ و منداڵی شەهید سلێمان قاوەچی بوو کەلەرەشبگیرییەکەی شاری کۆیە لەگەڵ پۆلێك لەشەهیدان بەدینگەکانی ناو بازاڕدا بەسترانەوە و گوللەباران کران، لەتەنیشتەوان ماڵی کاك عەزیز خۆشناو و شلێرخانی هاوسەری بوو کەئەوکاتی کاکە سەرداری کوڕیان مناڵ بوو و هەنوکە یەکێکە لەدادوەرە سەرکەوتووەکان.. هەر لەم هۆڵە ماڵی کاك مەجید خۆشناو دراوسێمان بوون کەهاوسەرەکەی (ئەمیرە) خان لەتەیراوەش ماڵی باوکی هەر جیرانمان بوو، دوو ماڵی کەرکوکیش لەم هۆڵەدا لەگەڵمان بوون، یەکێکیان ماڵی میمکە (ئاڵتون) بوو کوڕێکی هاوتەمەنی خۆمیان هەبوو ناوی (عەبدوڵلا) بوو بە (عەبە کەرکووکی) بانگمان دەکرد و بووینە هاوڕێ یەکتر و تا ئێستاش هاوڕێیەتیمان بەردەوامە. (هەر لەهۆڵەکەی ئێمە ماڵی حەمە کەریم هەورامی) لێ بوو مناڵەکانی هەموو کچ بوون و سەلکە و بنکە بوون و هەموو پێداویستی و ئیش و کارەکانیان من بۆم ڕادەپەڕاندن و زۆر ئاگادارییان بووم.

لەئۆردوگای زێوە دەستم بەخوێندن کردەوە.. ناوەندییەکیان بۆ کردینەوە بەناوی (ناوەندی زمناکۆ) من لەپۆلی دووی ناوەندی دەمخوێند.

ئەوکاتە سەروبەندم لەگەڵ کتێب خوێندنەوە و نووسین و شانۆ باش بوو تا ڕادەیەك لەبوارەکان دەگەیشتم.. لەناوەندی زمناکۆ بەسەرپەرشتیی مامۆستا (عەبدولقادر مەولود)ی مامۆستای وانەی کوردی و بەهاوکاریی چەند قوتابیەك

کەئەوانەی لەیادم ماون (نەژاد عەزیز سورمێ و ئازاد جوندیانی)یان لەگەڵدا بوو، پەخشنامەیێکی دیواری بڵاودەکرایەوە.. بەداخەوە ناوی پەخشنامەکەم بیرچۆتەوە.. من لەم پەخشنامەیە بۆ یەکەمینجار کورتە چیرۆکێکم بڵاوکردەوە بەناوی (سەنگەرێکی تر).

هەر لەئۆردوگای زێوەی شیعرێکی دەستنووسی مامۆستا (هێمن موکریانی)مان بۆ هات و دەستاودەستی پێدەکرا شیعرەکە (تا بمێنێ نوری چاو و هێزی پێم.. دێم و دێم و دێم و دێم و دێم) کەلەبەغداوە بەدەست خەت هێنرابوو لەناو خەڵکی و بەتایبەتی گەنجان دەنگی دایەوە.

رۆژێکیان، لەناو پۆل و لەوانەی کوردی قوتابییەك، کەوابزانم (زاهیر کەریم) بوو، باسی دێرە شیعری (بەتەمای دوو شەشم)ی کرد و وەك بڵێی جا توخوا ئەمە کەی شیعرە کەباسی دوو شەشی دۆمینە و ئەزنیف بکات.. ئیدی لەگەڵ مامۆستا (عەبدولقادر مەولوود) کەوتینە گفتوگۆ و باسی شیعر و ئەدەبیات تا لەناکاو مامۆستا ئەو شیعرەی مام هێمنی بیرکەوتەوە (دێم و دێم و دێم) دوو دێڕی یەکەمی خوێندەوە و پرسیاری کرد:

– ئەم شیعرە هی کامە شاعیری کوردە؟

کەس وەڵامی نەدایەوە.. هەینێ مامۆستا لەیەکەمین قوتابییەوە دەستی پێکرد و پرسیارەکەی چەند بارە دەکردەوە و ئیدی بەقوتابیاندا هات..

یەکێك دەیگوت: گۆران و ئەوانی دی (نالی) و (حاجی قادری کۆیی) و ناوی تریش، ئێمە لەناو پۆل بەسێ ریز دادەنیشین و هەر رەحلەیەك هی دوو قوتابی بوو.. ریزی ناوەڕاستیشی تەواو کرد و وەڵامی راستی دەست نەکەوت.. هاتە ریزی سێیەم کەمن لەگەڵ عەبە کەرکووکی لەناوەڕاستی ریزەکە بووین.. ئەوانی پێشەوەش نەیانزانی و گەیشتە من و پرسیارەکەی چەند بارە کردەوە:

– ئەم شیعرە هی کامە شاعیری کوردە؟

منیش هەڵسامەوە و زۆر بەدڵنیاییەوە گوتم:

– ئەمە هی مام هێمن موکریانییە و بەم دواییە نووسیتی و بەدەست خەت لەناو خەڵکی بڵاوبوویتەوە.

چەند دێڕێکیشم لەشیعرەکە بۆ خوێندەوە کەلەبەرم کردبوو.. ئیدی مامۆستا عەبدولقادر زۆر دڵی خۆش بوو و ئافەرینی لێکردم و سەرزەنشتی قوتابیەکانی دی کرد کەمەعقول نییە کەستان (هێمن موکریانی) شاعیر ناناسن و ئاگاتان لەشیعرەکانی نییە! لەوکاتەوە مامۆستا عەبدولقادر گرنگی بەمن دا و زانی کەبای خۆم ئاگاداری ئەدەبیاتم و دەخوێنمەوە.

هەفتانەش لەگەڵ برادەرەکانم بەتایبەتی رۆژانی هەینی دەچووینە شاری (ورمێ) (رەزاییە) کەلەئۆردوگاکەمان زۆر دوور نەبوو، لەوێ پیاسەمان دەکرد و دەچووینە سینەما.. هەموو جارێش گەر ژمارەی تازەی هەبا ئەوا گۆڤاری (ئەلئیخا) (الاخا ء)ی عەرەبیم دەکری کەگۆڤارێکی هەمە بابەتە و سەرنج راکێش بوو، لەهەر ژمارەیێك چیرۆکێکی تایبەتی تیا بڵاو دەکرایەوە، من لەماڵەوە هەوڵم دەدا ئەو چیرۆکانە بکەمە کوردی.. زۆرجاران کە لە وشەیەك یان دەستەواژەیەك نەدەگەیشتم ئەوا دەمنووسیەوە و لەقوتابخانە لەمامۆستا عەبدولقادرم دەپرسی و ئەو تێیدەگەیاندم.

ژمارەیێکی باشم لەو گۆڤارە عەرەبییە کۆکردەوە و لەگەڵ کتێبەکانی دی کەهەمبوون لەلایەکی ژوورەکەمان رێزم کردبوون.. دەفتەرێکیشم هەبوو بۆ نووسینەکانی خۆم و زۆرم خۆشدەویست.

ماڵی کاك (حەمە جەزای) هونەرمەندیش هەر لەم ئۆردوگایە بوو، ئەو لەگەڵ کاك (عەبدوڵڵا مەخموری) بنعامی باوکم زۆر برادەر بوون، جارێکیان باوکم لەو دیو هاتبۆوە و دایکم بۆ نیوەڕۆ خواردنێکی پوختی ئامادە کردبوو، دیارە باوکم کاك عەبدوڵڵا و کاك حەمە جەزای بۆ ئەم نیوەڕۆ خوانە داوەت کردبوو، بەرەبەری نیوڕانێ منی نارد و گوتی:

– هەردووکیان لەپێش مەکتەبەکەی نگۆ چاوەڕێت دەکەن، بڕۆ بیانهێنە

چونکە ئەوان ماری مە پێنازانن.

کەچووم هەردووکیان لەبەردەم ناوەندی زمناکۆ چاوەڕێیان دەکردم.. ئیدی بەسێیان هاتینەوە و سفرە و خوان رازێنرایەوە نان خورا.. پاشتر لەگەڵ چا خواردنەوە ئەوان (باوکم و کاکە حەمە و کاکە عەبدوڵڵا) کەوتنە باس و خواسی شۆڕش و پێشمەرگە و شەڕ و پێکدادانی تازە و گیانبازی پێشمەرگە و شەهید و بریندارەکان و منیش گوێم بۆ رادەگرتن و لەچایە و ئاو هێنان و خزمەتکردن قسوریم بۆ نەکردن، هەیێ هونەرمەند (حەمە جەزا) وەك گۆرانیبێژ ناسرا بوو.. من لەهەولێر و لەتەیراوە دەیان جار چاوم پێکەوتبوو دەمناسی.. بەڵام بۆ یەکەمین جار گوێم لەقسە خۆشەکانی بێت ئەو رۆژە بوو کەهاتەماڵمان و دڵخۆشی کردین.

ژووری بەرامبەرمان ماڵی شەهید (سلێمان قاوەچی) بوون، کوڕەکانی سەربەست و ئامانج و ژن و کچەکەی (خومار)، لەگەڵ ئێمە زۆر تەبا و گونجاو بوون و ئاگامان لەیەك بوو، بەتایبەتی (من و ئامانج) هەر زۆر یەکترمان خۆشدەویست و بەشەو و بەرۆژ بەیەکەوە بووین یەکترمان دەحوباند.

شەوانەش لەجیاتی رادیۆ و تەلەفزیۆن، لەژووری ماڵێك کۆدەبووینەوە و هەموومان دەورەمان لە (خەلیفە حوسێن)ی دەدا و بەقسەی خۆش و بەزم و رەزمی خەلیفەی شەوەکەمان بەڕێ دەکرد، زۆرجار داوامان لەخەلیفەی دەکرد کەتەلەفۆنێك بۆ (سەدام) بکات.. ئەویش یەکسەر گوایە بەدەستێکی سەماعەی تەلەفۆنی هەڵگرتووە و بەبنا گوێی وەدەنا و بەدەستەکەی دیشی ژمارەی تەلەفۆنەکەی لێدەدا و لەهیکرا دەیگوت:

– هەلەو.. هەلەو.. منو سەدام حوسێن شلونك؟

یابە لیش ما تنتینا حوکم زاتی هەی گەمبۆر، لەگەڵ وشەی (گەمبۆر)ەکەش شرق زللەیێکی لەروومەتی خۆی دەدا و ئێمەش خەنی دەبووین ئەوەندەی بەم دیمەنە کۆمیدییە پێبکەنین.

ئەم خەلیفە حوسێنە خەڵکی رواندزێ بوو، کاتی خۆی بەگەنجی فەقێ بووە و لەمزگەوتێکی رواندز لەگەڵ فەقێیەکانی برادەری دەژیا.. لەناو فەقێیەکانیش بەزم و رەزمی رابواردن و گاڵتە و گەپ هەبووە، شەوێك لەناو خۆیان رێك دەکەون، یەکێك خۆی دەکاتە مردوو ئەوانیش بەپارچە قوماشێك لەنزیك مینبەری مزگەوت دایدەپۆشن و ئایەتی لەسەر دەخوێنن گوایە مردوە و ئەمشەو لەمزگەوت دەیهێڵنەوە و بەیانی بەچاوی روناکی دەینێژن، بەم شێوەیە تا درەنگانی شەو بەردەوام دەبن و تەنها فەقێ حوسێن (خەلیفە حوسێن)ەکەی خۆمان بەمەسەلەکە نازانێ و وادەزانێ راستییە، کاتی خەوتن فەقێ حوسێن و مردووەکە بەتەنیا بەجێ دێڵن و پێی دەڵێن:

– ئێمە دەچین دەخەوین.. ئەتوش جار جارە عەشەرەیەك لەسەر ئەم مردووە بخوێنە تا بەیانی.

ئەوان دەڕۆن و خەلیفە حوسێنیش دەست بەخوێندنەوەی ئایەتان دەکات، تا لەپڕ مردوەکە وردە وردە دەجوڵێتەوە و سەرنجی خەلیفە بۆ لای خۆی رادەکێشێ.. خەلیفەش کەم کەم ترسی لێ دەنیشێ و لەسەرخۆ دەڵێ:

– بشمیلاهی رەحمانی رەحیم لەتاوان (سین) دەکاتە (شین).

نەخێر مردووەکە زیاتر چوار پەلان دەکوتێ و لەناکاو پارچە قوماشەکە لەسەر خۆی لادەبا و هەڵدەستێتەوە و هاوار دەکات.. ئیدی لەهەینێوە خەلیفە حوسێن تێك دەچێت و نابێتەوە بنیادەمەکەی جاران.

هەر لەئۆردوگای زێوە، من کرامە بەرپرسی گۆشت دابەشکردن کەهەفتەی دوو رۆژ بۆمان دەهات، منیش بەتەرازوو بەعەدالەت بەسەر خێزانەکاندا دابەشم دەکرد، هەموو جارێك ژنێك کەماڵیان لەژوورێکی هەمان قاعەکەی ئێمە بوو، دەهاتە سەر سەرم و هەراسانی دەکردم و داوای بەشە گۆشتی زیاتر و نەرموکی پتری لێدەکردم و وازی نەدەهێنا هەتا بەدڵی خۆی گۆشتی بەرنەکەوتبا.

ئەوکاتیش توانای نواندن و لاسایی کردنەوەم هەبوو، هەندێك شەو جلکی رەنگاورەنگی ژنانەم لەبەر دەکرد و مکیاژێکی تۆخم دەکرد بەسوراو و چاو رەشکردنەوەش، ئینجا لەژوورێك دەمکردە بەزمی خۆم و ژن و پیاو دەورەیان لێدەدام.. برادەرێکمان ناوی (حەمە سەعید) بوو وەك چاودێر لەئۆردوگاکەمان دامەزرابوو ترە موچەییێکی وەردەگرت.. کەبەم جلکە کوردییە رەنگاورەنگ و لێوە سور و چاوە رەشەوە دەیدیتم دەیگوت:

– سێ معاشی چاودێرییەکەم خێری مەولوودی پێغەمبەر بێت بەس ئەتو بەراستی بیبیە کچ و ئەمن لەخۆمت مارە بکەم.

لەناوەندی (زمناکۆ) لەگەڵ کورێك بوومە برادەر هەر لەئۆردوگاش جیران بووین، ناوی (یوسف محەمەد یوسف) بوو، کورێکی زۆر بێدەنگ و غەریبۆکە بوو.. بەگەنجی ئەو سەردەمەی ئێمە نەدەچوو.. هەتا قسەت لەگەڵ نەکردبا ئەو هیچ قسەیێکی نەدەکرد، هۆگری من بوو بوو بەرۆژ زۆربەی کاتەکان بەیەکەوە بووین.

(یوسف) باوکی پێشمەرگە و کارمەندی ئیزگەی دەنگی کوردستان بوو کەلەسەروبەندی نسکۆ و پێچانەوەی دام و دەزگاکانی شۆرش باوکی ئەم یوسفە بەدەنگی خۆی دوا ماڵئاوایی لەبیسەرانی ئێستگە کرد و بەقورگی پڕ لەگریانەوە هەواڵی داخستنی ئێستگەی راگەیاند. یوسف خوشکێکی عازەبی هەبوو ناوی (تەنکە) بوو، هەمووجار بەگۆرانییەکەی حەمە جەزا (تەنکە مەرۆ لەدواتم) هەراسانمان دەکرد و دایکە هارەکەی بەگاشە بەردان راوی دەنایین، زۆر بەداخەوە ئەم (یوسفە) گەنجە جوان بەرەوشتە دواتر لەشەڕی قادسیەی سەدام وەك هەزاران گەنجی دی بووە قوربانی غرورییەکەی رژێمی بەعس و لاشەی پارچە پارچە بوویان بۆ دایکە داماوەکەی هێنایەوە.

## كارەساتی نسكۆ

دەنـگ و دۆری بەیـەك گەیشـتنی (سـەدام) و (حەمـە رەزا) شـای ئێـران لەجـەزائیر و رێكـەوتن و فرۆشـتنی شۆڕشـە مەزنەكـەمان لـەناو ئۆردوگـا وەك ئاگری ناو پوش بڵاوبۆوە.. ڕۆژ بەڕۆژ و سات لەدوای سات هەواڵەكە پتر پشـت ڕاسـت دەكرایـەوە و لـەدیوی لای خۆشمـان هـەر پێشـمەرگە بـوو بەمـەلولی و كەساسی دەهاتنەوە ئۆردوگا و سەری كزیـان لـەناو مـاڵ و منـداڵ دەلەقانـد و دەیانگوت:

– خۆ ئەگەر ئەم شۆڕشە (بەفر)یش بـا، ئـەوها زوو بـەزوو نەدەتاوایـەوە و ساڵێك پتری دەخایاند.

ناخۆشیەكە لەوەدا بوو، حەمە كـەریم كەهـەر بەتـەمای ئـەوە هـاتبووە نـاو شـۆڕش كەچـەند مانگێـك شـەڕەكە دەخایـەنێ و حكومـەت ناچـار دەبـێ داواكارییـەكانی شـۆڕش جـێ بـەجێ دەكـات و ئـەویش دەگەڕێتـەوە شـار و لەمامۆستاییێكی سادەوە دەبێتە بەڕێوەبـەری گشـتی لەپـەروەردەی هـەولێر و خەڵك تەشەبوسی پێدەكەن، هـەر كەهـەواڵی نسـكۆ بڵاوبـۆوە نـاوبراو هاتـەوە ئۆردوگا و ناو ماڵ و منداڵەكانی.. شـەوانە ژوورەكـەی دەبـووە جێگـای كـۆڕ و كۆبوونەوە و باس و خواسـی توانـەوەی شـۆڕش و ئـەویش لەهـەموان زیـاتر و ڕژدتر زەمی سەركردایەتی و دام و دەزگای شۆڕشی دەكـرد و قسـەی نـاجۆری پێدەوتن.

ئێوارەییێك گوتیان كاك (فەرەنسۆ هەریری) هاتووە قسە بۆ خەڵك دەكـات.. لەگۆڕەپانی ناو ئۆردوگا خەڵك لێی خڕبوونەوە.. قسەكانی بەم ئاراسـتەیە بـوو كەراستە شۆڕش تووشی نسكۆ بووە، بەڵام میللەتەكەمان هەر زیندووە و هـەر بەزیندوویش دەمێنێتەوە و شۆڕشی دیش هەڵدەگیرسێنێتەوە، ئینجا ئامـاژەی

بەوەکرد کەخەڵك ئازادە ئەوەی دەچێتەوە عێراق، حکومەت بڕیاری لێبوردنی گشتی دەردەکات و دەتوانن بگەڕێنەوە، ئەوانی دی هەر لەناو ئۆردوگا لەئێران دەمێننەوە و لێرە ژیان بەسەر دەبەن.

ئیدی حکوومەتی بەعس لێبوردنی گشتی راگەیاند و خەڵکەکەش سەری لێشێوا بوو، نەماندەزانی چ بڕیارێك بدەین، بچینەوە بەر دەستی ئەم رژێمە داگیرکەرە کەرەنگە بەجۆرێك لەجۆرەکان تۆڵەمان لێبکاتەوە، یان لێرە لەئێران و لەژێر دەسەڵاتی شایەك بمێنینەوە کەکورد و شۆڕشەکەی لەپێناو بەرژەوەندی خۆی فرۆشت.. دواجار بڕیارماندا بگەڕێینەوە وڵات و شاری خۆمان، ئەگەر قەرارە هەر زەلیل و ژێر دەستە و قوڕبەسەر بین با هەر لەوڵات و شار و لەناو خزم و کەسی خۆماندا بین.. بڕوبوزگوڕمان تێك نا و چاوەڕێی زیلی سەربازی عەجەمان بووین تا بەرەو سنوورە دەستکردەکە بمانگێڕنەوە.

## شەوی بەر لەگەڕانەوە

خەڵکی ناو ئەو هۆڵەی ئێمە هەموو تێك قڕ قڕابوون.. هەریەکەو قسەیێکی دەکرد و پاش کەمێکی دی قسەکەی بەنەوعێکی تر دەکردەوە.. هەبوو دەیگۆت ئەگەر بشمرین با هەر لەسەر خاك و مەفتەنی خۆمان دا بمرین، هەشبوو دەیگوت تازە ژیانی مە لەژێر سایەی بەعسیان زەحمەتە و هەرچۆنێك بێت لێرە و لەژێر دەسەڵاتی شا بەمیوانی بمینێنەوە سەد قات باشترە، هەندەکیش دەیانگۆت یەك دوو مانگان خۆمان لێرە دەگنخێنین و هەر دەرفەتەك هاتە پێشێ سەفەر بەرەو هەندەران دەکەین و جارێکی دی روو لەو کاولستانە ناکەینەوە.

باوکم بڕیاری کۆتایی دابوو کەدەگەڕێینەوە هەولێرێ و چ دەبی با ببی.. ئێوارەیێك ئاگادارییان کردینەوە کەئەوانی ناویان بۆ گەڕانەوە نووسیوە با خۆیان ئامادە بکەن سبەینێ ماشێن دێت و دەتانبەنەوە ئەودیو.

شەوەکەی، ئێمە هەموو ناو ماڵمان ئامادەکرد، منیش پێرە باوڵم دەرهێنا و کردمەوە و بەپەڕە کاغەز و کتێب و نووسینەکانمدا دەچوومەوە و چ باشە و بڤە نییە لەلایەکی دانێم و چشیان خراپە و خەتەرە بیاندڕێنم و لەکۆڵ خۆمیان بکەمەوە..

ماوەییێکی باش من لەدایە و بابە و براکانم دابڕا بووم و کاغەزم دەدڕاند و کتێب و نووسینەکانم هەرگێڕ و وەرگێڕ دەکرد، هەر کەتەواو بووم و باوڵەکەم داخستەوە و ئاهێکی قوڵ و پڕ لەحەسرەتم هەڵکێشا و سەرم بەرز کردەوە دەبینم دایك و باوکم بەدیارمەوە دانیشتوون و فرمێسك لەچاوەکانیان دێتە خوارێ.. منیش لەتاوان لەپڕمە گریانێم دا، ئەو شەوە دایە و بابە لەگەڵ من، بۆ نووسین و کاغەزە دڕاوەکانم گریان و ناومانناشەوی کاغەزە دڕاوەکان.

بەیانیەکەی ماشێن پەیدا بوون و ناو خوێندرانەوە و کەلوپەل بارکران و خۆشمان سەرکەوتین و بازۆ بەرەو سنور.. بەرەو هەولێر.. بەرەو تەیراوەکەی خۆمان.. لێبوردنە گشتییەکەش جارێ هەر لەسەرەتای رۆژە ئەوەلییەکانیدا بوو.

## سنوور و بێکەسی

هاتین.. کەگەیشتینە خانێ، لەرێڕەوی رۆیشتنمان بەکاروان بەرەو سنور، من دەڵێم بەدەیان تۆ بڵێ سەدان خەڵکی کوردی بەشەرەفی دەڤەرەکە هاتبوونە رۆخ رێگاکە و چاو بەگریان ماڵئاواییان لەئێمە دەکرد و کاروانی ماشێنەکانیش زۆر لەسەرەخۆ رێی دەکرد، کەگەیشتینە سەر سنور و پەڕینەوە ئێوارەیێکی درەنگ بوو، بەر لەپەڕینەوە ماشێنەکان رادەوەستان و ئێمەش دابەزین و کەلوپەلەکانمان بەعەردی دادا و پاشان بەکۆڵ پەڕاندمانەوە دیوی نیشتمان و خاکی زامدار و وا لەسەر مەرزی حاجی ئۆمەرانین.

بەماڵی ئێمەوە، سێ ماڵی دی بەیەکەوە بووین، ماڵێ کاک مەجید و ماڵی کاک عەزیز خۆشناو ئی حەمە کەریم، لەوێ (پیکابێک) بەکرێ گیرا و بڕوبوزگوڕی هەر چوار لامان بارکرد و خۆمان لەسەر شمەکەکانمان گیرساینەوە و شڕە پیکاب بەڕێ کەوت.. بەڵام هەر زوو بەزوو تاریکیمان بەسەردا هات و لەرێگاکەش دەمانبینی تانك و زرێپۆش و زیلی سوپا وا لەنوێ بەرەو مەرز هەڵدەکشێن، بۆ سەلامەتی خۆمان ئەو شەوە لەخانووە چۆڵەکانی ئازادی لاماندا و شەو لەوێ ماینەوە.

بۆ بەیانی کەرێکەوتی (١٩٧٥/٤/٢٨) بوو، کاك مەجید و کاك عەزیز و حەمە کەریم بڕیاریاندا خۆیان بگەیەننە رواندوز و لەوێ خۆیان رادەستی رژێم بکەنەوە تا ماوەی لێبوردنە گشتییەکە بەسەر نەچووە و ئێمەیان لەناو خانووەکانی ئازادی لەچاوەڕوانیدا بەجێ هێشت.

ئەو رۆژە باوکم لەگەڵ ئێمە نەبوو، چونکە کەهەواڵی نسکۆ دەبیستێ، قەمەرەکەی لەگەڵا لەحەوشەی خانووی برادەرێکی بەجێ دێڵێ و بەنەفەرات هاتە لامان بۆ زێوە.. کەگەڕاینەوەش ئەو زووتر گەڕایەوە تا سۆراخێکی ترومبێلەکەی بکات کە لەخانووێکی چۆڵ و لەگەڵاڵەیێکی چۆڵتر بەجێی هێشتبوو.

بەیانیەکەی ئەوان هەرسێکیان بەرەو رەواندوز بەرێکەوتن، ئێمەش لەناو خانووەکان هاتینەدەر و خۆمان وەبەر خۆری ئەم بەهارە پڕ لەکارەساتە دا، سەیرمان کرد بەدرێژایی رێگاکە و بەرەو خوارەوە ژمارەیەك خەڵکی دەست بەکەلەپچە و پێ بەزنجیری پچڕاو پیاو زۆرتر و ژن بەژمارە کەمتر هیلاك و ماندوو و برسی رێدەکەن.. کەپرسیمان گوتیان ئەمانە بەندکراوە سیخوڕەکانی حکومەتن کەلەبەندیخانەی (رایات) گیرابوون و دەرگایان شکاندووە و وا بەرەو لای رژێم دەچنەوە.

ئەوان کەلەوێ خۆیان رادەستی ئاسایشی گشتی و سوپا دەکەن.. عەزیز و مەجید دەنێرنەوە تا بچنەوە سەر وەزیفەکانیان، حەمە کەریمیش رادەسپێرن تا ئاگاداری منداڵەکانیان بێت و لەگەڵ خۆیان بیانهێننەوە هەولێر.

پاشتر هەر کەئێمەش گەڕاینەوە هەولێر و ئێوارەیێك کاك مەجید بەمیوانی لەماڵمان بوو لەگەڵ باوکم کەوتنە دەمەتەقێ و باوکم لێی پرسی:

– ئەنگۆ هەرسێکتان، کوو و لەکێندەرێ خۆتان تەسلیم کردەوە و چتان کرد؟

مەجید گوتی:

– هەقایەتەکە درێژە.. بەڵام بەکورتی.. ئەمە هەر کەگەیشتینە سەر پردی حافیز و عەسکەرەکان ئێمەیان بینی کەژمارەیێکیان خەریکی چاککردنەوەی پردەکە بوون، ئێمە دەستمان بەرز کردەوە بەمانای تەسلیم بوون و وردە وردە لێیان نزیك دەبووینەوە و حەمە کەریمیش هاواری دەکرد عاشە جەیشول عیراقی بەتەڵ.. عاشە ئەبتاڵ مونتەرسین.. عەسکەرەکان زۆر کەیفیان بەهوتافەکانی ئەفەندی هات و پێشوازیێکی باشیان لێکردین و بەزیلی سوپا ئەمەیان بردە رەواندزێ و گوتیان دەبێ لەوێ خۆتان ناونووس بکەن و تەسلیم ببنەوە.

هەروەها کاك مەجید گوتی:

لەگەڵ ئەو خەڵکەی کەلەوێ خۆیان تەسلیم دەکردەوە شەوێماینەوە، لۆ سبەینێ بانگیان کردینە ناو هۆڵێك، هەر کەچووینە ژوورێ، زەلامێك کەلەگەڵ ئاسایشەکان بوو خۆی لەحەمە کەریم نزیك کردەوە و هەر پستە پستیان بوو.. هەر کەنۆرەی ئێمە هات و چووینە بەردەم ئاسایش حەمە کەریم بەمن و عەزیزی گوت ئەو پیاوە ناوی مەهدی سافییە لەهەولێر جیرانمان بوو، قسەی باشی فێرکردم کە لەبەردەم ئاسایش بیکەم ئەنگۆ خۆتان بێدەنگ بکەن.. ئەمن لەجیاتی نگۆش قسان دەکەم.. ئیدی کەگەیشتینە بەردەم لیژنەی ئاسایش و کابرا بەعەرەبی پاش ئەوەی پرسیاری ناو و ئیش و کاری هەرسێکمانی پرسی و جوابمان دایەوە، لەحەمە کەریمی پرسی (لەبەر چ چوویە ناو یاخیبووان.. خۆ ئەتو مامۆستای و لەدونیایێ دەگەی؟ حەمە کەریم جوابی داوە و گوتی (ئەمن جگە لەوەی مامۆستام نووسەریشم و بابەتی ئەدەبی دەنووسم.. لەهەولێرێ هیچ کێشەیەکم نەبوو بەڵام لەسەر نووسینەکانم حیزبی شیوعی تەهدیدیان کردم و لەترسی وان چوومە دەرەوە. هەروەها گوتی (من لەخۆشی چاوی ئەوان نەچوومە ناویان، من گوتم فرسەتە من مامۆستام گەر بچمە دەرەوە هەر یەك دوو مانگە بەگفتوگۆ کورد لەگەڵ حکوومەتی عیراقی پێکدێن و کە گەڕاینەوە دەبمە مدیر عامی پەروەردەی، هەینێ کابرای عەرەبی ئاسایش گوتی: عەفیە.. مەترسێ لەژێر سایەی حیزبی بەعس ژیانی کەس ناکەوێتە مەترسی.

ئینجا کاك مەجید گوتی: هەمان پرسیارییان لەمەش کرد و ئەمەش جوابمان دایەوە و وەرەقەیان لۆ من و عەزیزی کرد کەبگەڕێنەوە هەولێرێ، وەرەقەکیشیان دایە حەمە کەریمی کە بگەڕێتەوە ئازادی هەتا مار و منداری بینتەوە، ئەمەش رامانسپارد مار و منداری مەش لەگەڵ خۆیان بهیننەوە.

کاك مەجید بەم جۆرە خۆ تەسلیم کردنەوەکەیانی بۆ باوکم گێڕایەوە.

بۆ بەیانی، عەسرێکی درەنگ حەمە کەریم بەسواری هەمان ئەو پیکابەی

لەسەر مەرزرا ئێمەی گەیاندە ئازادی، هاتەوە لامان و دەستکرا بەشمەك بارکردن و ئێمەش لەسەر شتومەکەکان سوار بووین و حەمە کەریمیش لەتەنیشت شوفێرەکە و شۆڕبووینەوە بۆ چۆمان، کەگەیشتینە چۆمان دونیا تاریك بوو، جگە لەعەسکەر و تانك و تۆپ هیچ شتێکی دی نەدەبینرا.. پیکاب لەنزیك وێستگەی کارەبا رایگرت و هەر ئەوەندەم زانی حەمە کەریم دەرگای کردەوە و بەپرتاو بەرەو بن دیواری خانوێك چوو دیار بوو دەیویست خۆی بگەینێتە پەنا دیوارەکە و میز بکات، لەو کاتەدا دوو سەربازی عارەب لێیاخوڕییەوە و چەکیان لێ راکێشا و ئەویش هەر بەهەمان پرتاو بەدەست بەرزکردنەوە گەڕایەوە لای پیکابەکە رەنگی وەك پەلکەپیازی لێهاتبوو و وەکی شەقشەقەی دەلەرزی و خۆی هاویشتەوە ناو پیکابەکە و بەڕێکەوتین.

لەخانووە چۆڵەکانی سەر رێگای سەرەکیی چۆمان لاماندا و کەلوپەلمان خست و هەر خێزانەو لەژوورێکی خانوێکی گەورە گیرساینەوە و شەو لەوێ خەوتین.

چەند رۆژێك لەوێ ماینەوە و بەو بڕە خۆراکەی پێمان بوو گوزەراندمان، پاش هەفتەیەك ژمارەییەکی زۆر لەسوپا بەزیل و تانك و تۆپەوە گەیشتنە لای ئەو خانووانەی لەهەورازی ئێمەوە بوون و کۆشکی سەلام بووە بارەگای ئەفسەرە گەورەکەیان، زۆر ئاسایی ئێمەیان دیت و هیچ قسەیەکیان لەگەڵ نەکردین و ئێمەش رۆژ لەدوای رۆژ بێزارتر دەبووین و نەماندەزانی چۆن بگەڕێینەوە بۆ هەولێر و لەناو ئەو مەعەسکەرە رزگارمان بێت..

بەیانییەکیان فەرماندە گەورەکەیان بەلای ئێمەدا رەت بوو.. هەر کەگەیشتە راستی ئێمە حەمە کەریم لەبەری هەڵساوە و گوتی:

– مەرحەبا سەیدی، سەیدی ئنتە تاج راسی.

فەرماندەکە وەڵامی دایەوە و گوتی: دیارە تۆ فەرقت هەیە لەگەڵ ئەوانیدی.. پێشتر چکارە بووی؟

ئەویش گوتی: من مامۆستا بووم، خزمەتم زۆرە.

فەرماندە پرسی:

چی تۆی گەیاندە ناو ئەوانە؟

ئەویش گوتی:

سەیدی من نەمزانی وامان بەسەردێ.. وامزانی چەند مانگێکە و حکومەتی وەتەنی لەگەڵ کورد رێکدەکەوێتەوە و دەگەڕێینەوە و منیش دەبمە مدیر عامی تەربیەی هەولێرێ.

فەرماندەکە بەسەربادانەوە پێکەنی و گوتی:

– ئێستا چتان دەوێ، چیتان بۆ بکەین؟

ئەویش گوتی: ئێمە لەئێران گەڕاوینەتەوە و چەند رۆژێکە لێرە گیرمان خواردووە و ئەو خواردنەی هەمان بوو تەواومان کرد، دەمانەوێ بگەڕێینەوە هەولێر چونکە خەڵکی ئەو شارەین، فەرماندەکە گوتی سەبرتان هەبێت یەك دوو رۆژی دی چارەسەرێکتان بۆ دەدۆزمەوە جارێ بەخۆمان بەتەواوی دانەمەزراوین، بۆ خواردنیش خەمتان نەبێت، بۆ بەیانی دوو سەرباز بەخواردنی وشکە و سێنی پڕ لەمیوە و گۆشتی مەڕی تازە سەربڕاو و کیسەیەك سەمون پەیدا بوون..

یەکێکیان گوتی:

– فەرماندە دەڵێ با ئەوەندە خواردنە لەناو خۆیان دابەش بکەن دوایش خوا کەریمە.

رۆژی پاشتر دوو زیل پەیدا بوون، گوتیان یەڵڵا بارکەن دەتانبەینەوە هەولێرێ، ئەوەبوو لەزیلێکدا ماڵی ئێمە و ماڵی کاك مەجیدی بارکرا چونکە لەتەیراوەش هەر لەیەك کۆڵان و هاوسێی یەکتر بووین و زیلەکەی دیش ماڵی کاك عەزیز و حەمە کەریمی بارکرد و بازۆ بۆ هەولێر، تەیراوە خۆت بگرە هاتین.

## تەیراوە و... شێخ فەتاح موفتی

ئۆخەی گەڕاینەوە تەیراوە و ماڵە چاوەڕێیەکەی خۆمان، بەبابە حاجی و دایە حاجی و دایە بابە و بابە خدر و پەریزاد و عارفی برام شاد بووینەوە، ئەوانەمان هەموو لەهەولێر و لەتەیراوە بەجێهێشتبوو، دوو جاران بابە خدر سمێر سۆر هاتە لامان لەئێران و جاری یەکەم دەیویست نەگەڕێتەوە هەولێر، دەیگوت لەناو بازاڕی ئەمنە عارەبەکان دەمگەنێ و بەپەلار پێم دەڵێن:

– عەدل شواریەك!

دەیگوت:

– ئەو سەگبابانە دەزانن ئەنگۆ لەناو شۆڕشن، وەهام پێ دەرێن دەترسێم رۆژەکی زەرپەکم لێبدەن.. یان بمگرن.. ئەمنیش بەو پیرییە بەرگەی حەپسخانەی ئەو وەحشیانە ناگرم.

کەچی دواتر رازیمان کرد کەبگەڕێتەوە و عارفی براشم لەگەڵ خۆی بباتەوە.. هەر واشی کرد و بەرێگای ولاخ و بەشەوی ئەنگوستەچاو بەیارمەتی خزمانی خۆی لە (بۆکلیسکان) گەڕایەوە هەولێر.

پاشتر مانگێك بەر لەنسکۆ جارێکی دی بەسەردان هاتەوە لامان، چەند شەوێك لەئۆردوگای زێوە مایەوە.. ئەو شەوەی بۆ بەیانی دەگەڕایەوە خەونێکی ترسناکی دیبوو کەلەخەو هەڵسا و خۆی خڕ کردەوە بۆ گەڕانەوە گوتی:

– ئەوشۆ خەونێکی زۆر ناخۆشم بینی خوا بەخێری بگێڕی.

دایکم لێی پرسی:

– خارە خەونی چت دیتییە؟ دە لۆمان بگێڕەوە.

بەگریانەوە گێڕایەوە:

– لەخەونمدا، ئەمە هەموومان و خەڵکەکی یەکجار زۆر لەژێر سێبەری دارێکی گەورە زۆر بەخۆشی و ئاسودەیی دەژیاین و پاڵماندابۆوە، کەچی لەهیکڕا دارە گەورەکە قرچ و هۆڕی پێکەوت و ئەوەندەی نەبرد بەلادا هات و دونیای لەتەپ و تۆزێ وەردا.

هەناسەیێکی قوڵی هەڵکێشا و بەقورگی پڕ لەگریانەوە گوتی:

– خوا رەحم بکات ئەو سایە و سێبەرەی شۆڕشمان لێ نەڕوخێ و رەنج بەخەسار نەبین.

لەهەولێر دوای ئەوەی شەوی یەکەمم لەباوەشی خەوێکی قوڵ بەسەر برد و پاش نانی بەیانی دەرپەڕیمە دەرێ و بەدیداری رەفیقە بەجێماوەکانم شاد بوومەوە (جەمالی حەمە ساڵح کارەباچی، مۆفەقی مام کاکۆ خەیات و ئازاد و دلشادی سابیر سەماوەر و تۆفیقی عومەر پەڕەشوت و نامیقی پلکە رەحمەتە و کەژاد و فەوزی معاون ساڵحی).

بۆ رۆژی دواتر بەنیازی گەڕانەوەم بۆ خوێندن و قوتابخانە چوومەوە (ناوەندی جمهوری) لەوێ یەکەمین کەس بەڕێکەوت کەرووبەڕوو هاتە بەرامبەر مامۆستا جەعفەر عەبدولواحید بوو، هەر کەچاوی پێم کەوت زۆر بەگەرمی بەخێری هێنامەوە و گوتی:

– زاهیر گیان گوێ مەدێ.. گەر شۆڕشیش بڕوخێ ئەوە میللەت قەت ناڕوخێ و هەر بزانە سەرلەنوێ تێهەڵچووینەوە.

کەچوومە ژووری مامۆستا (فەرهاد حەسەن حوسنی) بەڕێوەبەر بەڕووێکی خۆشەوە کاغەزێکی بۆ نووسیم و گوتی:

– دەبی بچیە تەربیەی لەوێ نووسراوی گەڕانەوەشت لۆ بکەن ئەوجا دەبی دەوام بکەی.

کاغەزەکەم لێوەرگرت و بەپایسکیل کەوتمە رێ بەرەو پەروەردە کەئەوکاتە

لەتەلارێك بوو کەئێستاش ماوە و کەوتۆتە تەنیشت باڵەخانەی پەرلەمان.. پاسکیلەکەم لەرۆخی جادە راگرت و قوفڵم دا و خەریکی چوونە ژوورەوە بووم.. قەمەرەیێکی سەرکراوەی دوور و درێژ لەبەردەمم ستۆپی گرت و راوەستا، شوفێرەکە پیاوێکی بەتەمەنی سوورکەڵەی رێکپۆش بوو لێی پرسیم:

– ها کوڕم چ دەکەی لێرە؟ چت دەوێ؟

منیش حاڵ و ئەحواڵی خۆم لەنووکەوە بۆ باسکرد.

ئەو گوتی:

– برۆ ئیستیعلامات و لەوێ بڵێ دەچمە کن شێخ فەتاحی.. ئیشی تو لەکنە وییە.

ئەو بەقەمەرەکەی لەدەرگای گەراجەکە چووە ژوورەوە و منیش چوومە پرسگە و گوتم:

– دەچمە کن شێخ فەتاحی.. ئیشەکەم لەکنە وییە.

کەمێك دوایان خستم و لەپاشان کوڕێکی گەنج ژووری شێخ فەتاحی پێشاندام.

چووم و لەدەرگامدا و (وەرە)یێکم بەر گوێ کەوت، یەکسەر دەرگام کردەوە کەچوومە ژوورەوە دەبینم شێخ فەتاح هەر ئەو شوفێرەیە کەلەبەر دەرگا قسەم لەگەڵدا کرد.. بەجوانی پێشوازی لێکردم و کاغەزەکەی لێوەرگرتم و لێی پرسیم:

– بابە ئەتو کوڕی کێی؟

گوتم:

– کوڕی عەبدوڵڵایمە.. باپیرم ناوی خدر سمێر سۆرە و هەموو هەولێر دەیناسن.

یەکسەر گوتی:

– کەونە پۆلیسە سمێر قیت و جوانەکە؟

ئەمنیش دەیناسم ئەوە نیوەی هەولێرێیە.

بەم شێوەیە لەلای خۆی هێشتمیەوە و بانگی یەکێکی کرد و کاغەزی بەڕێوەبەرەکەمی دایێ و گوتی:

– برۆ لەخوارێ با کتابی گەڕانەوەی لۆ بکەن و تایپی بکەن و لۆم بینەوە با ئیمزای بکەم.

کابرا رۆیشت و هەر چارەگە سەعاتێکی پێچوو هاتەوە و چەند کاغەزێکی تایپ کراوی خستە بەر دەست شێخە فریشتەکە، ئەویش خوێندیەوە و یەکسەر واژووی خستە سەر کاغەزەکان و لەگەڵ کابرا رەوانەی ژووری (صادرە) (دەرچوو)ی کردم و گوتی:

– زۆر سەلام لەسمێر سۆری بکە.. بڵێ شێخ فەتاح موفتی سەلام و حورمەتی هەیە.

کارەکەم بەسانایی بۆ هەڵسوڕا و هەر بەپایسکل خۆم گەیاندەوە قوتابخانە و نوسراوەکەم رادەستی بەڕێوەبەر کردەوە و ئەویش گوتی:

– هەوکە تەواوە.. لەچ شوعبەکی بووی بڕۆوە وێ و دەوامت مەزبووت بی.

بەم شێوەیە گەڕامەوە هەمان هۆبەی–ب–ی پۆلی دووەمی ناوەندی و بەقوتابیە هاوڕێکانم (شەماڵ چاو جوان و دلێر مامە خەیات و سالم کەریم و میعازی مەلا عەباس و خالید حەمیدی حاجی مەجید قەردار و ماجید عەبدولکەریم رەئوف و فەتحی کەریم و ئەنوەر عەزیز) شاد بوومەوە.

## چالاکییە هونەری و ئەدەبییەکانم

کەکەوتمەوە سەر خوێندن، رۆژ بەرۆژ زیاتر هۆگری خوێندنەوە و جارە جارە نووسین و هونەری شانۆ دەبووم، ئەوکاتە شیوعیەکان کە لەگەڵ حیزبی بەعس لەبەرەی نیشتمانی بوون بەئاشکرا ئیشیان دەکرد و لەناو قوتابخانەش دەماننناسین، من برادەرایەتیم لەگەڵیان بەتین بوو، (بیری نوێ) و (طریق الشعب)یان دەدامێ و دەمخوێندەوە.. جار جارە دەمم لەشیعریش دەدا و بۆ رەفیقەکانم دەخوێندەوە.

پاش نیوەڕۆیانیش لەگەڵ کەژاد (مەهدی) کوڕی معاون سالّحی جیرانمان هاموشۆی (تیپی هونەری هەولێر)مان دەکرد کەزۆربەی هونەرمەندە دیارەکانی شار لەوێ ئەندام بوون.. هەر لەم تیپەش لەنزیکەوە مامۆستایان (سابیر عەبدولڕەحمان و جەمال هیدایەت و عەدنان مەلا و تەحسین تەها و عەبدولواحید مەرجان و جەودەت شاکر و مستەفا رەئووف و فازیل و لوقمان بەرزنجی و تەلعەت عارف و شێرزاد سەرسپی و ئەکرەم عەلاف) و چەندانی دیم ناسی، پێشتریش بەرێگای چالاکی قوتابخانەکان و شانۆگەری (ئەنجامی پول پەرستی) مامۆستام هونەرمەند (سەباح عەبدولڕەحمان) و ئەکتەرە دیارەکانی ئەوکاتە (عەبدولڕەزاق شەمسەدین و فەیسەڵ محەمەد سالّح و عەلی ئەحمەد و سوبحی کۆیی و غازی غەفوور و سەلام کۆیی و جەلال بەیار و سەمیر ئەنوەر و وشیار سەید ئەحمەد و ئەنوەر شێخانی و ئەوانیدیم ناسی.

هەر بەرێگای چالاکیی قوتابخانەکان و لەگەڵ مامۆستای دەرهێنەر (هاشم زەینەل) بەشداری دوو شانۆگەریم کرد، کەبەرهەمێکی هاوبەشی قوتابییانی کوڕ و کچی ناوەندی (خەنسا و سەلاحەدین) بوو، شانۆگەری (سێ چاو) بەزمانی عەرەبی و (حەسەنە فەندی) بەزمانی کوردی. کەپاشتر شانۆگەری

(حەسەنە فەندی)م لەناوەندی جمهوری کردە بەرهەمێك و لەسەر شانۆی هۆڵی ناوەندی جمهوری پێشکەشمان کرد و ئەکتەری دیار (ئەنوەر عەزیز) لەم شانۆییەدا بۆ یەکەمین جار دەرکەوت و دواتر بەردەوام بوو.

هەر لە (تیپی هونەری هەولێر) بۆ یەکەمین جار هونەرمەند (سەعدون یونس)م ناسی کەتازە لەبەغدا گەڕابۆوە هەولێر و وەك مامۆستا و فەرمانبەر لەچالاکی قوتابخانەکان بوو و عەسرانیش هاموشۆی تیپەکەمانی دەکرد. ئەو عەسرەی بینیم و وتیان ئەمە فلان کەسە و دەرچووی پەیمانگای هونەرە جوانەکانی بەغدایە و بەئەسڵ هەولێرییە و تەیراوەییە ساڵانێك لەبەغدا ژیاوە.. هەر ئەو رۆژە کەبینیم دیار بوو تووشی هەڵامەت هاتبوو جار جارە شتێکی لەگیرفانی دەردەهێنا و بۆنی دەکرد تا هەناسەدانی خۆشتر بێت.

ئەو ماوەیەی لە (تیپی هونەری هەولێر) بووم، چونکە تیپێکی هونەری موزیك و شانۆیی بوو و ئەندامیان یەکجار زۆر بوو، ئێمە ژمارەیێك قوتابی بووین بەئەندامی یەدەگ (عضو اضافي) وەرگیراین.

ئەوکاتە وا باو بوو لەکاتی ئاهەنگ و بۆنەکان تیپی مۆسیقا بەرهەمەکانیان پێشکەش دەکرد و لەناوەڕاستی ئاهەنگەکەش کورتە شانۆییەك کەبەزۆری کۆمیدی ئامێز بوو نمایش دەکرا، پاڵەوانی زۆربەی ئەم کورتە نمایشانە (فەیسەڵ محەمەد و سوبحی کۆیی و سەلام کۆیی و سابیر عەبدولرەحمان و واحید مەرجان و عەلی ئەحمەد) بوون، ئێمەش لەکاتی پێویست هاوکارییان دەبووین.

هەر لەو رۆژانە هونەرمەند و نووسەر و رۆشنبیرە شیوعیەکان تیپێکی هونەرییان دامەزراند بەناوی (تیپی هونەری نوێی کوردی) کەدیارترینیان هونەرمەندان (تەڵعەت سامان و سەعدوون یوونس و سەیفەدین ئیسماعیل و فەرهاد شەریف و نزار جەرجیس) بوون.. تیپەکە بەتیپی شیوعیەکان ناسرا،

من لەگەڵ برادەرە قوتابیە شیوعیەکان (سالم کەریم و شەماڵ عەباس و ماجید عەبدولکەریم) چوومە ئەو تیپە و وەك شانۆکار بەئەندام وەرگیراین.

یەکەمین بەرهەم کەلەم تیپە وەك ئەکتەر تیادا بەشدار بووم شانۆیی (شەوچرا) بوو کەبەئەسڵ دەقێکی عەرەبی بوو و هونەرمەند (ئازاد مەولوود) وەرگێڕانی بۆ کردبوو، هونەرمەندان سەعدون یونس و فەتاح خەتاب بەکاری دەرهێنانی راگەیشتن. من رۆڵێکی سەرەکیم وەك ئەکتەر تیادا بینی بەچەشنێك لەنواندنەکەم هێندە سەرکەوتوو بووم، سەعدون کەئەوکاتە لە (شانۆی لادێ) (مسرح الريفي)یش کاری دەرهێنانی دەکرد، لەلای ئەکتەرەکانی ئەوێ باسی منی کردبوو گوتبووی (فلان) کەس ئاستی نواندنی زۆر بەرزە و شان لەشانی ئەکتەرە بەتواناکانی بەغدا دەدات. شانۆیی (شەوچرا) چەند رۆژێك لەسەر شانۆی هۆڵی ناوەندیی رزگاری لەگەڕەکی سەیداوە بەسەرکەوتوویی پێشکەش کرا و منیش وەك ئەکتەر باشتر ناسرام.

بەرهەمی دووەمی ئەم تیپە، شانۆیی (ماڵی نوێ) بوو، کەلەنووسینی نووسەری عێراقی (نورەدین فارس) بوو و کاك سابیر عەبدولڕەحمان وەریگێڕابووە سەر زمانی کوردی.. هونەرمەند (فەرهاد شەریف) کاری دەرهێنانی بۆ کرد. بەڵام بەداخەوە پاش دوو مانگی رەبەق لەپرۆڤە کردن و خۆ ئامادەکردن.. رۆژێ بەر لەنمایش ئاگادارییان کردینەوە کەپێشکەش کردنی ئەم بەرهەمە قەدەغەکراوە و پاتێشن و ریکلامەکانی ناو شارییان پێخڕ کردینەوە و ئەم بەرهەمە جوان و بەپێزە روناکی نەدیت و ئێمەش هەناسە ساردماینەوە و پاشتریش بەتۆمەتی شیوعی بوونی زۆربەی ئەندامان تیپەکەش داخرا و مۆرێکی سۆرییان لەدەرگای چەسپ کرد و بڕای بڕ بەلایدا نەچووینەوە

## هەمەوەندێکی کەرکووکی

عەبە کەرکوکی و میمکە ئاڵتونی دایکی و خوشك و براکانی کەلەئێران گەڕانەوە نەچوونەوە کەرکوك و لەهەولێر بار و بارگەیان خست و بوونە هەولێری و ئێمەش دۆستایەتی و هاوسێیەتیەکەمان لەگەڵیان هەر بەردەوام بوو، بەتایبەتی من و کاکە عەبە برادەرایەتیەکەمان تۆخ کردەوە و عەبەم بەشەماڵ چاو جوان و ئەمیری ئامۆزام و تەها خۆشناو ناساند و زۆربەی ئێواران لەپیاسەی تەیراوە و ناو بازاڕ و دانیشتنەکانی گازینۆی شەوانی هەولێر ژێر سێبەری قەلا بەیەکەوە بووین.

کاکە عەبەش، هاوڕێیەکی خۆشەویستی خۆی کە لەکەرکووك دەژیا پێناساندم کەناوی کاك (فەیسەڵ هەمەوەندی) بوو، ئەو کوڕەش وەك خۆمان متوی خوێندنەوە و شیعر و چیرۆك و ئەدەبیات بوو، هەر لەیەکەم بینینی خۆشمان ویست، بۆ درێژەدانیش بەهاوڕێیەتیمان و لەیەکدانەبڕان و ئاگاداربوون لەحاڵ و ئەحواڵی یەکتری، ناونیشانمان لەگەڵ یەکتر گۆڕیەوە و بەرێگای پۆستە زوو زوو نامەمان بۆ دەنارد و ئەویش هەر بەنامە بەسەری دەکردینەوە.

جارێکیان هاتە هەولێر و هەر بەپیاسە سەر قەلا و ژێر قەلا و تەیراوە و مەچکۆ و گازینۆی شەوانی هەولێرمان پێکرد و لەکن کاکە جومعەی خاوەنی کتێبخانەی (تەئمیم)ی رۆخ یانەی فەرمانبەرانیش چەند کتێبێکی دانسقەی کڕی و لەگەڵ خۆی بردیەوە کەرکووك.

نامەکانمان کەدەگۆڕییەوە زیاتر لەمەڕ ئەدەبیات و بابەتی بەرەنگاری و دەنگوباسی شاعیرانی ئەو سەردەمە کەبۆ ئێمەی گەنج وەك دەقی پیرۆز وابوون دەدواین، باسی (هێمن موکریانی) و (لەتیف هەڵمەت) و (عەبدوڵڵا

پەشێو) و (لەتیف حامید)مان بۆ یەکتر دەنووسی و لەسەر بەرهەمەکانیان گفتوگۆمان گەرم دەکرد.

تا دەهات پەیوەندیمان بەهێزتر و خۆشەویستی و هاوڕێیەتیمان پتەوتر دەبوو، جارێکیان جەژن بوو، من و عەبدوڵلا کەرکووکی و شەماڵ چاو جوان و ئەمیری ئامۆزام بەسەردان چووینە کەرکووك و بووینە میوانی ماڵی باوکی کاکە فەیسەڵ هەمەوەندی.

هەرگیز ئەو چەند شەو و ڕۆژەی کەرکووك و میوانداری و خانەخوێی دایك و باوك و خوشك و براکانی فەیسەڵم بیر ناچێتەوە، بەتایبەتی دایکە میهرەبانەکەی کەیەکجار زۆر بەئێمەوە ماندوو بوو ئاشی کەرکووکیانەی بەتام و لەزەتی بۆ دەخستینە سەر خوان و دەیان جار خۆی بەقوربانمان دەکرد، بەراستی دایکێکی سەلار و بەهیمەت و ڕێزدار بوو.

هەنوکەش، لەگەڵ کاکە فەیسەڵ هەمەوەندی چیرۆك و ڕۆمانووس و وەرگێڕ پەیوەندیمان هەر ماوە و یەکتر بەسەر دەکەینەوە.

## هەر ماڵی نوێ

دوای داخرانی (تیپی هونـەری نـوێ کـوردی) و پەرتـەوازەبوونی ئەنـدامان، ئێمە هەر لەکاری هونەری بەردەوام بووین و کۆڵمان نەدا.

ئەمجارەی تیپێکی نواندن دامـەزرا لەبەڕێوەبەرایـەتی رۆشـنبیری جـەماوەر (ثقافة الجماهیریة) لەوێش زۆربەی هەرە زۆری هونەرمەند و ئەکتەرە دیارەکانی هەولێر بەشداری چالاکیە هونەری و شانۆییەکانیان دەکرد.

جارێکی دی و لەم تیپە شانۆگەری (ماڵی نوێ) هێنرایە پێشەوە و سەعدون یونس ئەرکی دەرهێنانی گرتە ئەستۆ و ئـەم ئەکتەرانـەش رۆڵمـان تیـادا بینـی (سـابیر عەبـدولڕەحمان، چـەتۆ حەسـەن، سـەلام کـۆیی، سـەعدوون یـوونس، یاسین مستەفا، جوان، مەدینە عەبـدولڕەحمان و هـەروەها بەخۆشـم) کـەرۆڵی (فەقێ قادۆی) قۆڵبڕ و ساختەچیم تیادا بینی.

هونەرمەندی دەست رەنگین (عەبدولواحیـد مـەرجان) بـەدیکۆرێکی یـەکجار جوان کەخانوێکی لەسەر تەختەی شانۆ بەرز کـردەوە هاوکارمـان بـوو، (مـاڵی نوێ) لەسەر شانۆی (هـۆڵی گـەل) پـتر لـە (١٠) رۆژ نمایشـکرا و جـەماوەرێکی یەکجار زۆر بینیان و سەرکەوتنێکی مەزنمان بەدەست هێنا.

هــەر (مــاڵی نــوێ) لەســەرەتای هەشــتاکانی ســەدەی رابــردوو، لــەناو ستۆدیۆکانی تەلەفزیۆنی بەغدا تۆمارکرا و هونەرمەندی بەتوانا (ناسر حەسەن) کاری دەرهێنانی بۆ کـرد و هونەرمەنـد (کـەریم عوسمـان) یاریـدەدەری بـوو.. دوای ماندووبوونێکی زۆر و بەعیشقەوە بەرهەمەکەمان تۆمار کـرد و ئامـادەکرا تا لەتەلەفزیۆنە تاقانەکەی کەرکوك یادی بەخێر پێشان بدرێت، بـەڵام مـەخابن دیسـان راپـۆرت نووسـەکان دەسـتی خۆیـان وەشـاند و نەیانهێشـت بینـەرانی کوردستان ئەم بەرهەمە نایابە ببینن و قەدەغەیان کرد.

# بەڕازیلییەکە

ئەوکاتانە باوکم دڵخۆش و بەختیار دەبوو کە بەجۆرێك لەجۆرەکان هاوکار و یارمەتیدەری خەڵك دەبوو، هەر ئەو رۆحی یارمەتیەشی لەناخی ئێمەدا چاند و فێـری کـردین لەگـەڵ دەوروبەرەکـەمان رووخـۆش و هاوکـار بـین درێغـی لەبەخشینەوەی خۆشی لەگەڵ کەسدا نەکەین.

بەتایبەتیش لەگەڵ کەس و کـار و خـزم و ناسـیاوەکانی هەمیشـە دڵنـەرم و بەخشندە بوو، بۆ مەسەلەی ماڵی دونیاییش نـاڵێم دەوڵەمەنـد بـوو بـەڵام بـای ئەوەندەی هەبوو ژیـانێکی سـەربەرزانەی پێببەینەسـەر و زوو زووش یارمـەتی کەمدەرامەت و نەداران بدات.

ئـەوێ رۆژێ، حکومـەت وەك هاوکـاری و کارئاسـانی ترومبێلـی بـەڕازیلی بەرێگای کۆمپانیاکانی خۆیەوە دەهێنا عێراق و بەبڕە پارەیێکی کـەم دەیدایـە هاوڵاتیان بەمەرجێك هاوڵاتی رووخسەتی لێخوڕینی هەبێت.

لەم سەروبەندەدا، هەر جارەی حەمە کەریم دەهاتـە ماڵمـان مەسـەلەی بـێ ترومبێلی دەهێنا پێشەوە و تەمەننای دەکرد کەبتوانی (بەڕازیلییەك) بەدەست بێنێ و ناوی خۆی وەك ئەم خەڵکە تۆمار بکـات و بـەم بـڕە پـارە کەمـە ببنـە خـاوەن قەمـەرەی خۆیـان، بـەڵام کێشـەی (ئیجـازەی شـوفێری) و نـەزانینی لێخوڕینی ترومبێلی هەبوو.

هەینێ ئێمە، من و براکانم کێشـەی لێخـوڕینی ترومبێلمـان نـەبوو زۆرجـاران نێـرین و کۆسـتەری باوکمـان لێـدەخوڕی زۆریـش مـەعلان بـووین، رۆژێکیـان بەدەستپێشخەری باوکم تەکبیر کرا و (ئیجازەکەی) شوفێری خۆی دایە حەمـە کەریم و پێی گوت:

– ئـەوە ئیجازەکـەی مـن، بـڕۆ لـۆ خـۆت بەڕازیلییـەك تۆماربکـە، ئەگـەر

پارەشت نەقوستان بوو پێم بڵێ با لەویش یارمەتیت بدەم.

ئەو گوتی:

* ئاخر من کێشەی ئیجازەم نییە، من لەژیانم دەستم بەسوکانی سەیارە نەکەوتووە و نازانم لێیخوڕم.

باوکم وەڵامی دایەوە:

– با سەیارەکەت لۆ دەرچی، هەینێ بەدوو سێ شەوان فێرە لێخوڕینیشت دەکەم.

ئەوەبوو (ئیجازەکەی) برد و ناوی تۆمارکرد و پاش ماوەیێك بەڕازیلی وەرگرت و هەر باوکیشم لەگەڵیدا چووە خوار بەغدایێ و بۆی گەیاندەوە هەولێر و بەچەند شەوێکیش وایلێکرد کەبتوانی وردە وردە شوفێری بکات، بەم شێوەیە باوکم ئەوانی خەنی کرد و بوونە خاوەن بەڕازیلی خۆیان، کەهەندێجار ئێمە گلەییمان لەباوکمان دەکرد کەبۆچی بۆ ئێمەی تۆمار نەکرد و ئێمەی لێبێبەش کرد؟

ئەو دەیگوت:

– کوڕم، ئەوانەش هەر جەرگ و عەزیزی منن، ئەوانەش خوشك و منداڵە خوشکی خۆمن خۆ لۆ بێگانانم نەکردیە.

بەمشێوەیە، ئەوان بوونە خاوەن بەڕازیلی و کەشخەیان پێلێدەدا، جار جارە کەدەهاتنە ماڵمان بەئاشکرا دیار بوو کەهێشتا حەمە کەریم بەتەواوی فێرە شوفێری نەبووە، بەهەزار حاڵ بەڕازیلی دەهێنایە ناو کۆڵان و کەدەشچوونەوە بەهەمان شێوە لەکۆڵانێی دەبردە دەرێ.

شەوێکیان هاتن و دایانکوتا، مارفی براشم گەنج بوو و زۆر بەچاکی شوفێری دەزانی، داوای (سویچی) بەڕازیلی لەحەمە کەریم کرد کەبیداتێ و فرەیەك بەبەڕازیلیەکە لێبدات، بەڵام ئەو مۆڕەیێکی لێکرد و سویچەکەی نەدایێ و

پێیگوت:

- تۆ کەی شوفێری دەزانی؟ بتدەمێ تا بەدیوارێکی دابدەی.

ئیتر مارف تووڕە بوو و بووە هەرا، حەمە و ژنی و منداڵەکانی لایەك و من و مارف و براکانیدیم لایەکەی تر بووە دەمە دەم، ئەوان هەڵسان و بەتوڕەیی و بۆڵەبۆڵ دەیانویست لەماڵ بچنە دەر، مارف بەدەنگی بەرز گوتی:

- ئاخر خەتای مەبوو، ئەنگۆ بوونە ساحێب سەیارە، دەنا بەحەیاتتان بەڕازیلیتان نەدەبوو.

ئەوان ڕۆیشتن و باوکم کەوتە سەرزەنشتی ئێمە کەنەدەبوایە بەمشێوەیە دڵیان بشکێنین، هێندەی پێنەچوو گەڕانەوە.. تومەز لەناو ترومبێل ژن و کچەکان باوکیان تیخ تیخە دابوو کەچۆن دەبێ مارف قسەییێکی وا بکات، بەهەرحاڵ گەڕانەوە و هەر لەدەرگای حەوشەوە هێرشیان بۆ هێنایەن و بووە هەرا، دایکم بەلەخۆڕادیتن دەستی حەمە کەریم گرت و لێی دەپاڕایەوە کەواز بێنن و مارف گەنجە و تۆ لێی ببورە، کەچی (حەمە) پاڵێکی بەدایکم وەنا و شاپێکی بۆ راوەشاند بەلام بەری نەکەوت، ئەو دایکەم کەیەکجار زۆر قەدری حەمەی دەگرت و رێزی لێدەنا، لە (شنۆیێ) دۆشەگە ئەستورەکەی بۆ تەرخانکرد و خواردنێکی شاهانەی لەسەر خوان بۆ دانا، کەچی ئەو بەمشێوە بێڕێزیە بەرامبەر بەدایکم جولایەوە، ئیتر دوای شەڕە دەمێکی کەمخایەن جارێکیدی ئەوان دەرپەڕین و ڕۆیشتن، ئینجا لەسەر ئەم حاڵەش، باوکم و سمێر سۆری باپیرم سەرکۆنەی مارف و ئێمەیان کرد و لای ئەوانیان بەرنەدا.

# خۆتان بگرن هات

هەر لەتیپی رۆشنبیری جەماوەر شانۆیی (خۆتان بگرن هات)مان پێشکەش کرد، بەرهەمەکە چیرۆکێکی نووسەری بەتوانا (عەزیز نەسین)ە، نووسەری بەرەگەز کورد و بەنووسین عەرەبی (محێیەدین زەنگەنە) وەك شانۆگەری دایرشتبۆوە و بەزمانی عەرەبی لەیەکێك لەگۆڤارە ئەدەبییەکانی ئەوکاتی گەر هەڵە نەبم (الاقلام) بڵاوی کردبۆوە، هونەرمەند (خەلیل بابە) کردبوویە کوردی و سەعدون یونس دەرهێنەری بوو.

(خۆتان بگرن هات) شانۆییەکی کۆمیدی تەنز ئامێز بوو، باس لەکێشەی نێوان جوتیار و دەسەڵات دەکات و بەشێوازی تەنز و بەدرێژایی شانۆگەرییەکە رەنج بەخەساری جوتیار و ماندووبوون و کێشەی هەژاری و جەور و ستەمی دەسەڵات دەخاتەروو لەمیانەی دابەشکردنی پەینی کیمیایی بەسەر جوتیاری لادێ نشینەکان و لەبەر تەماحی تاکە باڵا دەستەکانی دەسەڵات و گلدانەوەی پەنیەکە بۆ سوود و قازانجی خۆیان و دواجار هەناسە ساردکردنی جوتیاران بەوەی هەر جوتیارەو بۆ تەبەروك سەرو کەوچکێك لەپەنیەکەی پێدەدرێ.

ژمارەییێکی بەرچاو لەئەکتەرە دیارەکانی هەولێر لەم بەرهەمە بەشداربوون جگە لەخۆم (فەیسەڵ محەمەد ساڵح و خەلیل بابە و هەژار سابیر و مۆفەق محەمەد سابیر و تەحسین عەلی و ئەنوەر عەزیز و بەختیار فەرەج و موفەقەرەش و عەلی ئەحمەد و جەلال بەیار و دڵشاد عومەر و خالید محەمەد و سیروان عوسمان) کە لەسەر شانۆی (هۆڵی گەل) بۆ ماوەی چەند رۆژێك نمایشەکە بەردەوام بوو و بینەرێکی یەکجار زۆر بینیان و بلیت بەپارە بوو من رۆڵی (نەجدەتە فەندی) فەرمانبەرم تیادا بینی.

پاش ئەوەی لەسەر شانۆ پێشکەشکرا، بۆ تۆمارکردنی وەك دراماییێکی

تەلەفزیۆنی چوینە بەغدا و لەوێ بەم شێوەیە بەرهەمەکەمان هاتە بوون.

هونەرمەند (بەختیار سیامەنسوری) وەك دەرهێنەری دراماکە دەست نیشان کرابوو، دیکۆری (خۆتان بگرن هات) لەناو ستۆدیۆییێکی هەواڵ کەزۆر بچوك بوو دامەزرا بوو، کە چووین گوتیان بەیانی زوو وەرن وێنەگرتن دەست پێدەکات، ئاگاداریشیان کردینەوە کەهەر تەنها ئەو رۆژەمان بۆ تەرخان کراوە و دەبێ دەست و برد بکەین بەکاری لابەلا کات بەفیڕۆ نەدەین.

بۆ بەیانی ئێمە لەکاتژمێر (٨)ەوە لەوێ ئامادە بووین و پاش مکیاژی ئەکتەرەکان دەست کرا بەوێنەگرتن، دەبوایە ئێمەی ئەکتەر هەوڵبدەین دیالۆژەکان بەچاکی بڵێین و هەڵەی تیادا نەکەین و بەدووبارە کردنەوە کاتمان لێنەڕوا. بەم شێوەیە و دەست لەسەر دڵ و بەگوڕ و تینی گەنجانە و بەعیشقی لەبن نەهاتووی دراما و شانۆ توانیمان ئەم بەرهەمە دوور و درێژە لەماوەی دیاریکراودا بەتەواوی تۆمار بکەین و تەقەی لێوە بینین و لەماوەی (١٢) کاتژمێردا لە (٨) بەیانییەوە بۆ (٨) ئێوارە بەردەوام بووین.

لەمێژووی درامای تەلەفزیۆنی کوردی، (خۆتان بگرن هات) بووە یەکەمین بەرهەمی دراماییی رەنگاوڕەنگ کەدرامایەکانی پێش ئەو لەسەرتاسەری کوردستان بەرەش و سپی تۆمارکرابوو، لە تەلەفزیۆنە تاقانەی کەرکووك بە (٨) ئەڵقە پیشاندرا و بینەرانی کورد پێی دڵخۆش بوون.

## چیرۆکەکانی مام سمایل

شانۆیی چیرۆکەکانی (مام سمایل) لەعەرەبیەوە مامۆستا هەژار سابیر وەریگێڕابوو و دەرهێنانی سەعدون یونس بوو، ئەم شانۆییە ئاهەنگ ئامێز بوو، نواندن لەناو هۆڵ واتە لەناو جەماوەر و لەسەر تەختەی شانۆ بوو، لە (هۆڵی گەل) پێشکەشمان کرد.

لەم شانۆییەدا جگە لەخۆم ئەم ئەکتەرانە بەشداری نواندنیان کرد (سەلام کۆیی، واحید مەرجان، عەلی ئەحمەد، سەلام عەدۆ، موفەقە رەش، هەژار سابیر، فەیسەڵ محەمەد ساڵح، سیروان عوسمان، مەغدید، ئەنوەر عەزیز، خەلیل یابە، ئەسعەد عومەر).

بەرهەمەکە لەرێگای بەڕێوەبەرایەتی رۆشنبیریی جەماوەر بوو.. پتر لە (٨) رۆژ نمایش بەردەوام بوو و جێگای رەزامەندی جەماوەر بوو.

دوای چەند رۆژێک لەپشوودان، شانۆیی (مام سمایل)مان بردە هاوینەهەواری (سەرسەنگ) و لەوێش ئێوارەیێك نمایشمان کرد و لەسەر شانۆ مامۆستا واحید مەرجان کردییە بەزم و رەزمی خۆی و لەکاتی دیالۆگ دەستەواژەی (خۆشە موشە)ی زۆر بەکاردەهێنا و هەر جارەی بەشێوازێك و ئێمەی ئەکتەرانی دەهێنایە پێکەنین، بەڵام بەوە باش بوو جەماوەری ئامادەبوو هەموویان خەڵکی بادینان بوون و باش لەدیالۆگەکانمان نەدەگەیشتن و کارەکەمان بەسەلامەتی مەیسەر بوو.

# وڕێنه

هەر ئەوان ڕۆژان، من جگە لەکاری نواندن و شانۆ، سەرقاڵی خوێندنەوە و چیرۆك نووسینیش بووم، زیاتر دەمخوێندەوە و کەمترم دەنووسی، پێنج شەمووان کەرۆژنامەی (هاوکاری) دەگەیشتە هەولێر بەپەلەپەل دانەیەکم دەکڕی و لەدوا لاپەڕەوە خوێنەری بووم و زۆربەی وتار و بابەتەکانم دەخوێندەوە و هەر بەراستی (هاوکاری)م زۆر خۆشدەویست و گەر پێنج شەممەیەك دوا کەوتبا و نەگەیشتبا هەولێر ئەوا ئەو شەوە خەوم لێنەدەکەوت و بۆ بەیانی ڕۆژی هەینی لەلای کاك (جومعە تەها)ی خاوەنی کتێبخانەی (تەئمیم) دەبوومە ئێشکگر و بەر مەکتەبەم چۆڵ نەدەکرد هەتا (هاوکاری) دەگەیشت و دانەیەکم دەکڕی و بەکەیف خۆشی و ڕۆژنامە لەباوەشم ئینجا دەچوومەوە ماڵ و ئاسوودە دەبووم.

بەشانازییەوەش، یەکەمین کورتە چیرۆکم، دوای کورتە چیرۆکەکەی ئۆردوگای زێوە (سەنگەرێکی تر)، لەهاوکاری و لەرێکەوتی (١٩٧٨/١١/٢٠) و لەژمارە (٤٤٩) بڵاوکرایەوە بەناوی (وڕێنە).

ئای لەو ڕۆژەی لاپەڕەکانی هاوکاریم ئەمدیو و ئەودیو دەکرد لەپڕ چاوم بە (وڕێنە)کەم کەوت کەبەناوی (ظاهر عبدالله) بڵاوکرابۆوە.. خەنی بووم ما ڕۆژنامەکە بەدەستەوە بگرم و پێشانی ئەم و ئەوی بدەم و پێیان بڵێم ئەوە چیرۆکی منە و لە (هاوکاری)یە ئازیزەکەم بڵاوکراوەتەوە، ئەو بەزم و ڕەزمە نزیکەی یەك مانگی خایاند و ڕۆژنامە بەستەزمانەکە لەبن دەستم داد و بێدادی بوو، هەر بەرێکەوتیش لەگەڵ برا و هاوڕێی ڕۆژنامەنووس کاك (شێرزاد عەبدولڕەحمان) کەئەوکاتە لە (هاوکاری) کارمەند بوو، سەفەری بەغدامان کرد و لەوێ چووینە دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی کوردی و سەردانی ڕەوانشاد و

بلیمەتی بواری ئەدەب و رۆشنبیری کوردی (مەحمود زامدار)مان کرد، لەوێ (زامداری) نەمر کتێبی (لەبانێژەی شیعرەوە) خۆی بەدیاری پێشکەش بەمێوانەکانی دەکرد، دانەیێکی لەکتێبەکە پێشکەش کردم و نووسیبووی (کاك زایەر عەبدوڵڵا) دیارییە. لەهەینێوە من وازم لە (ظاهر) هێنا و لەبواری نواندن و نووسین کردمە (زایەر). پاش ئەوەی لەلای زامدار دەرچووین، شێرزاد بردمییە ژوورێك، لەوێ پاداشتی چیرۆکەکەم کە (٨) هەشت دینار بوو وەرگرت، دواتر چووینە بازاڕ و بەو هەشت دینارەی (وڕێنە) کراس و پانتۆرێکی سادە رەشم کڕی و هەندەکیشم بۆ مایەوە، دواتر ماوە ماوە کورتە چیرۆك و چیرۆکی زۆر کورتم دەنارد بۆ (هاوکاری) و بڵاو دەکرایەوە و خوێنەرانیش وەك چیرۆکنووس ناسیمیان، هەر ئەو ساڵانە لەلایەن مامۆستا و نووسەرە دیارەکانی وەك (حوسێن عارف و مستەفا ساڵح کەریم)و یەك دووانی دیش لەگۆشە تایبەتیەکانیان لەوتارە ئەدەبیەکانیان ئاماژەیان بەچیرۆکەکانم دەکرد و گرنگیان پێدەدا و منیش پتر ئەزموونم لێوەردەگرتن و لەنووسین قاڵتر دەبووم.

## کۆمەڵەی رەنجدەران

ساڵی (١٩٧٩) کەهێشتا هەر قوتابی ئامادەیی پیشەسازی کارەبا بووم، پتر هامووشۆ و هاوڕێیەتیم لەگەڵ کوردۆ گەلاڵی و سیروان عوسمان کەلەگەڵ هەردووکیشیان لەبواری شانۆ و نواندنیش هەر بەیەکەوە بووین، هەروەها شێرزاد عەبدولڕەزاق و فازیل عەبدولڕەزاق کەهاوپۆل بووین، ئەو پێنجەمان بەردەوام بەیەکەوە بووین.. زۆرجاران هەر کەباس دەهاتە سەر سیاسەت و کوردایەتی هاوڕا و هاودەنگی یەك بووین.. تا رۆژێکیان بەدەم پیاسەی ناو بازاڕ کوردۆ گەلاڵی و شێرزاد عەبدولڕەزاق بابەتی شۆڕشی نوێ و کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستانیان هێنایە پێشەوە و زۆر بەدڵنیاییەوە پێشنیازییان بۆ کردم کەئەگەر مەبەستمە ئەوە ئەوان دەتوانن وا بکەن من ببمە ئەندام لەرێکخستنی نهێنی کۆمەڵە، پرسیم ئێوە ئەندامن؟ دیسان بەدڵنیاییەوە گوتیان بەڵێ ئێمە ئەندامین و پێمان باشە تۆش ببیە ئەندام، ئیتر زۆر بەخۆشییەوە پێشنیازەکەیانم قبووڵ کرد و پاش هەفتەیەك مۆژدەی بوونە ئەندامیان پێڕاگەیاندم.

دەبێ بڵێم، من ئەوکاتە وەك گەنجێکی خوێن گەرم و دڵسۆز بەنەتەوەکەم تەنها مەبەستم کوردایەتی و بەرەی گەل و دژایەتی رەفتارە دزێوەکانی رژێمی فاشیزمی بەعس بوو، وەکیدی زۆر و کەم سەرم لەسیاسەت دەرنەدەچوو، دەمزانی پێشمەرگە پەیدا بۆتەوە، شۆڕش هەڵگیرسایتەوە و جێگای ئومێدی کوردە، بەلام بەر لەبوونە ئەندام لەکۆمەڵە نە بڵاوکراوەیێك نە هیچ پەیڕەو و پرۆگرامێکی ئەم رێکخراوەم نەدی بوو و نەخوێندبۆوە، لەبەرئەوەی زیاتر گرنگیم بەبواری هونەر و ئەدەب دەدا بەلامەوە گرنگ نەبوو خۆم سەرقاڵی لایەنی سیاسی و رێکخستن بکەم، هەر سەریشم لێ دەرنەدەچوو، زۆرجاران

لەدانیشتن و کۆبوونەوەکانمان هەر کەباسی ڕێکخستن و کۆمەڵە و یەکێتی نیشتمانی کوردستان و ناکۆکی نێوان یەکێتی و سۆشیالیست و یەکێتی و پارتی و حیزبی شیوعی و حیزبەکانی دی دەکرا من تەقەی سەرم دەهات و وەك پێویست هیچیانم بۆ لێك جیا نەدەکرایەوە.

لەڕێکخستنی نهێنی کۆمەڵە ناوی نهێنیم (هێور) بوو، لەو ماوەیەدا دوو سێ جار بەتەنیا لەگەڵ کاك (ئازاد جوندیانی) وەك لێپرسراوی ناو شاری (کۆمیتەی راپەڕین) دانیشتن و کۆبوونەوەم بووە.. بڕواتان هەبێت ئەو قسەی دەکرد و من گوێگر، کەچی نیوە لەنیوەی تێنەدەگەیشتم باسی چی و لەسەر چ بابەتێك دەدوێ.. شەرمیشم بەخۆ بوو پێی بڵێم: کاکە من لەو قسانەی تۆ تێناگەم و سەرم لەسیاسەت دەرناچێ، چونکە لەدڵی خۆم دەمگوت: ئەوانە حیسابی تایبەتی بۆ من دەکەن وەك نوسەر و هونەرمەند، چۆن دەبێ من بەخۆم پێی بڵێم: کاکە من هونەرمەند و نووسەرم و لەسیاسەت و کاری ڕێکخستن تەقەی سەرم دێ ، بۆیە هەر سەرم بۆ رادەشاند وام پیشان دەدا کەسەد لەسەد لەقسەکانی دەگەم و لەبوارەکەدا زۆر چاك شارەزام، کەهیچ وانەبوو.

لەئامادەیی پیشەسازی کارەبا جموجۆڵ و چالاکیمان زۆر بوو، بەهەلێپەی گەنجایەتی بەبێ ترس و سڵەمینەوە قوتابیانمان ڕێك دەخست و بڵاوکراوە نهێنییەکانمان دابەش دەکرد، ژمارەیێك قوتابی سەرکێش و دڵئازا بوو بووینە هاوڕێی یەکتر، بەڵام مەرج نییە هەموومان لەڕێکخستن بەیەکەوە بووبین، لەوانە عەبدولستار حاجی ئەحمەد، سابیر عەبدوڵڵا (شەهید ئاشتی)، سعاد کچە هەولێرییەکی بەخانەوادە کۆمەنیست، قادر شەریف، موفەق دەرگەڵەیی، فەخرەدین زراری، موفەقە رەش، رزگار عەبدوڵڵا، عیمادە قەڵەو و کوردۆ گەلالی، هێندە بێمنەت و بەئاشکرا کارمان دەکرد زۆرجاران بەرپرسی (ئیتیحادیەکان) سەلاح ناوێکی عەرەب بوو لێمان دەپاڕایەوە دەیگوت:

– تکات لێدەکەم.. من ئێوەم خۆشدەوێ حەز ناکەم تووشی کێشە و گیروگرفت ببن، وا بەئاشکرا ئیش دەکەن کەمێك مساعەدەی من بکەن.. گەر رەحم بەخۆشتان ناکەن، رەحم بەئێمە بکەن.

کەچی ئێمە بێ سڵەمینەوە و بێ رێوشوێن گرتنەبەری ئەم جۆرە کارە ترسناکانە، لەکاری رێکخستن کە هیچ نهێنیمان نەبوو بەردەوام بووین، من یەك لەبارە خۆم حەزم دەکرد هەموو مامۆستا و قوتابیان بزانن من لەکاری رێکخستن ئیش دەکەم و کوردایەتی دەکەم، بیرم لەخەتەرییات و پاشەڕۆژی ئەم هەڵسوکەوتەم نەدەکردەوە. ئامادەیی پیشەسازی کارەبا قوتابی (کچ و کوڕ)ی تیا بوو، ئێمە چەند کچێکمان رێکخست و کارییان لەگەڵدا دەکردین، لەوانە دوو خوشکی ئازا و تێکۆشەر و چاونەترسم لەبیرە.. هەردوو خاتوون (ئاشتی ئیبراهیم فەندی و خەجیج کەبە (خەجە هیرانی) ناسراو بوو).

زۆربەی ئێوارانیش دوای دەرچوونمان لەقوتابخانە، بەیەکەوە (من و شێرزاد عەبدولڕەزاق و دڵداری مەلا ئەحمەد قادر و سابیر عەبدوڵلا (شەهید ئاشتی عەبدوڵلا) و سیروان عوسمان و کوردۆ گەلاڵی و فازیل عەبدولرەزاق) دەچووینە بارێك لەتەیراوە و لەنزیك گازینۆی عەنتەری (بارِ سەنابل) لەوێ وەك نیمچە کۆبوونەوەیەك لەگەڵ نۆکاوە بەتام و چێژەکەی و بەبیرەی سارد سەرمان گەرم دەکرد و قسەی گەورە گەورەی سیاسیمان دادەمەزراند و (دڵدار)یش بەدەنگە خۆشەکەی (قەلبی من)ی سامی عەودالّی بۆ دەگوتین و هێندەی دی گوڕ و جۆش و هەڵپەی زیاد دەکردین و ئەوەی ترس بوو بەخەیاڵماندا نەدەهات.. بەڵام لەبێ عەقڵی و لەنەکاملی و دەڵەمەیی ئەزموونی سیاسیمان بوو نەك ئازایەتی و شتی دی.

## هەبوو نەبوو

ئێمە لەسەر کارە هونەرییەکانمان لەبواری شانۆ هەر بەردەوام بووین، باوکیشم بۆ بینینی هەموو بەرهەمەکانمان دەهات و پڕ بەدڵ چەپڵەی بۆ لێدەداین و منی هان دەدا.. هێندە بەگەرم و گوڕی لەکۆتایی شانۆییەکان و لەکاتی چوونە سەر شانۆمان بۆ سڵاوکردن لەجەماوەر چەپڵەی بۆ لێدەداین تاکار گەیشتە ئەو رادەیەی هەر کەباوکم دەهاتە ناو هۆڵ.. چەتۆ حەسەن دەیگوت:

– ئەوە دیسان حاجی چەپڵە هاتەوە.

هەروەك دیارە کەئەم بەرهەمانە پێشکەشکراون من هەر لەقۆناغی قوتابیاتی دا بووم، بەراستیش هێندە گرنگیم بەوانەکانم نەدەدا چونکە پتر لەگەڵ هونەر و ئەدەب هۆگر بوو بووم، لەلاییێکی دیش مامۆستاکانی ئامادەیی پیشەسازی کارەبا منیان وەك ئەکتەر و هونەرمەندێکی شانۆیی ناسی بوو لەزۆر وانە و سەعی و تاقیکردنەوە چاوپۆشیان لێدەکردم و وەك برادەرمان لێهاتبوو. وەکی دی دەرسەکانمان بەمن هەزم نەدەکرا و هەرساڵێکم بەدوو ساڵ دەبڕی.. واتە لەبواری کارەبا و ئەندازەکەی زیرەك نەبووم و لەوانەی نەزەری و عەمەلی هیچ باش نەبووم و زۆر بەزەحمەت دەردەچووم. هەنوکەش نازانم پلاکێکی کارەبا ببەستم.

لەم سەروبەندە، دەزگای سینەما و شانۆی سەر بەبەغدا لەهەولێر کرایەوە و یەکەمین بەرهەممان شانۆیی (هەبوو نەبوو) بوو.

(هەبوو نەبوو) دەقە عەرەبی و ئەسڵییەکەی لەنووسینی هونەرمەندی گەورەی عێراقی (قاسم محەمەد)ە. دیارە بەمەبەستی کارکردن لەم بەرهەمە مامۆستا سەباح عەبدولڕەحمان دەقە عەرەبییەکە دەداتە نووسەری بەتوانای

بواری فۆلکلۆر مامۆستا (عومەر شێخەڵڵا) تا بیکاتە کوردی.

جا بەراستی مامۆستا عومەر هێندە بەجوانی و بەهەستێکی کوردانە بەرهەمەکەی وەرگێڕا، وەهای کوردانبوو گەر بەخۆمان نەمانگوتبا دەقەکە بەئەسڵ عەرەبییە کەس هەستی پێنەدەکرد.

بۆ دەق دابەشکردن و خوێندنەوەی سەرەتایی دەرهێنەر هەر لە (هۆڵی گەل) کۆیکردینەوە و دەقەکەمان وەرگرت و قۆناغی خوێندنەوە و پرۆڤەی سەرەتایی دەستپێکرا.

گرنگە ئاماژە بەچەند پێشهاتێك بکەم لەسەرەتا و ڕۆژانی یەکەمی پرۆڤە لەم بەرهەمەدا:

یەکەم: هەر کەدەورەکان دابەشکران، ڕۆڵی (ڕەجەب) درایە مامۆستا واحید مەرجان و چەند ڕۆژێکیش لەخوێندنەوە و پرۆڤە لەگەڵمان بوو زۆر عەجایب دەوری (ڕەجەب)ی ئەدا دەکرد.. کەچی پاشتر بەبیانووی ئەوەی مامۆستا (واحید) ئەم هەموو دیالۆگەی پێ ئەزبەر ناکرێ و زەحمەتە، لەپشت پەردەش ئاگادار نەبووم چی ڕوویدا و چۆن دەورەکە لەم وەرگیرایەوە و درایە مامۆستا (سەعدون)، بێگومان ئەویش زۆر زۆر سوودی لەخوێندنەوە سەرەتاییەکەی م. واحید بینی و کردییە بناغەی نواندن لەبەرجەستەکردنی کاراکتەری (ڕەجەب).

دووەم: من بۆ خۆم سەرەتا ڕۆڵی (بازرگان)ەکەم پێدرا، ئەو دەورەی پاشتر درایە هونەرمەند (قاسم عەزیز). لەڕۆژانی پرۆڤە و خوێندنەوە من هەر کاراکتەری بازرگانەکەم دەخوێندەوە.. هونەرمەندی جوانەمەرگ (سوبحی کۆیی) ڕۆڵی (ئۆمەرە گەدەی چاوچنۆك)ی پێسپێرا بوو زۆر بەسەلیقەش ئەدای دەکرد.. کەچی پاش چەند ڕۆژێك کەهێشتا لەقۆناغی خوێندنەوەدا بووین (سوبحی) وازی لەڕۆڵی (چاوچنۆك) هێنا بەهۆی ئەوەی ئەندام بوو لە (تیپی هونەرە میللییەکان) و ئەوانیش لەسەروبەندی سەفەری (فەرەنسا)دا بوون تا

لە (پاریس) تابلۆکانیان نمایش بکەن و لەخۆشی سەفەرەکەی دەستبەرداری رۆڵەکە بوو، دەرهێنەریش یەکسەر بەرجەستەکردنی رۆڵەکەی بەمن سپارد، بۆ مێژووش دەڵێم: منیش سوودێکی زۆرم لەئەدا و خوێندنەوەکەی هونەرمەندی جوانەمەرگ (سوبحی کۆیی) بینی و لەرۆڵی (ئۆمەرە گەدەی چاوچنۆك) بەکارم هێنایەوە و هەلێکی باش بوو بۆ دەرخستنی پتری بەهرەم لەنواندندا.

(هەبوو نەبوو)ش هەر لەسەر تەختەی شانۆی (هۆڵی گەل) نمایش کرا و دەنگی دایەوە و سەرکەوتنێکی بێوێنەمان تۆمارکرد و پتر لە (١٠) رۆژ بەردەوام بووین کەئەوکاتە (هۆڵی گەل) جێگا و کورسی پتر لە (٨٠٠) هەشت سەد کەسی تیادا بوو جگە لەو رۆژانەی ناوەڕاستی هۆڵەکە و بەردەمی شانۆش خەڵك پڕیان دەکردەوە و تامەزرۆی بینینی نمایشەکە بوون.

پاشتر ستافی (هەبوو نەبوو) سەفەری بەغدامان کرد و بەشدار بووین لە (فێستیڤاڵی شانۆ)ی سەر بەدەزگای گشتی سینەما و شانۆ و لەزۆربەی شارەکانی عێراقەوە بەرهەمی شانۆیی لەم فیستیڤاڵە پێشکەشکران.

ئێمە نمایشمان لەسەر شانۆی (شانۆی گەڕۆك) (مسرح الجوال) بوو، کەرۆژی پاشتر و بەیانیەکەی کۆڕی بۆ گیرا و گفتوگۆ لەسەر بەرهەمەکە کرا و بەدانپێنانی هونەرمەندانی بەغدا و زۆربەی شارەکان شانۆی (هەبوو نەبوو)ی کوردی ئێمە زۆر سەرکەوتووتر بوو لەشانۆگەریەکە بەزمانی عەرەبی و بەناوی (کان یا ما کان) کەهونەرمەندانی بەغدا پێشکەشیان کرد.

هەر لەسەرەتای ساڵی (١٩٨٠)، جارێکی دی ستافی (هەبوو نەبوو) روومان لەبەغدا کردەوە و لەئوتێل (دونیا) دابەزین و رۆژانە دەچووینە ستۆدیۆی تەلەفزیۆنی بەغدا لەساڵحیە بۆ تۆمارکردنی دیمەنەکانی شانۆییەکە و (نەبیل یوسف) دەرهێنەری بەرهەمەکەمان بوو. پاشتر درایە تەلەفزیۆنە تاقانەکەی کوردان (تەلەفزیۆنی کەرکووك) لەوێ پێشاندرا و دەنگی دایەوە و منیش شەرەفی ئەوەم پێبڕا کەلەدونیای دراما و شانۆ بە (ئۆمەرە گەدەی چاوچنۆك) بەناوبانگ بمو شانازیشی پێوە بکەم.

## هەنگوینە شیرینەکە

هـەر لـەدێر زەمانـەوە و لـەباوك و باپیرانمـەوە پەیوەنـدی و دۆسـتایەتی خانەوادەیی لەگەڵ زۆرێك لەخانەوادە رەسەنەکانی شـاری کۆیـەمان هـەبووە و پەرەی پێدراوە، بەر لەهاتنی باپیرەم (خدر سمێر سۆر) بەگـەنجی بـۆ شـاری هەولێر و لەگەڵ دروست بوونی حکومەتی عێراق و دامەزراندنی بەپۆلیس، باوك و برا و خوشك و ئـامۆزا و خـزم و کەسـەکانی لـەدێی (ئاریـان)ی نزیـك کۆیـە و لەناو عەشیرەتەکەی خۆیان (گەردی) ژیانیان بەسەر بردووە. هیچ کاتێك ئێمە بەشاری کۆیە نامۆ نەبووین، خزم و کەس و دۆستی باوك و باپیرم کۆیی بوونـە و لەگەڵیاندا لەهامووشۆدا بووین.

بەپێی ئەوەی من کوڕی گەورەی خێزانەکەی خۆمـان بـووم، جـارێ قوتـابی ئامادەیی بووم باوانم کەڵ کەڵەی ژن هێنانیان بۆ من کەوتە سەر و هەوڵیان بـۆ دەدا. (نـەزیرە) خـانی ئـامۆزای بـاوکم بـووکی کۆییـان بـوو لەگـەڵ کـاك (سەمەد)ی شوفێر هاوسـەرگیری کردبـوو، نـەزیرە هـەر کەدەهاتـە مـاڵی ئێمـە لەهەولێر، یان کەدایکم دەچووە لای لەکۆیـە، باسـی کچێکی بـرازای سـەمەدی دەهێنایە گۆڕێ و دەیگوت:

– پوورزا (ئاخر لەگەڵ دایکیشم پوورزا و خاڵۆزا بوون) شیرینی کاکم سـابیری هەر لەزاهیرنگۆ دەوەشێتەوە. زۆر حەز دەکـەم بەنسـیبی یـەکبن و لەدەسـتە خۆتانی مەدەن چونکە داخوازی زۆرە.

ئەو رۆژەی بەکۆستەرەکەی باوکم تـەواوی خێزانەکـەمان چـووینە کۆیـە بـۆ ماڵی (مام سەمەدی سایەق) تا هەموومان (شیرین) لەنزیکەوە ببیـنین و ئەگـەر کرا داوای بکەن بۆ من، هەینێ مـن لـەقۆناغی دووەمـی ئامـادەیی پیشەسـازیی کارەبـا دەمخوێنـد و هێشـتا قوتـابی بـووم، بـەڵام وەك ئەکتـەر و هونەرمەنـد

ناسراو بووم و هەردوو دراما (خۆتان بگرن.. هات و هەبوو نەبوو) لەتەلەفزیۆن پەخشکرابوون و دەنگیان دابۆوە.

دوای بینین و هەڵسەنگاندنی هەڵسوکەوتی (شیرین) لەلای ئێمەوە مایەی پەسندکردن و بەدڵخۆشیەوە رەزامەند بووین، بەتایبەتی من هەر زوو بەزوو خرپنی و چاوە سەوز و جوانەکانی کۆت و بەندیان کردم و لەدڵەوە عاشقی بووم.

ئەوانیش هەر لەنەزیرە و مام سەمەد و مام سابیری باوکی شیرین و یا نەزیفی دایکی و فریاد و هەڵمەتی جووتە برا رەزامەند و مەردانە و کۆییانە هاتنە پێشێ و هەر زوو بەزوو تەدارەکی مارەکردن و کڕینی پێداویستی جێ بەجێکرا.

لەرۆژێکی باراناوی لەرێکەوتی (١٩٨٠/١٢/١٢) بە (لادە) تایبەتییەکەی کاکە نەوزادی ئامۆزام و مام رەسول پاقڵاوەچی لەپێشەوە و من و شیرین لەدواوە و کۆستەری باوکم و کاروانی ترومبێلی خزم و کەس و دۆستەکانمان بەدوامانەوە بەرەو هەولێر کەوتینەڕێ و بارانیش هەر دەبارێ، نەخێر لەدێگەڵە دەرچووین باران گۆڕا و بووە تەرزە و دایکرد.. منیش هەر بۆ پێکەنین و خۆشکردنی کەشی ناو ترومبێل گوتم:

– وەڵڵاهی نەك تەرزە.. بەردیش ببارێ هەر دەیبەم.

ئەو رۆژە ماوەیێك بوو شەڕی نەگریسی (عێراق و ئێران) هەڵگیرسابوو شەوان کارەبا دەپچڕا و دەبوایە لەبەر رەحمەتی چرا و لامپە و فانۆس شەوگار بەڕێ بکەین، ئەو رۆژیش بەشەوەکەی کارەبا نەبوو لەگەڵ هاوژینە تازە بووکەکەم بەتیشکی روناکی چراێکی کز شەومان بەڕێکرد و درێژەمان بەژیانی پڕ لەسەروەری و تاڵ و شیرینی و هەوراز و نشێوی رۆژگار دا. زوو بەزووش هۆگری یەکبووین و پێکەوە گونجاین.. بەرۆژانەیێك کەدایکم بۆمانی بڕیبۆوە و

بەجیا بەشی من و هی شیرین، ژیانمان بەڕێدەکرد.

(شیرین) دەیزانی هێشتا من قوتابیم و جاریَ ماوەمە ببمە خاوەن کیسەی خۆم، لەتەلەفزیۆنیش تەمسیلییەکانی منی بینیبوو دەیزانی لەم بوارەشدا کار دەکەم، منیش زوو بەزوو زانیم (شیرین) بەئاگایە لەکایەکانی ژیان و روحێکی هونەری جوانی هەیە و یەکە یەکەی هونەرمەندان لەگۆرانیبێژ و ئەکتەرەکان دەناسێت یەکجار سەرسامیشە بەدەنگە زولاڵەکەی کاکە حەمە جەزای هونەرمەند.

سەیرەکە لەوەدا بوو، منی تازە زاوا و قوتابی پۆلی دووەمی ئامادەیی پیشەسازی ئەو ساڵە لەخوێندن دەرنەچووم و کارتی ساقیتیم وەرگرت و هەرتك هەرتك چوومە ماڵێ و بەدزی و لەژوورەکەی خۆمان پێشانی شیرینم دا و دەستم بەگریانێ کرد، کەچی ئەو دڵی دامەوە و بەسۆزی هاوسەرێکی سەنگین و دڵسۆز فرمێسکەکانی سڕیمەوە و گوتی:

– ئەو سار نا سارەکی دی عەجەلەت چییە؟ باشتریشە چەند لەخوندنێ تاخیر بی ئەوەندە درەنگتر تووشی عەسکەری دەبی، کەس نازانی خێر لەچ دایە.

بەمشێوەیە لەژیانی هاوژینی بەردەوام بووین، (شیرین)یش وردە وردە لەگەڵ هاوڕێ و هاوکارانم لەبواری شانۆ ئاشنایەتی پەیداکرد و هاموشۆی ماڵی یەکترمان دەکرد، قەت لەبیرم ناچێت تازە بووك و زاوا بووین و رۆژێك بەدوان چووینە بازاڕ لەسەر رێگای خۆمان سەردانی ماڵی برا و هونەرمەند رەوانشاد (جەلال بەیار)مان کرد، لەوێ دایکی و خوشکەکانی دەورەیان داین و مەجلیسمان گەرم کرد و بەر لەهەڵسانیش جەلال بەیار (لایتێکی سەر مێزی) وەك دیاری هاوسەرگیریمان پێشکەشکردین.

لەگەڵ هونەرمەند (ئیبراهیم حەکیم) دۆستایەتیمان خۆش بوو بەکفتەی

رواندزییان داوەتی ماڵێی کردین و برایەتیمان بەتینتر بوو.

بەحوکمی ئەوەی من پێشتر برایەتی و بەینم لەگەڵ سەمیرە خان و کاك سەعدون خۆشبوو، (شیرین)یش زوو بەزوو هۆگری (سەمیرە) بوو هەر بێتاقەت ببا دەمبردە لای سەمیرە و ئەویش خوشکانە باوەشی بۆ دەکردینەوە و لەچێشتە بەلەزەتەکانی بێبەشی نەدەکردین.

لەبواری رێکخستنیش لەکۆمەڵەی رەنجدەران، کەبۆم ئاشکرا کرد کەمن وەك ئەندام هەڵسوڕاوێکی رێکخستنم بەنهێنی هەوڵ و تێکۆشان دەکەین، لەبەر پێویستیمان بەژنێکی بەئاگا و جەسۆر تا بەهانای کچە قوتابیەکانی رێکخستن بێت بۆ سازدانی کۆبوونەوە و ئاڵوگۆڕی چاپەمەنی و بڵاوکراوە نهێنییەکان کونجێکمان هەبێت، دوای قسەکردن لەگەڵ هاوڕێیانم و رەزامەندی نواندن، لەماڵەوە و بەنهێنی قسەم لەگەڵ (شیرین) کرد و ئەویش بەجۆش و خرۆشەوە پێشنیازەکەی پەسند کردم، بۆ ئەم مەبەستە داواکاریمان بەنوسراوێك گەیاندە سەرووی خۆمان لەرێکخستنە نهێنییەکان و بۆ (کۆمیتەی راپەڕین) رەوانەکرا.

ماوەییێکی پێچوو، پاش نیوەڕۆییێك کەلەئامادەیی پیشەسازی وانەی (عەمەلی)مان هەبوو و بەدلەی شینمان لەبەر بوو، لەدەرفەتێکدا (شێرزاد عەبدولرەزاق) هاتە لام و گوتی:

– با بچینە دەرەوە.. لەشاخەوە میوانێکمان بەنهێنی هاتووە و دەیەوێ چاوی بەئێمە بکەوێ.

هەر کەچووینە دەرەوە و لەشەقامەکە پەڕینەوە سەیرم کرد (لۆرییێکی) گەورە لەلا کۆلانێك وەستاوە، شێرزاد گوتی:

– با بچینە لای ئەم لۆرییە.

کەگەیشتینە لای (لۆرییەکە) سەیرم کرد کەسێکی رەشی سمێل رەش لەپێشەوەی قەمەرەکە دانیشتووە دەرگای کردەوە و هاتە خوارێ و خۆی

گەیاندە لای ئێمە.. ئەوە هاوڕێ (وەرزێر) بوو، چاکەت و پانتۆرێکی رەشی بەڵ و گەورەی لەبەر کردبوو، بەراستی من سەرەتا لێی سڵەمیمەوە وامزانی ئەو ئەفەندییە سمێر رەش و رووخسار رەشە عەرەبە و ئەمنە و ئەوە تەڵەیە بۆ ئێمەیان ناوەتەوە تا ئاشکرامان بکەن و دەسگیرمان بکەن.

ئەوە بوو هاوڕێ (وەرزێر) لەگەڵمان کەوتە قسە، دیار بوو پێشتر لەگەڵ شێرزاد یەکتریان دیبوو بەیەك نامۆ نەبوون.. ئیدی (وەرزێر) تێیگەیاندین کەبەمەبەستی ئەنجامدانی چەند کۆبوونەوەیێك و جێبەجێکردنی چەندین چالاکی پێشمەرگانە هاتووە و پێویستە ئێمەش هاوکاری بین.. هەر لەم دیتنە نوسراوێکی فەرمی لەناوەندی کۆمەڵەوە و لە (کۆمیتەی راپەڕین)ەوە بۆ من هێنابوو و تەسلیمی کردم.. هەر کەخوێندمەوە تێگەیشتم رەزامەندی لەسەر بەئەندام بوونی (شیرین) دراوە، لەبیرمە سەرەتای نوسراوەکە بەدێرێکی هۆنراوەی (بێکەسی) شاعیر دەستی پێکردبوو کەدەڵێ:

نێر و مێ هەردوو بەجووتە بۆ وەتەن هەوڵێ نەدەن

دوورە دەرچوونی لەزیلەت، مەل بەباڵێ نافڕێ

لەو رۆژەوە پشتمان لێکردەوە و هەر راسپاردە و کۆبوونەوە و بڵاوکراوەیێك هەبوایە بۆ کچەکانی رێکخستن، (شیرین)مان کردە ئەڵقەی پەیوەندی و ژوورەکەی ئێمە بووە مەکۆی کۆبوونەوەکانیان و هاوڕێی شەهید (ئاشتی عەبدوڵلا)ش سەرپەرشتی دەکردن، لەیەکەمین کۆبوونەوەش کەلەژوورەکەی ئێمە کرا و (شیرین)یش یەکەمین کۆبوونەوەی بوو، هەر کەخاتوو (ئاشتی ئیبراهیمە فەندی) هات، دیارییێکی جوانی بۆ هێنابووین بەبۆنەی هاوسەرگیریمان.

بەمجۆرە خۆشاوی هەنگوینی هاوژینی من و شیرین.. شیرین و بەبۆن و بەرامتر بوو.

## محەمەد و سێوێ

سەرەتا دەبێ بڵێم من بەهیچ جۆرێك ئاگام لەوە نەبوو کەبرا و هاوڕێم (نازم دڵبەند) کەینێ و بەچ جۆرێك دەقێکی شانۆیی بەناوی (محەمەد و سێوێ) داوەتە مامۆستا (سەعدون یونس) تا کاری دەرهێنانی بۆ بکات، هیچ ڕۆژێکیش (سەعدون) ئەم بابەتەی لەگەڵ مندا باس نەکرد بوو.

ئەوکاتە من وەك گەنجێك عاشق بەئەدەب و بابەتە فۆلکلۆرییەکان، عەودالْ و سەوداسەری دەنگە ڕەسەنەکەی هونەرمەندی میللی (حەسەن سیساوە) بووم و یەکێك لەو کاسێتە دەنگیانەی کەبەردەوام گوێم لێڕادەگرت و لەگەڵێدا دەژیام.. بەسەرهاتی (محەمەد و سێوێ) بوو بەدەنگی مام حەسەن.

هەر ئەو عەشقەش بوو وای لێکردم بەسەرهاتەکە بەشێوە و فۆڕمی شانۆیی دابڕێژمەوە و بۆ دڵنیابوونیشم کەدەقێکی سەرکەوتووم نووسیوە، پێشانی هەریەك لەهونەرمەندی شانۆکار (قاسم عەزیز) و شاعیر و نووسەر (کاروان عەبدوڵڵا)م دا کەئەوکاتە زۆر ڕەفیق و دۆست بووین و بەردەوام بەیەکەوە بووین، ئەوانیش لەگەڵ چەند وردە تێبینیەك دەقەکەیان بەدڵ بوو و دەست خۆشیان لێکردم.

بۆ بەرهەمی دووەمی تیپی دەزگای سینەما و شانۆ لەپاش (هەبوو نەبوو)، سەعدون بەدوای دەقێکدا دەگەڕا کەبیکاتە بەرهەمی دووەمی تیپەکە، هەر کەباسی دەقەکەی خۆم (محەمەد و سێوێ)م لەلا کرد گوتی:

– بیهێنە با بیخوێنمەوە بزانم چۆنە؟

هەر کەدەقەم دایێ و پاشتر یەکتریمان دیتەوە، سەیرم کرد چەند تێبینییێکی لەڕێڕەوی سیناریۆ و ڕووداوەکان هەیە و بۆ (دیالۆگ)یش گوتی زۆرباشە و هیچ عەیبی نییە، ئیتر تێبینییەکانم لێوەرگرت و بەپێی پێویست شانۆگەریەکەم جارێکی دی داڕشتەوە و سوودم لەتێبینیەکانی وەرگرت،

کەچی دواتر ناچاری کردم لە (ڤولدەر)ی بەرهەمەکە بەوە رازی بم کەدەقەکە نووسینی هەردووکمانە و ئەو بەسیناریۆ و من بەدیالۆگ هاوکاری یەکترمان کردووە.. هەرواش کەوتەوە و لەڤۆلدەر نووسرا نووسینی/ زایەر عەبدوڵڵا و سەعدون یونس.

ئیدی (محەمەد و سێوێ) بووە دووەمین بەرهەمی تیپەکە و کاك (نازم دڵبەند)یش هەر کەزانی دەقێکی تری (محەمەد و سێوێ) کاری لەسەر دەکرێ دڵی لێمان رەنجا و کەوتە دژایەتی کردنی بەرهەمەکە، منیش ئاگامان لەو کەین و بەینە نییە، هەر کەدەگەیشتمە کاك نازم خۆی لێ لادەدام و قسەی لەگەڵدا نەدەکردم، ئەو مافی خۆی بوو کەبەمشێوەیە لەگەڵ سەعدون هەڵسوکەوت بکات، بەڵام چونکە من ئاگاداری نێوانیان نەبووم زۆر خەفەتم پێدەخوارد.. تا لەئاکامدا (دڵبەند) بۆی ئاشکرا بوو من گوناهم نییە و مەسەلەکە پەیوەندیی بەمنەوە نییە، هەینێ ئاشت بووینەوە و برایەتیمان وەك جارانی لێهاتەوە.

ئیتر دەستکرا بەدابەشکردنی دەقەکە بەسەر ئەکتەرەکان و خوێندنەوە و پرۆڤە دەستی پێکرد، ژمارەییێکی زۆر لەئەکتەرە دیار و ناودارەکانی هەولێر بەشداربوون، رۆڵی (محەمەد) هونەرمەند (کوردۆ گەلاڵی) و (سێوێ) خاتوونی هونەرمەند (جیهان ئەحمەد) بەرجەستەیان کرد، جگە لەخۆشم هونەرمەندان (فەرهاد شەریف، خەلیل بابە، ئەنوەر شێخانی، بورهان جۆلا، سیروان عوسمان، رەنجبەر خۆشناو، تەها ئاغاجان، ئازاد خەمە. مام فەتحوڵڵا و هونەرمەند رزگار خۆشناویش بەلاوك و مۆسیقا بەشدارمان بوون و هونەرمەند (وەلید مەعروف) بەرێوەبەری شانۆ.

پاش یەك مانگ پرۆڤە و تەواو لەخەمرەخسانی شانۆییەکە، هەر لەسەر شانۆی (هۆڵی گەل) بۆ ماوەی (١٢) رۆژ و بەئامادەبوونی جەماوەرێکی یەکجار زۆر نمایشەکەمان بەردەوام بوو، لەبەر شالاوی جەماوەری تینوو بەهونەری رەسەنی شانۆ ئێوارەییێکیان دەرگای گەورە و سەرەکی هۆڵەکە شکا و

جەماوەر هورژمی بۆ ناوەوە هێنا. ئێوارەیێکیان ژمارەیێك میوانی تایبـەتیمان هەبوو کەچەند پێشمەرگەیێك بوون بەنهێنی و بـۆ کـاری تایبـەتی هاتبوونـەوە شـار، هـاتن و شـانۆگەرییەکەیان بینـی و بەچـاوی خۆیـان جـۆش و خرۆشـی جەماوەری ناو هۆڵەکەیان بینی و هەر ئەو ڕۆژەش نمایشەکە بـەدەنگ ڕیکـۆرد دەکرا و سێ چوار کاسێتمان پڕ کردەوە.. لەکۆتایی نمایشـەکە پێشـمەرگەکان داوای کاسێتەکانیان لێکردم و منیش نەمتوانی دڵیان بشکێنم پێشکەشم کـردن و لەگەڵ خۆیان بردیانەوە بۆ شـاخ و ناوەنـدی کۆمەڵـە لـەکاتی پێویسـت وەك بەرهەمی شانۆیی بەدەنگ بۆ پێشمەرگەکانیان نمایش دەکردەوە.

لەیـەکێك لـەڕۆژانی نمـایش، شـاعیری گـەورە مامۆسـتا (هـێمن موکریـانی) ئامادەبوو، کەنمایش تـەواو بوو، دوای پەسندکردنی بەرهەمەکە، داوای بینینـی نووسەرەکەی کرد، کەمنی بینی ماچی کردم و پیرۆزبایی لێکردم بۆ یادگـاریش وێنەیەکمان بەیەکەوە گرت.

هەر لەیەکێك لەڕۆژانی نمایشی (محەمەد و سێوێ) (شیرین) لەگـەڵ دایکـم و باوکم و ئەوانی دی هاتە بینینـی شـانۆگەرییەکە و دواتـر کەچـووینەوە ماڵـەوە زۆر بەشان و باڵی من و بەرهەمەکەی هەڵدا و بـووە یەکـەمین چـرۆی هـەنگاوە سەرەتاییەکانی ئەو لەبواری شانۆ و نواندندا.

پاش کۆتایی هێنان بەنمایشی (محەمەد و سێوێ) تیپەکەمان بەدوو ئاراستە کەوتنە کارکردن.. ئاراستەیێك تۆمارکردنی (محەمەد و سێوێ) بۆ تەلـەفزیۆن، ئەوی دی کارکردن لەبەرهەمی سێیەمی تیپ کەشانۆگەری (لاس و خەزاڵ) بوو لەنووسـینی نووسـەر (نـازم دڵبەنـد) و دەرهێنـانی مامۆسـتا (سـەباح عەبدولرەحمان).

ئێمـە لەسـەرەتای دەسـتبەکاربوون بـووین لەشـانۆی (لاس و غـەزاڵ) دوو کێشە و دوو گرفت هاتنە پێشێ:

یەکـەم: ئێـواران کەلـە (هـۆڵی گـەل) خـڕ دەبووینـەوە و خـەریکی خـۆ

ئامادەکردن بووین بۆ بەرهەمە تازەکەمان، کاک (شێرزاد عەبدولرەحمان)یش وەك هاوڕێی زۆربەمان و وەك رۆژنامەنووس سەردانی دەکردین و بەردەوام لەگەڵماندا بوو، ئێوارەیێکیان کەهەموو لەناو هۆڵ دانیشتبووین و سەرقاڵی کارەکانمان بووین، ژمارەیێك لەپیاوە درێوەکانی (ئەمنی بەلدە) لێمان بەژووریێ کەوتن و یەکسەر (شێرزاد عەبدولرەحمان)یان راپێچ کرد و لەگەڵ خۆیان برد.

ئێمە زۆر مشەوەش بووین، بەتایبەتی من و سیروان و کوردۆ گەلاڵی کەلەرێکخستن و لەشانە نهێنییەکان کارمان دەکرد.. هەر نیو سەعاتێکی پێچوو کاک (شێرزاد)یان هێنایەوە. هەر کەهۆی بردنەکەیمان لێپرسی.. گوتی:

– بەغەڵەت منیان برد.. بەدوای یەکێکدا دەگەڕێن ناوی (ش. ع)ە، هەر کەزانیان من شێرزاد عەبدولرەحمانم و رۆژنامەنووسم و لەدەزگای هاوکاری کارمەندم.. داوای لێبوردنیان لێکردم و منیان هێنایەوە ئێرە.

ئیتر ئێمە لەمەسەلەکە گەیشتین و کێشەکەمان لەلا روون بووەوە.. ئەوان بەدوای (ش. ع)ی، هاوڕێی ئێمە لەقوتابخانەو لەرێکخستندا دەگەڕێن و دیارە ناوی دراوە، دەبێ بڵێم چەند مانگێك پێشتر شانەیێکی رێکخستن ئاشکرا بوو بوون و لەکاتی چالاکیەك سێ چوارێکیان دەستگیر کرابوون.. دیارە (ش) بەحوکمی ئەوەی خەڵکی لای باڵەکایەتی بوو ئیتر وەك ئەڵقەی پەیوەندی لەنێوان شانەکان و ئەندامەکانیاندا ناسراو بوو، ناویان درکاند بوو.

ئەو رۆژە کۆتایی هەفتە بوو، بەعادەت (ش) رۆژانی پێنج شەممە و هەینی دەچۆوە و سەردانی ماڵەوەیانی دەکرد لەقەزای سۆران.

بۆیە هەر دەست و برد من و دڵداری مەلا ئەحمەد کەئەویش هەر لەگەڵ خۆمان بوو خەڵکی باڵەکایەتی بوو، سبەینێکی زوو چووینە نەقلیات و (دڵدار) شوفێرێکی خزمی دۆزییەوە کەلەرێگای (هەولێر– سۆران) ئیشی دەکرد، بردیە پەنایێك و تێیگەیاند کەبەهیچ جۆرێك (ش) نەگەڕێتەوە بۆ هەولێر و بەزووترین

کاتیش باوکی بێتە هەولێر و پەیوەندیمان پێوە بکات.

هەرواش کەوتەوە، پاش عەسرێکی درەنگ (دڵدار) هاتە دوام و گوتی باوکی هاتووە و چاوەڕێمانە..

چووینە شوێنی مەبەست و باوکیمان تێگەیاند کەدایەرەی ئەمن بەدوای (ش)دا دەگەڕێن و برادەرێکی تریان بەهەڵە گرتووە کەزانیان هەونییە ئازادییان کرد، پێمان گوت:

– تکات لێدەکەین لەترسناکی مەسەلەکە بگە و هەوڵدە هەر ئێستا بگەڕێتەوە و جارێ نەهێڵی کوڕەکەت بێتەوە هەولێر و لەوێش با چەند رۆژێك خۆی بزر بکات تا بزانین کێشەکە بەچی دەگات.

یەکسەر باوکی دڵنیای کردینەوە و گوتی:

– بێخەم بن، هەر ئێستا دەگەڕێمەوە و هەر ئەمشەو ناهێڵم (ش) لەسۆرانیش بمێنێتەوە، دەینێرمە دەرەوە با بچێتە ناو پێشمەرگە و بەگەر کاك (ح. ك)ی خزمی خۆمان بکەوێ.

ئیتر دڵنیاییێکی تەواوی پێداین و ئەو گەڕایەوە سۆران و ئێمەش کەوتینەوە سەر ژیانی ئاسایی خۆمان.

دووەم: رۆژێکی دی هەر لەناو (هۆڵی گەل) بووین، ژمارەییێك (ئەمن) هاتن و ئەمجارە داوای (کوردۆ گەلاڵی)یان کرد، ئێمە من و کوردۆ و سیروان دەرفەتمان بۆ رەخسا و بەدەرگای پشتەوە کەدەیڕوانیە شەقامی (ئیسکان) بۆی دەرچووین و هەر بەپەلە چووینە ناوەڕاستی شەقامەکە و من چوومە بەردەمی (تاکسی)یێك و رێگەی رۆیشتنم لێگرت و بەناچاری راوەستا، (کوردۆ) خۆی تێپەستا و تەکسی بۆی دەرچوو، بەم شێوەیە (کوردۆ گەلاڵی)یمان لەگرتن و زیندانی کردن رزگار کرد.

هەر ئەو رۆژانە، ئێوارەییێکیان کاك (ئازاد جوندیانی) لەهۆڵی گەل هاتە لام و لەناو باخچەکەی بەردەمی هۆڵی گەل دانیشتین و کەوتینە گفتوگۆ.

کاك ئازاد تێیگەیاندم کەناوی دراوە و لەلای دایەرەی ئەمن ئاشکرا بووە، بۆیە لەئێستادا بەنهێنی هاتووچۆ دەکات و خۆی ئامادە دەکات تا لەدەرفەتێکدا بتوانی خۆی رزگارکات و بچێتە دەرەوە بۆ ناو شۆڕش و پێشمەرگە. بەر لەهەستان و خواحافیزی لیستی ناوی ژمارەیێك هاوڕێ دا بەمن کەدەبێ بۆ لەمەودوا من سەرپەرشتیان بکەم و بەکاروباری رێکخستنیان رابگەم.. ئیتر کاك (ئازاد) خواحافیزی لێکردم و رۆیی و هەتا دوای راپەڕین نەمدیتەوە.

ئێمەش من و سیروان عوسمان چەند رۆژێك لەخوێندن دابڕاین و دەوامەمان لەئامادەیی پیشەسازی کارەبا نەدەکرد و بەپارێزیش هاموشۆی (هۆڵی گەل)مان دەکرد.. هەینێش لەتەلەفزیۆنی کەرکوکەوە ئاگادار کراینەوە کەرەزامەندی وەرگیراوە لەسەر تۆمارکردن و وێنەگرتنی (محەمەد و سێوێ) و دەبێ رۆژانە ستافەکە هاموشۆی کەرکوك بکەین و لەستۆدیۆکەی تەلەفزیۆن بەرهەمەکە تۆمار بکەین.. بەڵام بەداخەوە لەبەرئەوەی (کوردۆ گەلاڵی) چووبووە شاخ، (سەعدون) بەخۆی رۆڵی محەمەدی بەرجەستە کردو، هونەرمەند (وەلید مەعروف)یش لەجێگای هونەرمەند (رەنجبەر خۆشناو) دەوری پاشای گەورەی بینی، بەمشێوەیە چەند رۆژێك چووینە کەرکوك و لەوێنەگرتن بەردەوام بووین، من کەرۆڵی (باین)م دەبینی چەند دیمەنێکم تۆمارکرا و هەندێکیشم مابوو.. کەزانیمان وەزعەکە ئارام بۆتەوە، بەیانی رۆژی (١٩٨١/١٠/٢٧) بەدوان من و سیروان چووینە دەوام.. هەر دەمودەست و لەناوەڕاستی وانەی یەکەم کارگوزاری قوتابخانە هات و کاغەزێکی دایە دەست مامۆستایەکەمان و گوتی ئەم ناوانە مامۆستا (سامی داود)ی بەڕێوەبەر داوایان دەکات.. مامۆستا ناوی من و سیروانی خوێندەوە.. هەڵساین و چووینە ژووری بەڕێوەبەر.. لەژوورەوە زەیتونی لەبەرێك دانیشتبوو هەر کەزانی ئێمە ئەو دوو کەسەین کەبۆمان هاتووە.. گوتی:

- هەتا دائیرەی لەگەڵمان وەرن.. چەند پرسیارێکمان هەیە و هەر نیو سەعاتێکە و بەخۆمان دەتانهێنینەوە بۆ دەوام. هیچ دەرفەتێکمان نەما کەهاتینە دەرەوە سەربان و بن بان پڕ بوو لەچەکداری جلك زەیتونی، هەر بەپەلە پرونێ لەپشتی پیکابێکی بەچادر داپۆشراوییان پەستاین و دەست و چاوییان بەستینەوە و بۆی دەرچوون.

(هۆ و چۆنیەتی ئاشکرابوونمان و دەستگیرکردنمان لەهەولێر و دواتر گواستنەوەمان بۆ ئیستخباراتی کەرکوك و ئینجا بردنمان بۆ بینای تازەی هەیئەی تەحقیقی کەرکوك و ڕۆژانی ئەشکەنجە و ئێش و ئازاری زیندانمان، لەکتێبێکی سەربەخۆ نووسیوەتەوە و خوا یار بێت بەمزوانە بەچاپی دەگەیەنم و تەواوی ووردەکارییەکان لەوێدا ئاشکرا کراوە).

دواتر زانیمان هەر کەباوکی (ش) دەگاتەوە ماڵێ لەسۆران و دەکەونە راو تەکبیر کەچیبکەن و چی نەکەن لەئەنجامدا بەهۆی خزمێکی دەست ڕۆیشتوویان وا بەچاك دەزانن ئەو خزمەیان (ش) بباتە دایەرەی ئەمنی سۆران لەوێ خۆم تەسلیم بکات و هەر ئەو خزمەیان دەمودەست وەریبگرێتەوە و بیهێنێتەوە ماڵێ! بەڵام کەلەئەمن بەحاڵ و مەسەلەی (ش) دەزانن یەکسەر لەلای خۆیان دەیگێڕنەوە و خزمەکەی بەڕێ دەکەن و پێی دەڵێن:

- تۆ بڕۆ هەقت بەسەر ئەو مەسەلانەدا نەبێت.

شەوێك لەزیندانی ئەمنی سۆران دەیهێڵنەوە و بۆ بەیانی دەیهێننە هەولێر و ئینجا یەکسەر دەیبەنە هەیئەی تەحقیقی کەرکوك.. لەوێ لەگەڵ ئەو ناوانەی درکاندبووی، ناوی من و سیروان عوسمانیشی تێهەڵکێش کردبوو. بەم شێوەیە ئێمە لەلایەن دایەرەی ئیستخباراتی هەولێرەوە گیراین، کەئەوکاتە لەکۆنە خانووێکی تێکۆشەری دێرین مامۆستا موحسین دزەیی دا بوون و داگیرییان کردبوو.

## هەر محەمەد و سێوێ و سۆراغی من

لەپاش گیرانی ئێمە، ستافی شانۆیی (محەمەد و سێوێ) خۆیان مەحتەل ناکەن و لەوێنەگرتن و تۆمارکردن و چوونە کەرکوک بەردەوام دەبن، رۆڵەکەی منیش (بایز) کەچەند دیمەنێکی مابوو وێنەی بگیرێ پینە دەکەن و لەم شوێنانەی کەدەبوایە دەرکەوم لەلایەن کارەکتەرەکانی دی ناوم دێت و خۆشم دیار نیم.. بەنموونە

لەدیمەنێك کەمن (باین) لەگەڵ (سەلام بەگ) فەرهاد شەریف و چەند کەسایەتیەکە دەردەکەوین و حیوارمان هەیە و رووداو گەرمە.. سەلام بەگ هاوار دەکات و دەڵێ (بایز.. بایز.. کوا بایز لەکوێیە؟ یەکێك لەخزمەتکارەکانی بەگ دەڵێ: گەورەم.. بایز بەئیشێك هەتا ئەو گوندانە چووە و لێرە نییە. هەینێ سەلام بەگ (فەرهاد شەریف) دەڵێ: دەباشە ئەگەر بایز هاتەوە پێی بڵێن وابکات و وانەکات. بەم جۆرە بۆشایی و نەبوونی من پڕ دەکەنەوە.

گەر ئێستاش (محەمەد و سێوێ) سەیر بکەنەوە کەبە (سی دی) هەیە، هەست دەکرێ رۆڵی من نەقوستانە و لەزۆر شوێن کەدەبوایە رۆڵم هەبێ بەحیوار پینە و پەڕۆ کراوە.

سەبارەت بەماڵەوەشمان کەزانیان دەستگیر کراوم چەند جارێك باوکم هاتووچۆی دایەرەی ئەمنی بەلدە دەکات و سۆراغی من و هەوڵی دەستکەوتنی سەرەداوێکی گرتنەکەم دەکات و هەموو جارێك پێی دەڵێن:

– چیدی موراجەعەی ئێمە مەکە، کوڕی توو لەکنەمە نەگیراوە.

لەماڵەوەش، رۆژانە شین و ماتەم و گریان بەردەوام دەبێت.. جلکی مەیلەو رەش دەپۆشن و شینی بێ مردوو دەگێڕن.. (شیرین)یش چەشنی ئەوان بەرگی رەش دەپۆشێ.. هەرچەندە مامێکی دێتە ماڵەوە تا لەگەڵ خۆی

بیباتەوە کۆیە و پێی دەڵێ:

– تازە زاهیر ڕۆیی، بەربوونی زەحمەتە، ئەتو چ دەکەی لێرە دەتبەمە ماڵی باوکت.

شیرین مەردانە باگۆی دەداتەوە و دەڵێ:

– بەهیچ جۆرێك ئێرە بەجێ ناهێڵم.. مردن و ژینم لەگەڵ دایك و باوك و خوشك و برایەکانی زاهیرییە.

بەمشێوەیە بۆ چرکەیەکیش لەدایك و باوکم دوور ناکەوێتەوە و کۆستەکەیان گەورەتر ناکات.

سەبارەت بەهاوڕێیانی ڕێکخستنیش، هەر کەدەنگۆی گیرانی ئێمە بڵاو دەبێتەوە، دەست و برد هەردوو خاتوونی تێکۆشەر (ئاشتی برایمە فەندی و خەدیجە هیرانی) واز لەخوێندن و هەولێر دەهێنن و ڕوو دەکەنە شاخ و دەچنە لای پێشمەرگە و خۆیان لەگرتن و ڕاوەدونان و ئەشکەنجە ڕزگار دەکەن، کەبەم هەنگاوە چارەنووسساز و بوێرانەیان چاکەیێکی یەکجار گەورەیان لەگەڵ کردین و (شیرین)یش لەڕێکخستن و کاری نهێنی دابڕا و سەلامەت دەرچوو.

## نەخۆشێك لەسماقووڵی گرتكی

كـە لـەژێر دەسـتی دڕنـدەكانی بـەعس ڕزگـارم بـوو و ئازادییـان كـردم و گەڕامەوە هەولێر و خۆم بەتەیراوەدا كرد، بەشوفێری تەكسیەكەم گوت:

– زۆر مەمنونت دەبم گەر بچیتە ناو كۆڵان و لەبەر دەرگای ماڵەوە دامگری.

شوفێرەكە گوتی:

– وەی بەچاوان.

هەركە دەرگام كردەوە و خۆم بـەژوورەوەدا كـرد، بینـیم لەحەوشـەدا دایـە حـاجی بـەدیار مەنجـەڵی كفتـە لێنـان مـات و مـەلول دانیشـتووە، (شـیرین) بەماكسـییێكی ڕەنـگ ڕەش و بـۆر خـەریكی ئیشـێ بـوو، مـارفی بـرام لـەزگ پایسكلەكەی بوو، سـەلامم كـرد و چـاوەڕێی وەڵام بـووم، سـەرییان هـەڵبڕی و بەحەپەساوی چاوییان لێكردم، چەند چركەییێكی بێدەنگ رابورد (لەبەرئـەوەی زۆر لاواز و لەڕ و شڕ و شپڕێو بوو بووم و پرچیشم بـەنارێكی لـەڕۆژی دادگـایی هەڵپاچرابوو زوو نەیاناسیمەوە) لەپڕ شیرین لەبۆم هات و قیژاندی:

– زاهیر.. خۆ ئەوە زاهیرە ! !

ئیدی بووە هەرا و هەموو دەورەیان لێدام، كەبینیم ژنەكان هـەموو جلكیـان بۆر و ڕەشە دڵم خورپەی كرد، چاوم گێڕا دایكم دیار نییە، پرسیم:

– لۆ هەمووتان مەكسیتان ڕەشە؟ كێ مردییە؟

گوتیان:

+ كـەس نەمردییـە، لەبـەر دووری و بێسـەر و شـوێنی تـۆ ئـەو مەكسـیە ڕەشەمان لەبەركردییە.

بەنوزە و قوڕگی پڕ لەگریانەوە گوتم:

– هیچم لێ مەشارنەوە، ئەدی كا داكم لۆ لەماڕێ نییە؟

باوکم گوتی:

+ داکت وا لەژوورێ لەسەر بەرمارییە و نوێژێ دەکات، ئەمن چووم پێم گۆت تازە نوێژەکەت مەبڕە، کوڕت بەساغی هاتەوە کەنوێژت تەواو کرد، دەست برندکە و حەمد و سەنای خوای گەورە بکە.

هەر واش بوو دایکم لەنوێژێ بۆوە و هاتە دەرێ و باوەشی بۆ کردمەوە و جارێکیدی بەو ئامێزە گەرم و بۆنخۆشەی دایە قەدرییەکەم شادبوومەوە و تێر تێر دەستیم ماچ کرد و پڕ بەسییەکانم بۆنە خوداییەکەییم هەڵمژی.

دیارە ئەو ڕۆژانەی من لەزیندان بووم، باوکم ڕۆژ بەرۆژ لەخەفەتان باری تەندروستی تێك دەچێت و ماوەیێك لەتاو ئێش و ئازاری نێکی بەشەلەشەل ڕێدەکات، ڕۆژێکیان گەورە و بچوکی ماڵەوە خڕ دەکاتەوە و پێیان دەڵێ:

– ئەمن بەهەموو دەمێ لەمارێ نیمە، ئەگەر خوا ڕەحمی پێکردین و زاهیر بەر بوو، هەر کەسەك لەنگۆ زوو خەبەرەکەم بداتێ ئەوە مزگێنیەکی باش باشی دەدەمێ.

ئیدی دەر و جیران و خزم و کەس بەسەرماندا ڕژان و خۆشی و شادی گەڕایەوە ناومان، کەچی (شیرین و مارف)ی برام لەسەر ئەوە پێك نەدەهاتن کەکامیان زووتر منیان ناسییەوە و لەهەڵایاندا تا مزگێنییەکەی باوکمیان بەرکەوێ، دواجار (شیرین) تەنازولی کرد و مارف مزگێنیەکەی لەباوکم وەرگرت.

ئۆخەی سەد ئۆخەی بەدایە و بابە و خوشك و برا و شیرینەکەم شاد بوومەوە، جا لەبەرئەوەی سەروپرچم زۆر بەنارێك هەڵپاچرابوو بەناچاری ناردیان مام عەلی حەلاقی ناسیاومان هات و هەر لەماڵێ بەمەکینە سەری سفر کردم، پاش دوو ڕۆژان لەپشوودانمان و ئاهەنگ گێڕان و سازدانی خوێندنەوەی مەولوود لەلایەن سەید ئیسماعیل و برادەرانی، کاتی ئەوە هات بچمەوە دەوام

و وەك قوتـابی دوا قۆنـاغی خوێنـدنی ئامـادەیی پیشەسـازی کارەبـا درێـژە بەخوێندن بدەم و ببمە خاوەن بڕوانامەی ئامادەیی، بەسەری تاشراو و جلك و بەرگێکی دەڵب، مـن و سـیروان چـووینە نـاو بینایـەی ئامـادەیی پیشەسـازی کارەبـا، هـەردووکمان بەیەکـەوە لەحەوشـە راوەسـتاین و کـاتی وانـە بـوو قوتابیەکان هەموویان لەپۆلەکانیاندا بوون و دەرگای ژوورەکان پێوەدرابـوون، تـەنها پۆلێـك دەرگـای کـراوە بـوو و مامۆسـتا خـەریکی وانـە وتنـەوە بـوو، سەیرمانکرد وا مامۆستا (نەوزاد حەسەن خۆشـناو) پسـپۆڕی زمـانی عـەرەبی، ئێستا دکتۆرای هەیەو مامۆستای زانکۆیە وانەی عەرەبی دەگوتـەوە سـەرقاڵە، لـەناکاو ئـاوڕی لای ئێمـەی دایـەوە و چـاوی بەهـەردووکمان کـەوت، یەکسـەر تەباشیرەکەی دەستی بەعەرز دادا و بەتاو و بەگوڕ وەك براگەورەیێکی دڵسۆز بۆمان هات و ئامێزی بۆ گرتینەوە و ماچ بارانی کردین لەبەرچاوی ئـەم هـەموو قوتابیە بەعسیانەی پۆلەکەی کەلەوکاتەدا سەیریان دەکردین مرچ مرچ ماچـی دەکردین و خۆشحاڵی خۆی بەدیتنەوەمان دەردەبڕی.

کەوتینەوە سـەر خوێنـدن و خـۆ ئامـادەکردن بـۆ تـاقی کردنـەوەی نیـوەی ساڵ.

لەم ماوەیەدا، ئێوارەیەکیان لەکاتی گەڕانەوەم بەپێ بـۆ ماڵـەوە.. لـەرۆخی شەقام لاندگرۆزەرێکی سپی لەتەنیشتم ستۆپی گرت و دوو کەتە زەلام بەپرتاو دابەزین و فەرمانیان پێکردم کەلەتەکیانـدا سـەرکەوم و هـیچ قسـەیەك نەکـەم، سـەرکەوتم و دەم و دەسـت و چـاوم بەپارچـەیەك قومـاش شـەتەك درا.. رۆیشتن.. هەر کەترومبێل راوەستا و منیان بەچاو بەستراوی دابەزاند و قۆڵیان گـرتم و بردمیانـە ژوورێـك و چـاوییان کردمـەوە.. سـەیر دەکـەم هـەمان ئـەو شوێنەیە کەدواجار لەهەولێر ئازادییان کردمو بەڕێیان کردم و گوتیان:

– برۆ تۆ ئازادی.. بـەس ئاگـات لـەزمانی خـۆت بـی و باسـی هـیچ شـتێکی

زیندانی هەیئەی کەرکووك لەلای هیچ کەسێك نەکەی.. دەنا خراپترت پێشان دەدەین.

هەر هەمان ئەو بەڕێوەبەرە سەر و کەللە گەورە و رەش ئەسمەرەیە کەدوای ئەوەی گوتی:

– وەزعی برادەرەکەت باشە زۆر لاواز نەبووە، بەڵام تۆ یەکجار لەڕ و لاواز بوویت.. خواردنی باش بخۆ تا بێیتەوە سەر خۆت.

هەر کەبەرامبەرییان راگرتم و ئەو لەپشت مێزەکەیەوە لەسەر کورسی پاڵی دابۆوە.. گوتی:

– ها زاهیر چۆنی.. هیوادارم ئەو چەند رۆژەی لەناو خانەوادەکەت بووی بەتەواوی حەسابیتەوە.. دیارە دەستت بەدەوام و خوێندنەکەشت کردۆتەوە.. پیرۆزبایت لێ دەکەم.

من نەمزانی چۆن وەڵام بدەمەوە و چی بڵێم.. چەند چرکەیەك وا تێپەڕی، ئەو تێهەڵچۆوە و گوتی:

– زاهیر.. دەزانم تۆ هونەرمەندی و ئیش لەبواری شانۆ دەکەی و دەنووسی و دەخوێنیەوە.. راستە لەدادگا ئازادکرای و قەناعەتیان بەبێگوناهیت هات.. بەڵام لێرە بەدواوە ئێمە ئیشی ترمان بەتۆ هەیە، چۆن ئێمە لەژێر سایەی ئەم پیاوە گەورەیە (بەدەست ئاماژەی بەوێنە گەورەکەی سەدام حوسێن کرد کەبەجلکی سەربازییەوە لەپشت سەری هەڵواسرابوو) رەحممان بەخۆت و بەدایك و باوك و خێزانەکەت کرد.. دەبێ تۆش لەمەودوا هاوکارمان بیت و بەوەفابی بەرامبەر بەم پیاوە گەورەیە (دیسان ئاماژەی بەوێنە گەورەکەی پشت سەری کرد).

هەینێ بەناچاری و بەنوزانەوەوە گوتم:

– ئەمن قوتابیەکی دوا قۆناغی پیشەسازیم.. خوا خوامە تەواوی بکەم و

ببمە خاوەن بڕوانامە، سەرم لەسیاسەت و حیزبایەتی دەرناچی.. ئەوەی پێشتریش کەلەسەری گیرام، دەرچوو بەملم داهاتییە و من لەو جۆرە گەنجانە نیم. تکایە رەچاوی بارودۆخی قوتابیەکی وەك من بکە.. من چەند مانگە لەخوێندن دابڕاوم.. خواخوامە بەقوتابیەکانی هاوپۆلم بگەمەوە.

ئەو، یەکسەر هەڵسایە سەرپێ و بەتوڕەییەوە گوتی:

– گوێ بگرە زاهیر.. هەرکاتێك ئێمە لێت رازی بین دەتوانین بتکەینە خاوەن بڕوانامەی کۆلێژ.. ئامادەیی چیە؟ بەڵام بەمەرجێك تۆ هاوکارمان بیت و چیمان گوت گوێڕایەڵ و گورج و گۆڵ بیت.. جارێ گەنجی و لەسەرەتای ژیاندای.

زانیم مەبەستی چییە و چی لێم دەوێ.. بەناچاری گوتم:

– گەورەم.. من قوتابیەکی گوێڕایەڵی مامۆستاکانم.. چیان وتبێ گوتیتم بەسەرچاو.. ئەوە مدیرمان مامۆستا سامی داود.. ئەوە مدیری شوئونی تەلەبە مامۆستا ئیبراهیم، لێیان بپرسە بزانە ئەوەندە ساڵەی لەسناعەم هیچ کێشەیێکم هەبووە.. ئێستاش هەموو خەونم تەواوکردنی سناعەیە.. با سناعە تەواوکەم.. هەینێ دەستم دەکرێتەوە و بڕیارێکی لێ دەدەم.

(دامنابوو، گەر وازم لێ بێنن و بتوانم قۆناغی کۆتایی بەسەرکەوتوویی تەواو بکەم و بڕوانامەکە بەدەست بێنم.. هەینێ بەنهێنی روو لەشاخ بکەم و ببمە پێشمەرگە).

ئەو گوتی:

– قەشمەر.. بڕیار لەلای ئێمە نەك لەلای تۆ، فرسەتێکی دی ژیانت دەدەمێ.. برۆ بیری لێ بکەوە.. چەند رۆژێکی دی دەنێرمە دووت.. هەرکە هاتی دەبێ خۆت یەکلا کردبێتەوە.. ئێستاش برۆ وەل بە.

کابرای لەتەکم وەستابوو پیلی گرتم و بردمیە دەرەوە.. لەهۆڵەکەش خۆی

لێبێئاگـا کـردم و وای پێشـاندا هـەر نامناسـێ و ئـەو نـەبوو چـاوی بەپارچـە پەڕۆیەك بەستمەوە.. نەمزانی چی بکەم.. هەندێك سـەیری دەوروبـەرم کـرد.. کابرای پرسگە لەپشـت مێزەکەیـەوە خـۆی بەتەلەفۆنەکـەی بـەردەمی خـەریك کردبـوو.. منـیش بەترسـەوە و وردە وردە هـەنگاوم بـۆ دەرەوە نـا و رووم لـەدەرگا کـرد.. کـەس رێگـری نـەکردم، گەیشـتمە سـەر شـەقام کـەس بـانگی نەکردم.. تاکسییەکم راگرت.. ئاوڕی ئەملا و ئـەولام دایـەوە هـیچ ئاماژەیـەکی خراپم نەبینی.. سەرکەوتم و بەشوفێری تەکسییەکەم گوت:

– بازۆ لۆ تەیراوەی.

کابرای شوفێر دیاربوو درامای (هەبوو نەبوو)ی دیتبوو.. هەر کەبەڕێ کەوت گوتی:

– چاوچنۆك.. دیارە لەجێیەکی زۆر خۆش هاتیە دەرێ.

گوتم:

– ئـەوها خـۆش.. هـەر مەپرسـە.. بـازۆ بـا لێـرە دوورکەوینـەوە هـەتا هەردووکمانیان بۆ جێیە خۆشەکە هەرنەپێچایتەوە.

هـەر کەگەیشـتمەوە مالـێ.. تاریـك داهـاتبوو.. بـاوکم و دایکـم و شـیرین و ئـەوانی دی لەنەگەڕانـەوە و دواکـەوتنم هەراسـان بـوو بـوون.. کـەهۆی دواکەوتنەکەم بۆ باوکم گێڕایەوە.. باوکم فەرمووی:

– کاکـە (لەبـەر ئـەوەی کـوڕی گـەورەی بـووم قـەت بـەناوی خـۆم بـانگی نەدەکردم و هەر پێی دەگوتم کاکە) ئەو زاڵمانە مەخسەدییان لەگەرت خراپە.. دەیانەوێ ببیە چاوساغیان.. بـرادەر و خـزم و کـەس و هاوڕێیـەکانت مراقەبـە بکەی.. ئەتو ئەوەت پێ دەکرێ؟

گوتم:

– باش دەزانم چییان لێم دەوێ، بەڵام ئیعدامیشم بکەن ئەمن قەت ئیشی وا

ناکەم و هەر بیریشی لێ ناکەمەوە.

باوکم یەکسەر نیوچەوانی ماچ کردم و گوتی:

– کوڕم ئاقڵ بە.. ئەگەر هەر بێخەیان بەرنەدای. ئەوە بابە خدر و ئەوە سماقووڵی گرتکی و ئەوە کێخوا ئەحمەدی بن عامی باپیرت.. بڕۆ و لەوێ پاردەوە هەتا خوا رەحمەکی دەکا.

من بەبیستنی هەردوو ناوی (سماقووڵی گرتکی و کێخوا ئەحمەدی) ئاهێکم هاتەوە بەرێ و پشت ئەستور و زۆر بێ منەتیش بووم و لەدڵی خۆم گوتم:

– ئەگەر هەر نەیانهێشت بخوێنم و لەهەولێرێ بژیم.. ئەوە بابە خدر و کێخوا ئەحمەد و سماقووڵی گرتکی باشترین چارەسەرمە.

پاش چەند رۆژێکی دی.. بەیانییەکیان بەڕێوەبەری ئامادەییەکەمان (سامی داود ئوراها) ناردی بەشوێنما، کەچووم شمەك زەیتونییەك لەلای دانیشتبوو.. یەکسەر (سامی) گوتی:

– گێ بگرە زاهیر.. حیزبی بەعس رەحمی پێکردی و لەسجن بەرەڵای کردی.. ئەوە نیعمەتێکی سەیدلرەئیسی بوو، ئەو پیاوەتییە بەهەموو کەس ناکرێت.. هەنووکە ئەو برادەرە هاتیە دەیەوێ بزانی ئەتو چەند بەوەفای بەرامبەر بەو نیعمەتەی سەیدلرەئیسی.

منیش هەناسەیەکم هەڵکێشا و گوتم:

– باشە لۆ وەها ئەمنتان لێ بویتە قارەمان.. ئەمن تازە بەتازە گەنجێکی بیست و سێ ساڵیم.. حەزم لێیە پاش ئەوەی سناعە تەواو دەکەم و بڕوانامەی ئامادەییم دەستکەوت، بچمە کۆلێژێك و ئەویش تەواو بکەم.. درێژەم بەقسەکانم دا و بەبەڕێوەبەری سناعە (سامی داود ئوراهام) گوت:

– دڵنیات دەکەمەوە ئەمن بەغەڵەتی گیرام، نە سیاسی بووم و نە بەحەیاتیشم سەرم لەسیاسەت و حیزبایەتی دەردەچی.. لێمگەڕێن با ئەو یەك

دوو مانگەی ئاخیری سالّیم بەڕێ کەم و ناجیح بم.

دیارە کابرای زەیتونی لەبەریش لەگفتوگۆیەکەی ئێمە کەبەکوردی بوو چاك تێدەگەیشت، هەر لەناکاو هەڵسا و گوتی:

– بەداخەوە، ئەمری گرتنتم پێ نییە دەنا دەبوایە هەر ئێستا قۆڵبەستت بکەم و لەسجن خودات بەملەوەنی پێشان بدەم.. بەس یەکتری دەبینینەوە.

هەر بەهەمان گورپوتین تۆقەیەکی لەگەڵ (سامی) کرد و رۆیی.. هەر کەئەو رۆیی.. سامی بەغەزەبەوە هێرشی بۆ هێنام و نەڕاندی:

– هەی بێ عەقڵ.. باشترین فرسەتت لەدەست خۆتدا.

هەر مرە مرێ بوو وەك تەماتەش سۆر هەڵگەڕا.. لەناکاو گوتی:

– بەراست زاهیر.. ئەتو موالید چەندی؟

گوتم:

– مامۆستا.. موالید (١٩٥٨)م.

یەکسەر گوتی:

– وای وای.. عومرت گەورەیە ئەتو کو ئەمساڵ دەوامت کردییە. ئەتو لەلای من (فەسلّی).. خۆ ئەگەر دەتەوێ دەوام بکەی و بڕوانامەی ئامادەیی وەرگری برۆ سەرێك لە (ئەبو عەلا) بدە.

هەمان ئەو ناوەی هێنا کەپێشتر و لەئەمنی بەلدە بەچاوبەستراوی بردمیانە بەردەمی.. ئیدی زانیم کاری من لێرە کۆتایی پێ هاتووە.. نەدەبمەوە ئەو قوتابیەی هەموو کاتی دەوامامان بەگاڵتە و فشقیات و نوکتە بەڕێ دەکرد.. نەئەو قوتابیەش بتوانێ لەتاقی کردنەوەی کۆتایی ساڵ بەشدار بێت و سەرکەوێت و ببێتە خاوەن بڕوانامەی ئامادەیی.

هەر ئەو رۆژی، لەگەڵ باوکم و سمێر سۆری باپیرم و دواتریش بەتەنیا لەگەڵ شیرینی هاوسەرم گەیشتینە ئەو دەرئەنجامەی:

(دەبێت.. مـن لەهـەولێر و لەخوێنـدن و لەخـەون و لەشـیرین و لەشـانۆ و لەدراما) دابڕێم و لەگەڵ باپیرە سمێـر سـۆرە جوانەکـەم بـەرەو سـەرفرازی.. بەرەو هەناسەیەکی پاك، هەنگاو بەرەو سماقووڵی گرتکـی و کێخـوا ئەحمـەدی سماقووڵی بنێم و خۆم لەکەڵبەی سەگە بەڕەڵا و بێ ڕەحمەکانی بـەعس ڕزگـار بکەم.

هەمان شەو، لەگەڵ (شیرین) وا ڕێککەوتین، سەرەتا من لەگەڵ بابـە خـدر و دایە قەدری بچمە سماقووڵی، هەر کەگەیشتم بەنامەیـەك ئاگـاداری بکەمـەوە و ئەویش شمەکی پێویست خڕکاتەوە و لەگەڵ دایکم خـۆی بگەیێنێتـە لای مـن و لەوێ بژین.

سبەینیەکی زوو.. مـن و سمێـر سـۆری بـاپیرم و دایـە قـەدری بەتەکسـیەك چووینە سێتاقان.. لـەوێ جێبـە قوتەیـەك چاوەڕێمان بـوو، چـەند نەفـەرێکی هـەبوو.. دوو لەپێشـەوە.. ئـەوانی دی بەشمەکەکانیانـەوە کـەبریتی بـوون لەشەکر و چا و پێداویستی دی لەدواوە سەرکەوتین و بازۆ بۆ ڕێگای کۆیە، بڕۆ بڕۆ هەتا گەیشتینە دەربەندی گۆمەسپانێ.. هەستم کرد ئەوانەی لەگەڵ ئێمەن لـەدواوەی جێـب زۆر ڕارا و مشەوەشـن، هـەر کەگەیشـتینە بازگـەی پۆلیسـی دەربەند.. (بازگەکە دوا بازگەی نێوان حکومەت و ناوچـە ئازادکراوەکـان بـوو) جێبە قوتە ڕاوەستا و کابرای پۆلیس لێمـان هاتـە پـێش، هـەر کەچـاوی بـەمن کەوت و ناسیمیەوە کەهونەرمەندم زۆر مەردانە و بەدەنگەکی دلێرانە گوتی:

– مادام مامۆسـتا زاهیرتـان لەگـەرە، هـەر چیەکتان پێیـە ئـازادن.. بـڕۆن خواتان لەگەڵ.

ئۆخەی سەد ئۆخەی لەوێ دەرباز بـووین.. پـاش کـەمێك بەسـواری جێـب، ئیدی نۆرەی پیادەڕێ و قـوڕ و چڵپاوی زسـتانی کۆتـایی مـانگی (١)ی سـاڵی (١٩٨٢) هـات.. هـەر کەگەیشـتینە نـاو گونـد و چـووینە مـاڵی مـام کێخـوا

– خۆشحاڵم کەساغ و سەلامەتی.. زەحمەتە یەکێك بکەوێتە بەردەستی ئەو بەعسیە زاڵمانە و قورتاری بێت.. گەلەك بەخێربێیەوە.. ئەتو برای هەمانی.

چەند شەوێك دواتر.. ئێوارەیەکیان شیرین قودیەك گۆشتی سەلکە گایەکەی لەسەرە و چەند هێلکەیەك و روون و پیازی تێکەڵ کرد و هەری شێلا.. نانی تەڕ کرد و بەتەمای نانخواردنێ بووین.. لەپڕ ئازادی کاکە رەشیدی کوڕی کێخوا ئەحمەدی لێمان بەژوورێ کەوت و گوتی:

– بابم (مەبەستی مام کێخوای باپیری بوو) دەرێ با بێن لەکنەمە نانی هێوارێ بخۆن.

تازە ئەمرە و مام کێخوا فەرموویەتی، کەچووین.. شیرین بۆ لای ژنان و منیش بۆ دیوەخانێ چووم، چەند پێشمەرگەیەك میوانی بوون.. یەکێك هەڵساوە و بەگەرمی چاك و چۆنی لەگەڵدا کردم و لەتەك خۆی دانام.. مام کێخوا بەمنی گوت:

– ئەوە کاك شاخەوانە.. هەر کەباسم کردی.. گۆتی زۆر حەز دەکەم ببینم لۆیێ لەدووم ناردی هەتا نانی هێوارێ پێکڕا بخۆین.

ئیدی بەدەم گفتوگۆوە نان خورا و چایەی گەرمی سماقولیانی بەسەردا کرا.. بەر لەهەستانی کاك شاخەوان و پێشمەرگەکانی و وەرگرتنی بەتانی بۆ ناو مزگەوت.. شاخەوان منی جیا کردەوە و گوتی:

– ئێوە ژمارەیەك گەنجی خوێن گەرمی سناعەی هەولێر بوون.. ئاگادارم ژمارەیەکتان گیران و ئەوانی دی هاتنە ناو شۆڕش.. دەستی درێژ کرد و نامەیەکی چوکلێتی دایە دەستم.. کەمن لەدوای نان خواردنەکە و چایە خواردنەوە هەستم کرد کەشاخەوان شتێك دەنووسێ و پێچایەوە.. ئەو نامەیەی دایە دەستم گوتی:

– تۆ گەنج و خوێنْ گەرم و ئەندامی کۆمەڵەی رەنجدەرانی.. ئەم نامەیە

هەڵگرە و با لەلات بێت، بیست رۆژێکی دی بەرپرسی رێکخستنی خۆشناوەتی دێتە ئێرە.. ئەو نامەیەی بدێ و هاوکاری بە.. با رێکخستن لەگوندی سماقووڵی گرتکی گرۆتینەکی دی بەخۆیەوە ببینی، بەتایبەتی ئەتو خزم و کەسی هەموویانی.

نامەکەم لێوەرگرت و هاویشتمە تەنکەی باخەرم.. هەتا رۆژەکیان کاتی نیوەڕۆ بوو وەختی نان و گندۆرە خواردنێ.. لەپڕ هەواڵ هات کە (ح. م) و جەماعەتەکەی گەیشتنە ناو گوندی.

بەعادەتی کەپێشمەرگە دەگەیشتنە ئاوایی هەموو لەناو مزگەوت و بەر دەرگاکەی گرد دەبوونەوە.. دوای نانخواردن چووم نامە چوکلێتیەکەی کاک (شاخەوان عەباس)م لەبن نوینان دەرهێنا و خستمە ناو گیرفانم و چوومە لای مزگەوتێ.. بەرپرسیار مەسئولم دیتەوە و چوومە بەردەمی و سڵاوم لێکرد.. زۆر بەساردی سڵاوەکەی لێوەرگرتمەوە.. دڵم خورپەی کرد بەڵام لەدڵی خۆمدا گوتم: هیچ نییە رەنگە هەوای مەسئولیەت چووبیتە کونە کەپوی و خۆی پێ موهیم بی و جارێ نامناسێ، رەنگە کەناسیمی جۆرێکی دی رەفتارم لەگەڵدا بکات و بگۆڕێ.

بەم شێوەیە لەبەرامبەر مزگەوت شوێنێك هەبوو بۆ دانیشتن چووینە ئەوێ، لەم کاتەدا لەناو دەرگای مزگەوتەکەوە کاك (عوبید مەجید) کەئەوکاتە ئەویش پێشمەرگە بوو لەگەڵ ئەواندا بوو سەرێکی هەڵکێشا و سەیرێکی منی کرد و سەری بردەوە ژوورێ و بزر بوو.. بەم شێوەیە من و ئەو و مامۆستا (سدیق گۆران) کەپێشمەرگە بوو لەگەڵیدا.. بەسێ قۆڵی دانیشتین.

سەرەتا من باسی خۆم بۆ گێڕایەوە کەچۆن لەرێکخستن کارمان کردووە و ئاشکرابوونمان لەلایەن دام و دەزگای بەعس و چۆنیەتی دەستگیرکردنمان و ئازار و ئەشکەنجەی زیندانی هەیئەی کەرکوك و مانەوەمان و پاشان دادگایی

کردنمان و ئازادبوونمان لەچنگی رەشییان کەچی ئەو جیا لەبرادەرانی پێشوو کەمنیان بینی و بەگەرمی باوەشی خۆشەویستیان بۆ کردمەوە فەرماندەکان (مەلا غەفور و ملازم سەید کەریم و شاخەوان عەباس)، هەر هەڵیدایێ و گوتی:

– پێم بڵێ کو لەسجن بەربووی و حوکم نەدرای؟

منیش بەهێمنی و بەزەردەخەنەوە گوتم:

+ لۆ دیارە جەنابت حەزت دەکرد حوکم بدرێم و ئازاد نەکرێم!

لەگەڵ ئەم قسانەشم دەستم لەباغەری راکرد و نامە چوکلێتیەکەی کاک شاخەوانم دەرهێنا و دامە دەستی. هەر کەنامەکەی خوێندەوە، کەمێك داما و پرسیاری کرد:

– کو شاخەوانی دەناسی؟ چی تووە؟ چ خزمایەتییەکتان لەگەڵ یەکدی هەیە؟

+ هیچ خزمایەتیەکمان نییە.. لێرە لەسماقووڵی یەکترمان بینی و تەعاروفمان کردیە.

سەیرێکی کردم و گوتی:

– ئەتو کو بەر بووی؟

گوتم:

+ وەکی ئەو هەڤاڵانەی کەبەر دەبن.. ئەمنیش بەر بووم.

– ئاخر.. زۆربەی برادەرانمان حوکمدران.. ئەوەی بەئیعدام.. ئەوەی بەموئەبەد.. هەندەکیشیان بەچەند ساڵێك.. کوە ئەتو حوکم نەدرای.

+ لۆ جەناب دیارە حەزت دەکرد ئەمنیش حوکمی ئیعدام درابام و پاشان فرمێسکتان لۆ هەرشتبام!

جارەکی دیشی بەرووگرژییەوە پرسی:

– کاك شاخەوان چی تووە؟ چ خزمایەتیەکتان هەیە؟

گوتم:

+ هیچم نییه.. لێره نەبی لەسماقوولّی هەر نەشم بینیه و نەشم ناسییه.

– دەگێ بگره.. ئەگەر ئەو نامەیەی کاك شاخەوانی نەبا.. هەنوکه سجنم دەکردی و هەر بەدەست بەسەریش رەوانەی سەرکردایەتیم دەکردی.. بەلاّم لەبەر خاتری کاك شاخەوانی ناتوانم ئەوەت لەگەلّدا بکەم.

+ لۆ برا ئەمن چم کردیه.. چ تاوانەکەم ئەنجامدایه؟

گوتی:

– لەخۆت بپرسە.. هەنوکەش بەشەرتەکی لێت خۆش دەبم و لێدەگەرێم لێره لەو گوندەی بژی.

گوتم:

+ شەرتەکەت چییه؟

– دەبی بچیەوە هەولێرێ.. ئەتو لەگەلّ (حەمید مەرمەرچی) بەینت خۆشه دەبی وەبکەی بەفرت و فێلّەکی لۆمان بیهینیه رێی کۆیێ.. ئەمه دێینه سەر جادەی و کەمینی دادەنێینەوە و دەیگرین و بەسزای گەل و شۆرشی دەگەیەنین.. هەینێ ئەتو هەر هەڤالّ و هەر چاوی مەی و سیقەت پێ دەکەین.

یەکسەر گوتم:

+ یەعنی بەدوو سەره ئیشێ بکەم.

گوتی:

– ئا.. ئەرێ وەللاّ بلزەبت بەدوو سەره.

گوتم:

+ ئەوەلەن ئەمن چ بەینم لەگەلّ ئەو کابرایەی خۆش نییه وەکی ئەتو بیری لێ دەکەیەوە.. ئەو مدیری سەقافەیه.. ئەمن جارێ تەلەبەمه و هەر تەعینیش نەکرایمه هەتا ببمه مۆزەفی وی. دوایی ئەوه لەتەربیەتی من ناوەشێتەوە

بەدوو سەرە کاری وا بکەم.. ئەمن بەخۆم خوا خوام بوو لەبەردەستیان قورتارم بی، کو جارەکی دی بەپێی خۆم دەچمە بەر چنگیان.

پرسی:

– ژن و مندارت هەیە؟

+ ژنم هەیە و ئێستا وا لەگەڵمە و مێوانی ماڵی مام کێخوا ئەحمەدینە.. بەڵام منداڵمان نییە.

هەستایە سەرپێ و بەتوڕەیی گوتی:

– کاکە ئەمن سیقە بەتو ناکەم.. کێ دەرێ ئەتو لۆ ئاین و ئۆینەکی نەهاتیە ئێرە.

گوتم:

+ ئەگەر غەرەزم خراپ بایە، بەتەنێ دەهاتم و خۆم لەنگۆ دەشاردەوە و هاوسەریشم لەگەڵ خۆم نەدەهینا.

هەینێ.. کەمێك داما و ئینجا گوتی:

– باشە بەس دەبی یێکەکی خەڵکی گوندی ببتە کەفیلت.. لەمەودواش لەگەڵ برادەرانی رێکخستنی ئێرە تەنیسق دەکەی و هاوکارییان دەکەی، لێرەش رێکخستنی سۆشیالیستی بەقوەتە، ئەو ماڵەی لێی هەموویان سۆشیالیستن دەبی ئاگات لێبی چ دەکەن و چ ناکەن هەمووی بکە راپۆرت و بیدە برادەران.

گوتم:

+ هەر یەکێك ئێوە دەست نیشانی بکەن لەم گوندەی ئەوا دەبێتە کەفیلم.. کێت پێ باشە؟

گوتی:

– مادام لەماڵی (کێخوا ئەحمەد)ی، با ئەو ببیتە کەفیلت.

گوتم:

+ زۆرباشە.

هەینێ مامۆستا سدیقی راسپارد لەگەڵم بێت و بچینە لای مام کێخوا ئەحمەدی، بەر لەوەی بڕۆین بەمامۆستای گوت:

– لۆ ئەوەی حەیامان نەچی راستیەکەی بەکێخوای مەرێ.. پێی برێ زاهیر مێوانی تووە و ئەتو داڵدەت دایە.. ئەمە شکمان لێی هەیە کەلەهەولێری (جەیشی شەعبی) بووە.. هەتا ئەمە لەبرادەرانی ناو شارەوە مەعلوماتمان لەسەری پێدەگا، دەبی ئەتو کەفالەتی بکەی کەلەگوندی نەڕوا و نەچیتەوە هەولێرێ.

چووینە ناو باخچان، مام کێخوا ئەحمەد لەوێ بوو، مامۆستا سدیق راسپاردەی مەسئوولەکەی پێڕاگەیاند، ئینجا لێی پرسی:

– ئەتو دەبیە کەفیلی؟

مام کێخوا بەهەڵچوون و توڕەییەوە گوتی:

+ ئەمن بەدە پەنجان لۆتان مۆر دەکەم و کەفالەتی دەکەم و بێ منەتیشم، ئەگەر ئاشکرا بوو کەئەو پیاوە لەهەولێرێ (جەیشی شەعبی) بووە.. ئەنگۆ ئەوەل جار ئەمن رەمی کەن ئەوجا زاهیر، کوڕە ئەو قوڕبەسەرە لەسەرەنگۆ رەزالەتی بەدەست ئەمن و ئیستیخبارات و هەیئەی کەرکوکێوە دیتیە.. ئەنگۆش ئەوشا پاداشتی دەدەنەوە.. وەڵڵاهی ئافەرین، هەزارجار ئافەرین.

بەهەرحاڵ، مامۆستا سدیق کلێشەیەکی نووسی و بۆ مام کێخوای خوێندەوە و لەسەر ناوەکەی پەنجەمۆری پێکرد، ئەو گەڕاوە لای پێشمەرگەکان و منیش لەلای جەنابی مام کێخوا ئەحمەدی مامەوە.. بەڵام دڵم زۆر تەنگ بوو گریان هەوکی گرتبووم و لەداخان قسەم نەدەکرد.. مام کێخوا زۆر دڵی دامەوە و ئامۆژگاری کردم کەواز لەسیاسەت و حیزبایەتی بهێنم و خۆم بەقوربانی

خەڵکی بێوەفا و خۆپەرست نەکەم. هەر ئەو چرکەساتە هەرچی سیاسەت و حیزبایەتی هەبوو لەبەرچاوم کەوت و بڕیارم دا جارێکی دی ببڕای ببڕ تێکەڵی حیزبایەتی و سیاسەت نەبم و ژیانی خۆم بۆ هونەرەکەم تەرخان بکەم.

هەتا لەگوندی سماقووڵی گرتکی مابووم، جارێکی دیش (ح. م) هاتەوە گوندی.. ئەمجارە بەیەکجاری سەروپرچی سفر کردبوو هەر بەتەواوی ڕەزای گرانتر بوو بوو.. ئێوارەکەی لەبەردەم قوتابخانەی گوندی لەنێوان پێشمەرگەکان و گەنجانی ئاوایی یاری تۆپی پێ دامەزرا.. ئێمەش لەدەرەوەی گۆڕەپانەکە سەیری یاریمان دەکرد.. چەکدارە مەسئوولە سەر سفرەکە خۆی لێ نزیك کردمەوە و کەوتینە گفتوگۆ، لەکاتێکدا من هەر سەیری دەم و چاویشم نەدەکرد چونکە بەسەرە تراشایەکەیەوە یەکجار ناشیرین و دزێو دەهاتە بەرچاوم، ئەو گوتی:

– ها هەڤاڵ.. هەواڵی گوندی چییە؟

+ جارێ من هەڤاڵت نیمە ناشمەوێ ببمە هەڤاڵت، دوایێ هەواڵی گوندی لەکنە من نییە لەکن خەڵکی دییە.. ئەمن جاسووسی لۆ بابیشم ناکەم.. تەربیەتەکەم ئەوهایە.

بەتوڕەییەوە مۆڕەیەکی لێ کردم و لێم دوورکەوتەوە و چۆوە ناو یارییەکەی تۆپی پێ. پاشتر نەمدیتەوە.

ئەوە هەموو ڕاستییەکانە کەلەنێوان من و ئەو حوکم بەدەستەی ئەوێ ڕۆژێ ڕوویدا.

کەچی ئەو زاتە مەسئوولە، دوای تێپەڕینی (٣٦) ساڵ لەو غەدرەی لەهەڤاڵێکی ڕێکخستنی خۆی کرد، هاتووە لەدوو توێی کتێبێك بەناوی (لەهەواری یادەوەرییەکانمدا) کەهەندێکیان وڕێنە و یادە وەریوەکانن نەوەك یادەوەری.. لەلاپەڕە (١٧٦) ناڕاستگۆیانە باسی ئەم غەدرەی خۆی

دەكاتـــەوە.. چـــۆن؟ نووســـیویەتی: (ز. ع) لـــەسماقوولّی بـــوو.. یـــەكێك لەهەوادارانی بـەعس و پەیوەنـدی بـەپیاوی بـەعس (حەمیـد مەڕمەڕچی)یەوە هەبووە، دەشڵێ (بەكەفالەتی یەكێك لەو جوتیارانەی گوندەكە ئازادمان كـرد و خۆیشـی گفتـی دا تفـەنگێك بـۆ پێشـمەرگەیەكی بـێ چـەك بكـڕێ و وەك هەوادارێكی كۆمەڵە لەگوندەكە دانیشێت و ئیشمان بۆ بكات!).

لێرەدا، مەبەستمە بەچـەند خاڵێـك، هۆكـار و پاڵنـەری ئـەم غـەدرەی ئـەو بەرامبەر بەمن ئەنجامیدا بخەمەڕوو:

یەكەم: من كەچوومە گوندی سماقوولّی گرتكی، چەند ئـامۆزا و پوورزایـەكم لـەوێ بـوون و هەمووشـیان پێشـمەرگە و ڕێكخسـتنی حیزبـی سۆشیالیسـت دیمـوكراتی كوردسـتان بـوون، منـیش بـەحوكمی خزمایـەتی و پەیوەنـدی كۆمەڵایەتی لەو ماوەیەدا زۆربەی كاتەكان لەگەڵ ئەوانـدا بـووم و هەڵسـوكەوتم دەكرد، هەتا یەكێكیان دەمانچەیێكی خۆی لەلا دانام و گوتی: با لای تۆ بێـت و بێ چەك نەبی خۆم تفەنگەكەم بەسە.

زۆربەی گـەنج و پیـاوانی گونـدیش یـان هـەوادار یـان لەڕێكخسـتنی حیزبـی سۆشیالیست دا بوون، ڕێكخسـتنی یـەكێتی و كۆمەڵـە لـەم گونـدە لاواز بـوو و لەچەند گەنجێك پتریان نەبوو.

بۆیـە گەنجـەكانی ڕێكخسـتنی ئـەوان ڕاپۆرتیـان لەسـەر نووسـیبووم گوایـە (زاهیر.. بویتە سۆشیالیست و چەكی وانی هەڵگرتووە و وازی لەئێمـە هێنـاوە) كەئەو بەرپرسە هاتە گوندی ڕاپۆرتەكەیان دابوو بەئەو، بۆیە ئەوها لەگـەڵ مـن ناحەز جولایەوە.

سەبارەت ناڕاسـتگۆیی و بوختانەكەشـی كـە لـە بیرەوەریوەكانیـدا تۆمـاری كردوون.. دەڵێم:

یەكەم: ئەو كاتەی ئـەو باسـی دەكـات، لەسـاڵی (١٩٨٢)ەوە، مـن قوتـابی

بووم و فەرمانبەر نەبووم تا لە (حەمید مەڕمەڕچی) نزیك بم و پەیوەندیم لەگەڵیدا هەبوویێت و هەواداری بەعس بوویم. بێجگە لەو برادەرە چەكدارە زەبر بەدەستەی ئەوكاتی، با یەكێكی دی لەخەڵكی هەولێر بەبەڵگەوە بڵێ (زاهیر) بەعسی بووە.. من وەك شانۆكار و هونەرمەند كەئەوكاتیش هەموو خەڵكی هەولێر و كوردستان منیان ناسیوە، چونكە لەگەڵ بەرەی خەڵكی خۆمان بووم هەموو كەس رێزییان لەخۆم و لەهونەرەكەم گرتووە و بەكوڕ و برای خۆیانیان داناوم.. با یەكێك بێ و بەبەڵگەوە بڵێ زاهیر بەعسی بووە.. من شانۆیی (محەمەد و سێوێ) و (هاوارێك لەحاجی قادری كۆیی) و (كەونە دەركەم) نووسیوە و بەشداریی دەیان شانۆگەری و درامای تەلەفزیۆنیم كردووە كەهەر هەموویان باسی ئێش و ئازاری میللەتەكەم بووە و شانازییان پێوە دەكەم و سەریشم بەرزە.

دووەم: لەبیرەوەریوەكەیدا بێ نمەكانە ناوی مام كێخوا ئەحمەدی سماقووڵی ئیهمال دەكات و دەڵێ: بەكەفالەتی جوتیارێكی گوند ئازادمان كرد.. لەكاتێكدا جەنابی مام كێخوا ئەحمەدی سماقووڵی، گەورە و پیاوماقوڵ و دەمڕاستی گوندەكە بوو.. هەموو خەڵكی گوندەكە بەگەورەی خۆیان دادەنا و سوڵح و مەسرەت هەر بەوی دەكرا و هەموو لایەنەكان و پێشمەرگەكانیشیان رێزییان لێ دەگرت و حیسابیان بۆ دەكرد، بەخۆشی دەیانجار لەماڵەكەی ئەو لەسەر سفرە و خوانی ئەو پارووی باداوە، كەچی ئەو بۆ بێڕێزی ناوی ناهێنێ و دەنووسێ: جوتیارێكی گوند! نازانم ئینسان چۆن هێندە بێ وەفا و بێ نمەك دەبێت؟!

سێیەم: بیرەوەریونووس دەڵێ: (خۆیشی گفتی دا تفەنگێك بۆ پێشمەرگەیەكی بێچەك بكڕێ)!!

جارێ لەلای هێروە ئەوكاتی من لەقوتابیاتی فەسڵ كرا بووم و فیرار و بێ

ئیش و کار و بێ پارە و پول لەسماقوولی دەژیام و میوانێکی قەدر گرانی ماڵی مام کێخوا بووین.. پارەم لەکوێ بوو تا تفەنگ بۆ پێشمەرگەی بێ چەك بکڕم.

چونکە مێکیشی لەق بووە وادەزانی سەرەتای شۆڕشە و ساڵانی دوای حەفتا و شەشە و پێشمەرگەیان لەگەڵ بووە بێ چەك بووە.. قوربان ئەوکاتی کەباسی دەکەی ساڵی (١٩٨٢)ە و هیچ پێشمەرگەکتان بێ چەك نەبوو، زۆربەشیان جگە لەتفەنگ دەمانچەشیان هەبوو. ئاخر درۆ و بوختانیش وەستای خۆی دەوێ و بەوڕێنان چێ نابێت.

چوارەم: بەهیچ جۆرێك من گفتی ئەوەم نەدایێ وەك هەواداری کۆمەڵە لەگوندی دانیشم. چونکە دوای بینینی ئەو و ئەو رەفتارە دزێوەی هەر حیزبایەتیشم لەبەرچاوی کەوت.

پێنجەم: ئەو بەخۆی لەکاتی قوتابیاتی گرێی دەروونی و کێشەی لەگەڵ (حەمید مەڕمەڕچی) مامۆستا هەبووە.. جا نازانم چ بەزم و رەزمێکیان لەگەڵ یەکدا هەبوو ئاوا لێ بوو بووە گرێی دەروونی و دەیویست بەرێگای من تۆڵەی لێ بکاتەوە.

(تکایە سەیری لاپەڕە (٤٣) بکە لەبیرەوەریوەکانی).

شەشەم: چونکە بەخۆی دوو سەرە و سێ سەرە بووە، حەزی دەکرد هەموو کەس وابێت و دوو سەرە و جاسووسی بۆ بکات.. لەبیرەوەریوەکانی سەیری لاپەڕەکانی (٥٧، ٥٨، ٥٩، ٦٠، ٦١، ٦٢) بکەن و بەوردی بیخوێننەوە ئینجا دەزانن نەوەك دوو سەرە سێ سەرەش بووە، ئەوەتا لەبەغدا لەبەر خاتری جەنابی، پیاوانی رژێم وبەعس چاو لەگرتنی برادەرێکی دەپۆشن و وازی لێ دەینن، لەولایەش لەبەر خاتری وی، برادەرێکی کەهیوای لەدامەزراندن و موچەخۆری دەبڕێت، ئەو واستەی بۆ دەکات و لەگەڵ گەورەترین کەسی دەزگای پاراستنی ئەوێ رۆژێی شۆڕشی ئەیلول دانوستان دەکات و لەبەر

خاتری ئەو برادەرەکەی دادەمەزرێنن و نوسراوەکەش بەئەو دەنێرنەوە بۆ برادەرەکەی تا بەدیارکەوێت واستەکەی موعتەبەرە.. ئەدی دوو سەرە کوە؟

حەوتەم: لەمانگی (١٩٨٢/١٢) ژمارەیەك مرۆڤی گەورە، پێشمەرگەی سەربەرز و سەر ئازا، لەتەقینەوەیەکدا لەناو ترومبێلدا شەهید بوون بەداخەوە ئەو برادەرەشیان لەگەڵدا بوو بەساچمە سەری برینداربوو.. ماوەیەکیش لەنەخۆشخانەی سەربازی رژێمی بەعس لەهەولێر و لەکەرکووك و لەبەغدا چارەسەر کرا!! رەنگە هەر بەو برینداریيەوە مێشکی تێك چووبێت و دواتر کەبیرەوەریوەکانی نووسیوە، هەندێك ورێنە و کەمێك بیرچوونەوە و شتی وای لەدەست دەرچووە!!

هەشتەم: یەکێك لەو هۆیانەی کەلەساڵی (١٩٨٤) لەلایەن سەرکردایەتییەوە سزا درا و سڕیان کرد و ناردیانە گوندی نازەنین دانیشێ، ئەو غەدرە بوو کەلەمنی کرد و پێیان گوتبوو (تۆ بەچ هەقێك لێکۆڵینەوەت لەگەڵ ئەو هونەرمەندە بەهەڵوێستە کردووە کەفیلت لێ وەرگرتووە و لەئێمەت تۆراند؟).

نۆیەم: ئەو لەبواری کۆمەڵایەتیش پێشمەرگەیێکی دەست و دەم و داوێن پاك نەبووە هەروەکو جەنابی مام جەلال داوای لەهەموو پێشمەرگەکان ئەوە بووە.. لەم بارەیەوە هیچ ناڵێم تکایە بەوردی لاپەڕەکانی (١١٠ و ١١١) بخوێننەوە.. بەخۆی شەرحی حاڵی خۆی لەم بوارەدا دەکات.

دەیەم: جا ئەگەر هێندە دڵسۆز و خەمخۆر و گیانفیدای کۆمەڵە بوو، هەر بەو حسێبەش لێکۆڵینەوەی لەگەڵ مندا کرد و بەکەفیل وازی لێهێنام. ئەدی بۆ بەخۆی وازی لەو (کۆمەڵەیە)ی کولەکەی رۆحی هێنا و ئینشیقاقی کرد و کەوتە تەقە لەو (کۆمەڵە)یە و هەتا پێیکرا دوژمنایەتی کرد.. دواتریش گەڕایەوە سەر رەوسە چەورەکە.

بەنوکتەیەك کۆتایی بەم بەشە دێنم.. دەنا جاریێ زوو بوو زۆر سەرمەقولاتی

دی ماوە گەر باسی بکەم.

نوکتەکە: دوای ئاوارەبیمان لەسلێمانی و رێکەوتنی ئاشتی نێوان (پارتی و یەکێتی) ئێمە گەڕاینەوە هەولێر و تەلەفزیۆنی گەلی کوردستان/ کەناڵی هەولێرمان زیندوو کردەوە.. رۆژێك لەژووری بەڕێوەبەری تەلەفزیۆن کاك (ئازاد سادق) دانیشتبووین و باسی بەرنامەکانمان گەرم بوو، لەپڕ ئەو برادەرە لەگەڵ بەرپرسێکی گەورە و قسە خۆش و قۆشمەچی بەژووریٚ کەوتن.. دوای بەخێرهێنان.. بەرپرسەکە بەمجۆرە ئەو برادەرەی بەدانیشتوان ناساند و گوتی: (ئەوە (ح. م)ە و تازە عادە ئیلا سەفولوەتەنی نادیمەن). ئێمەش هەر هەموومان تێر تێر پێی پێکەنین.

## هەر لەگوندی سماقووڵی

ئەو چەند مانگەی لە سماقووڵی گرتکی مامەوە لەگەڵ ماڵی مام کێخوا ئەحمەدی وەك میوان دەژیاین.. زۆر هاوڕێ و دۆست و پێشمەرگە ڕۆژانە سەردانیان دەکردم و دڵیان خۆش دەکردم.

جارێکیان، هاوڕێ (وەرزێر) کەبەجەولەی پێشمەرگانە لەگەڵ هاوڕێ پێشمەرگەکانی هاتنە گوندی، بۆ نانی ئێوارە هاتە لای ئێمە. (شیرین) لەبەر خاتری ئەو خواردنێکی پوختە و بەلەزەتی ئامادەکرد و هەر لەسەر نانخواردنیش ئەو درکاندنی کەهێندەی خواردنی بێتام خواردووە وای لێهاتووە تام لەخواردنە بەلەزەتەکانیش ناکات.

جارێکی دی، هاوڕێی قوتابیەتی و ڕێکخستن کەدەمێك بوو ببووە پێشمەرگە (سابیر عەبدوڵڵا) کەبە (ئاشتی) ناوی دەرکردبوو بەداخەوە دواتر لەگەڵ سەرکردە مەلا غەفور و هەڤاڵەکانی دی شەهید بوو، هاتە گوندی بۆ نیوەڕۆ و ئێوارەکەی میوانی من بوو تا درەنگانی شەو لەگفتوگۆ و بیرەوەری و یادگاری ڕۆژانی قوتابیەتی و ڕێکخستن و دانیشتنی بارەکان و کۆبوونەوە سەرکەوتووەکانمان بەسەربرد، هەر ئەو شەوەش بۆ یادگاری وێنەیێکی جوانی پێشمەرگایەتی خۆی پێشکەش کردم.. کەدواتر و لەدەرفەتێکدا ساڵانی دوای ڕووخانی ڕژێمی بەعس چاوم بەکاکە (پێشەوا)ی کوڕی کەوت و وێنە ناوازەکەی باوکیم وەك دیارییەك پێشکەش کرد.

هەر ئەوان ڕۆژان لەگەڵ مامۆستا (بەڵێن) کەئەوکاتی پێشمەرگە و بەرپرسی حیزبی سۆشیالیست بوو ماڵی لەسماقووڵی بوو.. زوو زوو دادەنیشین و گفتوگۆ گەرم دەبوو، ئەو بەحیزبەکەی خۆیدا هەڵدەگوت و بەرگری لێدەکرد، منیش بەکۆمەڵە و یەکێتیمدا هەڵدەگوت و دەرویشانە دیفاعم دەکرد، بەلام هیچ

جارێك لەسەر ئەو دانیشتنانە لێك عادز نەبووین و برایەتیمان تێك نەچوو.

هەر دوو هەفتە جارێکیش دایکم لەشارەوە بەدەست و دیاری و خواردنی بەلەزەتەوە خۆی دەگەیاندە گوندی.. مام کێخوا ئەحمەدیش هەر بۆ شۆخی و تەلتیفی جەو دەیگوت:

- هاتەوە.. دیسان پورزا عەلی تەتەرەکەم هاتەوە.

سەردەمانێك دیوەخانەکەی منیش گەرم و گوڕ بوو جگە لەمن و شیرین، وەك فێراری عەسکەری جوانەمەرگ (فریاد)ی برای شیرین و هونەرمەند (ئیسماعیل قادر)ی ئامۆزای و جیهانگیر و برزۆی کوڕە پلکم لەلامان بوون و هەموومان لەسەر یەك خوان دادەمەزراین و ژیانمان بەڕێ دەکرد.

(شیرین) لەگەڵ نەوە و بووکەکانی مام کێخوا ئەحمەدی یەکجار تەبا و گونجاو بوو بەردەوام ئیش و کاری ناو ماڵ و ناو باخچانی لەگەڵ دەکردن و لەهەرەوەزی نیسك و نۆك بەشداری خەڵکی گوندی دەکرد و گەورە و گچکە خۆشیان دەویست.

جارێکیان لەگەڵ (شیرین) بەسەردان لەگوندی دەرچووین و هەر بەپیادە بەنیازی سەردانی ماڵی (پلکە عەفیفی) و (دەشتی) برای کەفەرماندەیێکی پێشمەرگە بوو، خارە (شوان)ی براشی کەفێراری سەربازی بوو لەگوندی (مێکوکاو)ێ بوون، ئێوارەکەی لاماندا گوندی سماقوولی سەروچاوە و هەوارمان لەماڵی کێخوا عەزیز و کوڕەکانی خست، بۆ بەیانیش هەر لەوێ ماینەوە و کاك (جەعفەر خەیات)ی هاوڕێی دێرینم داوەتی کردین و شەویش هەر لەلای ئەو لەگەڵ ژن و منداڵەکانی ماینەوە، کاك جەعفەریش فێراری سەربازی بوو، مەکینەی خەیاتی لەرۆخی ئاوێ و لەژێر درەختێکی بەسێبەر دامەزراند بوو قاتی خاکی بۆ پێشمەرگە و خەڵکی گوندی دەدوری.

پاشان هەر بەپیادە کەوتینەڕێ و چووینە گوندی (مێکوکاو)ێ، لەوێش دوو رۆژی پڕ لەیادگاریمان لەگەڵ پلە عەفیف و نیگاری کیژی و مامۆستا ئازادی

زاوای و خارە شوانی برای بردە سەر. هەر بەپیادەش گەڕاینەوە سماقووڵی گرتکی.

لەگەڵ خەڵکی گوندی سماقووڵی بەینم زۆر خۆشبوو، لەگەڵ ژمارەیێك لەهاوتەمەنەکانم بوو بووینە برادەر و هامووشۆی یەکترمان دەکرد، یەکێك لەوانە (رەمەزانی مام سابیر)ی بوو، عەسران دەهاتە دووام و بەیەکەوە دەچووینە دەرەوەی گوند و لەوێ دادەنیشتین و کاتەکەمان بەقسە و باس و نوکتەی خۆش بەسەر دەبرد.. هەموو جارێ کەدەهاتە لام بۆ نمونە دەیگوت:

– با بچینە دەرێ لۆ بن دارەکانی هەورازی قەبرستانێ.

+چ هەیە لەوێ.. لۆ بچین.

دەیگوت:

– کوڕە هەر بەپیاسە دەچین و وەختەکە لەوێ بەسەر دەبەین.

ئەو (هەر بەپیاسە)یە لەلای من مایەوە و زۆرم بەدڵ بوو، ناونیشانی ئەم کتێبەشم (تەیراوە.. هەر بەپیاسە)یەم لە (هەر بەپیاسە)کەی کاك رەمەزانی مام سابیری سماقووڵی گرتکی قەرز کرد.

بەیانیەکییان زوو کەبەهار جارێ هەر تەڕ بوو، لەگەڵ ژمارەیێك جاحێلی گوند، کەرەمەزان و حاجی مام کێخوا ئەحمەد و پشتیوانی حاجی قادری و ئازاد و سەمەدی حاجی رەشیدمان لەگەڵدا بوون، هەوراز بووینەوە و بەسەر چیای (ئاوەگرد)ی پشت گوندی کەوتین، بۆ من وەك سەیران وابوو، بەڵام هەورازەکەی تاقەت پڕوکێن بوو، لەبەسەر کەوتن برادەران زۆر هاوکارییان کردم بەتایبەتی کاك رەمەزان.. ئیدی هەر کەگەیشتینە تۆقەرەی چیای ئاوەگرد زۆر دڵخۆش بووم و پاش حەسانەوەیێکی کورت کەوتینە (رێواس) کردن، هەر یەکێکمان نیو گونیەیێك رێواسمان خڕ کردەوە.. ئیدی بۆ نیوەڕۆ برادەران دەست و بردیان کرد و ئاگر کرایەوە و شلە ساوار بەسەرنرا و هێلکە کوڵێنرا و چایە دەمکرا و بەتەڕەپیاز و نانی تیری تێر تێر بووین و چایەمان

بەسەردا کرد.. ئینجا رەمەزان گۆتەنی هەر بەپیاسە چەند بیرە ئاوێکی کۆنمان بەسەر کردەوە و بەبینینی ئەم بیرانە سەرم سوڕما کەبێگومان وەك شوێنەوارێکی یەکجار کۆن ئەم بیرە پڕ لەئاوانە لەسەر چیای ئاوەگرد چۆن لێدراون و کێ لێیداون.. پاش عەسرێکی درەنگ بۆ ناو گوند شۆڕ بووینەوە کەدابەزینەکە زەحمەت و ناخۆشی هیچ کەمتر نەبوو لەبەسەرکەوتنەکەیی و هەر لەدابەزینەکەش و لەپەڕینەوەم لەقوتەییێکەوە بۆ یەکێکی دی قاچی راستەم ئازاری پێگەیی تا سێ چوار رۆژ لەناو گوندی بەشەلەشەل رێم دەکرد.. هێشتا بەتەواوی لەنگیەکەم لەکۆڵ نەبوویۆوە، ئێوارەییێك رەمەزانم لێپەیدا بوو گوتی:

– چ دەرێی جارەکیدی هەر بەپیاسە بچینەوە سەر ئاوەگرد.

یەکسەر گوتم:

+ نا بەقوربانت بم.. ئاوەگرد بەکەڵکی هەر بەپیاسەکەی تو نایێ.

چونکە دڵم لەهەڵسوکەوتی کابرای مەسئوول رەنجا بوو، کاتێك بڕیاری لێبوردنی گشتی لەلایەن حکومەتی بەغداوە دەرچوو سەبارەت بەراکردووە سەربازەکان و ئاشکرا کرا هەر سەربازێکی فیرار خۆی رادەست بکاتەوە ئەوا هەر لەسەربازگەکانی نزیك شارەکەی خۆی دەبێتەوە سەرباز.. منیش کەلەخوێندن فەسڵکرابووم و دەبوایە یەکسەر بچمە سەربازی، ئیدی خۆم بەفیرار دەزانی، ئەوەبوو بەیانیەك ماڵئاواییمان لەخانەخوێکەمان مام کێخوا ئەحمەد و کوڕ و نەوەکانی و تەواوی خانەوادەکەیان و خەڵکی گوندی کرد و سوپاسمان کردن کەوەك باوك و برا و پشت و پەنا ئەو ماوەیە دالدەیان داین و گەڕاینەوە هەولێر و لە (مەرکەز تەدریبی هەولێر) لەسەر رێگای عەنکاوە خۆم رادەست کردەوە و بوومە سەرباز و دروشمی:

(عەسکەری بەشەرتی تێنەپەڕاندنی سنووری پارێزگای هەولێر)م کردە بەرنامەم.

## له سەربازی

بەهەزاران سەربازی هەڵاتوو گەڕانەوە سەربازی و لەسنووری پارێزگای هەولێر هەر هەموو لە (مەرکەز تەدریبی هەولێر)ی سەر ڕێگای عەنکاوە خڕکراینەوە، بەیانیان زوو بەجلکی سەربازی فش و فۆڵ و پۆستاڵی ڕەزا قوڕس لەوێ لە (مەیدانی مەرکەز) کۆیان دەکردینەوە و پاش مەراسیمی عەرەزات ئیدی لەو ساکە بەیارەی مەرکەز دەکەوتینە مەشق کردن و ڕێڕۆیشتن و یەس یەم، دیمەنی سەیر سەیر ڕوویاندەدا و خۆمان پێوە سەرقاڵ دەکرد، بەنمونە:

* پیاوێکی قەڵەو هەموو بەیانیان بەکورتەک و شەرواڵی دەهات و جلکە سەربازییەکەی لەناو کیسەیەک بەدەستەوە دەگرت، کەلێیان دەپرسی بۆ جلکە سەربازییەکەت ناپۆشی، یەکسەر دەیگوت:

– لەبەر قەڵەویم هیچ جلکێکی سەربازیم لۆ نابی، خەتای خۆم نییە.

ئیدی کابرا هەتا لەمەرکەز تەدریب بووین، هەر بەجلکی کوردی و کیسە لەدەستەوە دەوامی کرد و جلکە سەربازییەکەی لەبەر نەکرد.

* ژمارەیێک دەروێش لەگەڵمان سەرباز بوون، بەپرچی درێژ و ریشی پڕەوە دەهاتن و دەوروبەری سەعات (٩) بەیانیان لەپشت ژوورەکەی ئەفسەری بەرپرسی مەرکەز تەدریب دەستیان بەحایوحو و زیکر دەکرد و ئێمەش دەورمان دەدان و سەیرمان دەکردن، پرچیان بەردەداوە و ئەڵقەی زیکریان گەرم دەکرد.. یەکێکیان خەنجەرێکی دەردەهێنا و دەیدایە دەروێشی ڕەفیقی و بەخۆشی لەسەر چیچکان دادەنیشت و دەروێشەکەی دیش دەستی دەکردە گاشەبەردێك و نوکی خەنجەری لەتۆقی سەری دەروێش لەچیچکان دانیشتووەکە دەچەقاند و بەبەردان خەنجەری لەسەری نقوم دەکرد، هەر

کەخەنجەرەکـە دەچەسـپا هـەینێ دەروێشـەکە هەردەسـتاوە و بـەحایوحوو هاواری دەکرد:

– ئـەو دینـە زدی گەوادانـە، زدی خۆفرۆشـانە.. . زدی نیشـتمانفرۆش و هیچوپوچانە.

هەر بەسەری خەنجەرەوە بـۆ ئێمـە دەهـات و ئێمـەش لەترسـان بـۆ دواوە رامان دەکرد، هەینێ ئامیر مەرکەز تەدریب لەپەنجەرەی ژوورەکەیـەوە سـەری دەردەهێنا و بەعەرەبی دەیگوت:

– ئەوە چیتانە بۆ وادەکەن.. ئەوانە چنە ئەو هەڵایەیان دروست کردووە.

کەتێمان دەگەیانـد ئەوانـە دەروێشـن و زیکـر دەکـەن.. هـەر لەپەنجـەرەیڕا هاواری دەکرد.

– زیکرەکەتان راگرن، دەروێشەکان هەموو ئیجازەن و بڕۆن یەك هەفتـە بـۆ مەرکەز نێنەوە.

* هەر لەو مەرکەزە، هونەرمەند فەیسەڵ محەمەد ساڵح نایـب عـەریف بـوو، بەخۆ و بەدەفتەرە گەورەکـەی بـن بـاڵی و دارە درێژەکـەی دەسـتی بـەیانیان تەدریبی پێدەکردین، کاك شـێرزاد عەبـدولڕەحمانی رۆژنامەنووسـیش لەقەڵـەم وەك (کاتب) دەوامی سەربازی دەکرد و زۆر هاوکارمان بوو.

ئێمەش ژمارەیێك هونەرمەند وەك سەرباز لەوێ بووین لەوانە (فوئاد جەلال، خالیـد سـەرکار، سـەید ئەحمـەد بـەرزنجی، رێبـوار سـەعیدی شـێوەکار، فەرەنسیس داود، فەیسەڵ محەمەد ساڵح) جگە لەژمارەیێك گەنجی بەهرەمەند کەلەسەربازگەکە لەگەڵمان بوون. جـا بـۆ ئـەوەی لەمەشـەقەتی راکـە راکـەی بەیانیان و تەدریب رزگارمان بێت، هەوڵمان دا تیپێکی شانۆیی دروسـت بکـەین و هەموومان بەیەکەوە بەبیانووی پرۆڤە و خۆ ئامادەکردن بـۆ پێشکەشـکردنی نمایشی شانۆیی بەتایبەتی کۆمیدی لەبۆنە و ئاهەنگەکانی ناو مەرکەز تـەدریب بەشـداربین، بـەم شـێوەیە هەوڵەکـەمان سـەریگرت و لەتـەدریب و هیلاکـی

بەردەستی نایب عەریف رزگارمان بوو.

هەندێجاریش کەدەیانبردینە تەدریب و یەس یەمیان پێدەکردین، لەجیاتی یەس یەم هەموو پێکەوە دەمانگوت:

(هە چەرمە چەرمە چەرمە عیلانێ)

کابرای نایب عەریفی عارەب دەیگوت:

– ئەوە ئێوە چ دەڵێن؟

دەمانگوت:

– هەر یەس یەمەکەی ئێوەیە، بەس بەکوردی.

* بەیانیەکیان، بووە هەرا و هۆریا و هەموومانیان کۆکردەوە بردراینە هەوارزی مەرکەز بەلای عەنکاوە، لەوێ لەترومبێلێکی کەپس ژمارەیێک گەنجیان دەرهێنا کەدەست و چاوییان بەسترابۆوە، ئەوانیان لەپەنا گردێک بەدارەوە بەستەوە و بریاری گوللەبارانکردنیان خوێندرایەوە و پاش چاوەڕوانییێکی کورت گەنجەکانیان خەڵتانی خوێن کرد، لەو کاتەدا ئەو هەموو سەربازە وروژان و غەڵبە غەڵب و هات و هاوار بەرز بۆوە، نەخێر بەوەندە نەوەستاین و بووە هوتاف لێدان و بەرد باران کردنی ئەفسەر و سەربازە چەك بەدەستەکان، ئیدی هەرایەکە درێژەی کێشا، ئەوان شەهیدەکانیان بەپەلەپەل لەدار کردنەوە و خستیاننە ناو ترومبێلە کەپسەکە و بەپەلە بۆی دەرچوون، ئێمەش ڕێڕەوی ڕۆیشتنمان گۆڕی بەرەو دەرگای سەرەکی و ئەو سەدان سەربازە بەهۆیها و هوتاف لێدان و جویندان لەدەرگا دەرچووین و بەرەو ناو شار بەڕێکەوتین.. هەرایێك بوو کەس ئاگای لەکەس نەبوو تا گەیشتینە سەری فلکەی عەنکاوە لەشێستیەکە، لەوێ دوو پیکابی دۆشکە لەسەر لەمبەر و ئەوبەری شەقامەکە رووی دۆشکەیان لەو خەڵکە کرد و بووە تەق و هۆڕ، ماوەییێکیش بەم شێوە هوتاف لێدان و تەق و هۆڕ بەردەوام بوو، تا لەناکاو بەبڵندگۆ هاوارییان کرد بێدەنگ بن با پارێزگاری هەولێر (یەحیا جاف) قسەتان

بۆ بكات و داواكارییەكانتان بۆ جێبەجێ بكات.. خەڵكەكە سەبر سەبر هێور بوونەوە و پارێزگار چووە سەر پیكابێك و بەبڵندگۆ قسەی كرد و داوای هێوربوونەوەی كرد، تا بزانێ چیمان دەوێ و بۆ وادەكەین.. ئیدی ئەو هەموو سەربازە هەموو پێكڕا هاوارییان كرد:

– تەسریح.. تەسریح، دەمانەوێ تەسریحمان بكەن.

(یەحیا جاف)یش یەكسەر وەڵامی دایەوە گوتی:

– بان چاو.. ئێوە هەمووتان تەسریح دەكەین، ئەمە بڕیارە و بەزووترین كات جێبەجێی دەكەین. بەڵام تكایە ئێوەش پەرتەی لێبكەن و واز لەموزاهەرە و هەرا و هۆریا بێنن. بەم شێوەیە و بەم درۆیەی (تەسریح) خەڵكەكەی سارد كردەوە و بەهیوای رزگاربوون لەسەربازی هەریەكەو بەلایەكدا پەرتەمان لێكرد و گەڕاینەوە ماڵێ.

كەچی نەتەسریح كراین و نەرزگارمان بوو، بەمشێوەیە ساڵمان بەڕێكرد و كەوتینە ناو ساڵی نوێی (١٩٨٣)، هەینێ دەنگۆی (تەنسیب) بۆ دایەرە مەدەنیەكانی ناو شار بڵاوبووەوە، هەر بابا بوو لەدایەرەیێك نوسراوی دەهێنا و لەقەڵەم بۆیان جێبەجێدەكرد و دەبووە فەرمانبەر. منیش لەچەند دایەرەیێك هەوڵمدا بەڵام لەبەر زۆری سەرباز و تەنسیب بوونیان دەیانگوت: جێگەمان نەماوە و پێویستمان بەنەفەری دی نییە.

تا رۆژێكیان، كاك (قاسم حەمەدەمین عەباس)ی هاوڕێم بینی، گوتی لەلای ئێمە لە (نەقڵ بەڕی) جێگە ماوە و هەوڵدە لەوێ وەرتگرن.

بەڕێوەبەری فەرمانگەی نەقڵ بەڕی كەلەسەر رێگای كەركوك بوو، كاك (عادل عەقراوی) بوو، (عادل عەقراوی) مەشروف خۆرێكی عەجایب بوو، بەیانیان تا سەعات (١١) هەر مەست و خەیاڵ بوو بەرینەدەدا. سبەینەیێك چووم و داوام لێكرد بۆ تەنسیب كەچی زۆر بەتوڕەیی وەڵامی دامەوە و هەر بەدەركردن دەریكردم. ناچار كەوتمە بیركردنەوە لەوەی واستەیێكی بۆ

بدۆزمەوە و دڵی نەرمکات، لەگەڵ (سەعدون یونس) بڕیارماندا بەهونەرمەند (تەحسین تەها) بڵێین بەڵکو دەیناسێ. هەرواش بوو کەپێمان گوت زۆر پێکەنی و گوتی:

– ئەوجا لەوەی ئاسانتر هەیە، سبەینێ دەچین و غەزبەن لەسەری دەبی وەرتگری.

بۆ سبەینێ (من و سەعدون و تەحسین) چووین، هەر لەدەرگای ژوورەکەیەوە تەحسین بەگاڵتە و جوێن دان لێی بەژووری کەوت و ئێمەش بەدوایەوە. عادل عەقراویش پێشوازییێکی گەرمی لێکردین و چایەی بۆ بانگ کردین.

هەر کە (تەحسین) پێی گوت:

– لۆ دوێنێ موافەقەت لۆ زاهیری نەکردیە هەتا لەکنەنگۆ تەنسیب کرێت.

عەقراوی سەیرێکی منی کرد و گوتی:

– کوا.. کەینێ هاتیتە لای من داوای شتی وای کردبێت.

هەر لەبیریشی نەمابوو چۆن بەدەرکردن دەریکردم، ئیدی لەبەر خاتری (تەحسین تەها)ی نوسراوم بۆ کرا تا تەنسیب بم.. لەوێ هاتینە دەر، هەر بەغار خۆم گەیاندەوە مەرکەز تەدریبی و لەپەنجەرە گچکۆکەی قەڵەم بانگی کاك (شێرزاد عەبدولڕەحمان)م کرد و نوسراوەکەم دایێ، ئەویش هەر دەست و برد فۆرمێکی بۆ پڕ کردمەوە و بردییە لای ئامیر و پێی ئیمزا کرد و نوسراوی تەنسیبی بۆ (نەقڵ بەڕ) دایە دەستم، گوتی:

– زاهیر گیان، بڕوا بکە ئەتو ئاخیر نەفەری کەتەنسیب کرای.. چونکە هەر ئەوڕۆ تەنسیب راگیرا و کەسێکیدی تەنسیب ناکەن، منیش سوپاسم کرد و بای بام لەمەرکەز تەدریبی هەولێر کرد و بەرەو ژیانێکی تازە هەنگاوم هەڵێنا.

## له نەقلٌ بەڕی

فەرمانگەی نەقلٌ بەڕی لەسەر ڕێگای کەرکوك بوو، دایەرەیێکی زۆر گەورە و پڕ ئیش بوو، کاروباری ژمێریاری و سیانەی ئەو لۆرییە بارهەڵگرانە رایی دەکرا کەشمەکیان دەگواستەوە لەنێوان (عێراق و ئوردن) من لەوێ موچەم بووە (٤٠) دینار و لەبەشی ڕێکخستنی فۆرمی ژمێریاری و گازوایل دەست بەکار بووم.

لەوێ جگە لە (قاسم حەمەدەمین عەباس)ی کۆیی کەپێشتر یەکترمان دەناسی، هەر لەژوورەکەی خۆمانٍ فەرمانبەرێکی چوست و چالاك و ڕووخۆشم ناسی کەهەر بەخۆشی بەرپرسی بەشەکەمان بوو بەناوی (سالّح گەردی)، هەر بەخۆشی لەماوەی چەند ڕۆژێك فێرە پڕکردنەوەی فۆڕمی هاتووچۆی شوفێرەکانی کردم و بەردەوام هەولّی دەدا لەکاتی پڕکردنەوەکە هیچ هەڵەیەك نەکەم.

خۆ پێشتر گوتم بەڕێوەبەرمان (عادل عەقراوی) بوو پیاوێکی کەمدو و لەسەرخۆ و ڕووخۆش بوو، بەلّام بەیانیان کەدەهاتە دەوام تا سەعات (١١)ی پێش نیوەڕۆ کەس بۆی نەبوو بچێتە ژوورەکەی لەبەرئەوەی تا ئەوکاتە هەر خەیالٌ و مەست و کاریگەری مەشروبی شەوێی لەسەر دەما ! پاشترێ دەبووە ماستی مەیی و دلّی کەسی نەدەڕەنجاند.

لەو بەشەی ئێمە چەند کەسێکم ناسی کەناچارم باسیان بکەم، کاك خەلیلێك لەگەڵمان فەرمانبەر بوو لەبەشی ژمێریاری زۆر لێزان و مەعلان بوو بەبێ تەماشاکردن ئامێری (حاسیبە)ی بەکاردەهێنا و مەحالٌ بوو هەڵەی تێدا بکات، بەلّام پیاوێکی ژنانی بوو دایمەی خوا هەڵسوکەوتی لەگەلٌ ژن و کچەکانی دایەرە بوو وەك ئەوانیش خۆی ناسك دەکردەوە و قسانی دەکرد،

بۆیە کچەکان لەناو خۆیان حیسابی کچێکیان لەگەڵ دەکرد و پێیان دەگوت (خوشکە خەلیل).

پاش ئەوەی ماوەیێك لەوێ دەست بەکار بووم، هەستم کرد (م) کچێکی دوورەپەرێز و زۆر بەدەگمەن تێکەڵ بەفەرمانبەران دەبێ و زۆربەی کات هەر لەژوورەکەیی و لەپشت مێزەکەی دادەنیشت. پرسیم ئەمە بۆ ئاوا دوورەپەرێزە.. گوتیان لەبەرئەوەی بەشێك لەرووخساری سووتاوە و هەست بەجۆرێك لەکەم و کوڕی دەکات و تێکەڵمان نابێت.

لێم ببووە مەراق، هەوڵمدا لێی نزیك ببمەوە و بیدوێنم، وردە وردە وەك خوشك و برایێك و دوو هاوڕێ لێك نزیك بووینەوە.

(م) لەپۆلی یێکی سەرەتایی لەقوتابخانە و لەناو پۆلی خۆیان لەکاتی یاریکردن لەگەڵ قوتابییە دەستە خوشکەکانی سۆبە عەلادینەکەیان وەردەگەڕێ و گڕ دەگرێت.. ئیدی ئاگرەکە تەشەنە دەکات و دەبێتە هۆی سووتانی چەند پەپوولەیێکی ئەم پۆلە کەیەکێکیان (م) بوو.

ئیتر ڕۆژانە دەمبینی و هانم دەدا کەژیان خۆشە و تەنهایی تاقەت پڕوکێنە و تووشی خەمۆکیت دەکات، باسی شیعر و چیرۆك و کتێبی ئەدەبیم بۆ دەکرد و هانمدەدا بخوێنێتەوە، ئینجا ڕۆژانە کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامەم بۆ دەبرد و دەیخوێندەوە و پتر چاو و دڵی دەکرایەوە.. واملێکرد لەگۆشەگیرییەتی دەرچێت و ڕوو لەژیانی ناو خەڵك بکات، دەهاتە ناومان و زۆر جارانیش بەشداری گاڵتە و گەپی لەگەڵدا دەکردین و بووە کەسێکی دی.

ماوەی ساڵێك (١٩٨٣-١٩٨٤) لەم فەرمانگەیە وەك تەنسیب مامەوە، لەو ساڵەدا نێوانم لەگەڵ زۆربەی فەرمانبەرەکان باش بوو بەتایبەتی فەرمانبەرە میسرییەکان زۆر هۆگرم بوون، لەگەڵ شوفێرەکانیش هەروا، کە لەسەفەری ئوردن دەگەڕانەوە دەست و برد کاروباری ژمێریاری و سەرفیاتی گازوایل و

مەسرووفاتی خۆیانم ڕایی دەکرد و دوام نەدەخستن، بۆیە نێوانم لەگەڵ شوفێرەکانیش زۆر باش بوو، جار جارە کە لە ئوردن دەگەڕانەوە دیاری گچکۆکەشیان (وەك بۆن و قەڵەم و کراس) و ئەو بابەتانەیان بۆ دەهێنام.

هەر لەنەقڵ بەڕێ بووم، لەگەڵ شیرین حەزمان کرد ترومبێلمان هەبێت، چونکە ماڵی خۆشمان کردبوو لەخوار ماڵی (قاسم) کۆیی هاوڕێم، ژوورێکمان لەخانووێك بەکرێ گرت کەژن و مێردێك بوون چەندین ساڵ بوو هاوسەرگیرییان کردبوو بەڵام بەداخەوە منداڵیان نەدەبوو.

ئیدی ڕۆژێك (شیرین) بڕیاری دا کەهەرچی ئاڵتونی بووکێنی خۆی هەیە بیفرۆشین و قەمەرەیێکی پێبکڕین.. هەرواشمان کرد و زێڕەکانمان فرۆشت بەبڕی (١ر٦٠٠) هەزار و شەش سەد دینار، ترومبێلێکی گچکۆکەی (نەسر)ی میسریم کڕی، ئەو یەك ساڵەی تەنسیب بوونم لەنەقڵ بەڕێ ساڵێکی یەکجار خۆش و پڕ لەبەرەکەت بوو بۆ من و شیرین، چونکە هەر ئەو ساڵە و دوای (٥) ساڵ و چەند مانگێك خۆشی و شادی کەوتە نێوانمان و مژدەی یەکەمین کۆرپەمان پێدرا کەبەراستی خەریك بوو هیوا بڕاو دەبووین لەمنداڵ بوون و نەوە نانەوە، بەڵام (ڕۆشنا)ی نۆبەرەمان دونیای جوانتر و خۆشتر کرد لەبەرچاومان و سەرلەنوێ بۆ ژیان تێهەڵچووینەوە. ئێش و ئازاری ئەو (٥) ساڵەی کەمنداڵمان نەدەبوو و هەوڵ و تەقەلامان بۆ چارەسەر و دەرباز بوون لەم گرفتە لەبەشێکی سەربەخۆ باس دەکەم.

## ( رۆشنا )ی رۆشناییمان

که لەگەڵ شیرین لەرێکەوتی (١٢/١٢/١٩٨٠) هاوسەرگیریمان کرد و پاش چەند مانگێك من دەستگیرکرام و لێکیان دابڕین، ئەو چەند مانگە زۆر ئاسایی بوو لەلامان و بیرمان لەمنداڵ و کێشەی منداڵ نەبوون هەر نەدەکردەوە، کەچی ئەو چەند مانگەی لەزیندان بووم بەهۆی ئەشکەنجە و ئازاری جەستەیی و دەروونی کاریگەری لەسەر ژیانی داهاتووم بەجێهێشت.

لەزیندانی هەیئەی کەرکووك ئازار و ئەشکەنجە زۆر ترسناك و تۆقێنەر بوو، منیش وەك گیراوە سیاسیەکانی دی ئازار و ئەشکەنجە درام و لەم بوارەشدا خۆم ناکەمە پاڵەوان و یەکە یەکەی ئەشکەنجەکان ناگێڕمەوە.

بەڵام باسی ئەو شەوە دەکەم کەدواتر کاریگەری لەسەر دواکەوتنی منداڵ بوونمان دانا، ڕۆژانی سەرەتای لێکۆڵینەوەم بوو لە (هەیئە)، شەوێکیان بانگیان کردم و دوای مشتومڕێکی کورت خایەن هەموو جلك و بەرگیان لەبەر کردمەوە و بەچاو و دەست بەستراوی هەڵیان واسیم و لێم دوورکەوتنەوە، چارەگە سەعاتێك بەم شێوەیە بەهەڵواسراوی بەرووت و قوتی مامەوە و هەستم راگرتبوو بزانم کەینێ دێن و دەست بەلێدانم دەکەن، لەپڕ تەقە تەقی پۆستاڵێك هاتە بەر گوێم لێم نزیك بووەوە، هەر کەقسەی کرد بەدەنگ ناسیمەوە (عەباسە رەشی) جەللاد بوو، چونکە پێشتر دوو جاران لەگەڵ ئەوانیدی بەشداری ئەشکەنجەدانی منی کردبوو، ئەو وەك سەردەستەیان هەڵسوکەوتی دەکرد، لێم هاتە پێش و بەگاڵتەوە حاڵ و ئەحواڵی پرسیم. منیش نووزەم لەخۆ بڕی و وەڵامم نەدایەوە، لەپڕ بەئامێرێك کەوزەی کارەبای تیا بوو، لەگۆی مەمکم و لەناوکمی دەدا و هەڵیدەتەکاندم، پاشان دەستی هێنایە خوارتر بۆ ناو گەڵم و چاوی بە (هەرامەکەم) کەوت و فیکەییێکی دوور و

درێژی لێدا و بەعەرەبی گوتی:

– ئەوە بەچ وەها گەورە بووە کوڕی قەحپەی.

ئیدی کارەبای لەوێدا و منیش دەستم بەهات و هاوار کرد، گوتی:

– بۆ هاوار دەکەی خۆ لێمنەداوی؟ وا یاری بە (هەرامەت) دەکەم.. ئەمشەو سۆندە و کێبل و قامچی بەکارناهێنم بێخەمبە، بۆ خۆم هەر یاری بەو هەرامە گەورەیەت دەکەم.

ئیدی عەباسەرەش ئامێرە کارەباییەکەی وەلانا و بەدەست وەك زللە لێدان کەوتە لێدانی و جار جارەش دەستی پێدا دەهێنا و دەیگرت و دەیگوشی و یاری پێدەکرد و بەمنیشی دەگوت:

– ئەو تەعزیبەت پێخۆشە.

منیش نقەم لەخۆم بڕی بوو و نەمدەوێرا وەڵامی بدەمەوە.. لێم دوور کەوتەوە و جارێکیدی گەڕایەوە و یەك دوو جەلادی تریشی لەگەڵ خۆی هێنا.. هاتەوە گژ هەرامەم و بەئامێرە کارەباییەکە و جار جارەش بەدەست لێیدەدا و دەیگرت و دەیکوشی.. منیش هەر دەپاڕامەوە و (خاتر ئەڵلا، خاتر ئەڵلا)م بوو، جەلادەکانی دیش قاقا پێدەکەنین، ئینجا ئەو زاڵمە.. ئەو عەباسە رەشە بێشەرەفە لەپڕ بزمارێکی گەورەی لەسەر کونەکە داناوە و رەوانەی ژوورەوەی کرد.. لەتاوان زیڕەم گەیشتە حەوت تەبەقەی ئاسمان و ئاگام لەخۆم نەما و بورامەوە. کاتێك بەهۆش هاتمەوە لەبەرامبەر هەوای موبەریدەك پاڵیان خستبووم و ئاوی ساردییان پێدا دەکردم. پاشتر جلکەکانیان خستمە باوەش و سەری سۆندەیەکیان دایە دەستم و بردمیانەوە بۆ ژوورە تاکە کەسیەکەم کەئەو شەوە نۆیەمین شەو بوو لەوێ بووم.. ئیدی بەئازاری برین و خوێنی تێکەڵ بەمیز ئۆقرەم لێهەڵگیرا.. تا ئازدیش بووم هەر کەمیزم دەکرد رەنگی سۆر سۆر بوو و برینەکەشم هەر دەکولایەوە.

بەم شێوەیە، ساڵێکیشم دوای ئازاد بوونم بەدەم ئازارەوە بەڕێکرد، لەگەڵ (شیرین)یش حەزی منداڵ و کۆرپە دروستکردنمان زیادی دەکرد و ئەو بەلایەك و من بەلایێکی دی سەردانی دکتۆر و پڕ و پیرێژن و داودەرمانی کوردەواریمان دەست پێکرد، من دەمزانی کوێم دێشێ بەڵام شەرمم دەکرد لەلای خەڵك و کەسە نزیکەکانیشم باس بکەم.. کەتەواو بێهیوا بووین بیرمان لەهەڵگرتنەوەی منداڵێك یان کۆرپەیێکی بێدایك و باوك کردەوە. ڕۆژێکیان خزمێك هاتەماڵمان گوتی:

– ماڵێك لەگەڕەکی دۆمان، منداری سەرکە و بنکەیان زۆرە و ژنەکەش تازە کچەکی بووە، دەڕێن پێمان بەخێو ناکرێ ئەگەر یێکەك هەبی بەخێوی بکات دەیدەینێ.

کەگوێم لەو قسەیە بوو، یەکسەر دایکم تەنگەتاو کرد و هەرمپێچا کەبچی ئەو کۆرپەیەمان بۆ بێنێ و من و شیرین دەیکەینە منداڵی خۆمان.

دایکم ڕۆیی و منیش لەبەر دەرگا بەدەم چاوەڕوانی و خۆشی منداڵەکەوە جگەرەم بەجگەرە پێدەکرد و هەر ملە قوتەم بوو کەینێ دایکم بەخۆ و بەمەلۆتکەوە دێتەوە، زۆری پێچوو و زۆرم جگەرە کێشا.. کاتێك دایکم لەسەری کۆڵانێ بەدیار کەوت چ کۆرپەی پێنەبوو من لەشوێنی خۆم سارد بوومەوە، دایە گەیشتەوە ماڵێ و گوتی:

– سەرەتا بابی مندارەکەی زۆری پێخۆش بوو هەتا لەباوەشێی نام و گەردنیشی ئازاد کردم.. هەستام بێمەوە.. دایکە زەیستانەکەی دەستی بەگریان و بابەڕۆیەك کرد کافری حەفت دینان زکی پێدەسووتا.. مەجبوور بووم کۆرپەکەم لەباوەشی داناوە و بەچاوی بەگریان هاتمەوە. کەلەمەش بێئومێد بووم، ڕۆژێك بەشەرمەوە باسی ئازاری میزکردنەکەم لەلای مامۆستا سەعدون کرد، ئەویش پێی باش بوو سەردانی دکتۆری پسپۆر بکەم و

پێشنیازی بۆ کردم و گوتی:

– دکتــۆر جەعفــەر حەمــەد قــادر پســپۆری ئــەو بابەتانەیــە، دکتــۆری عەسکەرییە و ولداش تەلەبەم بووە و هەوکەش برادەرمە، پێکەوە دەچینە کنە وی.

چووینە لای دکتۆر جەعفـەر، پـاش پشـکنین و پرسـیارێکی زۆر و فەحسـی موختەبـەر بـۆی روون بـووەوە کـەبرینێکی زۆرم هەیـە و نـاوەوە تـا بنـەبانێ بەبرینان وێران بووە، هەینێ دوو جۆرە حەبی بۆ نووسیم.. یـەکێکیان تـا سـێ مانگان لەسەری بەردەوام بـووم و ئەوەکەیـدیش مـاوەی یـەك سـاڵ خـواردم و هەستم دەکرد بەرەو چاکبوونەوە دەچم و رەنگی میزم ئاسایی بووە و ئـێش و ئازار و زورانەوەم نەما.

بەم شێوەیە لەماوەی ئـەو سـێ مـانگ و یـەك سـاڵە تـەواو چـاك بوومـەوە، شەڕە نەگریسەکەی قادسـیەش لەگەرمـە گـەرمی وێرانکاریـدا بـوو، زوو زووش (شیرین) دەچوو فەحسی دەکـرد تـا بـزانین دووگیانـە یـان نـا، لەفەحسێکیان دەرچوو دووگیانە، ئۆخەی خۆشی و شادی کەوتە ناو ماڵ و بەهەموومان نازی (شلە)مان رادەگرت تا کۆرپەکەمان سەلامەت بێت.

رۆژێکیـان لـەپڕ تـەرمی کـوژراوی (عەبـدوڵڵا)ی دادە عیسـمەتێ بەعەلـەمی عێراقەوە گەیشـتەوە کۆڵانـێ و بـووە قیـژ و هـۆڕ، (شـیرین)یش لەگـەڵ ژنـانی کـۆڵان دەورە لـەدادە عیسـمەتی دەدەن و شـینی لەگـەڵ دەگێـڕن.. تـەرمی عەبـدوڵڵای سـەربازیش لەحەوشـەیە و چـاوەڕێ دەکـەن سـەردار و برایـەکانی بێنەوە و کفن و دەفنی بکەن.. دادە عیسمەت قەپاغی سندوقی تـەرمی کـوڕە کوژراوەکـەی هەڵدەداتـەوە تـا دوا مـاچ و دوا ماڵئـاوایی لێبکـات، (شـیرین)یش دەچێت سەیری ئەم دیمەنە بکات، هەر کەبەتانی لەسەر دەموچـاوی خوێنـاوی عەبدوڵڵا لادەبەن زۆر ترسناك دەبێت، گوللەیەك بەر سـەری کـەوتبوو لـەکونی

گوێچکەی هاتبووە دەر و گوێچکەی بەسەرەوە نەهێشتبوو، کە (شیرین) ئەم دیمەنە دەبینێ شۆك دەبێت و دەترسێ و نیمچە بورانەوەیێك دەبورێتەوە، هەر بۆ شەویش کۆرپەکەی لەبارچوو و خەم و پەژارە و نائومێدی کەوتەوە نێو خێزانەکەمان.

ئەو خەمەشمان تێپەڕاند و جارێکی دی بەهیواوە دەستمان بەژیان کردەوە.. هەر ئەو ساڵەی کەتەنسیب بووم لەنەقڵ بەڕێ مژدەی دووگیانی (شیرین)یان پێدایەوە، ئەمجارە زۆر لەجاری پێشوو باشتر (شلە) ئاگای لەخۆی بوو. تا لەبەرەبەیانی (١٩٨٥/٤/١٦) کەمن گەڕابوومەوە سەربازی و هەر لەمەرکەز تەدریبی هەولێر بووم، یەکەمین نۆبەرەمان لەدایك بوو، ئای خودایە ئەو (رۆشنا)یە چ رۆشناییێکی بەژیانمان بەخشی.

# فیراری و دایه و هەمزاتۆف

بەتەمەنم رۆژێك لە رۆژان، هیچ برە پارەیەکم لە باوکم وەرنەگرت، ئەو بەتـەنها خەمی هەڵسوڕانی ئیش و کاری دەرەوە و کار و کاسبی خۆی بـوو، وەکـی دی دایکم لە خەمی ناوماڵ و کابانی و خەمخۆری هـەموان بـوو، ژنیشـم هێنـا بـوو رۆژانەم هەر لە دایکم وەردەگرت.

لە گەرمەی شەڕی (عێراق – ئێـران) و سـەرەتای هەشـتاکان، کـە وردە وردە شەڕ گەرمتر و ترسناکتر و قوربانی پتر دەبوون، سـەربازی راکـردووش رۆژ بـە رۆژ ژمارەیان پتر هەڵدەکشا، ماڵ نەبوو لە تەیراوە کوڕێك و دووی فیرار نەبێت و لە چنگی رەشی شەڕی قادسیەی شووم خۆیان دەرباز نەکردبێت.

هەینیٚ، لەو سەراو و دەراوە، من بۆ چەندەمینجار بوو لە سەربازی فیرار و لـە شەڕی نەخوازراوی قادسیە لاتەریك خۆم دەدزییەوە، لە تەیراوە و لـە خـانووە دوو نهۆمەکەمان، کە لە سەرەتای ساڵانی هەشتاکان کەم خانـەوادە هـەبوو لـە گەڕەکەکەمان خانووی دوو نهـۆمی هـەبێت، جێگامـان چ جێگـا نـەبوو و مـن و مارفی برام لە ژێر زەمینەکەمان و دوور لە چاوان دەژیاین.

ئینجا، رۆژانە فڕۆکە جەنگییەکانی ئێـران بـە ئاسمـانی هـەولێر و لـە گـەڕەکی تەیراوە و لە سەربانی ماڵی ئێمە دەسوڕانەوە، ژێر زەمینەکەیمە تاقە پەناگەی خەڵکی کۆلآن بوو، هەرکە لورەی ئاگادارکردنەوەی فڕۆکە لە قوتابخانەی زانین بەرز دەبۆوە.. ژن و پیاو، گەورە و گچکە بـە لێشـاو و بـەغار هانایـان بـۆ ئـەو حەشارگەیەی خانووی ئێمە دەهێنا، ژنێکی قەلآتی بەتەمەن، خاوەن کۆمـەڵێك کوڕ و کچ هەرکە لورەی ئاگادارکردنـەوەی دەبیسـت، قـەدەمی دەسـت و پێـی دەشکاو بە راکێشان دەیانگەیاندە ژێر زەمینەکەی مـاڵی ئێمـە، هەرکـە دایکـم هێوری دەکردەوە و پێیدەگووت:

–دادە گیان.. چ خێرە.. لۆ وەها قەدەمی دەست و پێت دەشکێ.. خۆ ئەتو لەو زەرد و سۆرانە زیاترنی (ئاماژەی بە کوڕ و کچە جحێلێ و تازە پێ ڕاگەیشتووەکانی دەکرد) ئەویش بە تەنگە نەفەسی و بە ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاوی و دەست و چۆك لەرزینەوە دەیگوت:

–بمرین بمرین قەیناکە.. بەس ببین بڕوش ؟!

ژیانی ئێمە، خواردن و خواردنەوەمان لەم ژێر زەمینە تاریك و لاتەریکە بوو، ئەو کاتەی بە فیراری و گیرفانی بەتاڵی و ترس و لەرزی مشتەرەکە و مەفرەزەی ئەمن، دایە قەدری مشووری دەخواردین و بە هەموومان رادەگەیشت، شەوان هەرکە ئێمە لە ژێر زەمین دەخەوتین، ئەو نەدەخەوت، تا گزنگی بەیانی دووجار و سێجار دەهاتە خوارەوە و دڵنیا دەبوو کە ساغ و سەلامەتین هەینێ دڵی ئاوی دەخواردەوە و دەچۆوە سەر جێگا و خەوی لێدەکەوت.

سبەینانیش زوو، هێشتا ئێمە لەخەو بووین، لە خەونی جڕنا و فڕنای گرتن و زیندان و شەڕ و قوربەسەری بووین، ئەو دەچووە جادەی تەیراوە، نانی گەرم و شامی نۆك و لۆبیای مام سەید و ماستی مەڕ و پەنیری ناو پێستەی بۆ دەکڕین، لەسەر سێنییەك دەیڕازاندەوە و دەیهێنا خوارەوە، ئینجا چایەی دێم دەکرد و جارێکی دی دەهاتەوە خوارێ، بەلاواندنەوە و بە قوربان و حەیرانمان دەبوو و لە خەوێی بەئاگا دەهێنایـن، هەرکە نانیشمان دەخوارد و چایە عەنابیەکەمان بەسەردا دەکرد، دەستی لەبەرکی کەواکەی رادەکرد و دوو پاکەتی سۆمەری کیسەی شینی دەردەهێناو لە پێشی دادەنایـن، ئێمەش بە دووکەڵی جگەرەی سۆمەر ترس و لەرزی قوربەسەری و فیراری و بەسەرداداني وەلەکە عەرەبمان بەبا دەکرد.

دایکم مەعلان بوو، لەتەیراوەی جلك و بەرگی بۆ ژنانی گەڕەك دەدوری،

دەرزی لە منداڵ و نەخۆشان دەدا، گەرووی منداڵە لەوزەتێن هەڵاساوەکانی هەڵدەدایەوە، بەهەموو دەمێ گیرفانی پڕ و گەرم بوو، بەهیچ جۆرێکیش قسوری لە پارە سەرفکردن بۆ ئێمەی فێرار و خۆ حەشاردراو نەدەکرد،

دەیزانی من جار جارە دەم لەمەی دەدەم، زۆر جاران بە نهێنی و بە دزی باوکم، چارەکێك عەرەق و زەلاَتە و جاجکی بۆ دەهێنامە خوارەوە و بەر لە تەواو مەست بوونیشم خواردنە بەتام و بەلەزەتەکانی لەبەردەم دادەنام، تێر و پڕم دەخوارد و مەست و حەیران و خەیاڵ سەرم دەخستە سەر سەرین و تا سبەینەکی تازە فشەم بە فێراری و دایەرەی ئەمن و مەفرەزەی موشتەرەکە و ئینزیباتی سەر سۆر دەهات.

ئەو رۆژانە، دایە قەدریەکەیمە، چاوێکی کردبووە چوار چاو، لەکۆڵاَن و لە بازاڕی تەیراوەی چ هەواڵ و چ دەنگۆیەك هەبا بەهەشتاوی دەهات و پێی رادەگەیاندین، ئەو رۆژانەی هیچیشی نەدەبیست دەهاتەوە و دڵنیای دەکردین و دەیگوت:

—بێخەم پاڵدەنەوە.. ئەوڕۆ هیچ لە گۆڕێ نییە.

ئێمەش بێخەم پاڵماندەداوە، جارجارە بە دیار فیلم کارتۆنی (عەدنان و لینا) و هەندێجاری دیش بەسەیری زنجیرە دراما میسرییەکان لێی رادەکشاین.

دەیزانی من متووی خوێندنەوەم، هەرکە (برایم زەبۆك و تاریك و روونی مام هێمن و داغستان)ی رەسوڵ هەمزاتۆفم دەخوێندەوە، دەیگوت:

—کاکە برۆکەك دەنگت برندکە با ئەمنیش گێم لێبی چ دەخینیەوە !

لە عەشقی (داغستانی من ) و گەورەیی هەمزاتۆف، دایکم عاشقی خوێندنەوە و نووسین بوو، هەینێ تازە بڕیاری نەهێشتنی نەخوێندەواری بۆ گەوران دەرچوو بوو، دەستوبرد دایە ناوی خۆی تۆمارکرد و بووە قوتابیە گەورە و سەلارەکەی پۆلێك لە پۆلەکانی ژنە نەخوێندەوارەکانی قوتابخانەی زانین و رۆژانە پاش

عەسران دەچووە مەکتەبێ، هەرکە دەشهاتەوە وەك قوتابییەکی تازە و تامەزرۆ دەهاتە ژێر زەمین و دەرس و دەوری دەکردەوە و منیش هاوکاریم دەکرد و ووشە و ڕێنوسەکانم باشتر فێردەکرد.

دایە قەدرییەکەیمە زوو بە زوو فێرە خوێندنەوە بوو، مامۆستا عەباس کە ئەرکی پیرۆزی وانە ووتنەوەی گەورانی لە ئەستۆ گرتبوو زۆر هانیدەدا و دەیگوت:

—دادە قەدرییە.. زۆر تا مەزرۆی فێربوونی خوێندنەوە و نووسینە.. دەرێی کیژە جاحێڵەکانە لە ورد و درشتان دەپرسیتەوە.

هەرواش بوو، قۆناغی نەهێشتنی نەخوێندەواری بەسەرکەوتویی تێپەڕاند، ئینجا هەرکە بەیانیان شامی نۆك و لۆبیای مام سەیدی دەرخوارد دەداین و هەریەکە و پاکەتێکی شینی سۆمەری کیسەی دەداینێ، هەڵدەستا و کتێبی (داغستانی من)ی لەسەر کۆشی دادەنا و بەعونجە و بە ڕێك و پێکی دەیخوێندەوە و جارجارەش سەیرێکی منی دەکرد و بەبزەوە دەیگوت:

—نەخوێندەوار وەکی کۆرەیە.. هەنوکە ئەمن دوو چاوی ساغ ساغم هەیە.

ئای دایە قەدری چ رۆحێکی هاوکاری و چ گیانێکی لە خۆبرد و چ حەزێکی فێربوون و وەرگرتنی زانیاریت هەبوو ؟ یادت گوڵباران.

## چاوچنۆك.. سێ گندۆرمم هەیە

لە سەرەتای کاری هونەریم لە بواری شانۆدا، یەکێك لەو هـاوڕێ و ڕەفیقانـەی زوو بە زوو ناسیم، هونەرمەندی شانۆکار (قاسم عەزین) بـوو، ئـەو کـوڕە جگـە لەوەی لەبوارەکە ئارەزووی نواندنی دەکرد بەردەوامیش عەودالّی کتێب و ئـەو سەرچاوانە بوو کە لەبواری شانۆ و ڕۆشنبیری شانۆیدا لەبەردەستدا بوون، مـن بۆخۆم چەندینجار سەرچاوەی بەسوودم لێوەردەگرت و دەمخوێندەوەو پاشان هەر بە پیاسە لەتەیراوەی یاخود لە دانیشتنەکانی ئێـوارانی گـازینۆی شـەوانی هەولێر گفتوگۆمان لەسەر دەکرد و مەجلیسـمان گـەرم و مناقەشـەمان گـەرمتر دەکرد، لێرەوەش دانیپێـدادەنێم بـۆ یەکـەمینجار مـن لـەم شـانۆکارەوە نـاوی (برێخت) و (تەغریب) م بیست و شارەزای بووم.

(قاسم عەزین) لەسەرەتای لاوییەوە شانبەشانی هونەرمەندان (سوبحی کۆیی و هەڤاڵانی) لە یەکێتی قوتابیان و یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردسـتان گـروپ و تیپی هونەری شـانۆییان ڕێـك دەخسـت و لەبۆنـە و ئاهەنگـەکان لەگـەڵ تیپـی مۆسیقا و گۆرانیبێژان، ئـەوانیش دیمـەنێکی کۆمیـدییان ئامـادەکرد کـە پێیـان دەگوت: (فاصل فکاهی) و بۆ دڵخۆشی جەماوەر پێشکەشیان دەکرد.

ئەم شانۆکارە بەتوانایە هەر لە یەکەمین ناسینیەوە دەرکەوت کە زۆر بێکەس و بێدەرەتانە، بـاوکی مـرد بـوو، دایکـی شـووی کردبـۆوە لـە شـاری سـلێمانی دەژیا.. ئەویش بە هـەوڵ و مانـدووبوونی خـۆی بـژێوی ژیـانی دابـین دەکـرد و کۆڵی نەدا تا خوێندنی ئامادەیشی تەواوکرد، هەر چـەند سـاڵێك لـە کونجێـك و هەر ماوەیەك لە کونـە ژوورێـك دەژیـاو درێـژەی بـەکاری هونـەری خـۆی دەدا، زۆربەی ئەو شوێنانەی کەتیاشـی دەژیـا هـەر لـە کۆڵانـەکانی تـەیراوە بـوون و بەردەوامیش ئاگامان لەیەکتر بوو.

ڕۆژانێك لە ژوورێکی بچـوکی پێشـەوەی ئـەو خـانووە دەژیـا کـە مـاڵی بـاوکی

هاوڕێ (ئازاد جەلال) بوو، ژوورەکە هەر بەتەنها جێگای قەروێڵەیەك و ژمارەیەك کتێبی تیا دەبۆوە.. هەر ئەوان ڕۆژانیش ئەو لە درامایەکی تەلەفزیۆن وەك ئەکتەر بەشدار بوو، درامای (فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە) لە دەرهێنانی هونەرمەند (تەلعەت سامان).

هەر ئەو دەوروبەریش بوو (قاسم) تێکەڵ بە ژمارەیەك هاوڕێ و برادەری شیوعی بوو و لەسەر ئەو حیزبە حسێب دەکرا.. کە لە ژوورە گچکۆکەی ماڵی (ئازاد جەلال) بوو، زۆربەی نیوەڕۆیان دەهاتەوە ماڵی خۆمان و دەبووە هاوخوانمان، خۆ ئەگەر نەشهاتبا ئەوە دایکم سەفەرتاسەکەی بۆ پڕ لە شلە و برنج دەکرد و دەبوایە بۆی ببەمە کونجەکەی، یەکەم ڕۆژی هەردوو جەژنەی رەمەزان و قوربانیش دەبوایە بێو برنج و شلەی قەیسیەکە لەگەڵ ئێمە بخوات و هەر ئێمەش یەکەمین کەس بین پیرۆزبایی جەژنەی لێبکەین.

(قاسم) هەرکە خوێندنیشی تەواوکرد، دامەزراو وەك فەرمانبەرێکی ئیداری لە دادگای هەولێر دەوامی دەکرد، هەینێ باری دارایی باشتر بوو لەگەڵ ژمارەیەك لە زووگرتی وەك خۆی لە هەورازی حەمام سیروان هەریەکە و ژوورێکیان لە خانووە کۆنەکەی دادە حاجی خێرییەی خوشکی ئەفسەری شەهید (خێروڵڵا عەبدولکەریم) بەکرێ گرتوو تیایدا حەسایەوە، زۆربەی شەوانیش ئێمەی برادەرە نزیکەکانی لە حەوشە گەورەکەیان خڕ دەبووینەوەو بەدەم گفتوگۆ و باس و خواسی شانۆ سەرمان گەرم دەکرد و پاشان پەرتەمان لێدەکرد.

(قاسم) زۆر حەزی لە گەشت و سەیران بوو، لەگەڵمان دەهاتە سەیرانگاکان و کاتە خۆشەکانمان بەیەکەوە بەسەر دەبرد، لەبواری شانۆش ئەو پتر بە ڕێگای (کۆمەڵی هونەر و وێژەی کوردی / لقی هەولێر)و لەگەڵ هەردوو دەرهێنەر (تەلعەت سامان و فەرهاد شەریف) کاری دەکرد و شاکارەکانیان (مەم و زین و حەمە وەی وەی و پیلان و ئەو پیاوەی بوو بە سەگ) لەبیر و هزری جەماوەری شانۆ ماونەتەوە و لەیاد ناکرێن.

ئەو لە (کۆمەڵ) و من لە (تیپی هونەری هەولێر) بەردەوام بووین و برایەتی و خۆشەویستیمان رۆژ بە رۆژ بە تینتر دەبوو، ئەو عەیامیش دانیشتنە ئێوارەکانمان لە چایخانەی (شیرین)ی تەنیشت تۆمارگەی (مشکۆ) بەسەر دەبرد.

لە کۆتایی هەفتاکان، هەرکە (تیپی شانۆی نەتەوایەتی ) سەربە تیپی نەتەوایەتی بەغدا لە هەولێر دامەزراو یەکەمین نۆبەرەی ئەم تیپە شانۆیی (هەبوو نەبوو) بوو، هەردووکمان وەك ئەکتەر لەم شانۆگەریە بەشدار بووین، سەرەتا من دەوری بازرگانی قوماشم وەرگرت کە دواتر درایە (قاسم) و منیش رۆڵی کاراکتەری ( ئۆمەرە گەدەی چاوچنۆك)م بینی.. ئەمە لەسەر شانۆ.. کەچی بۆ تۆمارکردنی وەك درامای تەلەفزیۆنی، قاسم دوو رۆڵی بینی، جگە لە بازرگانی قوماش، رۆڵی کاراکتەری گندۆرە فرۆشەکەشی بینی کە لەبەردەم پاشای وڵات حیکمەتی تام و بۆنی هەر سێ گندۆرەی ئاشکرا دەکات. هەموو جارێش بەمنی دەگوت:

–چاوچنۆك ئەتو نیوەی ئەو شارەی هی تووەو هیچت نییە، ئەمنیش سێ گندۆرانم هەیەو سێ حیکمەتان ئاشکرا دەکەم.

دواجار، لەگەرمەی شەڕی نەگریسی قادسیەی دۆڕاو، قاسم کرایە سەرباز.. هێندە لە سەربازی نەمایەوەو رۆژێکیان بە قاچی بریندارەوە پەیدا بۆوە، لە هەولێریش خۆی نەگرتوو بەرەو شاخ سەریهەڵگرت، لەوێش زۆر نەگیرسایەوەو بەرەو هەندەران سەفەری کردو رۆیی.. ئەو هەموو ساڵەی لەوێیە وەك بەردێکی بن گۆمی لێهاتووە، تەنها جارێك لە دوای راپەڕین هاتەوە هەولێر و بەدڵی خۆمان گەڕاین و پیاسەمان لەتەیراوەی کردو ئیدی جارێکیدی رۆیشتەوەو تا نووسینەوەی ئەم چەند دێڕەش هەر لێمان بزرە.

سڵاو، لەتەیراوەوە.. لە هەولێرەوە.. لەکوردستانەوە، بۆ هونەرمەندی شانۆکار (قاسم عەزیز) لەهەر کوێیەکی ئەم دونیایەیە.

# شیرین و شانۆ

پاش ئەوەی خەمە گەورەکەی منداڵ نەبوونمان لەکۆڵبۆوە، ئیدی بەهەمووومان هەر خەریکی (رۆشنا) بووین و لەباوەش و ئامێزان بوو و بەعاردی نەدەکەوت، لەبواری شانۆش هەر بەردەوام بووم، لەمەرکەز تەدریبی هەولێریش سەرباز بووم و بڕیارمدا گەر لەسنوری هەولێر گواسترامەوە نەچم و فیرار بکەم. هەر کەلەگەڵ ژمارەیێك سەربازیدی فەرمانی گواستنەوەمان بۆ مەرکەز تەدریبی بەسرە دەرچوو یەکسەر خۆم دزییەوە و نەچووم.

ئیدی کەوتمە ماڵێ، جگە لەخوێندنەوەی کتێب، کاتەکانی دیم بۆ (رۆشنا) تەرخان کرد و مشوریم دەخوارد، ئەویش لەهەمووان پتر هۆگری من بوو هەر لەئامێزی من دەحەواوە.

لەشانۆش خەریکی ئامادەکردنی شانۆگەریی (سورمە خان) بووین، لەلای هاوڕێ شانۆکارەکانم نەمگوت لەسەربازی رامکردووە، هەر وایان دەزانی لە مەرکەز تەدریبی هەولێر دەوام دەکەم و پاش نیوەڕۆیان بۆ پڕۆڤە کردن دەچوومە لایان لەهۆڵی (گەل).

لەشانۆی (سورمە خان) پێویستیمان بەچەند ئافرەتێك هەبوو بۆ بەشداری کردن، (شیرین)یش پێشتر لەکاتی پرۆڤە و پێشکەشکردنی شانۆگەرییەکانی دی لەگەڵم دەهات و لەگەڵ جەوەکەی ئێمە راهاتبوو، هاتینە سەر ئەوەی بەکامە ئافرەت و بەچ خانەوادەیێك بڵێین کەبێن بەشداربن لەم شانۆگەرییە، دواجار لەسەر ئەو بڕیارە گیرساینەوە کەپێویستە ئێمەی شانۆکار لەخۆمانەوە دەست پێبکەین، پێشتر کاك سەعدون، رەوانشاد (سەمیرە) خانی خێزانی و خوالێخۆشبوو هونەرمەند جەلال بەیار (جیهانی) خوشکیان وەك دەست پێشخەری هێنا و لەشانۆگەرییەکان سەرکەوتووانە و سەلارانە بەشدار بوون،

منیش لەگەڵ شیرین بابەتی بەشداربوونیم هێنا پێشەوە، دیاربوو زۆری پێخۆش بوو، بەڵام گوتی:

– دەبی رەزامەندی داك و بابیشم وەرگرین.

بەمەبەستی رەزامەند بوونی ئەوان چووینە کۆیە و بابەتەکەم لەگەڵ دایك و باوکی باس کرد، سەرەتا دایکی زۆر توند بوو رازی نەبوو کە (شیرین)ی کچی لەتەمسیل و تەلەفزیۆنی دەرچی، بەڵام پاشتر هەر کە (مام سابیر)ی خەزوورم گوتی:

– ئەو مەسەلەیە پەیوەندی بەمەوە نییە.

رووی لەمن کرد و درێژەی بەقسەکانیدا:

– راستە شیرین کچی مەیە، بەڵام ئێستا خێزانی تووە، ئەتو لێی بەرپرسی.. ئەگەر دەزانی بەئیشەکەتان سەربەرز دەبن و ئەمەش سەربەرز دەکەن، کوتان پێباشە وابکەن.

هەینێ دایکیشی نەرمی نواند و هەردووکیان رەزامەند بوون و ئێمەش بەدڵخۆشی گەڕاینەوە هەولێر.. من ئەوکاتە ئەندامی (نەقابەی هونەرمەندانی عێراق/ لقی هەولێر) بووم هەر بەناسنامەی نەقابەش هاتووچۆی شارانم دەکرد، چونکە ئەوکاتە هونەرمەند و نەقابەکەی پلە و پایەی تایبەتیان هەبوو هەتا لەبازگەکانیش رێزیان لێدەگرتین.

بەم شێوەیە، بۆ یەکەمینجار (شیرین) لەساڵی (١٩٨٤) و لەشانۆگەریی (سورمە خان) کەمامۆستای خوالێخۆشبوو (سەفوەت جەراح) دەرهێنەری بوو، وەك ئەکتەر بەشداری نواندنی کرد، ئیدی بەشەوان دادەنیشین و پێکەوە دەقەکەمان دەخوێندەوە و فێرم دەکرد چۆن دیالۆگەکان بخوێنێتەوە و لەکوێ پێویستە راوەستێ و هەناسە وەرگرێ و لەکوێش دەنگ بەرزکاتەوە یاخود لەرستەکە بوەستێ و ووشەکان بەروونی دەربڕێت.

هەر هەمان ساڵیش بەهەوڵ و تەقەلای مامۆستا سەعدون لەبەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری و هونەر وەك فەرمانبەر بەناونیشانی (ئەكتەر) دامەزرا و بووە خاوەن مووچەی خۆی و منیش هەر فێرارم.

شانۆگەری (سورمە خان) لەنوسینی (محەمەد عەبدوڵڵا یونس)ی كوڕی حاجی عەبدوڵڵا دەفژەنی بەناوبانگی هەولێری بوو، ژمارەیێك ئەكتەری هەولێر بەشداربوون لەوانە (جگە لەمن و شیرین، حاجی مەكی عەبدوڵڵا، سەعدون یونس، سەمیرە عەبدۆك، جیهان ئەحمەد، سەباح عەبدولڕەحمان، ئەحمەد جەمیل، ئەنوەر عەزیز، حەمە سەعید ئیبراهیم) و ژمارەیێكی دی.

یەكەمین ڕۆژی نمایشی شانۆییەكە و چركەساتی چوونە سەر شانۆی (شیرین)، من لەتەنیشتی بووم و هانمدەدا كەنەشڵەژێ و دیالۆگەكانی بەجوانی دەربڕێ و بەهیچ شێوەیێك بیر لەوە نەكاتەوە خەڵكێكی زۆر لەناو هۆڵ دانیشتووە و سەیری دەكەن.. زوو زووش (شیرین) دەیگوت:

– زاهیر.. بەدەستە خۆم نییە، هەناوم دەلەرزی، دەترسێم حیوارەكانم لەبیر بچێتەوە.

بەم شێوەیە زیاتر هانمدەدا و لەدڵەڕاوكێ دوورم دەخستەوە، كە چووە سەر شانۆ و لەبەرامبەر ئەكتەرەكانیدی ڕاوەستا و دیالۆگەكانی خۆی دەگوتەوە زۆر سەركەوتوانە ترسەكەی تێپەڕاند و وەك ئەكتەرێكی قاڵبوو نواندنەكەی ئەنجامدا و ئەمە بووە یەكەمین هەنگاوی سەركەوتنی لەبواری شانۆ و دراما و بووە یەكێك لەو ژنە سەلار و سەربەرزانەی كەكێشەی قات و قڕی و نەبوونی ئافرەتی لەبواری شانۆی كوردی كەمكردەوە.

## کاروانی گۆڤاری کاروان

جگـه لـەو چـیرۆکانەی لەرۆژنامـەی (هاوکـار) زوو زوو بڵاومدەکردنـەوە، ئەمجارە خۆم بۆ تاقیکردنەوەی گۆڤاری (کاروان) ئامادەکرد.

گۆڤارەکە لەهەولێر دەردەچوو و مامۆسـتای چـیرۆکنووس (حسـێن عـارف) سەرنووسەری بوو، چیرۆکێکم بۆ ناردن و لەدڵی خۆمدا گوتم:

– هەرچـەندە دڵنیـا نـیم کـەبڵاوی دەکەنـەوە، بـەڵام بـا بـزانم چـۆن دەکەوێتەوە.

پاش ناردنی چیرۆکەکەم بەهەفتەیێك ژمارەی تازەی (کاروان) بڵاوکرایەوە و حەتمەن چیرۆکەکەی منی تیا نەبوو، کەچی لەژمارەی دواتر کەلـەلای مـن وەك خەون بوو سەیر دەکەم چیرۆکەکەم بـڵاو کراوەتـەوە و گرینگیشـی پێـدراوە.. زۆر زۆر دڵخۆش بووم، ئەو ژمارەیـەی (کـاروان)م زۆر لـەلا بـەنرخ بـوو زوو زوو پێشـانی هـاورێ و خزمـانم دەدا و واملێـدەکردن بـەزۆریش بێـت هـەر دەبـێ چیرۆکەکەی من بخوێننەوە.

گەرماوگەرمیش چووم و سەردانێکی مامۆستا حسێن عارفم کـرد و سوپاسـم کـرد لەهەمبـەر بڵاوکردنـەوەی چـیرۆکەکەم.. ئـەویش جگـە لەپەسـندکردنی بەرهەمەکە زۆر هانیدام و ئامۆژگاری کردم کەپتر بخوێنمەوە و کـەمتر بنووسـم و بەردەوامیش بم.

بەمجۆرە لەبڵاوکردنەوەی چیرۆکەکانم لەگۆڤاری (کـاروان) بـەردەوام بـووم، جێی خۆیەتی بشڵێم ئەوکاتە گۆڤارەکە بەباشترین و پـڕ خوێنـەرترین گۆڤـاری کوردی هەژمار دەکرا و بابەتی بـەپێز و نووسـەرە بـەتوانا و قەڵـەم جوانـەکان لەوێ بەرهەمە ئەدەبی و رۆشنبیرییەکانیان بڵاو دەکردەوە.

## موشتەرەکە

جگە لەئینزیباتە سەر سۆرەکانی لای باتای ناو بازاڕ کەبەردەوام ڕێیان لەگەنجان دەگرت و داوای ناسنامەیان لێدەکردن و منیش بۆ چوونە بازاڕ جادەی باتام تەرك کردبوو بەکۆڵانی پشتەوە و بەبەردەم تەکیەی شێخ محیەدین هاتووچۆم دەکرد، جگە لەئەو ئینزیباتانە، مەفرەزەیێکی تێکەڵاو لەپۆلیس و ئەمن و جاش دروست بوو بوو لەهیکەوە سەرەکۆڵانیان لەخەڵکی دەگرت و بەسەر ماڵانیان دادەدا و بەدوای فیراری عەسکەریدا دەگەڕان.

منیش فیرار و قوڕبەسەر ژێرزەمینی ماڵێم کردبووە خەڵوەتگەی شەو و ڕۆژم، ڕۆشناش تازە بەسەر پێیان کەوتبوو قسەی خۆشببوو زۆر هۆگرم بوو.

عەسرێکیان بووە مشەوەشی و دایکم هات گوتی:

– قوڕمان بەسەر، سەری کۆڵانێ پڕ بووە لەموشتەرەکە.

لەژێر زەمین وەدەرکەوتم و پێم باش بوو بەپەلە خۆم بگەینمە نهۆمی سەرەوەی خانووەکەمان لەهەورەبانەکە خۆم پەنا بدەم، لەکاتی بەسەرکەوتنم (ڕۆشنا)ش بەبابە بابە و بەشەقاوی گچکۆکە بەدوام کەوت و منیش هاوارم کرد:

– ئاگاتان لە (ڕۆشنا)ی بیت لەدووم نەیێ.

سەرکەوتمە نهۆمی سەری و لەپەنا دەرگای هەورەبانەکەوە لابەلا سەیری خوارەوە و ناو کۆڵانم دەکرد و تا بزانم چەکدارەکانی موشتەرەکە چی دەکەن و گەیشتنە کوێ؟ لەم کاتەدا (ڕۆشنا)ش گەیشتبووە سەربانی نهۆمی یەکەم و دەگریا و دەیقیژاند:

– بابە.. بابە..

منیش بەدەنگی نزم بەئامازە تێم دەگەیاند بگەڕێتەوە سەرنەکەوێ و

بچێتەوە لای دایە.. نەخێر ئەو وازینەهێنا و مشتەرەکەکانیش بەسەربانی ماڵی حاجی کەریمی بەرامبەر ماڵی ئێمە کەوتبوون و کون و قوژبنی سەربانیان دەپشکنی.. ناچار بەدەست ئاماژەم بۆ رۆشنا کرد کەسەرکەوێ و بێتە لام، لەخوارەوەش لەناو کۆڵان چەند چەکدارێك دوو گەنجیان راگرتبوو داوای ناسنامەیان لێدەکردن، رۆشنا گەیشتە لام و کرم کردەوە و لەباوەشێم کرد و خۆم دا پەنای دەرگا و دڵیشم لەسەر سەد و بیست لێیدەدا.

لەوکاتەی نۆرە هاتە سەر ئەوەی بەناو ماڵی ئێمە بکەون (عارف) برام کەئەوکاتە تەمەنی کەم بوو کاتی سەربازی نەهاتبوو دەرگای حەوشەی کردەوە و بۆیان چووە دەرەوە، ئەوانیش داوای ناسنامەیان لێکرد و سەیریان کرد جارێ منداڵە و کاتی سەربازی نەهاتووە وازیان لێهێنا و لەماڵی ئێمەش دوورکەوتنەوە، منیش لەپەنا دەرگا ئەم هەموو دیمەنانە دەبینم و (رۆشنا)م لەئامێزە و هەوڵدەدەم بێدەنگ بێت و کەشفم نەکات، ئیدی لەوێ ماینەوە تا ئەوان سەرجەم ماڵەکانی کۆڵانی ئێمەیان پشکنی و بەدەستی بەتاڵ ملی خۆیاند شکاند و رۆیشتن.

# ئەگلەنجە

پاش بڵاوبوونەوەی دراماکانی (خۆتان بگرن هات و هەبوو نەبوو و محەمـەد و سێوێ و ماڵەی سەرگردەکە) بەشێوەیێکی گشتی لەناو خـەڵك و جـەماوەری خۆمان ناسرا بووم، لەبواری چیرۆك نووسینیش کـەم تـا زۆر دەیانناسـیم و تـا رادەییێك لەلای خوێنەران چیرۆکەکانم پەسند کرابوون.

ناوەڕاستی ساڵی (١٩٨٨) لە (١٩٨٨/٦/١٥) کچێکم بوو منـداڵی سـێیەممان بوو، ئەوکاتە گەرمەی ئەنفال و ماڵوێرانی کورد بوو، بابـە خـدرم لەسـەر جێگا کەوتبوو لەسەرەمەرگدا بوو، هەر کەمەلۆتکەکەمان بردە لای و زانی کچە و هی منە، گوتی خۆزگـە کـوڕ بـا وەبـی نـاوێکی شایسـتەی ئـەو وەزعـەمان لێنابـا، بـەهۆی ئـەو بارودۆخـەی کـورد و تێکچـوونی (هێلانـە)ی کـوردان ناومـان لێنـا (لانە)، لانەی خۆڕاگری کوردان.

چەند رۆژێك بوو چیرۆکی (ئەگلەنجە)م نووسی بوو، بەنیاز بووم بۆ گۆڤـاری کـاروانی بنێـرم، هـەینێش گەرمە گـەرمی سـازدانی کـۆڕی شـیعری و چـیرۆك خوێندنەوە بوو، بەڕێکەوت لەچاپخانەی (مەچکۆ) برای نووسەر (محەمەد خـدر مەولوود) پرسیاری چـیرۆکی تـازەی لێکـردم، هـەر کـەزانی چـیرۆکێکی تـازەم هەیـە بـەناوی (ئەگلەنجـە)، زۆر بەگـەرمی پێشـنیازی بـۆ کـردم تـا لـەو کـۆڕە بەشداریم کەبۆ چیرۆك خوێندنەوە ساز دەکرێت لەهۆڵی (یـەکێتیی نووسـەرانی کورد/ لقـی هـەولێر) و تایبـەتی بـۆ قوتابیـانی زانکـۆی سـەلاحەدین و خـەڵکی دیش، منیش زۆرم پێخۆشبوو پاشتر چیرۆکەکەم پاکنووس کرد و ئامادەم کرد بۆ رۆژی بەستنی کۆڕەکە.

ئەو رۆژە جگە لەئامادەبوونی دەستەبژێری نووسەران و رۆشنبیران، هۆڵەکە پڕاوپـڕ بـوو لـەقوتابی کـچ و کـوڕی زانکـۆی سـەلاحەدین و رێ بەبـەر رێـداری

نەدەکەوت، ژمارەیێك چیرۆکنووس بەشداریتان لەم کۆڕەدا کرد.

هەر کەنۆرەی من هات و چوومە سەر شانۆ و دەستم بەخوێندنەوەی چیرۆکەکەم کرد و خوێندنەوەکەم بەشێوەیێك ئەنجامدا کەتێکەڵەیێك لەنواندن و دروستی دەربڕینی پیتەکان، هەستم کرد ئەم هەموو خەڵکە، ئەم جەماوەرە زۆرەی ناو هۆڵ تەواو بێدەنگن و دەنگی کێشکەش نایێ. منیش هەر بەردەوامم لەسەر خوێندنەوە و بەحەماسەوە وشەکان دەردەبڕم و بەبێ هەڵە و بێ راوەستان درێژەم بەخوێندنەوە دا. هەر کەچیرۆکەکەم تەواو بوو کۆتاییم پێهێنا، لەگەڵ هاڕەی چەپڵە و دەست خۆشی جەماوەر هەڵسامە سەرپێ و دەست لەسەر سینگم و سوپاسگوزاریم بۆ دەربڕین، کەکورەکەش تەواو بوو، قوتابیانی کچ و کوڕ زۆر بەگەرمی دەستیان دەگوشیم و پیرۆزباییان لێدەکردم دەیانگوت:

– چیرۆکەکەی تۆ باشترین بوو.

لەبەر دەرگاش، خوالێخۆشبوو نووسەر و رۆژنامەنووسی بەتوانا (عەبدولغەنی عەلی یەحیا) بەگەرمی پیرۆزبایی لێکردم و بەچرپەش گوتی:

– دەست خۆش، باش شەرەف و نامووسی جاش و خۆفرۆشانت هاویشتە ژێر پێڵاوەکانت.

بێگومان ئەم شەهادەیە لەم نووسەرە بەتوانایە بۆ من مایەی شانازی و بەردەوامیم بوو لەنووسین.

# قاسپەی کەو

ڕۆژێك سەعدون گوتی:

– برادەرێکی خۆم مامۆستایە، درامایێکی نووسیە و دایتییە من، بابەتەکەی باشە، بەڵام زۆر کورتە لەوانەیە هەر نیو سەعاتێکی لێدەرچێت، دەتدەمێ بیخینەوە بزانە شتێکی باشی لێدەرناکەی؟

پاشتر کەلێم وەرگرت، سەیر دەکەم درامایەکە بیست لاپەڕەیە و بەناونیشانی (قاسپەی کەو) و لەنووسینی (سەمیر عەبدولستار)ە. کەخوێندمەوە بەڵێ ناوەڕۆکێکی باش و کاریگەری هەبوو، ئەوەی دەهێنا خۆمی بۆ ماندوو بکەم و بیکەمە بەرهەمێکی درامایی بەپێز، ئەوکاتەش هەر فیرار و بێکار بەیانیان لەژێر زەمینەکە دەژیام و ئێوارانیش پیاسەیێکی لای هۆڵی (گەل)م هەر دەکرد.

لەگەڵ کاك سەعدون ڕێکەوتین کەهەوڵدەم بەشێوەی زنجیرە دراما بیکەمە چەند ئەڵقەیەك، ئیدی دەستم پێکرد و بەرنامەم بۆ داڕێژا، کە ئەڵقەی یەکەمم کە (٣٤) لاپەڕەی فولسکاب بوو تەواو کرد، پێشانی سەعدونم دا تا بزانم بەدڵیەتی، دوای خوێندنەوە ئەوەندەی پەسندکرد بەهەڵپەوە گوتی:

– ئەوە ئەڵقەی یەکەم، لەمەودوا ڕۆژ بەڕۆژ هەر ئەڵقەیەکت تەواو کرد بیهێنە تا بیخوێنمەوە.

هەروام کرد، بەشەو و ڕۆژێك ئەڵقەیێکی تازەم تەواو دەکرد و رادەستی سەعدونم دەکرد، تا هەشت ئەڵقەی چڕ و پوختم لە (قاسپەی کەو) تەواو کرد و بووە درامایێکی ئامادەکراو بۆ بەرهەم هێنان.

سەعدونیش دەستوبرد کاروباری مۆڵەت و ڕەزامەندی تەلەفزیۆنی کەرکوکی جێبەجێکرد و کەوتینە دابەشکردنی دەورەکان و خوێندنەوە و پرۆڤە.

ئەکتەرە بەشداربووەکان جگە لەخۆم (شیرین، سەمیرە، حەمە عـەلی خـان، ئیسـماعیل قـادر، خـەلیل بابـە کـەریم، ئەحمـەد جـەمیل، سـیروان عوسمـان، ئەنوەر عەزیز، سەوسەن، ئازاد خەمـە، کـەریم عوسمـان، غـازی غفـور، خالیـد بەرزنجی، ئاسایش عوسمان، رزگار ئەحمەد) بوون.

بـۆ (لۆکەیشـن) حـەریر و چـیایە سەرکەشـەکەیی و مـەلا ئۆمـەر و گونـدی ئۆخسەر هەڵبژێردرا. ستافی پشت کامێرا لەتەلـەفزیۆنی کەرکوکـەوە هـاتن و سەعدونیش دەرهێنەر.

بێگومان ئەرکـە قورسـەکەی لەبـەرکردنی حیـوار کەوتـە سـەر شـانی مـن و شیرین، چـونکە رۆڵـی سـەرەکیمان هـەبوو زۆرتـرین دیمـەن لـەلای ئێمـە بـوو. لەماوەی پانزە رۆژێك بەبێ پشوو وێنەگرتن بەردەوام بـوو بەگـەرمای هـاوین و ووشك و برینگی چیای بەنی هەریرێ، میواندۆستی خانەخوێکانمان (محەمـەدی قادر ئاغا) لەهەریرێ و (شێخ بەهرام هارون) لەمـەلا ئۆمـەری تـەواوی دراماکـە تۆمارکرا.

بۆ مۆنتاژیش چەند رۆژێك لەکەرکوك من و سەعدون ماینـەوە تـا لەنزیکـەوە ئاگاداری مۆنتاژەکە بین و هەڵەی تێنەکەوێت.

مۆنتاژ تەواو بوو درامای (قاسپەی کەو) ئامادەکرا بۆ پـەخش بـە (هەشـت) ئەڵقەی پوخت و بەتایتڵێکی یەکجار جوان، مایەوە چاوەڕوانی بۆ پەخشکردنی یەکەمین ئەڵقە.. چاوەڕوانیمان درێژەی کێشا، هەواڵێك لە (قاسـپەی کـەو)ەوە نەبیسترا، دواجار پێکەوتین کەلیژنەی تایبەت بـەدراما لەتەلـەفزیۆن سـەیرییان کـردووە بڕیـاری قەدەغـەکردنی پەخشـیان لەسـەر داوە، بەمشـێوەیە کـەوی (قاسـپەی کـەو)یان جوانەمـەرگ کـرد و بینـەری کـوردی تینـووی درامـا کوردییەکانیان لەبینینی ئەم بەرهەمە بەپێزە بێبەشکرد.

## جارێکیدی سەربازی

منداڵی دووەممان کاکە (لاوێن) کوڕ بوو، هەرکە لاوە لەدایك بوو، کوڕ بوو زۆر حەزم دەکرد ناوێکی بۆ هەڵبژێرم لێی پەشیمان نەبمەوە، هەینێ بەینی باوکم و مامۆستا مەلا ئەحمەدی وەرتێ زۆر خۆشبوو، باوکم پەیوەندی بەمامۆستاوە کرد و ئەو ناوی لێنا (لاوێن) و منیش بەشانازییەوە قبوڵم کرد، ئەوکاتە ئەویش بەسەر پێیان کەوتبوو جارێکیدی لێبوردن بۆ سەربازە راکردووەکان دەرچوو، منیش لەژیانی ژێر زەمین و ترس و لەرزی گرتن تەواو بێزار بوو بووم، چووم لەمەرکەز تەدریبی هەولێر خۆم تەسلیم بکەمەوە، هەر کەسەیری (دەفتەر خدمە)یان کردم، گوتیان ئەتو وەحدەت لەبەسرایە، دەبێ بچی لەمەرکەز تەدریبی بەسرا خۆت تەسلیم و ناونووس بکەیەوە.

حازمی حاجی برایمی خزم و دراوسێشمان خۆی تەسلیم کردبۆوە و پێیان گوتبوو (وەحدەت لەخوار بەغدایێ لەلای عمارە و بەسرایە دەبێت بچی لەوێ خۆت تەسلیم بکەیەوە) ئیدی بەدووان بەقەمەرە بەرازیلییەکەی مام حاجی برایمی باوکی ئەو شوفێر و ئێمە نەفەر سبەینەیێکی زوو بەرەو بەغدا بەرێکەوتین، هەتا بەغدا هیچ کێشەیەکمان نەبوو، شەو ماینەوە بۆ بەیانی بەرەو (جنوب) کەوتینەرێ لەهەر شوێنێك بنکە و وەحدەی سەربازی هەبا لامان دەدا و حازم ناو و ژمارەکەی وەحدەی دەپرسی و کەدەیانگوت ئێرە هەو نییە بەهەناسە ساردی سەردەکەوتەوە و بەرەو شوێنێکی دی بازۆ.. زۆر ماندوو بووین و ئەو رۆژە وەحدەکەی حازممان نەدۆزییەوە شەومان بەسەردا هات و ئێمە هێشتا لەرێگاین و پرسیاران دەکەین، لەرێگاییێکی چۆڵ و سەحرا قەمەرە کوژایەوە و ئەوەندەی پاڵماندا و مام حاجی برایم لەسەر ستێرن کلاج بکە و پێ هەڵگرە نەخێر بەرازیلی غەزری و بەگەڕ نەکەتەوە، بەناچاری ئەو

شەوەمان لەناو ترومبێل بەسەربرد و لەگەڵ ڕۆژهەڵاتێ کەوردە وردە ترومبێل بەدەرکەوتن ناچار بەڕازیلیمان بەراکێشان گەیاندە شاری عمارە و بۆ لای فیتەر، زۆریشمان برسی بوو، قەمەرەمان لەلای فیتەر بەجێهێشت و بەخۆمان چووینە چێشتخانەیێکی نزیک ئەوێ، خواردنمان داواکرد، من داوای (تەشریب)ی مریشکم کرد، هەر کەبۆمان هات سەیرم کرد رانە مریشکەکە هێشتا تووکی پێوە مابوو زۆر دیمەنێکی قێزەونی دەنواند، بێزم بۆوە و بۆم نەخورا، پاشان هاتینە دەر مام حاجی برایم گوتی:

– ئەوە دوکانی گەس و لەفەیە، بڕۆ لەوێ لەفەیەك بخۆ.

چووم و داوای لەفەکەم کرد و بەناچاری خواردم، هەینێ مام حاجی گوتی:

– دەزانی گۆشتی لەفەکەی گۆشتی چ بوو؟

گوتم:

+ وەڵڵا کەمەك شیرین بوو، دەتگۆت شەکرییان پێداکردیە.

– نەخێر.. لێرە گۆشتی (حوشتر)ی دەکەنە گەس.

هەرسێکمان پێکەنین و گوتم:

+ نەمردین و گۆشتی حوشتریشمان خوارد.

بەڕازیلی بەگەڕ کەوتەوە و جارێکیدی بەرێکەوتینەوە نێوان (عمارە– بەسرا) چەندین سەربازگە و گوند و شارۆچکەی لەسەرە، هەر هەموویان بەهۆی تۆپباران و بۆردومانی فڕۆکە و شەڕە نەگریسەکەی قادسیە کاول و وێران بوو بوون، بەسەدان لافیتە و پەڕۆی رەش بەدیوار و لەسەربانی خانووەکانەوە دەبینران و تازیەبار بوون. لەم رێگایەش پرسیار بەپرسیار وەحدەی (حازم)مان هەر نەدۆزییەوە، منیش وردە وردە دڵم توند دەبوو تاقەت و هێزم لەدەست دەدا، زوو زووش ئاوڕم لەحازمی دەداوە دەستی چەپەم وەك مست لێدەکرد و دەمگوت:

- حازم دڵم زۆر توندە، (ئاماژە بەدەست و مستم) دڵم ئەوهای لێهاتیە.

عەسرێکی درەنگ گەیشتینە (بەسرە) و مەرکەز تەدریبمان دۆزییەوە، من دابەزیم و سوپاس و خواحافیزیم لەوان کرد، ئەوان رۆیشتن بەدوای وەحدەکەی حازمدا بگەڕێن.. منیش مات و غەمبار و هیلاك و ماندوو بەرەو دەرگای سەرەکی سەربازگەکە ملمنا.

کەچوومە ژوورەوە ژمارەیێك گەنج و پیر لەبەر دەرگای پرسگەکە خڕ بووبوونەوە دیاربوو لەچاوەڕوانیدا بوون، منیش لەپەنجەرەکەوە دەفتەر خدمەکەم تەسلیم کرد و چووم لەپەنایێك قاچم لێکڕاکێشا و مات و مەلول لێیدانیشتم، کوڕێکی هاوتەمەنی خۆم لێم نزیك بووەوە و گوتی:

- کاك زاهیر ماندی نەبی، دیارە ئەتوش ناوت لێرەیە.

هەر لەخۆمەوە کەمێك دڵم خۆش بوو، ئۆخەی بەتەنیا نیم وا کوڕە کوردێك وەك فریشتە لێم پەیدا بوو بەکوردی قسان دەکات، ئیدی کەمێك کەوتینە قسە، پاش ماوەیێك نائیب زابتێك هات و بەعەرەبی گوتی:

- برایان.. ئەنگۆ هەمووتان ناوتان لەلای ئێمە هەیە، بەڵام بەو درەنگە چناکرێ و (قەڵەم) دەرگای قەپاتە، ئێستا پسولەتان بۆ دەکەین ئەمشەو برۆنە (زوبێر) لێرە نزیکە، بەیانی زوو وەرنەوە تا وەرتانگرین و سەین و بەینی تەسلیم بوونەوەتان بۆ جێبەجێ بکەین!

دیسان کەوتینەوە چاوەڕوانی تا پسوولەمان بۆ بکەن، ئیدی هەتا پسولە هێنرا و یەکە یەکە ناومان خوێندرایەوە، دونیا تەواو تاریك داهات، لەگەڵ گەنجە کوردەکە (بەداخەوە ناوەکەیم بیر نەماوە) سواری پاسێك بووین و چووینە شارۆچکەی (زوبیر)، لەوێ ئوتێلێکمان دۆزییەوە و چووین ناوی خۆمان تۆمارکرد و پارەی شەوێکمان دا.. گەنجەکە گوتی:

- ئەوجا با بچین نانەکی بخۆین پاشان دێینەوە وەبی ئیسراحەت بکەین و

زوو بنووین.

لەهاتنە دەرەوەمان کابرای ئوتێل بانگی کردین و بەعارەبی گوتی:

– با پێتان بڵێم، ژوورەکانمان هەموو گیراینە و قەپاتن، ئەنگۆ دەبی لەسەربانێ بنوون!

گەنجەکەی رەفیقم ویستی دەمەبۆڵەی لەگەڵدا بکات کەبەو گەرمایە و بەبێ (پانکە) چۆن لەسەربان خەومان لێدەکەوێت.

من گوتم:

– کاکە وازبینە، یەك شەوە و بەسەردەچی، سەربان سەربان چ بکەین.

ئیدی لەئوتێل دابەزین و چووینە کەبابخانەیێك، منیش هەروا دڵم تووندە و جگەرە بەجگەرە دادەگیرسێنم، هەریەکەمان داوای سێ شیش گۆشتمان کرد، گۆشت هات و گەنجەکە دەستی بەپارو بادانێ کرد، منیش هەرچەندی دەمکرد دەستم نەیدەگرت پارویێك بکەم و مەیلی خواردنێم تۆرا بوو، زوو زووش برادەرەکەم دەیگوت:

– دەبخۆ.. ئەوە لۆ ناخۆی.

ئەو هەرسێ شیشەکەی خۆی نۆشکرد و بەشەکەی منیشی ئاودیو کرد، ئیتر بەناچاری پاش خواردنەوەی یەك (چا)ی شیرین چووینەوە ئوتێل و جانتامان وەرگرتەوە و بەسەربانێ کەوتین، ئای خوایە چ دەبینم، سەربان سەرتاسەر قەروێڵە رێزکرایە و لەسەر هەر یەکێکیان سودانێکی قولەڕەش پاڵکەوتووە و پرخەیان رۆژە رێیەك دەڕوا، شەویش گەرمە و ئاگر بارانە، بەناچاری ئێمەش لەسەر قەرەوێڵەکانمان پاڵکەوتین، بەلام (خەو) لەکوێیە، دوورە و نامگاتێ، لەبەر گەرما و پرخە پرخی سودانیە قولەڕەشەکان کەهەر نەمدەوێرا سەیریشیان بکەم تا بەیانی بەئاگا بووم و بۆ یەك چرکەش نەخەوتم، سبەینێ زوو بەپاسێك چووینەوە مەرکەز تەدریب و پسولەکەمان تەسلیم کردەوە و

نوسراومان بۆ کرا و چووین (جلکی سەربازی و پۆستاڵ و نیتاقمان) وەرگرت و بوومەوە سەرباز، بەڵام سەربازێکی بێورە و دڵ توند.

جارێکیدی، ریشتاشینی شەوانە و بۆیاغکردنی پۆستاڵ و مەشەقەتی تەدریبی بەیانیان دەستی پێکردەوە. پاش نیوەڕۆیانیش لەدەرەوەی هۆڵە گەورەکان کەبەدار و درەخت دەورە درا بوو جێگەمان رادەخست و پاڵدەکەوتین، من دڵێکم بەدوو وێنە خۆش بوو، لەناو جانتا گچکەکەی پارەم، دوو وێنەی بچوکی (رۆشنا و لاوێنم) هەڵگرتبوو کەهەر دەموچاویان دیار بوو، ئەو وێنانە بۆ (نفوس) دەگیران، هەردوو وێنەم دەردەهێنا و تێر تێر سەیرم دەکردن و ماچم دەکردن و لەو غەریبیە سوکناییان بۆ دڵە توندەکەم دەهێنا. جار بەجار لەبەر بەلوعە کەخۆمان دەشوشت چونکە ئاوەکە خوێاوک بوو چرکنتر دەبووین و پاك نەدەبووینەوە.

شەوانیش دوو دوو و سێ سێ کۆدەبووینەوە و بەقسە و قەشمەرییات کاتمان بەڕێدەکرد، دوعاشمان دەکرد کەزابتە خۆڕییەکە نەیێ.

ئەفسەرێکی گەنجی بەعسی پلە بەرز جێگری ئامیر مەرکەزەکە بوو، شەوان هەر کەبەسەرخۆشی لە (نادی) دەگەڕایەوە، ئیدی دەبووە سافیرە لێدان و جەمع جەمع، ئێمەش بەپەلە جلکی سەربازیمان لەبەر دەکرد و پێمان لەپۆستاڵ هەڵدەکێشا هەر (سریە) و لەبەردەم نایب عەریفی خۆی رادەوەستاین، هەینێ ئەفسەری سەرخۆش فەرمانی دەردەکرد و دەکەوتینە رێڕۆیشتن و یەس یەم و دەبوایە بەمەزبونی و لەبەردەمیدا رەتبین و دەست و لاقان وەك یەك راوەشێنین، قوڕ بەسەر ئەو سەربازەی هەڵەیێکی لێدەبینی، جیای دەکردەوە و بەلێدان و قسەی ناشیرین و ئیهانەکردن عەدمی دەکرد، کەئەم بەزمەش تەواو دەبوو، جارێکیدی لەبەردەمی خۆی رایدەگرتین و پاش چەندین کەرەت ئیستاعید و ئیستەریح، ئینجا موکەبیرەیان بۆ بەگەڕ دەخست

و مایکی بەدەستەوە دەگرت و دەرسی نیشتمانی و وڵاتپارێزی و باسی شەڕی (قادسیەی سەدام)ی بۆ دەکردین تا تەواو هیلاك دەبوو ئینجا فەرمانی دەکرد و دەینەڕاند:

– فەرق.. یەڵڵا فەرق جوبەنا.

سێ مانگێکم بەو دەردە سەرییە بردەسەر و دوو جاران مۆڵەتی چەند ڕۆژێکمان وەردەگرت و دەگەڕاینەوە هەولێرێ.. خوا کردی و بڕیارێکی تایبەتی کەدواتر بەقەراری (٧٣٦-٧٣٧) ناسرا، بۆ کوردان دەرچوو، بەو بڕیارە تەسریح بووین، ئۆخەی ئۆخەی ئەمجارەش نەجاتم بوو.

## قەلای دمدم

گەر راگوزەر بەشێك لەبەرهەمە شانۆیی و دراماییەكان بەبیر خوێنەر بێنمەوە لام وایە خراپ نییە، دواتریش لەسەر ئێستكە و ئەو بەرهەمانە بووەستم كەپێویستە قسەیان لەسەر بكەم، بەرهەمەكانی (گولاڵە، ماڵەی سەرگردەكە، گەڕەكەكەمان، كۆلارە، قەرەج، زولێخا، ئاسكە، خانەدان، گوڵی نهێنی و چەند درامای رادیۆیی و شانۆیی و تەلەفزیۆنی.

(قەلای دمدم) رۆمانی (عەرەبی شەمۆ)یە، من ئەو رۆمانەم خوێندبۆوە، ئەوكاتی هەوڵم دەدا كتێبە كوردییەكانی كەبەردەستم دەكەوتن و دەمخوێندنەوە، بیدەمە (سەعدون)یش تا بیخوێنێتەوە، هەر كە (قەلای دمدم)ی خوێندەوە وای بەچاكزانی بیكەینە شانۆگەری، ئەوكاتە من تەنسیب بووم لەفەرمانگەی نەقڵ بەڕی.

ئیدی ئەو بەقەڵەمی سۆر لەسەر كتێبەكە ئەو شوێنانەی دەستنیشان كرد كەگرنگ و كاریگەرن و بۆ خەتە دراماییەكە دەست دەدەن. منیش بەسیناریۆ و دیالۆگ دامدەڕشتنەوە و دیمەن بەدیمەن رووداو و بەسەرهاتەكانم نووسییەوە و بووە شانۆگەرییەكی تەواو ئامادە، بەمشێوەیە بووە نووسین و دەرهێنانی سەعدون و منیش تەنها هیلاكی و ماندووبوونەكەم پێبڕا.

هەر لەهۆڵی (گەل) دەق بەسەر ئەكتەرەكان دابەشكرا و قۆناغی خوێندنەوە و گفتوگۆ دەستی پێكرد، من رۆڵی (مام ئەسكەندەر)م هەبوو، زۆربەی ئەكتەرە بەتواناكانی هەولێر بەشدار بوون لەوانە (سەلام كۆیی، چەتۆ حەسەن، جەوهەر باپیر، خلیل بابە، حەمە سەعید ئیبراهیم، سەمیر عەبدۆك، شیرین سابیر، دڵپاك تاهیر، سیروان عوسمان، ئەنوەر عەزیز، جەلال بەیار، فەیسەڵ محەمەد ساڵح، ئەحمەد جەمیل، مەحمود ئەحمەد بێوەی، عەلی

ئەحمەد، ئیبراهیم حەکیم، رزگار ئەحمەد، عوسمان رەحمان، رزگار ئەحمەد، کاروان شەمسەدین، مۆفەق محمد سابیر، حەمید سابیر، زوهیر سەعدون).

بۆ ماوەی پتر لە (١٠) رۆژ (قەلای دمدم) لەسەر شانۆی هۆڵی (گەل) پێشکەشکرا کەجەماوەرێکی یەکجار زۆر بینیان، رۆژانە هۆڵەکە پڕ دەبوو خەڵك لەدەرەوە دەمایەوە، رۆژێکیان دەرگای سەرەکی هۆڵیان شکاند و لافاوی خەڵك گوررژمی کرد و بەجۆش و خرۆشەوە شەیدای بینینی بەرهەمە بوون. گەر خۆمان لەبەر وادەی تۆمارکردنی بۆ تەلەفزیۆن نەمانوەستاندبا ئەوا چەندین رۆژیدی بەردەوام دەبوو و جەماوەر هەر دەهاتن.

بۆ تۆمارکردنی وەك بەرهەمێکی تەلەفزیۆنی و هەر لەسەر شانۆ، هونەرمەندی دەرهێنەر (ناسر حەسەن) و ستافی پشت کامێرا لەبەغداوە هاتن و بەچەند شەوێك کەتا بەیانی نەدەخەوتین دیمەنەکان تۆمار دەکران. بەهیلاکی و ماندووبوونێکی زۆر بەرهەمە ئامادەکرا بۆ پەخش، کەچی بەداخەوە ئەویش بووە قوربانی وشەی (قەدەغە) و لەسەر شاشەی تەلەفزیۆنی کەرکوك رووناکی نەدیت و ماندووبوونەکەمان بەفیڕۆچوو.

# خەرەند

ئەو ساڵانەی فێرار بووم و کاتی خوێندنەوە و نووسینم یەکجار زۆر بوو، بەردەوامیش کورتە چیرۆك و چیرۆکە زۆر کورتەکانم لەرۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەوێ رۆژێ بڵاو دەکردەوە و خوێنەرێکی زۆرم بەلای خۆمدا راکێشا بوو وەك چیرۆکنووسێکی بەرچاو ناسرا بووم، جا بیرم لەوە کردەوە کەچیرۆکەکانم کۆبکەمەوە و وەك کتێب لەچاپیان بدەم.. کۆمکردنەوە و ناونیشانی کتێبەکەشم بەناوی یەکێك لەچیرۆکەکان دەست نیشان کرد بەناوی (خەرەند).

بەڵام خۆ من فێراری عەسکەریم و سەین و بەینی چاپ و هاتووچۆی چاپخانە و بەغدا بۆ من یەکجار دژوار بوو، ئەوکاتە برای نووسەر (سەعدوڵڵا شێخانی) جوامێرانە ئەرکی ئێمەی ئاسان کردبوو و بەردەوام هاتووچۆی بەغدا و چاپخانەکانی ئەوێی دەکرد و کتێبی بۆ نووسەرانی هەولێر چاپدەکرد.

لەگەڵ منیش هەروایکرد، بەیەکەوە دانیشتین و رێککەوتین کەئەو هیمەت بکات دەستنووسەکەم بۆ بباتە بەغدا و رەزامەندی چاپکردنی بۆ وەرگرێ و هەر لەوێش بیداتە چاپخانەیێك بکاتە کتێب، بڕی پارەی تێچوو دیاریکرا و تەسلیمی کاك سەعدوڵڵام کرد و ئەویش دەست و بردی لێکرد و نەخشەی بەرگ بەسەلیقەی هونەری مامۆستا (فازیل شەورۆ) جێبەجێکرا و پاش عەیامێکی کورت (خەرەند) لەدایك بوو، وەك یەکەمین بەرهەم و تاقە بەرهەمم لەبواری کتێب، بووە تاقانە زۆر ئازیز و خۆشەویستەکەی من.

## کەونە دەرگە

ڕۆژگاری کەونە دەرکە، من بەبڕیاری (٧٣٦-٧٣٧) لەسەربازی ڕزگارم بوو بوو، جموجۆڵی هونەریشمان زۆر دیار و بەرچاو بوو، لەگەڵ هاوڕێیان زوو زوو دەچووینە بەغدا بۆ کاری هونەری یاخود بینینی ئەو بەرهەمانەی لەوێ پێشکەش دەکران.

لەسەفەرێکمان من و سەعدون ئێوارەیێکیان بۆ بینینی شانۆگەری (باب القدیم) چووین.

شانۆگەرییەکە لەنووسینی (خەلیل شەوقی) بوو، بەبەرهەمێکی کۆمیدی گران و سەنگین هەژمار دەکرا، پاش بینینی بەرهەمەکە بیرۆکەی کردنە کوردی و پێشکەشکردنیم لەلا گەڵاڵە بوو، هەر کە بە (سەعدون)م ڕاگەیاند گوتی:

- ئاسانە، هەوکە دەقێکیان لێوەردەگرین و ئیشی لەسەر بکە.

جا چونکە ئەکتەرەکان زۆربەیان دۆست و هاوڕێی سەعدون بوون، بۆ پیرۆزبایی و دەست خۆشی چووینە لایان لەسەر شانۆ و داوای دانەیێك لەدەقەکەشمان لێکردن و دەمودەست دانەیێکی شانۆیی (باب القدیم)یان تەسلیم کردین.

هەر کەگەڕاینەوە هەولێر، کاتم بۆ تەرخان کرد و دەستم بەوەرگێڕانی کرد، بەڵام وەرگێڕانێك کەکوردانە و هەولێرییانە بێت و کەس هەست نەکات دەقەکە لەبنەڕەتدا بەعەرەبیە، بەگونجاندن لەگەڵ مگێزی ئەو دەمی هەولێرێ ناوی کەسایەتیەکانم گۆڕی وەك ئەوەی لەدەقە عەرەبیەکە هاتوو نەما، هەر بۆ نموونە:

کاراکتەرەکانی (نوری کسمیش و جەلیلی خەرەیتەچی و فەتاح و تۆفیقی نەجار و ئەوانیدی).

پاش پرۆڤەیێکی باش، بەدیکۆرێکی جوان و قەشەنگ و تۆکمە لەسەر شانۆی رۆشنبیری جەماوەر پێشکەشمان کرد.

لەسەر شانۆ هونەرمەندان (حەمە عەلی خان رۆڵی جەلیلی خەریتەچی و ئیسماعیل قادر رۆڵی کەمال)یان دەبینی و ئەکتەرە بەشداربووەکانیش (سەمیر عەبدۆك، شیرین سابیر، عەلی ئەحمەد، سیروان عوسمان، خۆم، فەیسەڵ محەمەد سالح، رزگار ئەحمەد) بوون.

پاشان وەك بەرهەمێکی تەلەفزیۆنی، هونەرمەند (جەبار غەریب) و ستافی پشت کامێرا لەبەغداوە هاتن و لەخانوویێکی کۆن (کەونە دەرکە) تۆمارکرا بەگۆڕانکاریەوە، لەجیاتی حەمە عەلی خان.. سەعدون خۆی رۆڵی جەلیلی خەریتەچی بینی و لەجێی ئیسماعیل قادریش زوهیر سەعدون رۆڵی (کەمال)ی گێرا.

(کەونە دەرکە) نەدرایە تەلەفزیۆن، خرایە سەر کاسێتی ڤیدیۆ بەسەر تۆمارگاکان دابەشکرا بۆ فرۆشتنەوە، لەبیرمە، لەگەڵ سەعدون و زوهێری کوڕی کاسێتی (کەونە دەرکە)مان بردە رانیە تا بیدەینە کەسایەتێکی دەڤەرەکە، بەقەمەرەی (بەرازیل)ی خۆم چووین و لەلای ئاغایەکە میوان بووین و بۆ نیوەڕۆ هەر لەماڵی خۆی داوەتێکی چەوری کردین، کاتی عەسر و بەر لەگەڕانەوە سەعدون لەگەڵ خانەخوێ کەوتە پستە پست بەتەنیا، تێیگەیاند کەبەرهەمێکی تازەمان هێناوە و لەسەر کاسێتی ڤیدیۆیە و وەك دیارییەك پێشکەشی دەکەین و ئەویش دەبێت هاوکاریمان بکات، ئیدی ئاغا کاسێتی وەرگرت و (٥٠٠) پێنج سەد دیناری دایە دەست سەعدون و خواحافیز خواحافیز گەڕاینەوە، بەڵام من چاوم بەیەك دیناریش نەکەوت و پارەی بەنزینی ئەو سەر و ئەمسەریش هەر بەخۆم وێرم کرد !

## هاوارێك لەحاجی قادری كۆییەوە

دەمێك بوو، هەر لەسەرەتای هۆگریم بۆ كتێب و شیعر، شەیدای شاعیرە هەڵوێستەكانی حەزرەتی حاجی قادری كۆیی بووم و زۆربەی شیعرەكانیم لەبەركردبوو و بەیەكێك لەشاعیرە هەرە بەئاگا و شۆرشگێڕ و رابەری بیری نەتەوایەتیم دادەنا، هەركەسێ بەرگەكەی بیرمەند و نووسەری بەناوبانگ مامۆستا مەسعود محەمەد چاپ و بڵاوكرایەوە كەلەمەڕ ژیان و شیعرەكانی حاجی قادری كۆیی بوون و بەدیقەتەوە هەرسێ بەرگەكەیم خوێندەوە و ئەوەندیدی حاجیم لەلا مەزن بوو.

لەناوەڕاستی هەشتاكان بەسەرەوە، شانۆی ئاهەنگسازی لەهەولێر و سلێمانی وردە وردە دەبوە میتۆد و كاری لەسەر دەكرا، ئێمە لەهەولێر بەم ستایلە شانۆی (چیرۆكەكانی مام سمایل)مان پێشكەشكرد و لەسلێمانیش مامۆستای هونەرمەند (ئەحمەد سالار) شانۆی (نالی و خەونێكی ئەرخەوانی) نووسی و هەر بەخۆشی ئەركی دەرهێنانی خستە ئەستۆ و پێشكەشكرا و مامۆستا (سالار) هونەرمەندانە برەوی بەم ستایلەدا و كاری لەسەر بەرهەمیدیش كرد.

ئەوێ رۆژێ من فیرار و دەست والاّ و كاتێكی زۆرم هەبوو، بیرم لەژیان و بەسەرهاتی (حاجی قادر) دەكردەوە و بیرۆكەی نووسینەوەی شانۆییێكی ئاهەنگ ئامێزم لەلا گەڵاڵە بوو.

ئیدی بەكەونە سپیار و دیوان و هەرسێ بەرگەكەی مامۆستا مەسعود محەمەددا چوومەوە و شەو و رۆژم تەرخانكرد و بەنووسینەوەی شانۆگەریەكەوە خەریك بووم، لەئەنجامدا دەقێكی شانۆیی ئاهەنگسازی بەناوی (هەوارێك لەحاجی قادری كۆییەوە) لەدایك بوو.

هەروەکو گوتم هەینێ فیرار و لاتەریك بووم، دەقەکەم تەسلیم بەکاك سەعدون کرد و خوێندییەوە و پەسندی کرد و دەست و برد خستیە بواری جێبەجێکردنەوە.

من نەمتوانی وەك ئەکتەر بەشداری ئەم بەرهەمەی خواستی دڵی خۆم بم، بەڵام ژمارەیێکی بەرچاوی ئەکتەری باش و لێهاتوو لەهاوڕێیانم بەشدارییان کرد لەوانە (سەمیرە عەبدۆك، حەمە عەلی خان، حەمە سەعید ئیبراهیم، فەیسەڵ محەمەد سالح، بەکر مەعرووف، ئیسماعیل قادر، ئەحمەد جەمیل، سیروان عوسمان، سەلام سەعدون).

هەروەها هونەرمەندی گەورە (زیاد ئەسعەد) وەك ئەکتەر و گۆرانیبێژ کەپتر رەونەقی بەبەرهەمەکە دا و بەدەنگە زوڵاڵەکەی شانۆییەکەی رازاوەتر و پڕ ئاهەنگتر کرد.

بەرهەمەکە لەمیهرەجانێکی شانۆیی بەشداری پێکرا و لەهۆڵی رۆشنبیری جەماوەر پێشکەشکرا و بووە جێی سەرنجی جەماوەر، دواتریش لەسەر شانۆی هۆڵی (میدیا) لەپاش فیستیڤاڵەکە درێژە بەنمایش کردنی درا.

بێگومان بەهۆی ناوەرۆکە شۆرشگێڕییەکەی ئەم بەرهەمە کەهەر لەشیعرە ئاگرینەکانی حەزرەتی حاجی قادرەوە سەرچاوەی گرتبوو، کێشەی زۆرمان بۆ دروست بوو لەرۆژانی نمایش لەلایەن دەسەڵات و خودی ئەمینداری گشتی رۆشنبیری و لاوان و پیاوانی ئەمن تووشی سەرئێشە و لێپرسینەوە دەبووین و هەموو جارێکیش بەپشت بەستن بەمۆڵەتەکەی کەهەر خۆیان پێیان دابووین خۆمان رزگار دەکرد.

دێرە شیعرێکی (حاجی) کەتیایدا دەفەرمووێ:

هەڵیکەن بەیرەقی کوردی لەدەوران

لەمابەینی کەکۆن و هەیبەت سوڵتان

ئەم دێرە شیعرە لەبەرزاییەك و لەناوەڕاستی شانۆ، ئەكتەری بەتوانا (حەمە عەلی خان) لەگەڵ بەرزكردنەوەی جەمەدانی سەرشانی بەدەنگە نمونەییەكەی دەیخوێند و دەبووە هۆی ووروژاندنی جەماوەری نـاو هـۆڵ و هەراسـان بـوونی پیاوانی دەسەڵات.

ڕۆژێكیان لەنمایشی هـۆڵی میـدیا، گـەورە هونەرمەنـد و نووسـەر ڕەوانشـاد مامۆستا (خالیـد دلێـر) ئامـادە بـوو لـەریزی پێشـەوە جێگامـان بـۆ كـردەوە. منیش دوور بەدووری لەنهۆمی سەرەوەی هۆڵەكە و لەكاتی نمایشەكە چاودێری مامۆسـتا (دلێـر)م دەكـرد و زەیـنم دەدایـێ بـزانم كاریگـەری بەرهەمەكـەمانی لەسەر چۆنە، هەستم كرد زوو زوو سەری ڕەزامەنـدی دەنوێنـێ و بەشـەوقەوە لەدیمەنـەكان دەڕوانـێ، بەتایبـەتی لـەو شـوێنەی كەباسـی بـەیرەقی كـوردی خوێنرایـــەوە، ئاگـــام لێبـــوو مامۆســـتا (خالیـــد دلێـــر) وا ورد ورد فرمێســـك لەچـاوەكانی دێنــە خـوارێ و بەدەسـت چـاوی دەسـڕییەوە، لـەكۆتایش بـۆ پیرۆزبایی هاتە سەر شانۆ و یەكە یەكە دەستی بەشـداربووانی گوشـی و داوای بینینی نووسەرەكەی كرد، منیش خـۆم پێناسـاند و ئـەو ستایشـەی بـەڕێزیان كردیان بەرانبەر بەبەرهەمەكەمان بووە میدالیای شەرەف و تـا مـردن شـانازی پێوە دەكەم.

## موختەبەر شیمال

ئەو کاتانەی بەبڕیاری (٧٣٦-٧٣٧) لەسەربازی رزگارم بوو بوو ئەو دوو بڕیارەی لەرێکەوتی (٩/٦ و ١٩٨٨/٩/٨) لەلایەن ئەنجومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی بەعس سەبارەت بەکوردان دەرچوون، هیچ ئیش و کارێکم نەبوو جگە لەبەشداری کردنم لەکارە هونەرییەکان، ناسیاوێکمان خەڵکی لای تەوێڵە و هەورامان بوو و زەنگین و پارەدار، بیری لەکردنەوەی (موختەبەرێك) کردەوە لەشاری هەولێر کەتا ئەوکاتە هیچ موختەبەرێکی فیلم شوشتنەوە نەبوو و ستۆدیۆکانی ناو شار فیلمە فۆتۆگرافیەکانی خەڵکیان یان بۆ موسڵ یاخود بۆ بەغدا دەنارد و پاش هەفتەیەك و هەندێ جار پتریش ئینجا وێنە فۆتۆگرافیەکان دەهێنرانەوە.

ئەم ناسیاوەمان ناوی (مستەفا) بوو، کۆنە خانوێکی لەسەرەتای ئەو کۆڵانە کڕی کەڕێك بەرامبەر فولکەی مەلیك مەحمودی نەمرە.. خانووەکەی تێکدا و کردیە عەرد و بینایێکی زۆر جوان و مۆدێرنی لەسەر دروستکردەوە بۆ موختەبەر، بەهاوکاری برای خۆشەویستم (هوشیار محەمەد حەسەن) لەبەغدا ئامێری تازە و پێشکەوتووی شوشتنەوەی فیلم و چاپکردنی وێنەی کڕی و هێنایەوە هەولێر، هەر لەبەغداش ئەو کیژە هەولێرییانەی لەخولێکی فێرکردنی چاپ و شوشتنەوە بەشداری پێکرد و لەسەر کارەکان رایهێنان.

منیش وەك کارمەند لەبەشی پێشوازی موشتەرییەکاندا جێگیر بووم و رۆژانە بەرووێکی گەش و خۆش پێشوازیم لەو خەڵکە دەکرد کەفیلمەکانیان دەهێنا و پاش نیو سەعاتێك وێنەکانیان وەردەگرتەوە.

دونیای (موختەبەر شیمال) بۆ ئێمە دونیایێکی دی بوو، کەدەچووینە ژوورەوە وامان هەست دەکرد چووینەتە وڵاتێکی ئەورووپی و هەر لەهەولێریش

نین، ئینجا لەگەڵ ژمارەیێك كیژی سەربەرزی هەولێر كەلەوێ كارییان دەكرد وەك خوشك و برا و هاوڕێ ڕۆژانە كاروبارەكانی سەرشانمان جێبەجێ دەكرد، كاك مستەفاش چونكە ماڵی لەسلێمانی بوو بەڕێوەبردنی موختەبەرەكەی دابووە كاك (هوشیار) و بەخۆشی بەگوێرەی دەرفەت پێنج شەممە و هەینیان دەهات و لەلامان دەمایەوە، هەر لەسلێمانیش مام ساڵح هەورامی لەگەڵ خۆی دەهێنا چونكە پێشتر لەتەلەفزیۆنی كەركوك كاری كردبوو سەری لەئامێرەكان دەردەكرد و بەكێشەكان رادەگەیشت.

چونكە كارەكەشمان سەرەتا بوو، زوو زوو ئامێرەكان دەوەستان و كێشەیان دروست دەكرد، بۆ ئەم مەبەستە لەبەغداوە شارەزایێكی میسرییان بۆ ناردین و ماوەیێكی باش لەلامان مایەوە، بەداخەوە ناوەكەیم لەبیر نەماوە، ئەم شارەزا میسرییە پیرەمێردێكی بەتەمەن بوو، لەبوارەكەی خۆی زۆر مەعلان و لێهاتوو بوو، هەر كەسەری دەخستە سەر ئامێری شوشتنەوەی فیلم یان چاپكردنی وێنەكان وامان هەست دەكرد قسە لەگەڵ ئامێرەكان دەكات، دەلیل و كتێبێكی (٦٠٠–٧٠٠) لاپەڕەیی بەزمانی ئینگلیزی پێبوو كەپڕاوپڕ بوو لەزانیاری دەربارەی ئامێرەكانی موختەبەر، زۆر ئاگای لەم دەلیلە بوو بەهەموو دەمێ لەبن هەنگڵی بوو و دەیپاراست، جارێكیان هاتینە سەر ئەو رایەی چۆن بتوانین ئەم دەلیلەی لێوەرگرین و بەزووترین كات دانەیێكی لەسەر كۆپی بكەینەوە، كەداوایان لێكرد، ئەو گوتی:

– مش ممكن، مەمنوع.

ئێوارەیێكیان پارێزمان لێگرت و لەهەلێكدا كەئەو بۆ سەرخەو شكاندنێك چووە ژووری سەرەوە، دەلیلم برد و هەر هەموویمان لەدوكانێكی كۆپیكردن كۆپی كرد و ئەوەی ئەومان لەشوێنی خۆی دانایەوە و دانە كۆپیەكەشمان لەلای خۆم لەناو دۆلاب تەقەتكرد. ئەو رۆژی و شەوەكەشمان بەسەلامەتی

بەڕێکرد و هیچ لەگۆڕێ نەبوو، بۆ بەیانی هەر کەمن دەرگای پێشوازیم کردەوە و کەوتمە خۆ ئامادەکردن بۆ وەرگرتنی فیلمی خەڵکی، بەبیرمدا هاتەوە گوتم با سەیرێکی کۆپیەکە بکەم تا دڵنیا بم لەشوێنێکی تەقەت دامناوە، من دەرگای دۆلابم کردەوە یەکسەر دەستێك لەپشت منڕا درێژبۆوە و دانە کۆپیەکەی راکێشا و منیش ئاوڕم دایەوە بینیم پیرەمێردی میسرییە، کۆپیەکەی لەباوەشێ گرت و بەتوڕەیی، بەمنی گوت:

– عێب، وەڵڵا عێب.

هیچ قسەیتری نەکرد و هەر بۆ ئێوارەش یەکسەر گەڕایەوە بەغدا و جارێکیدی نەهاتەوە، تومەزا هەر کەدەلیلەکەی خۆی دەست دەکاتێ و دەیکاتەوە یەکسەر هەست دەکات کۆپی کراوە و کار لەکار ترازاوە.

بەم شێوەیە ماوەیێکی باش لەوێ کارمەند بووم و مارفی براشم هات و بووە شوفێری ئەو قەمەرە بەڕازیلیەی کەکارمەندەکانی هاتووچۆ پێدەکرد، ژیانێکی شاهانە دەژیاین، راستە ماندوو دەبووین، بەڵام موچەشمان باش بوو، خواردن و خواردنەوەشمان هەر بێ حسێب بوو.

لەو ماوەیەی لەوێ بووم نێوانم لەگەڵ کاك (هوشیار محەمەد حەسەن) زۆرباش بوو وەك برا و هاوڕێ مامەڵەمان لەگەڵ یەك دەکرد و زۆربەی شەوانیش هەر بەیەکەوە بووین.

کەچی بەداخەوە، لەپڕ دیکتاتۆرەکەی بەغدا بەبڕیارێکی تازە، هەردوو بڕیاری (٧٣٦-٧٣٧)ی هەڵوەشاندەوە و کراینەوە بەسەرباز و چووینە سەربازگەیێك لەدەرەوەی شەنگال، ئەوجا وەرە دڵت شەق نەبا لەم جێگە خۆشە لەم کەش و هەوا ئەورووپیەوە بێیتە دەرێ و دابڕێی و بەجلك و پۆستاڵی سەربازییەوە بچیتە ناو ئەو جەهەندەمەی سەربازگەی دەرەوەی شەنگال.

## بەرەو دۆزەخی سەربازی

ڕۆژ بەڕۆژ هەواڵەکانی سەرکێشی دیکتاتۆر دژوار و ئاڵۆزتر دەبوو، خەڵکی قوڕ بۆ گێراوەی عێراقیش بەکورد و عەرەب و کەمە نەتەوایەتیەکان پڕۆژەیێکی ئامادەکراو هەمیشە قوربانی حەماقەتەکانی سەدام و ڕژێمە شۆڤێنیەکەی بوون.

لەم سەروبەندەدا بوو سوپا دڕندەکەی عێراق خاك و وڵاتی کوێتی داگیرکرد و خەڵکەکەی سەرگەردان و دەربەدەر کرد، ئا لەو کاتەدا جارێکیدی ئێمەشیان ڕاپێچی سەربازی کردەوە و لەبەهەشتە سیحراوییەکەی موختەبەر شیمال دابڕاین و بەرەو دۆزەخی سەربازگە لەشنگال و فایدە.

ئەوکاتە مارفی برام و ئەمیری ئامۆزاشم هەمان بڕیار دەیگرتنەوە و بەیەکەوە مارف شوفێری بەڕازیلی و ئێمەش هەردووکمان نەفەر و بەدڵێکی شکاو و پڕ لەکەسەر بۆ شەنگال.

سەربازگەی (فایدە) چەند کیلۆمەترێك لەشەنگال دوور بوو، لەوێ حەشامات هەڵسا بوو، ئەو هەموو کوردە، بەپیر و گەنج و نەخۆش و پەككەوتە و شێتەوە، ئەوەی دە ساڵیش دەبوو نەدیتبوو لەوێ چاوت پێدەکەوت و بەیەك شاد و شوکر دەبوونەوە، لەم سەربازگەیە بەسەدان سەربازی تازە و پێشمەرگەی دوای ئەنفالە بەدناوەکانت دەبینی و هاتبوونەوە و خۆیان ڕادەستی سەربازگە کردەوە، هەرا و هۆریاییێك بوو کەس بەکەس نەبوو، لەماوەی هەفتەیێك کاروباری ئەم هەموو خەڵکە ڕێکخراو لەفەوج و سریە و کەتیبە پۆلین کراین. ئێمە هەرسێکمان بەبەر کەتیبەی دەبابات کەوتین و جلك و بەرگی سەربازی و تاخم و تفەنگ و دەمامکی خۆپارێزی لەچەکی کیمیاییشمان وەرگرت. ئینجا هاتینە سەر تەدریب و بەزم و ڕەزمی دەوام و

هاتن و چوون.

وامان بڕیار دا، ڕۆژانی شەممە و یەکشەممە دەوام بکەین و پاشنیوەڕۆی یەکشەممە بەهەر ڕێگاییێك بێت لەمەعەسکەر دەرچین و بگەڕێینەوە هەولێر و عەسرێکی درەنگی هەینی بگەڕێنەوە سەربازگە و بۆ شەوەکەی لەوێ بخەوین. بەڵام ئەمەمان وا بەئاسانی بۆ نەدەچووە سەر، چ لەکاتی دەرچوونمان لەسەربازگە بەرەو هەولێر، یاخود لەگەڕانەوەمان بەرەو دۆزەخەکە، هیچ جارێك بێکێشە و گیروگرفت نەدەبووین.

لەگەڵ ئێمە، غانمی کوڕە خەزوری مارفی برام، ڕزگار کارەباچی و موسا ئاکرەیی بەقەمەرەی ڕزگاری کارەباچی لەچوون و گەڕانەوە دەبوونە هاوسەفەرمان.

جارێکیان کەلەمەعەسکەر دەرچووین و بەخۆمان ئیجازەمان دابووە خۆمان و ترومبێلەکانمان بەرەو شەنگال بەڕێکەوت، سەیرمان کرد ئینزباتەکانی مەعەسکەر بازگەیان داناوە و ئەوانەی وا بەقاچاغ دەیانەوێ بچنەوە لەترومبێل دایاندەبەزێنن و دەیانگرن، ئێمە جارێ زۆرمان مابوو بگەینە بازگەکە یەك لەدوای یەك سوڕاینەوە و بەرەو ڕەبیعە و لەوێشەوە بەلاڕێ بەناو گوندی بەدەوار نشینەکان تا لەوسەری لەڕێگاییێك بگەینەوە ڕاستەڕێی (شەنگال- موسڵ) و ڕزگارمان بێت، زوو بەزووش دونیا تاریك داهات و بووە شەو، لەم سەفەرەدا کاك کەریم دەشتی شاعیریشمان لەگەڵدا بوو، ئیدی لە (ڕەبیعە)وە لاماندا ڕێگای خۆڵ و نەشارەزا بەناو گوندی عارەباندا تێدەپەڕین، شەوێکی زۆر ترسناك بوو، دەترساین لەناو گوند و بەدەستی عارەبان تەقەمان لێبکرێ و لەو چۆڵەوانیەی کەسیش بەهانامانەوە نەدەهات، چونکە نەشارەزاش بووین ڕێگەمان ون کرد و سەفەرەکەمان درێژەی کێشا، تا بەرەبەیان لەو ناوە سوڕاینەوە و هەر کەتاریکی ڕەویەوە و ڕوناکی دەرکەوت ڕێگای قیر و

سەرەکیمان دۆزییەوە و بازۆ بەرەو موسڵ و لەوێشەوە بۆ هەولێر و ئەو هەموو بازگەیەمان بڕی نەئیجازەمان پێبوو نەهیچ پسوولەیێك.

هەموو جارێکیش هەر کەئێوارەی هەینی دەگەڕاینـەوە بـۆ فایـدە، لەیانـەی شەنگال لاماندەدا و بەعارەقە مەستەکیە تام و بۆنخۆشەکە تەواو مڕ دەبـووین و هـەینێ دەچـووینەوە بـەردەم مەعەسـکەر و ترومبێلمـان رادەگـرت و بـەبن سیمی دڕاو دەچووینەوە ناو مەعەسکەر و بەراکەراکە خۆمان دەگەیاندەوە ناو هۆڵەکان.

کـەرەتێکیان لەیانـەی شـەنگال لامانـدا و هـەتا تـەواو سـەرخۆش بـووین عەرەقمان هەڵقوڕاند، لەهەموومان مەستر موسا ئاکرەیی بوو کەلەبەر مڕ بـوون نەیدەتوانی بەپێی خۆی بڕوا، موسا لەش و لارێکـی لاواز و گچـکۆکەی هـەبوو، رزگاریش بالاّ بەرز و بەهەیکەل، ناچار موسای خستە سەر شانی و تا ناو هۆڵی مەعەسکەر داینەنا و موساش لەخەوێکی خۆشدا بوو هەر بەئاگاش نەهات.

جارێکیدی لەکاتی گەڕانەوەمان لەموسڵ دەرچووین بەرەو شـەنگال، مـارف شوفێر بوو لەناکاو بەو تیژڕۆیشتنەوە لەچاڵێکیدا و یـەك مـەتر بـەرازیلی بـەرز بـۆوە و هەڵیتەکانـدین و مەکینـە کوژایـەوە، ئەوەنـدەی هەوڵمانـدا ترومبێـل نەکەوتەوە گەڕ، بەناچاری ئەو شەوەمان لەناو بەڕازیلی بـەڕێکرد و بـۆ بـەیانی چونکە لەموسڵەوە نزیکتر بـووین بەراکێشـان ترومبێلمـان بـردە نـاو فیتـەرانی موسڵ، هەتا چـاکیان کـردەوە کـەمێك دواکـەوتین، بەپەلـە بـاژۆ بـۆ (فایـدە)، لەوێش هەر بەغاردان بۆ مەیدانی عەرەزات، بەڵام کار لەکار ترازا بـوو ئێمـەیان بە (غائیب) نووسی بوو، هەر کـەنایب عـەریف و زابتەکـەشمان چـاویان پێمـان کەوت بڕیاریان دا سزامان بـدەن، بەمقەسـت سـەرییان هەڵپاچـین و تـا بـانگی نیوەڕۆ بەتەدریب و عقوبەی سەخت وازییان لێنەهێنایین.

ئیـدی لەگـەڵ نایـب عەریفەکـەمان رێگـاییێکی ترمـان دۆزییـەوە، هـەر

کەدەچووینە هەولێر و دەگەڕاینەوە مەعەسکەر، هەریەکەمان دیارییێکی لەگەڵ خۆی دەهێنا و پێشکەش بەنایب عەریفە رەشە پیسەکەمان دەکرد و بەمجۆرە کەویمان کرد و بووە برادەرمان، زۆرجاران لەکاتی گەڕانەوەمان لەشەنگال و لەبەردەم یانەکە چاوەڕێی دەکردین و دەهات لەگەڵمان دادەنیشت و دەیخواردەوە کە هەڵدەستاین هەریەکەو دیارییەکەی خۆی تەسلیم دەکرد و دەچووینەوە بەر دەرگای سەربازگە، ئەو لەدەرگای سەرەکی دەچۆوە ژوورێ و ئێمەش لەبن سیم و بەقاچاغ خۆمان دەگەیاندەوە شوێنی خۆمان.

چەند مانگێکی ئاوامان راکێشا، ئیتر دەستکرا بەگواستنەوەمان بۆ شوێنێکی دی، ئێمە لەکەتیبەی (٩٥)ی دەبابات هەر هەمووومان نەقلی مەرکەز تەدریبی تکریت کراین، پێمانخۆشبوو بۆ تکریت چونکە ماڵی مامم ئەنوەر لەوێبوو نانەواخانەی دانابوو، لەناو شار ژوورێکمان لەئوتێلێك بەرامبەر چێشتخانەکەی مام فەتاحی هەولێر بەکرێ گرت و بەیانیان زوو دەچووینە سەربازگە و پاش نیوەڕۆ دەگەڕاینەوە ناو شار و پاش نانخواردن و پشوودان دەچووینە ناو شار و بەپیاسە کاتەکەمان بەسەر دەبرد، شەوانیش بەدیار تەلەفزیۆن یان کتێب خوێندنەوە خەریك دەبووم، من لەمەراقی سەربازی و دوورکەوتنەوە لەهەولێر و تەیراوە و ژیانە خۆشەکەی ناو موختەبەر خەوم دەزڕا و نەمدەتوانی بخەوم، کەچی مارفی برام هەر سەری دەخستە سەر باليف و پرخ و هۆڕی دەست پێدەکرد و زۆر خەفەتم پێدەخوارد، لەوێش هەر لەچوارشەممەوە دەگەڕاینەوە هەولێرێ و ئێوارەی هەینیان دەگەڕاینەوە تکریت، هەموو جارێکیش غائب دەدراین و عقوبەیان دەداین. هەر لەمەرکەز تەدریبی تکریت، ئەمیری ئامۆزام بووە شوفێری ئامیر کەتیبەکەمان کەرائیدێکی عەرەبی بەغدایی زۆر پیاوچاك بوو ناوی (جەدوع) بوو، مارفی براشم وەك حیمایە لەگەڵیاندا بوو، منیش هەر سەرباز و بێئیش و بێکار مەگەر

بەیانیان تەدریبمان کردبا.

رۆژێکیان کۆیان کردینەوە و چەك و تەقەمەنی و دەمامکیان داینەوە و گوتیان (غەرازتان) ئامادەکەن نەقڵ بوونە، بۆ کوێ؟ بۆ سەفوان لەناو خاکی کوێت! ئیدی لۆریە درێژ و پشت بەتاڵەکان بەناو مەعەسکەر وەربوون پێیان دەوتن (فاون) دەبابەکانیان بارکرد و سەربازەکانیش بەغەرازەوە بۆ سەر دەبابە و بازۆ بۆ سەفوان، مارف خۆی لەرائیدەکە دزییەوە لەگەڵ من هاتە سەر دەبابە، ئەمیریش شوفێرە و رائیدی هەڵگرتووە بەگەر قافلە کەوتن، بەم گەرمای هاوینە لەسەر دەبابە و بەرەو ئاگر بارانی گەرمای بەسرە و لەوێوە بۆ سەفوان، من زۆر بێتاقەت و ماندوو و هیلاك ببووم و لەداخان قسەشم بۆ نەدەکرا، ئیدی بەم هەلاکەتە گەیشتینە دەروازەی شاری بەسرا و قافڵەی فاون و دەبابەکانمان لایاندا و چاوەڕێی فەرمانی رۆیشتن بووین، بەدرێژایی رێگاکەش لەوبەر و لەمبەر چایخانەی سەفەری و سەندەویچ و سەهۆڵ فرۆش دایانکوتابوو و ئێمەی سەربازیش موشتەری بووین، گەرمایەکەش تاقەت پڕوکێن و بێزارکەر، زۆرم تینوو بوو دەشمزانی ئاوی بەسرە خوێاوکە و ئێمە تێنوویتیمان پێی ناشکێ، بەمارفم گوت:

– کاکە برۆ نیو کێل بەفر بکڕە، لەئاوەکە باشترە با لەرێگا نەخنکێین.

مارف چوو نیو کێل بەفری کڕی و لەولاش قوتێکی گەورەی شیری نیدۆی بەتاڵی هەڵگرتەوە و هاتەوە، ئیدی سەهۆڵەکەمان پارچە پارچە کرد و خستمانە ناو قوتوەکە، دەمنا دەم پارچەیێکم لێدەکردەوە و دەمکرۆشت و قوتم دەدا و ئاهێك بەهەناومدا دەگەڕا.

ئیدی عەسرێکی درەنگ گەیشتینە سەفوان و ئەو شوێنەی بۆ ئێمە دەست نیشان کرابوو رۆخ رووبارێك بوو کەسەرجەم دابەزین و شوێنی خۆمان گرت و بەتانیە و دۆشەکمان لەسەر لم راخست تا بەکزە بایەکە نەختێك فێنك ببنەوە،

خۆ بەدرێژایی رێگاکەش تا گەیشتینە سەفوان مـن تەقـەم لەسـەمۆڵەکەمانەوە هێنا و هەمووم خوارد.

بۆ خۆ فێنك کردنەوە و جل و بـەرگ شـۆردنیش چـووینە سـەر رووبارەکـە، ئاوەکەی خوێاوك بوو هەر کەکراسەکەمان لـەئاو هەڵدەکێشـا و دەرمانـدەهێنا کراس وەك دەفـە رەق رەق رادەوەسـتا، ئێوارەکـەی نـازانم چـیمان درایـە بـۆ خواردن، بەڵام من هەستم کرد بۆم قوت نادرێ، وردە وردەش بێتاقـەت و شـل دەبووم و تایێکی گەرم دایگرتم، بەر لەخەوتن مـن لـەم هاتنـەم بـۆ سـەفوان و فێرار نەکردنم بەتەواوی پاشگەز بوومەوە و بڕیارمدا کەبـەیانی لەخـەو هەڵسـام گەر بەتەنیاش بم ملی رێگا دەگرم و ئێرە بەجێدێڵم و دەچـمەوە هـەولێر چـش دەبێ با ببێ. درەنگانێـك خـەو بردمیـەوە، بـەڵام بـەهۆی ئـەو تایـە گەرمـەی کەسەرتاپای جەستەمی گرتبـۆوە لەخـەو رادەپـەڕیم و ئارەقـەی سـەرهەنیە و گـەردنم دەسـڕییەوە، بـەیانی لەگـەڵ گـزنگ لـەناو جێگـا رابـووم و مـارف و ئەمیریشم بەئاگا هێنا و پێم گوتن:

– کاکە ئەمن لێـرە تەحـەمول ناکـەم، بڕیارمدایـە بچـمەوە، ئـەنگۆ دێنـەوە لەگەڵم یان نا؟

مارفی برام یەکسەر گوتی:

– کو لێدەگەڕێم بەتەنێ بڕۆی، ئەمنیش دێمەوە، مردن و ژیانمان پێکەوە.

کەچی ئەمیر کەوتە پاڕانەوە گوتی:

– ئەورۆ یەکەم رۆژمانـە لێـرە، بـا بـزانین چـمان لێدەکـەن و وەزعمـان کـو دەبی، ئاخر کاکە ئامیرەکەمان پیاوەکی زۆر باشـە، کـوردی زۆر خۆشـدەوێ.. خۆ ئەگەر زانیمـان شـەڕ دەقـەومێ دەچـمە کنـی و ئیجـازەی لـۆ هەرسـێکمان لێوەردەگرم و هەینێ دەچینەوە.

من زۆر نەخۆش و بێتاقەت بووم، چاوێکم بەدەوروبەر و نـاو سـەربازگەکەدا

گێڕا بۆنی خوێنی لێدەهات، خۆم کۆکردەوە و جانتای جلك و شمەکەکانم کردە شان و گوتم:

– ئەمن دەڕۆم.. ئەوەی لەگەڵم دێتەوە با بێ، ئەوەیدی هەرکەسەو ئازادە کو بڕیار دەدا.

بەمشێوەیە، چەك و بڕوبوزگوڕمان هەر لەشوێنی خۆیان بەجێهێشت و پشتمان لەئەمیری کرد کەهەر پرتە و بۆڵە بۆڵی بوو، بەپێیان ملی سەحرامان گرت، قەدەر عەیامێك ڕۆیشتین و گەیشتینە سەر شەقامێکی قیر، من کەمێکم هێز لەبەردا مابوو جارێ وەهاش هیلاك نەبوو بووم، لەوێ چاوەڕێمان کرد بەڵکو ترومبێلێك بەلاماندا ڕەت بێت و هەڵمانگرێت، هێندەی پێنەچوو لەدوورەوە زیلێکی سەربازی پەیدا بوو و بەرەو لای ئێمە دەهات، کەگەیشتە لامان و دەستمان لێڕاگرت و بۆمان وەستا سەیر دەکەین زیلی وەحدەکەی خۆمانە و شوفێرەکەش ئەو چەند ڕۆژە لەگەڵ ئەمیر و مارفی بوو بووە برادەر، نائب عەریفەکەشمان لەتەکیدا دانیشتبوو، ئیدی ئاماژەی بۆ کردین کەلەدواوە سەرکەوین و تا (ئوم قەسر) دەمانبا.. سەرکەوتین و زیلەکە وەڕێکەوت و من لەسەر سندوقە بەتاڵەکان دانیشتم و مارفیش هەر بەپێوە و لەدەوروبەری دەڕوانی، پاش نیو سەعاتێك گەیشتینە ئاواییەك من هەڵسامەوە و خۆمان بۆ دابەزین ئامادە کرد، هەر کەدابەزین و بەمەبەستی سوپاسگوزاری و خواحافیزی چووینە لای شوفێرەکە، کەچی ئەو گوتی:

– ها مجازین، بلخیر بلخیر.. الله ویاکم.

دیارە ئەوان وەك فریشتە بۆ ئێمە پەیدا بوون، هاتوون لە (ئوم قەسر) ریوگی مەعەسکەر هەڵگرن و بگەڕێنەوە تا بتوانن لەسەعات نۆی بەیانی بەسەر سەربازەکاندا دابەشی بکەن.

ئەوان ڕۆیشتن و ئێمەش لەشەقامەکە پەڕینەوە ئەوبەر دیارە نەقلیات

لەولاتر بوو، خۆمان گەیاندە ئەوێ و لەدواوەی قەمەرەیێك جێگەمان گرت و بازۆ بۆ (بەسرە). ڕێگای نێوان ئوم قەسر و بەسرە وێرانە بوو، وێڕای شەڕی قادسیە، جارێ شوێنەواری ئەم شەڕە هەر مابوو کەچی کەللە ڕەقەکەی بەغدا خۆی بۆ شەڕێکی دوڕاوتر ئامادە دەکرد و سواری سەری خۆی بوو بوو دەیگوت: (کوێت نۆزدەمین پارێزگای عێراقە و پاشەکشەی لێناکەین).

لەنەقلیاتی بەسرە شتێکمان خوارد و خۆمان دوانەخست و سەرکەوتینە کۆستەرێك و بەرەو بەغدا جوڵەی کرد، لەرێگای نێوان (بەسرە– بەغدا) من بەتەواوی هیلاك بووم و جەستەم وەك تەندور گڕی لێهەڵدەستا و لەسەر کورسیەکەم پاڵکەوتم و ئاگام لەدونیا نەما.. (بەهۆی کرۆژتن و خواردنی ئەم هەموو بەفرەی کەلەرێگای بەرەو سەفوان لەوزەتێن و قورگم قەپات بوون و بەئاستەم دەمتوانی هەناسە بدەم هەموو جەستەم داهێزرا بوو).

ئاگام لێنەبوو چەند سەعات لەناو کۆستەرەکە بووین لەکوێ لایداوە و چەند بازگەمان بڕیوە، وەختێك مارف بەئاگای هێنام و گوتی:

– کاکە هەستە وا گەیشتینە بەغدایێ، لەپێش دەرکەی گەراجی (نەهزە)ین، ئیدی ئەو جانتایەکەی منیشی کردە شان و بەلۆژە لۆژ دابەزین، لەبەردەم گەراجی نەهزە بەرزە پردێك ژێرەکەی خەڵك لێدادەنیشتن و پشوویان دەدا، مارف گوتی:

– کاکە ئەتو وەرە لێرە لەبن ئەو پردەی پاڵدەوە و جانتایەکی لەبن سەرتنێ و ئەویدیش لەکنە خۆت دانێ و ئاگات لێبێ، ئەمن دەچمە ناو گەراجی، هەر کەسەیارەم بەدەستکەوت دوو جێیان دەگرم و ئەوجا دێمە دووت، ئەتو جارێ پاڵدەوە با ئەوەندە هیلاك نەبی.

ئەو ڕۆیشتن و منیش لەسەر عەردەکە پاڵکەوتم و جانتایێکم خستە ژێر سەرم و ئەویدیشم لەتەنیشتەخۆم دانا و کەوتمە خەوێکی قوڵ.. لەپڕ مارف

بەئاگای هێنامەوە گوتی:

– کاکە هەستە زوو با بڕۆین، بەهەزار شەڕە شەق دوو جێم حیجز کردیە نەوەك عەسکەریدی جێیەکان بگرن.

بەپەلەپەل چووین و خۆمان گەیاندە پاسێکی مونشەئە کەپڕ بوو لەسەرباز و زۆربەشیان کورد بوون، مارف لەلای پەنجەرە دانیشت و منیش لەسەر کورسیەکەی تەنیشتی، دەنگە دەنگ و هەرا و هۆریایەك بوو کەس بەکەس نەبوو، پاسەکە بەڕێکەوت و دەنگی نەوار و گۆرانی (عبرت الشط)ی کازم ساهیر بەرز بۆوە.. منیش وا وردە وردە لەپەلوپۆ دەکەوم، چیتر تاقەتی دانیشتنی سەر کورسیم نەما.. هەستام و لەناوەڕاستی ڕاڕەوی هاتووچۆی هەردوو ریزە کورسییەکان لەسەر پشت پاڵکەوتم، نەفەرەکانیش لەکاتی هاتووچۆیان بەسەرمدا بازییان دەدا و ڕەت دەبوون، بەم حاڵەوە بازگەکانمان بڕی و بێکێشە سەعات (٩)ی شەو گەیشتینەوە شاری شاران، هەولێرە عەزیمەکەم، لەخوار سەرۆکایەتی زانکۆی سەلاحەدین پاسەکە ڕاوەستا و نەفەرەکان دابەزین، ئێمەش دابەزین و یەکسەر بەتەکسی خۆمان گەیاندەوە ماڵێ، هەر کەبەژوور کەوتین و دایکم چاوی پێمانکەوت، گوتی:

– ئۆخەی ئەوە هاتنەوە، دونیاش خراپبی ناهێڵم بچنەوە عەسکەری.. با خانیەکەمان بەسەردا برووخێنن.

من هێز و گوڕ و تینم تیا نەمابوو بەحاڵ خۆم گەیاندە ناو هۆڵ، ئیدی جلکی سەربازییان لەبەر داکەندم و کراس و پانتۆڵیان لەبەر کردم، چ حاڵ نەبوو تیا بووم، بەپەلەپەل بەکۆستەرەکەی باوکم گەیاندمیانە تەواری تەنیشت نەخۆشخانەی جمهوری.. کەچووینە ژوورەوە سەیر دەکەم دکتۆر (جەلال سدیق)ی هاوڕێم ئێشگرە و خەریکی نەخۆشەکانە، هەر کەچاوی بەمن کەوت بەپرتاو هات و لەسەر یەکێك لەقەرەوێلەکان پاڵی خستم، ئیدی منیش شەرحی

حاڵی خۆم بۆ کرد و باسی ئەو بەفرە زۆرەم بۆ کرد کەلەرێگا خواردبووم، سەیرێکی ناو دەم و قورگی کردم و گوتی:

– قورگت وێران بووە، هەموو ئیلتیهاباتە و لەوزەتێنت لەهەردوولا شۆڕ بوویتەوە.

هەینێ کەوتە هەڵواسینی ئاو و دەرزی لێدان و چارەسەرم، سێ سەعات لەتەواری ماینەوە تا دوو دانە لەئاوی موغەزی چۆڕبڕ بوون، هەستم کرد تایە گەرمەکەم وردە وردە دادەبەزێت و دەتوانم چاوم بکەمەوە و بڕۆم.

دواجار دکتۆر جەلال سدیق بەقسەی خۆش و دڵدانەوە بەڕێیکردین و چووینە ماڵ، ئیدی یەکەمین شەوی فیراریێکی تازەمان دەست پێکرد و قاچمان لێڕاکێشا.

## راپەڕین

بەمشێوەیە بووینەوە خەڵوەتنشینی ژێر زەمینەکەمان، لەناو شاریش ڕۆژ بەڕۆژ بارودۆخ ئاڵۆزتر دەبوو و خەڵك لەچاوەڕوانی شەڕێکی دژواردا بوون، بەشی هەرە زۆریش دەستە و دوعایان بوو کە (خوایە.. سەدام هەر ئەوها عاسێ بێت و تەنازول نەکات و لەکوێت پاشەکشە نەکات) چونکە دەمانزانی بەم هەڵەیە خۆیی و ڕژێمەکەی جێگەیان لەق دەبێت و ڕەنگە هەر بەیەکجاریش ڕزگارمان بێت.

دەسەڵات لەناو شار لاواز بوو بوو، پیاوانی ئەمن و موشتەرەکە ئەو گوڕ و تینەی جارانیان نەمابوو، ئەوانیش لەچاوەڕوانی پێشهاتێکی نادیار و وڕوگێژ دەسوڕانەوە، خەڵك وەك جاران لێیان نەدەترسان و ئەو هەیبەتە تۆقێنەرەیان لەدەست دابوو.

زۆر شەو خۆم دەگەیاندە یانەی ئازادی و لەگەڵ برادەران لەدەوری مێزێك خڕ دەبووینەوە، ڕەوانشاد مەحمود زامداریش زوو زوو بەبێ ترس دەنگی هەڵدەبڕی و دەیگوت:

– وای بابە وای.. کاریتە دەباری کاریتە.

مەبەستی ئەو ڕوکێت و ساروخانە بوو کەهێزە هاوپەیمانەکان بەسەرۆکایەتی ئەمریکا دەیگرنە بەغدا و تەخت و تاراجی سەدام و ڕژێمەکەی وەردەگێڕن.

بارودۆخی کارەبا بەرەو خراپی دەچوو، دەسەڵات کۆنترۆڵی ناو شاری زۆر بەلاوازی ئەنجام دەدا.

خەڵك کۆمەڵ کۆمەڵ گرد دەبوونەوە و باس هەر باسی شەڕ و لێدان و ئومێدی ڕزگاربوون بوو، ئێوارانیش بەدەنگی ئێستگە جۆش و خرۆش دەکەوتە

ناو جەماوەر و دڵنیا دەبووین گۆڕانکارییێك بەڕێوەیە.

لەرۆژی (٣/٦) لەشێخەڵڵا و لەبەردەم چاپخانەی کرێکاران، برادەرانی شیوعی گردبوونەوە و بەدروشم و دڕاندنی وێنەی دیکتاتۆر خەڵکیان لەخۆ خڕکردەوە و تەقیەوە و بووە خۆپیشاندان و تا دەهات شەپۆلی جەماوەر پتر دەبوو، بەڵام بەداخەوە ئەو رۆژە بەزەبری تەقە و راوەدونان و گرتن و زەبر و زەنگ خۆپیشاندەران پەرتەیان لێکرد و بارودۆخەکە ئاسایی بووەوە.

ئێستگەکانی شۆڕشیش بووبوونە داینەمۆی جەماوەری ناو شارەکان و بروسکە لەدوای بروسکەیان بڵاو دەکردەوە و هانی پێشمەرگە و رێکخستن و جەماوەرییان دەدا بۆ راپەڕین.

لەئۆردوگای زۆرەملێی (خەبات) کەزۆربەی دانیشتوانی خەڵکی قەڵادزێ بوون خۆپیشاندان کرا و لەوێش پیاوانی رژێم بەزەبری چەك پەرتەیان پێکردن و لاوێکی قەڵادزەیی بەناوی (بەختیار) شەهید بوو، چەندین کەسیش برینداربوون.

لەبەرەبەیانی (٣/٥) جەماوەری تینووی ئازادی لەشاری رانیە، گەورە و بچووك، ژن و پیاو راپەڕین و لەماوەیێکی یەکجار کورت شاریان لەچنگی چەپەڵی پیاوانی رژێم رزگارکردن و تەپڵی سەرکەوتنیان لێدا و جەماوەر و پێشمەرگە ئاوێتەی یەك بوون، هەواڵەکە لەئێستگە بڵاوکرایەوە و خۆشی و شادی کەوتە ناو سەرجەم شارەکانیدی و خۆزگەمان بەخەڵکی بەشەرەفی شاری رانیە دەخواست کەئێستاکە ئازادن و دەسەڵاتی شومی بەعسیان لەسەر نەماوە و رزگارییان بووە.

تا دەهات خەڵك ورەی بەرز دەبۆوە و پیاوە بودەڵەکانی دەسەڵاتیش وەك مشك و جورج خۆیان لەکونان دەپەستا، شەوان دەردەکەوتن و بەمەفرەزە و بەترومبێلی زۆری لەدوای یەکتر بەناو شەقامەکانی شاردا دەسوڕانەوە و

زەندەقیشیان چوو بوو.

لە (٣/٧) مژدەی (سلێمانی ڕاپەڕی) بەگوێماندا درا و خۆشی و شادییەکە گەورەتر بوو، ئای خودایە دەبێ کەینێ لافاوی ڕاپەڕین لەشارەکەی منیش هەڵسێ و ئەم جڕ و جانەوەرانە ڕامالێن.

ئێواران لەگەڵ برادەران یەکترمان دەبینی و تەگبیری ڕاپەڕینمان تاوتوێ دەکرد، بەرچاومان روون بوو وا وردە وردە ڕاپەڕین شار و شارۆچکەکانی دەوروبەرمان دەگرێتەوە و هاکە بزانە قەڵا و منارەش ڕاپەڕی، دەشمانگوت: هەولێر هەستی ڕاناوەستی.

ئێوارەی (٣/١٠)، هیچ گومان نەما کەسبەینێ (٣/١١) ڕاپەڕین لەهەولێر ڕوودەدات و کوڕ ئەو کوڕەیە بەشدار بێت، ئێمە لەگەڵ شەهید (نەوزاد نانەوا)ی هونەرمەند ڕێکەوتین، کەئەو بەرێگای ڕێکخستنەکانی کەخۆی پەیوەندی لەگەڵیان هەبوو و سەر بە (پارتی دیموکراتی کوردستان) بوون، بەیانی زوو چەکمان بۆ بێنێ و ئێمەش لەتەیراوەی کوردایەتیەوە دەست پێبکەین.

شەوەکەی، ترومبێلێکی نەجدەی پۆلیس بەموکەبیرە بەناو شاردا دەسوڕایەوە و هاتە تەیراوەش و فەرمانی (عەلی حەسەن مەجید)ی بڵاوکردەوە کەسبەینێ هاتنە دەرەوە لەماڵەکان قەدەغەیە، ئەوکاتە من لەسەربانیماڵەوە لەگەڵ باوکم و برایەکانم سەیری نەجدەکەمان دەکرد کەسەر بەرەو خوار لەلای نەقلیاتەوە بەرەو مزگەوتی حاجی عەبدوڵلا حەمامچی چەند جارێك بڕیارەکەی بەدەنگ لەموکەبیرەوە بڵاو کردەوە، هەر هێندە شۆڕبۆوە گەنجانی سەر جادە ترومبێلیان دایە بەر بەردان و بەپرەپڕ دەربازیان بوو.

ئەو شەوە لەخۆشی سبەینێ خەو نەچووە چاوانم و خوا خوامبوو ڕۆژ بێتەوە، لەگەڵ گزنگی بەیانی خەڵك لەماڵان وەدەرکەوتن و هەموو سەرە

کۆڵانێکی تەیراوە بەدەیان گەنج و پیر گرد بوونەوە و سەرەتاتکێ چاوەڕوان بوو، ئێمە لەسەری کۆڵانی خۆمان خڕبووینەوە و من چاوەڕوانی نەوزادی نانەوا بووم و بێت و چەکەکان دابەش بکات و ئێمەش لەلای خۆمانەوە دەست پێبکەین، چونکە هەر زوو بەزوو دەنگی تەقە و هەرا و هۆریای خەڵك دوور بەدووری دەهاتە بەر گوێمان، کات دەڕۆیی و نەوزاد هەر نەهات. لەم عانوساتەدا نەبەزی کەریم کێشکە و ژمارەیێك گەنج لەخوارەوەی کۆڵانی ئێمەوە بەرەو لامان هاتن و هەموویان بەرگی کوردییان پۆشیبوو (نەبەز) خۆشی بەستبوو کلاشینکۆفی بەدەستەوە بوو بەرەو روومان هات و هاواری کرد:

– راپەڕینە راپەڕین، وا مەرکەزی قەزای هەولێریش دەست بەسەردا گیرا و ئازاد کرا، ئەو چەکەم لەوێ بەدەست هێنا.

ئیدی ژمارەیێك گەنجی لای ئێمەش بەگەڵیان کەوتن و سەر بەرەو خوار و بەهوتاف کێشان شۆڕبوونەوە بەرەو لای فلکەی عەنکاوە و لەوێوە بۆ هەڵکوتانە سەر دایەرەی ئەمن.

منیش وا لەناخەوە دەکولێم و نەوزاد هەر دیار نییە، لەو کاتەدا (م) هاتە لام کەئەویش بۆ مەسەلەی چەك بەتەمای نەوزادی نانەوا بوو، بەیەکەوە بڕیارماندا بەبێ چەك بەرەو لای دایەرەی ئەمنی نزیك چایخانەی بایز بڕۆین، لەرێگا سەیر دەکەم (م) لەفافێکی لەمل کردەوە و لەدەموچاوی پێچا و وەك دەمامك بەس کونی چاوەکانی دیار بوون، هێشتا نەگەیشتبووینە ئەوبەری مزگەوتی حاجی عەبدوڵڵا، لایدا کۆڵانەکان و لەپەنای دیواری خانووەکان رێیدەکرد و زۆر بەسستی و بەترسەوە هەنگاوی دەنا، لە ترسان چۆکی دەلەرزی، کەچی جارێ ئێمە لەکوێ و دەنگی تەقە و دایەرەی ئەمن لەکوێ؟

بەهەرحاڵ پێبەپێ لەگەڵیدا خۆمان گەیاندە سەری کۆڵانی ئەو خانوە کۆنەی موڵکی مامۆستا موحسین دزەیی بوو، پێشتر لەسەرەتای هەشتاکان ئیستخباراتی بەعس داگیرییان کردبوو و من سەرەتای گرتنەکەم لەساڵی (١٩٨١) چەند رۆژێك لەوێ بەندکرام و دواتر برامە هەیئەی کەرکوك.

لەسەری کۆڵانەکە کەلاوەیێك کەتەنها دیوارێکی بەپێوە مابوو ژمارەیێك گەنج خۆیان دابووە پەنا دیوارەکە و لەوێڕا چاودێری تەقە و شەڕی جەماوەر و دایەرەی ئەمنیان دەکرد، ئێمەش چووینە لای ئەوان، کەسەیرم کردن یەکێکیان غەریب نەبوو لەلام ناسیمەوە، سڵاوم لێکرد و گوتم:

– چۆنی کاك ئازاد (وامزانی کاك ئازاد جوندیانیە).

کەچی گەنجەکە گوتی:

– ببورە کاك زاهیر، من هەڵگوردی برای کاك ئازاد جوندیانیم.

ئیتر بەیەك شاد بووینەوە و وردە وردەش بەرگری لەلای دایەرەی ئەمنەوە نەدەما و ئیتر جەماوەر بەگوڕ هەڵمەتیان بۆ دایەرەکە دەست پێکرد، هەر کەگەیشتینە بەر دەرگای دایەرەی ئەمن ژمارەیێك گەنج بەچەکەوە وەستابوون، یەکێکیان کاك کرمانج عەبدوڵڵا بوو، ئیتر پاش چاك و چۆنی کاك کرمانج بەمنی گوت:

– ئەوە چییە، لۆ بێچەکی و هیچت پێنییە؟

منیش حاڵ و مەسەلەی خۆمان و شەهید نەوزاد نانەوام بۆ باسکرد و گوتم بڕیار بوو ئەو چەکمان بۆ پەیدا بکات کەچی هەر نەهات و بەدەرنەکەوت. تومەزە کاك کرمانج ئاگاداری مەسەلەکە بوو، گوتی:

– کاك نەوزاد لەقۆلێکی دی و لەلای کوران مەشغوڵە، لۆیێ نەیتوانیوە بێتە لاینگۆ.

کاك کرمانج دەمانچەیێکی تاریقی لەبەر پشتێنەکەی دەرهێنا و دایە من و

گوتی:

– با ئەو دەمانچەیەت پێبی، باش نییە بێ چەك بیت.

بەسوپاسەوە دەمانچەکەم لێوەرگرت و لەلام مایەوە تا رۆژێك بەر لەشار دەرچوونمان و کۆچە بەکۆمەڵەکە.

بەهەرحاڵ، جەماوەری راپەڕیو بەناو دایەرەی ئەمنی هەولێر وەربوون و لەملا و لەولاش تەرمی ئەمنەکان بەکوژراوی کەوتبوون و خەڵك بەبێ نرخی سەیرییان دەکردن، چووینە ناو دایەرە لەگۆشەیێك خەڵك دەورەیان لەسێ چوار گەنجی جلك شڕ و لەڕ و لاواز دابوو گوتیان ئەوانە لەناو زیندانی دایەرەی ئەمنی هەولێر جەماوەری راپەڕیو ئازادییان کردون، یەکێك لەو گەنجانە کاك غازی حەسەنی رۆژنامەنووس بوو.

خەڵکەکە وروژابوو، دەگەیشتنە یەکتری و پیرۆزباییان لەیەکتر دەکرد، ئێمەش بەرەو لای سەرەوە هەنگاومان هەڵێنا و چووینە ناو ئەو بینایەی کەکاتی خۆی یەکێك لەسانەوییەکانی شاری هەولێر بوو کرابووە دایەرەی ئەمن و زیندانەکەش هەر لەوێ بوو، سەرم بەژوورێك داگرت بینیم گەنجێك کیسەیێکی گەورەی لەبەردەم خۆی داناوە و یەك یەك زەرفەکانی ناوی دەردەهێنێ و هەڵیاندەپچڕێنێ و هەویە و وەرەقەکان فڕێدەدات و پارەکەش لەگیرفانی دەپەستی، خۆم بۆ نەگیرا و گوتم:

– برادەر ئەوە ئەتو چ دەکەی.. ئەو زەرف و پارانە هەمووی هی زیندانیەکانە کەگیراون لێیان وەرگرتوون و لەو زەرفانەیان داناون، ناکرێ تۆ پارەکان ببەی و هەویە و بەڵگەکانیش بەو گۆڕەی وەرکەی.

گەنجەکە هەر وەڵامیشی نەدامەوە، چوومە ژوورێکی تر سەیرم کرد یەك کارتۆن کاسێتی دەنگی داندراوە و هەموویان ژمارەیان لەسەر بوو بەش بەش کراون، کارتۆنەکەم هەڵگرت و نەمهێشت کەس دەستی بۆ ببات، دواتر

کەلەماڵەوە گوێم لێگرتن بۆم دەرکەوت، ئەم کاسێتانە دەنگی ئەو خەڵکانەی لەسەرە کەبەتەلەفۆن قسەیان لەگەڵ یەکتر کردووە و لەژێر چاودێری دایەرەی ئەمندا بوونە.

بەمشێوەیە، تا دەوروبەری سەعات یانزەی پێش نیوەڕۆش جار جارە فڕۆکەی کۆپتەر لەئاسمانی هەولێری سەر ئازا و رزگارکراو لەبەرزایی دەسوڕانەوە، ئەو ڕۆژە لەهەولێر بووە شایی و ئاهەنگ، ئۆخەی سەد ئۆخەی هەولێریش چووە پاڵ شارە ئازادکراوەکانی دی.



لەگەڵ دوو ئامۆزای دایکم



کەشافە...

لە قۆناغی سەرەتاییدا



لەگەڵ پەریزادی خوشکم

مام گیوی موکریانی چرکاندویەتی



باوکم و من و ئەدیبە و پەریزاد

مام گیوی موکریانی چرکاندویەتی



من و ئەدیبە و پەریزاد

مام گیوی موکریانی چرکاندویەتی



ساڵی ١٩٦٦
وێنەگری ڤینۆس



ساڵی ١٩٦٦
لەگەڵ باوکم
لە گەڵی عەلی بەگ



شانۆیی (ئەنجامی پول پەرستی) بۆ یەکەمجار چوونە سەر شانۆ وەك ئەکتەر لە ١٩٧٢/١٢/٤

لەراستەوە:  ئازاد قەرەداغی ، عیماد ئەکرەم ، خۆم



لەگەڵ باوکم، پاش تەواو بوونی نمایشی شانۆیی (ئەنجامی پول پەرستی)  لە ١٩٧٢/١٢/٤



**لە ئاوارەیی ئۆردوگای زێوە**

**١٩٧٥/١/٢٠**



١٩٧٣



١٩٧٥/٥/٩

وێنەگری شێروان



١٩٨٢/٢/٢

وێنەگری بەشدار



١٩٨٣



ڕۆژی هاوسەرگیریمان لەگەڵ (شیرین) ١٩٨٠/١٢/١٢



لەگەڵ (شیرین)
١٩٨٠/١٢/٣٠
وێنەگری میدیا



هاوینەهەواری حەمامۆك لە كۆیە



ناوەڕاستی شەستەكان / خانەوادەكەم



جەژنی یەك ساڵەی هاتنە

دونیای (رۆشنا)

١٩٨٦/٤/١٦



خانەوادەکەم

(رۆشنا ، شیرین، خۆم ،

لاوێن، رەوا ، لانە)

١٩٩٧/١٠/٢٥



لەنێوان دایك و باوكم - ١٩٨٠/١٢/٧



دایەگیان
(قەدریە حەسەن حوسێن)



**گازینۆی شەوانی هەولێر (شەماڵ عەباس، خۆم، عەبدوڵڵا محیەدین/عەبە کەرکوکی**

**١٩٧٥/١٢/١٤**



**کەرکوکی کوردان ، لەکەڵ نووسەر (فەیسەڵ هەمەوەندی و برادەران)**

**ساڵی ١٩٧٦**



لەگەڵ قوتابییە هاوڕێکانم لە ئامادەیی پیشەسازی کارەبا/ هەولێر

ساڵی ١٩٨٠



خۆم و دڵشادی شەهید مەولود شینە و حاجی ڕەشیدی کێخوا ئەحمەد و سەمەدی کوڕی

گوندی سماقوڵی گرتك / ١٩٨٢



لەگەڵ شیرین لە گوندی سماقوڵی گرتك ، دروستكردنی ناندین / ١٩٨٢



لە موختەبەر شیماڵ / ١٩٨٩



یەکەمین دیداری شانۆی کوردی لە هەولێر / هۆڵی نەقابەی کرێکاران ، لەگەڵ ڕەوانشاد (مەحمود زامدار)



تیپی شانۆی سەربازی / لە مەرکەز تەدریبی هەولێر



له موختەبەر شیمال /

١٩٨٩/١١/٢

لەگەڵ هونەرمەندی گەورە

رەوانشاد (کەریم کابان)



لەگەڵ شاعیری گەورە

رەوانشاد مامۆستا

(هێمن موکریانی)




**ستافی شانۆگەری (ماڵی نوێ) هۆڵی گەل - ١٩٧٩/٣/٢٤**



**لەکاتی مەکیاژکردن لەگەڵ**
**(سەعدون یونس)**



شانۆگەری (محەمە و سێویێ) هۆڵی گەل /
لەگەڵ هونەرمەندی رەوانشاد (فەرهاد شەریف)



ستافی شانۆیی (چیرۆکەکانی مام سمایل)



شانۆیی (قەڵای دمدم) هۆڵی گەل

لەراستەوە: شەهید جەوهەر بایر ، سیروان عوسمان، سەلام کۆیی، خۆم، ئیبراهیم



شانۆیی (قەڵای دمدم) هۆڵی گەل

لەراستەوە: خۆم، شیرین سابیر ، ئەحمەد جەمیل، دڵپاک تاهیر



ستافی شانۆیی (قەڵای دمدم) هۆڵی گەل

لەراستەوە: شیرین ، دڵپاك ، رەوانشاد سەمیرەی شەکرە خوشك



ستافی شانۆیی (هاوارێك لە حاجی قادری کۆییەوە) هۆڵی رۆشنبیری جەماوەر

رەوانشاد مەحمود زامدار و هونەرمەندی گەورە زیاد ئەسعەد دیارن / ١٩٩٠

## دوا هەناسە بۆ ئەم بەرگە:

* ئۆخەی نەمردم و (خەرەند)ی تاقانەم بەتاقانەیی نەهێشتەوە و (تەیراوە.. هەر بەپیاسە)ی بیرەوەریم کردە دەستەخوشکی.
* سوپاس بۆ هەفتەنامەی (باس) کە بە سوپاسەوە ژمارەیێک لەم بیرەوەرییانەمی بڵاوکردەوە و لوتفیان نواند، بەتایبەتی برای رۆژنامەنوس کاك (بەرهەم عەلی) سەرنووسەر.
* سوپاس بۆ کاك (جەعفەر جەوهەر خدر) لەدیوانی وەزارەتی رۆشنبیری و لاوان کەدڵسۆزانە پاڵپشتم بوو.
* رێز و سوپاس بۆ هاوتەیراوەییم کاك (ئاری نانەکەلی) کە لە بەچاپگەیاندنی ئەم بەرگە هاوکار و دڵسۆزم بوو.
* سوپاس بۆ کاکە (لاوێن)ی کورم، کەهەر هەموو بەشەکانی لەهەفتەنامەی (باس) بڵاو کراوەتەوە ئەو بۆی تایپ کردم و زەحمەتی دەکێشا.
* زۆر سوپاس بۆ هونەرمەند (سەلام (ئاشتی) عەدۆ) کە بە سەلیقە جوان و هونەرییەکەی فۆتۆی بەرگی ئەم بیرەوەرییانەی بۆ رازاندمەوە.
* زۆر سوپاسی بۆ کاك (جەمال حەمەدمین) کەبەرگی ئەم کتێبەی بۆ رازاندمەوە.
* سوپاس بۆ برای شاعیر کاك (مەسعوود پەرێشان) کەبەردەوام پاڵپشت و هاندەرم بوو.
* سوپاس بۆ برای شاعیر و رۆژنامەنووس کاك (عەبدولرەحمان فەرهادی) کە لەبواری زمانەوانی بەم بەرگەدا چووەوە و زەحمەتی کێشا.

# پێرست